**باس و توێژینەوە بڵاوکـــراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کـــوردی دەربـــڕی بیـــر و بۆچوونـــی توێژەرانـــن نەک دەستەی نووســـەرانی گۆڤار**


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەساز: عیسام موحسین.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، شیلان جەلال، ئیمان نەجات
- بەشی پەیوەندی: شیلان جەلال
- چاپ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر.
- تیراژ: ٢٥٠ دانە.

لەم ژمارەیەدا

## بەشی کوردی



## بەشی عەرەبی - القسم العربي



## بەشی ئینگلیزی

# ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوە
# لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

١- گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی، گۆڤارێكی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی كورد و كوردستان، بڵاودەكاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێكی دیكە بڵاو نەكرابێتەوە یان بۆ بڵاوكردنەوە وەرنەگیرابێت.
٢- زمانی كوردی زمانی سەرەكی بڵاوكردنەوەیە لە گۆڤارەكە، بەڵام لێكۆڵینەوەی زانستی بە زمانانی دیكەش بڵاودەكاتەوە كە سەروكاری بە كوردستانەوە هەبێت.
٣- هەر بابەتێك كە بۆ گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی دەنێردرێت، دەبێت ناوونیشانی باسەكە، ناوی نووسەر، شوێنی كارەكەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەكەی لە سەر لاپەڕەی یەكەمی لێكۆڵینەوەكە نووسرابێت.
٤- نووسەر دەبێت پوختەی باسەكەی بە هەردوو زمانەكەی دیكە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەكە لە كۆتایی توێژینەوەكە بنووسێت، كە نابێت لە یەك پەڕەی (A4) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەكییەكانی توێژینەوەكە بخرێنەڕوو.
٥- لە دوای پەسەندكردنی باسەكە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستییەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوكردنەوەی بە توێژەر دەدات.
٦- بۆ ئەوەی بابەتەكە لەگەڵ ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوەی گۆڤارەكەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێك بیرۆكەی سەرەكی توێژینەوەكە نەگۆڕێت.
٧- ئەگەر باسەكە لە بارەی ساخكردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەكە بە پێی بنەما زانستییەكان بێت و چەند لاپەڕەی كۆپیكراوی دەستنووسەكە و شوێنی وەرگرتنی، كۆد و جۆری دەستنووسەكە (دەستنووس، چاپ، مایكرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.

٨- ئەگەر ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باسەکە، توێژینەوەی بابەت، شێوازی بەکارهێنانی سەرچاوە و ڕێکخستنی پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێت، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێت فەرامۆش دەکرێن.

٩- دەبێت باسەکە دانەیەکی لەسەر (CD) لەگەڵ (٣) دانەی چاپکراوی سەر کاغەز (A4) بە فۆنتی یۆنیکورد بێت، ناوونیشانی سەرەکی بە قەبارە (١٥) و ناوی توێژەر و ناوونیشانی لاوەکی بە قەبارە (١٤) و ناوەڕۆک بە (١٣) و پەراوێزیش بە (١٢) بێت، بە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانی بە لیستی پەراوێز و سەرچاوەکانیشەوە لە (٢٥) لاپەڕە زیاتر نەبێت و لە حاڵەتی ناچاریشدا تا (٣٠) لاپەڕە وەردەگیرێت، بە مەرجێ پێویستە و پەراوێزەکانیشی لە ناوەڕۆک و لە پەراوێزدا لە ناو دووکەوانەی( ) بچوک دابێت و لە کۆتایی باسەکە دابندرێت.

١٠- ئەگەر بابەتەکە وەرگێڕدراو بوو، دەبێت لە زمانی یەکەمەوە بێت و دەقە ئەسڵەکەشی لەگەڵدا هاوپێچ کرابێت.

١١- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی ناساندن و هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبانەی لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرە زانستییەکانی ئەم بوارەی کردبێت.

١٢- بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بە هیچ شێوەیەک نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# ڕۆڵی هێز و ئاواز لە ڕستەی پرسیاردا لە زمانی کوردی و فارسیدا

**د. تارا سەعید عەبدوڵلا**
کولێجی زمان- زانکۆی سلێمانی

**ئەژین ئیبراهیم ساڵح**
کولێجی پەروەردە- زانکۆی گەمیان

لە ئاخاوتندا وشە و ڕستەکان بە ڕەوتێکی ڕێکی ئاسایی دەرنابڕێن ، بەڵکو بەردەوام لە بەرزی و نزمیدا دەبن. دوو جۆر ڕەوت لە زماندا دەست نیشان کراون (هێز) و (ئاواز). هێز زیادە وزەیێکی دەنگییە لەپڕ لەسەر یێکێ لە بڕگەکانی وشەدا سەرهەڵدەدات. هێز سەر بە ئاستی مۆرفۆلۆجییە. ئاواز گۆڕینی ڕەوتی قسەکردنە لە ئاستی ڕستەسازیدا. هەر ئاوازە واتا و مەبەستێکی تایبەتی دەدات. پرسیار .. سەرسوڕمان .. ناڕەزایی خۆشی .. ناخۆشی ..هتد. ئەم لێکۆڵینەوەیە کە بەناونیشانی هێز و ئاوازە.. هەوڵدانێکە بۆ دەسنیشانکردنی چۆنیەتیی کارکردنی هێز و ئاواز لە زمانی کوردی و فارسیدا و دەرخستنی چیاوازیی لە نێوانیاندیە لەم دوو لایەنەدا.

**ڕۆڵی هێز و ئاواز لە ڕستەی پرسیاردا لە زمانی کوردی و فارسیدا**

مرۆڤ لەکاتی بەکارهێنانی زمان و ئەنجامدانی ئاخاوتن ئامانجێکی هەیە، ئەویش گەیاندنی مەبەست و واتایە. واتە تێگەیاندنی بەرامبەر یان دەوروبەرەکەی لەو وشە و ڕستانەی دەریاندەبڕێت، ئەمەش بە تەنها لە بەکارهێنانی وشەی فەرهەنگی و ڕیز بوونیان لە ڕستەدا بەدی نایەت، بەڵکو هێز و ئاوازیش دەورێکی گرنگ دەبینن لە تەواوکردنی واتا و گەیاندنی مەبەستی قسەکەردا، بەجۆرێك لەکاتی قسەکردندا گۆڕینی شوێنی هەریەك لە هێز یان ئاواز دەبنە هۆی گۆڕینی واتای وشە و ڕستەکان یان دەبنە هۆی گۆڕینی مەبەستی قسەکەر.

ڕستە لە نووسیندا زۆر بە ئاسانی دیاری دەکرێت، چونکە سەرەتا و کۆتایی هەیە، بکەر و کردار بەئاسانی دیاری دەکرێت بەهۆی خاڵبەندییەوە دەزانرێت چ جۆرە ڕستەیەکە، بەڵام لەکاتی ئاخاوتندا بە هۆی هێز و ئاوازەوە مەبەستی ڕستەکە ئاشکرا دەبێت، کە دەتوانێت بە گۆڕینی هێز لە وشەیەکدا واتای ئەو وشەیە بگۆڕێت، گۆڕینی هێز لە سەر وشەیەك لە ڕستەدا یان گۆڕینی ئاوازی ڕستەیەك واتای جیاواز دروست دەبێت.

کەواتە لەکاتی قسەکردندا هێز و ئاواز جێگەی خاڵبەندی دەگرێتەوە، چونکە لەکاتی نووسیندا دانەنانی خاڵبەندی بۆ ڕستەکان دەبنە هۆی لێ تێنەگەیشتنی خوێنەر، بە هەمان شێوە لە کاتی قسەکردندا ئەگەر قسەکەر بەتەواوەتی بیری لای ئەو هێز و ئاوازە نەبێت کە پێویستە بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستەی کە خۆی دەیەوێت، بێگومان گوێگر تێناگات.

**هێز لە ڕستەی پرسیاردا:**

ڕستەی پرسیار وەکو هەمو جۆرە ڕستەیەکی تر هێزی لەگەڵدا بەکار دێت، واتە هێز دەکەوێتە سەر وشەیەك لە وشەکانی ڕستەکە بەپێی مەبەستی قسەکەر. لە سەرەتادا ئاماژەمان بەوە دا کە ڕستەی پرسیار چەند جۆرێکە هێز لەسەر ئەم جۆرانە دەستنیشان دەکەین:

**١- هێز لە جۆرەکانی ڕستەی پرسیار لە زمانی کوردیدا:**

**یەکەم: هێز لە ڕستەی پرسیاری تایبەتی:**

لەم جۆرە ڕستە پرسیارییەدا، لەبەر ئەوەی وشەی پرس بەشداری لە داڕشتنی ڕستە پرسیارییەکەدا دەکات، هێزی سەرەکی ڕستەکە دەکەوێتە سەر وشە پرسەکە چونکە لە ڕستەی پرسیاری تایبەتیدا قسەکەر مەبەستی سەرەکی پرسیارکردنە لەو بەشەی ڕستەکە کە وشەی پرسیاری تێدا بەکاردەهێنێت، بەم شێوەیە:

**١ - کتێبەکەم لەکوێیە'؟**

هێز دەکەوێتە سەر وشە پرسەکە، وشە پرسەکە لە هەرشوێنێکی ڕستەکە بێت، هەر هێزەکە بۆ خۆی ڕادەکێشێت، چونکە قسەکەر مەبەستی زانینی ئەو شتەیە کە پرسیاری لێ دەکات. نموونە:

٢- أ – کێ' لەم شوێنە دادەنیشێت؟
ب – لەم شوێنە کێ' دادەنیشێت؟

بەگۆڕینی شوێنی وشەی پرس هێزەکەش لەگەڵ وشە پرسەکەدا جێگۆڕکێ دەکات.

**دووەم: هێز لە ڕستەی پرسیاری گشتی:**

**١- ڕستەی پرسیاری گشتی بەبێ بەکارهێنانی وشەی پرس:**

ئەم جۆرە ڕستە پرسیارییە، وشەی پرسیاری تێدا بەکار ناهێنرێت، تەنها بە بەکارهێنانی ئاوازی پرسکردن دروست دەبێت لە قسەکردندا، بۆیە هێزی سەرەکی ڕستەکە دەکەوێتە سەر ئەو وشەیەی کە قسەکەر خۆی مەبەستییەتی، گواستنەوەی هێزەکەش لەسەر وشەیەك بۆ سەر وشەیەکی تر، مەبەستی پرسیارکردنەکە دەگۆڕێت. بەم شێوەیە:

٣ – أ – سبەینێ' تاقیکردنەوە ئەنجام دەدەین؟
ب – سبەینێ تاقیکردنەوە' ئەنجام دەدەین؟
ج – سبەینێ تاقیکردنەوە ئەنجام دەدەین'؟

لەم ڕستانەی سەرەوەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، بەگۆڕینی شوێنی هێزەکە مەبەستی پرسیار کردنەکەی گۆڕی، واتە لە ڕستەی یەکەمدا هێز کەوتووەتە سەر (سبەینێ) مەبەستی پرسیارەکە بەم شێوەیەی لێدێت (سبەینێ تاقیکردنەوە ئەنجام دەدەین یان ڕۆژێکی تر؟)، لە ڕستەی دووەمدا هێز کەوتووەتە سەر (تاقیکردنەوەکە) پرسیار لە تاقیکردنەوەکەیە، مەبەست بەم شێوەیە (سبەینێ تاقیکردنەوە ئەنجام دەدەین یان محازەرە ئەخوێنین؟)، لە ڕستەی سێیەمدا هێز کەوتووەتە سەر کردارەکە و مەبەست پرسیارکردنە لەوەی کە (ئایا تاقیکردنەوە ئەنجام دەدەین یان نا؟).

**٢ _ ڕستەی پرسیاری گشتی بە بەکارهێنانی ئامرازی (ئایا):**

لەم جۆرە ڕستە پرسیارییەدا، هێز دەکەوێتە سەر ئامرازی ئایا. بەم شێوەیە:

٤ – ئایا' میوانەکان دێن؟

لەم ڕستەیەدا ئامرازی (ئایا) بەهێزێکی زۆرترەوە دەردەبڕدرێت، واتە هێزی زیاترە لە وشەکانی تری ناو ڕستەکە.

**سێیەم: هێز لە ڕستەی پرسیاری هەڵبژاردن:**

ڕستەی پرسیاری هەڵبژاردن کە بە یارمەتی ئامرازی (یان، یان....یان) دروست دەبێت لە دوو ڕستە پێکدێت، هێزی سەرەکی ڕستەکە دەکەوێتە سەر ڕستەی یەکەم. وەك:

**٥ – أ – دەڕۆیت' یان ناڕۆیت؟ ب – بیهێنم' یان نا؟**

ڕستەی یەکەم لەم دوو ڕستەیەی (٥ – أ و ب) هێزیان زیاترە لە ڕستەکانی دوای خۆیان.

**چوارەم: هێز لە ڕستەی کلکە پرسیار:**

کلکە پرسیار ئەو ڕستەیە، کە بەشی یەکەمی ڕستەکە لە شێوەی گەیاندنی هەواڵێکدایە، لەگەڵ بەکارهێنانی کلکە پرسیار، "هێزیش دەکەوێتە سەر برگەی یەکەمی وایە (وا') و ئەگەر کلکە پرسیارەکە نەرێ بێت دەکەوێتە سەر مۆرفیمی نەرێ (نی') ی (وانییە) کلکە پرسیارەکە.(**ڕەحمان ئیسماعیل،١٩٩٨: ١٨٧)**

**٦– ئازاد خوێندکارێکی زیرەکە، وانییە؟**

لەم ڕستەیەدا هێز کەوتۆتە سەر مۆرفیمی نەرێ (نی') و هێزێکی زیاتری بۆ خۆی ڕاکێشاوە.

**٧ – نووسەرێکی سەرکەوتووە، وایە؟**

هێز کەوتووەتە سەر برگەی (وا') ی سەرەتای کلکە پرسیارەکەوە.

**ئاواز:**

لەکاتی ئاخاوتندا ئاواز دەورێکی گرنگ دەبینێت لە گەیاندنی واتای ڕستەکاندا، قسەکەر بەپێی مەبەستی خۆی کە ئاوازی دەربڕینی دابەش دەکات بەسەر وشە لەناو ڕستەکاندا و بۆ گەیاندنی ئەو واتایەی کە خۆی مەبەستییەتی; لە دەنگسازیدا ئاواز فۆنیمێکی ناکەرتییە چونکە بە گۆڕینی ئاوازی ڕستە دەبێتە

هۆی گۆڕینی مەبەستی ڕستەکە. ئەم ئاوازەش لە ئەنجامی گۆڕینی لەرینەوەی ژێکان دروست دەبێت بەپێی ویستی قسەکەر، هەر ئاوازێکیش واتایەکی جیاواز بە دەربڕینەکان دەبەخشێت. چەندین پێناسە بۆ ئاواز کراوە[1]، لەوانەش:

_ ئاواز بریتییە لە بەرز بوونەوە و نزمبوونەوەی دەنگ لە کاتی ئاخاوتندا **(تمام احسان،١٩٧٩: ١٩٨)**

_ گۆڕینی پلەی (نغمە)ی ڕستەیەك بەبێ دەستکاریکردنی وشە و بڕگە و فۆنیم و مۆرفیمی ئەو ڕستەیە، پێی ئەوترێ ئاوازە و ئەبێتە هۆی گۆڕینی ئەو ڕستەیە."**(غازی فاتیح وەیس، ١٩٨٤: ٩٣)**

_ گۆڕینی لەرینەوەی ژێکان دەبنە هۆی گۆڕینی ئاوازی ڕستە. هەر ئاوازەش واتایەکی جیا بە ڕستە دەبەخشێت.**(وریا عومەر ئەمین، ٢٠٠٩: ٢٨٩)**

ئاوازیش دوو جۆرە:

ئاوازی وشە و ئاوازی ڕستە.

**٢– ئاوازی ڕستەی پرسیار لە زمانی کوردیدا:**

**١ _ ئاواز لە ڕستەی پرسیاری گشتیدا:**

قسەکەر دەتوانێ ڕستەیەکی هەواڵی بگۆڕێت بۆ پرسیاری گشتی بەگۆڕینی ئاوازەکەی، ئەو ئاوازەش کە بۆ ئەم مەبەستە بەکاردەهێنرێت ئاوازی ٢ (بەرز _ هەڵس)ە، واتە بە بەکارهێنانی ئەم ئاوازە ڕستەکە لە هەواڵییەوە دەگۆڕدرێت بۆ پرسیاری گشتی، کە بە بەڵێ یان نەخێر وەڵام دەدرێتەوە.

**٨ – أ – || بەختیار مامۆستایە. ||**

**ب – || بەختیار مامۆستایە؟ ||**

جیاوازیی نێوان ئەم دوو ڕستە لە ئاوازدایە، ڕستەی یەکەمیان کە ڕستەیەکی هەواڵییە و ئاوازی دەربڕینی ڕستەکە ئاسۆییە و ئاوازی ١(کەوت) وەردەگرێت، واتە هێزی سەرەکی ڕەوتی نزم، بەڵام ڕستەی دووەم ئاوازێکی بەرزی هەیە، واتە هێزی سەرەکی ڕەوتی بەرزی هەیە ٢ (بەرز _ هەڵس) کە ئەرکی پرسکردنی بە ڕستەکە بەخشیوە.

**- أ || باخەکە گەورەیە. ||**

**ب - || ئایا باخەکە گەورەیە؟ ||**

لە نموونەی ( أ ) دا ئەم ڕستە هەواڵییە و ئاوازی ١ (کەوت) ی هەیە، لە ڕستەی (٩- ب) بە هۆی بەکارهێنانی ئامرازی (ئایا) بووە بە ڕستەیەکی پرسیاری گشتی، ڕستەکەش ئاوازی٣ (نزم _ هەڵس) ی هەیە، واتە لێرەدا ئامرازی (ئایا) ئەرکی پرسکردنەکەی بەجێ هێناوە نەك ئاوازەکە.

لە ڕستەی پرسیاری گشتیدا، "تۆنی( ٢) زیاتر مەیلی بەرەو ئەوە دەڕوات کە لەگەڵ دەربڕینە کورتەکاندا بەکاربێت"**(ڕەحمان ئیسماعیل،١٩٩٨: ١٨٥)**. واتە ڕستەی پرسیاری گشتی لە شێوەی مۆرفۆ سینتاکسدا ئەم تۆنەی بۆ بەکاردێت.

**- أ - || دەڕۆی؟ ||**

**ب - || ناخەویت؟ ||**

لەم دوو جۆرە ڕستەیەدا تۆنی( ٢) بەکارهێنراوە.

**٢ _ ئاواز لە ڕستەی پرسیاری تایبەتیدا:**

ڕستەی پرسیاری تایبەتی ئاوازێکی ئاسایی هەیە کە هەمان ئاوازی ڕستەی هەواڵی وەردەگرێت، هێڵی ئاوازەکەی بەم شێوەیە | ↘ | ، واتە لەگەڵ ئاوازی (١ کەوت) دەردەبڕێت.**(تالیب حوسێن عەلی،٢٠١٤: ١٥٦)**. کاتێك ڕستەیەکی هەواڵی دەکرێ بە ڕستەی پرسیاری تایبەتی، وشەی پرسیار لەشوێنی ئەو کەرەستە دادەنرێت کە پرسیارەکەی لێ دەکرێت و هەمان ئاوازی (١ کەوت)ی ڕستە هەواڵییەکەی بۆ بەکار دێت. نموونە:

**١١ - أ - || منداڵەکە یاری دەکات. ||**

**ب _ || کێ یاری دەکات؟ ||**

**ج _ || منداڵەکە چی دەکات؟ ||**

لەم ڕستانەی سەرەوەدا ڕستەی (١١ - أ) ڕستەیەکی هەواڵییە و ڕستەکانی (١١ - ب و ج) ڕستەی پرسیاری تایبەتین، بەهەموویان هەمان ئاوازی (١ کەوت)

وەردەگرن."بەگشتی ڕستەی پرسیاری تایبەتی ئاوازی (١ کەوت) وەردەگرێ کاتێك بەشێوەیەکی ئاسایی دەردەبڕێت و تەنیا بۆ مەبەستی پرسیارکردن بەکاردێت، واتە لەگەڵ مەبەستی تردا تێکەڵ نەکرێت، چوکە بەکارهێنانی ڕستەی پرسیاری تایبەتی لەگەڵ مەبەستی تردا وەك نەرێ کردن ڕستەکە ڕەنگە ئاوازی تر وەربگرێت."**(تالیب حوسێن عەلی،٢٠١٤: ١٥٦)**

**٣ _ ئاواز لە ڕستەی پرسیاری هەڵبژاردندا:**

لە ڕستەی پرسیاری هەڵبژاردندا ئاواز لە بەرزەوە بۆ نزمە لەسەر ئامرازی (یان) نزم دەبێتەوە، وە لە کۆتاییدا نزم دەبێتەوە، واتە ئاوازی ٥ (هەڵس– کەوت) وەردەگرێت. وەك:

**١٢– ‖چا دەخۆیتەوە یان قاوە؟‖**

ئاوازی ئەم ڕستەیە بریتییە لە ئاوازەی ناوەڕاست بۆ زۆر نزم.

**٤ _ ئاواز لە ڕستەی کلکە پرسیار:**

ئەم جۆرە ڕستەیە، بەشی یەکەمی ڕستەیەکی هەواڵییە و ئاوازی١ ( کەوت) ی هەیە،"بلاوترین تۆن کە لەگەڵ کلکە پرسیاردا بەکاردێت، لە باری ئاسایی قسەکردندا، تۆنی (٣)یە کە بە تۆنێکی بێ لایەن دادەنرێت. جگە لەمە تۆنی (٢) بەشێوەیەکی بلاو بەکاردێت کە دووپاتی دەگەیەنێت وەك واتایەکی سەربار لەگەڵ ئەم جۆرە پرسیارکردنە"**(ڕەحمان ئیسماعیل،١٩٩٨: ١٨٦)**، بەم شێوەیە:

**١٣– أ – ‖هاوینی ئەمساڵ زۆر گەرمە، وانییە؟‖**

**ب – ‖دەڵێن کچێکی جوانە، وایە؟‖**

بەشی یەکەمی ئەم ڕستانە (١٣ – أ و ب) ئاوازی ڕستەی هەواڵییان هەیە و بەشی دووەمیش کە کلکە پرسیارەکەیە ئاوازی بەرەوە ژوورە واتە لە نزمەوە بۆ بەرزە.

ئەوەی تێبینی دەکرێ تۆنی (٢) مەیلی زیاتر لەوەیە، کە لەگەڵ دەربڕینی (وانییە)دا بێت. **(هەمان سەرچاوە:١٨٧)**

**٥ _ ئاواز لە ڕستەی پرسیاری دەنگدانەوە:**

ئـەم جـۆرە ڕسـتـەیە هـەروەکو پێشـتر ئاماژەمـان پێکـردووە، لـەدوای ئـەوەی کەسی یەکـەم هـەواڵێك دەگەیـەنێت ئـەم جـۆرە پرسـیارە دروسـت دەبێـت. بۆیـە ئاوەزەکەی بەپێی جۆری ڕستە دەنگدانەوەکە دەگۆڕێت، واتە ڕسـتـەی پرسـیاری گشتی بێت یان تایبەتی بێت.وەك:

**١٤ – أ – میوانەکان هاتن؟**

**ب – ‖هاتن؟‖**

لەم پرسیارە (١٤ – ب) دەنگدانەوەیەدا تۆنی (٢) بەکارهاتووە.

**ج – منداڵەکان یاری دەکەن.**

**پ – ‖چی دەکەن؟‖**

نموونەی(١٤– پ) لەم پرسیارە دەنگدانەوەیەدا تۆنی (٢) بەکارهاتووە.

**٣ – تکیە در زبان فارسی _ هێز لە زمانی فارسیدا:**

لە زمانی فارسیدا، هێز هۆکارێکە بۆ دیاریکردنی برگەیەك لە برگـەکانی تـر لـە یەك وشەدا. برگەی هێزدار ئاسـایی بـە هـەوڵێکی فیزیـایی زیـاتر بەرهـەم دێـت لـە برگەی بێ هێز، ئەم هەوڵدانە فیزیکییە لە زیادکردنی چالاکی ماسوولکەکانی قورگ و زیادبوونی ماوەی مانەوەی ئەندامەکانی بەرهەمهێنان.

بەگشتی هێز بۆ سێ جۆر (اولیة، ثانویە، بی تکیە _ یەکەم و دووەم و بێ هێز) دەستنیشان کراوە. بۆنموونـە لـە وشـەی ( phonetician ) برگـەی یەکـەم، هێـزی دووەمی هەیە و برگـەی سـێیەم، هێـزی یەکـەمی هەیـە و برگـەکانی تـر بـێ هێـزن **(گلناز مدرسی ،١٣٩٠: ١١٥)**.

لـە خشـتـەی ئـەلفابێی دەنگـی نێـو دەوڵەتیـدا، بـۆ پیشـاندانی هێـزی یەکـەمین و دووەمـین سـوود لـە نیشـانەکانی['] و [ˌ] وەردەگیرێـت و برگـەی بـێ هێـزیش نیشانەی نییە.

شارەزایانی دەنگسازی ئاماژە بۆ دوو جـۆر هێـز دەکـەن، ئـەوانیش هێـزی وشـە و هێزی ڕستەن.

**تکیه در جمله پرس _ هێز لە ڕستەی پرس:**

هێز لە زمانی فارسیدا بەواتای (تکیه) دەکەوێتە سەر پیت یان وشەیەك کە زۆرترین ڕۆڵی لە ڕستەدا هەیە و ئامانجی سەرەکی قسەکەرە. ئەگەر چی کۆتایی داخراوی هێز بڕگەیە، لەگەڵ ئەمەشدا لە ڕووی کارکردنەوە یەکەی هێز پەیوەندی بە وشەوە هەیە، هەر وشەیەك ئەگەر بە تەنها دەربڕدرێت، بڕگەیەکی هێزدار لەگەڵ هێزێکی یەکەم تێدا هەیە.

**١- تکیه در جمله پرسشی آزاد _ هێز لە ڕستەی پرسیاری تایبەتی:**

ڕستەی پرسیار کاتێك تەنها بەمەبەستی پرسیارکردن بەکاردێت، ئەگەر وشەی پرس لە ڕستەکەدا هەبێت هێز دەچێتە سەر وشەی پرسیارەکە، بەڵام لەڕستەی پرسیار کە بەهۆی ئاوازەوە دروست دەبێت هێز دەچێتە سەر ئەو وشەیە لە ڕستەکەدا کە قسەکەر خۆی مەبەستییەتی.

**١٥- مانی <u>کجا</u>' است؟**

لە ڕستەی (١٥) ئەو وشە پرسیارییەی کە هێڵمان بەژێردا هێناوە هێزی کەوتۆتە سەر، چونکە جێی مەبەستی پرسیارکەرە.

**٢ _ تکیه در جمله پرسشی بله/خیر _ هێز لە ڕستەی پرسیاری گشتی:**

لەم جۆرە ڕستەیەدا کە وشەی پرسیاری تێدا بەکار ناهێنرێت، هێز بەپێی مەبەستی قسەکەر بەکاردەهێنرێت. واتە مەبەست لە هەر وشەیەك بێت هێز دەچێتە سەر ئەو وشەیە لە ڕستەدا.

لە ڕستەی پرسدا چۆنێتی گوتن دەکرێت ببێتە هۆی گۆڕینی پرسیارەکە.بۆ نموونە لە ڕستەیەکی سادە:

**١٦ -أ- مەریەم کتاب می خواند؟ مەریەم کتێبی دەخوێندەوە؟**

ئەم ڕستەیە لە سێ وشە پێکهاتووە لە سێ باری جیاوازدا ئەتوانین هێز بەکار بهێنین و لە هەر بارێکیشدا واتای جیاواز دەگەیەنێت.

ئەگەر هێز بخەینە سەر (مەریەم')، ئەوا پرسیار لە بکەر دەکرێت، پرسیارەکە ئەم واتایە دەگەیەنێت:

**ب - آیا این مەریەم است کتاب می خواند یا شخص دیگر؟**

**ئایا ئەمە مەریەمە کە کتێب دەخوێنێتەوە یان کەسێکی ترە؟**

ئەگەر هێز لەسەر وشەی(کتاب')، ئەوە واتا بابەتی پرسیار کتێبەکەیە، بەم شێوەیە پرسیارەکە ئەمەیە:
**ج – مەریەم کتاب می خواند یا روزنامە؟ مەریەم کتێبی دەخوێندەوە یا ڕۆژنامە؟**

ئەگەر هێز بخەینە سەر کردارەکە (می خواند')، واتا بابەتی پرسیارەکە خوێندنەوەیە.پرسیارەکە دەکرێت بەم شێوەیە بێت:
**پ – آیا مەریەم اهل کتاب خواندن هست؟ ئایا مەریەم کەسێکی خوێنەرە؟**
لێرەدا بینیمان کە یەك ڕستەی پرسیار دەتوانرێت بە سێ شێوەی جیاواز دەربڕدرێت، کەواتە هێز ڕۆڵێکی گرنگ لە ڕستەی پرسیاردا دەبینێت.

**٤ – زیروبمی جملە پرس_ ئاوازی ڕستەی پرس لە زمانی فارسی:**

ئاواز لە لێکدانی تایبەتییەکانی لەرەلەر و سەرەتای لەرینەوە پێکدێت. هەرچی ژمارەی لەرەلەر زیاتر بێت، دەنگ بەرزتر و هەرچی کەمتر بێت دەنگ نزمتر دەبێت.(**علی محمد حق شناس،١٣٥٦ :١٢٤)**
وشەی زیر بە واتای بەرز و بم بە واتای نزم دێت لە زمانی فارسیدا، کە مەبەست لێی بەرزبوون و نزم بوونی دەنگ دەگەیەنێت لەکاتی ئاخاوتندا.

لە ڕستەی هەواڵیدا پەستانی دەنگەکانی کۆتایی ڕستە کەمترە لە پەستانی دەنگەکانی سەرەتای ڕستە، بە واتایەکی تر (الگو _ ڕێچکەی) ی ئاوازەی ڕستەی هەواڵی (افتان _ کەوت)ە.
بەڵام پەستانی دەنگەکانی کۆتایی ڕستەی پرسیاری و سەرسوڕمان و فەرمانی بە بەراورد بە پەستانی دەنگەکانی سەرەتای ڕستە زیاترە، بە واتایەکی تر لەم جۆرە ڕستانەدا ڕێچکەی ئاوازەیان (خیزان _ هەڵس)ە.
ڕێژەی گۆڕانی ئاواز لە ڕستەی پرسیاری، سەرسوڕمان و فەرمان جیاوازە. بۆنموونە لە ڕستەی سەرسوڕماندا جیاوازی پەستان لەنێوان دەنگەکانی سەرەتا و کۆتاییدا زیاترە لە ڕستەی پرسیار و فەرمان، بێگومان دەبێت ئەوەش بڵێین کە

له ڕستەی پرسدا سوود له هەردوو جۆری ئاوازەی (خیـزان _ هـەڵس) و (افتـان _ کەوت) وەردەگیرێت.

**ئاواز له جۆرەکانی ڕستەی پرسیار له زمانی فارسی:**

**١ _ ئاواز له ڕستەی پرسی بله و خیر _ پرسیاری گشتی:**

ئـەم جـۆرەی ڕسـتەی پرسـیار بـە بـەڵێ و نـەخێر وەڵام دەدرێتـەوە، هـیچ وشەیەکی پرسـی تێدا نییە. بۆ ئـەم جـۆرە ڕسـتەیە ئـاوازی (خیـزان _ هـەڵس) بەکاردەهێنرێت.بۆنموونە:

**١٧ – پ _ داود به دانشگاه رفته؟** ↖ **داود بۆ زانکۆ ڕۆیشتووە؟**

ئاوازی ئەم ڕستەیە هەڵس واتە بۆ سەرەوەیە.

**٢ _ ئاواز له ڕستەی پرسیاری آزاد _ پرسیاری تایبەتی:**

لەم جۆرە ڕستەیەدا کە یەکێك له وشە پرسیارییەکانی وەکو (کجا، کـی، ئێـا، چه، چند، ....) تێدایە. ئەم ڕسـتەیە یـان بـە ئـاوازی (خیـزان _ هـەڵس) یـان بـە ئاوازی (افتان _ کەوت) گۆ دەکرێت. **(خسرو غلامعلی زاده،١٣٨٢: ٣٠٢)**

لە هەریەکێك لە ڕستەکانی خوارەوەدا نیشانەی تیرەکە، کارایی هەر یەکە لە ڕستە پرسەکان بە دوو ئاڕاستەی گۆڕان لە ئاوازی (هەڵس و کەوت) دیاریدەکات:[1]

**١٨ – أ – پ _ آیا داود به دانشگاه رفته؟** ↖

**ب – پ _ آیا داود به دانشگاه رفته؟** ↙

**ج – پ _ داود کجا رفته؟** ↖

**پ – پ _ داود کجا رفته؟** ↙

کەواتە ئاڕاستەی گۆڕانی ئاواز لە ڕستەی پرسدا جێگیر نییـە، ئەگـەر قسـەکەر بیەوێت وەڵام لە گوێگر وەربگرێت، ئەوا ڕستەی پرس لەگەڵ بـوونی وشـەی پـرس بە ڕێچکەی ئاوازەی (خیزان _ هەڵس) گۆ دەکرێت، جگە لەمـەش، ڕەنگـە هـەمان ڕستە بە ئاوازەی کەوت گۆ بکرێت. **(خسرو غلامعلی زاده،١٣٨٢: ٣٠٣)**

ئـاوازەی (خیـزان _ هـەڵس) بـەزۆری کاتێـك بـەکاردەهێنرێت کـە قسـەکەر پێویستی بە وەڵامدانەوە یان کاردانەوەی گـوێگر هـەبێت، بەپێچـەوانەوە ئـاوازەی

(افتـان _ کـەوت) ئامـاژە بـۆ کۆتـایی هـاتن یـان تـەواو بـوونی قسـەکردنەکەیە، واپیشان دەدات کە قسەکەر پێویستی بە وەڵامدانەوەی گوێگر نییە.

**٥ – بەراوردی هێز و ئاوازی ڕستەی پرسیار لە زمانی کوردی و فارسیدا:**
**لێکچوونی هێزی وشە لە زمانی کوردی و فارسیدا:**

١ _ لە زمانی کوردیدا هێـز فـۆنیمێکی ناکەرتییـە و دەکەوێتـە سـەر بڕگەیـەك لـە وشەدا، یان دەکەوێتە سەر وشەیەك لە وشەکانی ڕستە و بەگۆڕینی شوێنی هێز لە وشە و لە ڕستەشدا، دەبێتە هۆی گۆڕینی واتا یان گۆڕینیان لە ڕووی ڕێزمانەوە.
بۆنموونە: برایەتی
ئەگەر هێز لەسەر بڕگەی یەکەم بێت/برا'/ _ واتە ئەو برای ئەوە.
ئەگەر هێز لەسەر دوا بڕگە بێت/تی'/ – ناوی واتاییە.
لێـرەدا گرنگـی و کاریگـەری هێزمـان بـۆ دەردەکـەوێت لـەکاتی ئاخاوتنـدا، کـە بەگۆڕینی شوێنەکەی واتاکەی گۆڕی.
بەهەمان شێوە لە زمانی فارسیدا، هێز مامەڵەی فۆنیمی لەگەڵدا دەکرێت چـونکە بە گۆڕینی شوێنی هێز واتا دەگۆڕێت. هێز هۆکارێکە بۆ دیـاریکردنی بڕگەیـەك لـە بڕگەکانی تر لە یەك وشەدا.
هێز دەتوانێت چەند ڕۆڵێك بگێڕێت، بۆنموونە لە زمانی فارسـیدا جیـاوازی شـوێنی هێز لە وشەکانی (ولی _ سەرپەرشـت) [va.'li] و (ولی _ بـەلام) ['va.li] دەبیـنین کەتیگۆری و واتاکەشی دەگۆڕدرێت.
٢ _ ئەو بڕگەیەی هێزی ئەکەوێتە سەر، هەوایەکی زۆری لەگەڵدا سـەرف ئـەکرێ و ئەوەی هێزی ناکەوێتـە سـەر، هەوایـەکی کـەمتری لەگەڵـدا سـەرف ئـەکرێت. هێـز لەزماندا هیچ وێنەیەکی تایبەتی بۆ دانەنراوە، بەلام خاوەن زمان بەئاسانی و بەبێ تەنگوچەڵەمە بەکاری ئەهێنێ و لەو شوێنەدا بەکاری ئەهێنێ کە پێویستە بـەکاری بهێنی بەبێ هەڵەکردن.
بە هەمان شێوە لە زمانی فارسیشدا، بڕگەی هێزدار ئاسایی بـە هـەوڵێکی فیزیـایی زیاتر بەرهەم دێت لە بڕگەی بێ هێز، ئەم هەوڵدانە فیزیکییە لە زیادکردنی چالاکی ماسوولکەکانی قوڕگ و زیادبوونی ماوەی مانەوەی ئەندامەکانی بەرهەمهێنان.

**جیاوازی هێزی وشە لە زمانی کوردی و فارسیدا:**

لە زمانی کوردیدا هێزی وشە بەو جۆرە دابەش کراوە کە یەکێك لە بڕگەکانی وشە هێزی دەکەوێتە سەر، واتە ئەو وشەیەی کە بریتییە لە دوو بڕگە یان زیاتر، بڕگەیەکیان هێزی ئەکەوێتە سەر و بەگۆڕینی ئەو هێزە لەو بڕگەیەوە بۆ بڕگەیەکی تر واتا دەگۆڕێت واتە دوو جۆر هێزی وشە دیاریکراوە (هێزی یەکەم، بێ هێز) واتە بڕگەیەك هێز وەردەگرێت و بڕگەکانی تر بێ هێزن.

بەڵام لە زمانی فارسیدا هێزی وشە، بەگشتی بۆ سێ جۆر هێز (اولیة، ثانویة، بی تکیە _ یەکەم و دووەم و بێ هێز) دەستنیشان کراوە. بۆنموونە لە وشەی (phonetician ) بڕگەی یەکەم، هێزی دووەمی هەیە و بڕگەی سێیەم، هێزی یەکەمی هەیە و بڕگەکانی تر بێ هێزن.

**٦ – بەراوردی هێز لە ڕستەی پرسیار لە زمانی کوردی و فارسیدا:**
**لێکچوونی هێز لە ڕستەی پرس لە زمانی کوردی و فارسی:**

**یەکەم: هێز لە ڕستەی پرسیاری تایبەتی:**

لەم جۆرە ڕستە پرسیارییەدا، لەبەر ئەوەی وشەی پرس بەشداری لە داڕشتنی ڕستە پرسیارییەکەدا دەکات، هێزی سەرەکی ڕستەکە دەکەوێتە سەر وشە پرسەکە، بەم شێوەیە:

**کتێبەکەم لەکوێیە'؟**

هێز دەکەوێتە سەر وشە پرسەکە، وشە پرسەکە لە هەر شوێنێکی ڕستەکە بێت، هەر هێزەکە بۆ خۆی ڕادەکێشێت چونکە مەبەستی سەرەکی قسەکەرە. نموونە:

بەهەمان شێوە لە زمانی فارسیدا، ڕستەی پرسیار کاتێك تەنها بەمەبەستی پرسیارکردن بەکاردێت، ئەگەر وشەی پرس لە ڕستەکەدا هەبێت هێز دەچێتە سەر وشەی پرسیارەکە، بەڵام لەڕستەی پرسیار کە بەهۆی ئاوازەوە دروست دەبێت هێز دەچێتە سەر ئەو وشەیە لە ڕستەکەدا کە قسەکەر خۆی مەبەستییەتی.

**مانی کجا' است؟**

ئەو وشە پرسیارییەی کە هێڵمان بەژێردا هێناوە هێزی کەوتۆتە سەر.

**دووەم: هێز لە ڕستەی پرسیاری گشتی، کە بە دوو ڕێگە دروست دەبێت:**

**١– ڕستەی پرسیاری گشتی بەبێ بەکارهێنانی وشەی پرس:**

ئەم جۆرە ڕستە پرسیارییە، وشەی پرسیاری تێدا بەکار ناهێنرێت، تەنها بەکارهێنانی ئاوازی پرسکردن دروست دەبێت لە قسەکردندا و لە نووسینیشدا نیشانەی پرسیار دادەنرێت، بۆیە هێزی سەرەکی ڕستەکە دەکەوێتە سەر ئەو وشەیەی کە قسەکەر خۆی مەبەستییەتی، گواستنەوەی هێزەکەش لەسەر وشەیەك بۆ سەر وشەیەکی تر، مەبەستی پرسیارکردنەکە دەگۆڕێت. بەم شێوەیە:

**سبەینێ' تاقیکردنەوە ئەنجام دەدەین؟**

**سبەینێ تاقیکردنەوە' ئەنجام دەدەین؟**

**سبەینێ تاقیکردنەوە ئەنجام دەدەین'؟**

هەروەها لە زمانی فارسیدا ڕستەی پرسیار کە بەهۆی ئاوازەوە دروست دەبێت، بەپێی مەبەستی قسەکەر هێز دەکەوێتە سەر ئەو وشەیە کە قسەکەر مەبەستییەتی. لە ڕستەی پرسدا چۆنێتی گوتن دەکرێت ببێتە هۆی گۆڕینی پرسیارەکە.بۆ نموونە:

**مەریەم کتاب می خواند. مەریەم کتێبی دەخوێندەوە.**

ئەم ڕستەیە لە سێ وشە پێکهاتووە لە سێ باری جیاوازدا ئەتوانین هێز بەکار بهێنین و لە هەر بارێکیشدا واتای جیاواز دەگەیەنێت.

ئەگەر هێز بخەینە سەر (مەریەم')، ئەوا پرسیار لە بکەر دەکرێت، پرسیارەکە ئەم واتایە دەگەیەنێت:

**ئایا این مەریەم است کتاب می خواند یا شخص دیگر؟**

**ئایا ئەمە مەریەمە کە کتێب دەخوێنێتەوە یان کەسێکی ترە؟**

ئەگەر هێز لەسەر وشەی (کتاب')، ئەوە واتا بابەتی پرسیار کتێبەکەیە، بەم شێوەیە پرسیارەکە ئەمەیە:

**مەریەم کتاب می خواند یا روزنامە؟ مەریەم کتێبی دەخوێندەوە یا ڕۆژنامە؟**

ئەگەر هێز بخەینە سەر کردارەکە (می خواند')، واتا بابەتی پرسیارەکە خوێندنەوەیە. پرسیارەکە دەکرێت بەم شێوەیە بێت:

**آیا مەریەم اهل کتاب خواندن هست؟ ئایا مەریەم کەسێکی خوێنەرە؟**

**٢- ڕستەی پرسیاری گشتی بە بەکارهێنانی ئامرازی (ئایا):**

لەم جۆرە ڕستە پرسیارییەدا، هێز دەکەوێتە سەر ئامرازی ئایا. بەم شێوەیە:

**ئایا' میوانەکان دێن؟**

لەم ڕستەیەدا ئـامرازی (ئایـا') بـەهێزێکی زۆرتـرەوە دەردەبڕدرێـت، واتـە هێـزی زیاترە لە وشەکانی تری ناو ڕستەکە.

**٧ - بەراوردی نێوان ئاوازی ڕستەی پرسیار لە زمانی کوردی و فارسیدا:**

**لێکچوونی ئاواز ی ڕستەی پرس لە هەردوو زمانەکەدا:**

**ئاوازی وشە** (ton)**:**

بریتییە لە ئاوازی تاقە وشەیەك کە پێی دەوترێت تـۆن (واتـە وشـەیەك ئـاوازی جیاجیای دەخرێتە سەر و هەمان وشە واتای جیاواز دەبەخشێت)، کە ئەم جـۆرە ئاوازە لە زمانی کوردیدا بوونی نییە، لە زمانی چینیدا ئەم جۆرە ئاوازە زۆر بـەدی دەکرێت.

بە هەمان شێوەی زمانی کوردی لە زمـانی فارسـیدا جیـاوازی ئـاوازی وشـە نابێتـە هۆی جیاوازی واتا.

**١- ئاواز لە ڕستەی پرسیاری گشتیدا:**

لە زمانی کوردیدا، قسەکەر دەتـوانێ ڕسـتەیەکی هـەواڵی بگۆڕێـت بـۆ ڕسـتەی پرسـیاری گشـتی بـەگۆڕینی ئاوازەکـەی، ئـەو ئـاوازەش کـە بـۆ ئـەم مەبەسـتە بەکاردەهێنرێت ئاوازی ٢ (هەڵس)ە، واتە بەبـەکارهێنانی ئـەم ئـاوازە ڕسـتەکە لـە هەواڵییەوە دەگۆڕدرێت بۆ پرسیاری گشتی.

‖ **بەختیار مامۆستایە.** ‖ ڕ. هەواڵی ئاوازی نزم١ (کەوت)

‖ **بەختیار مامۆستایە؟** ‖ ڕ. پرسیاری ئاوازی ٢ (بەرز _ هەڵس)

بە هەمان شێوە لە زمانی فارسیشدا، ئاسایی کاتێك دەست دەکەین بـە دەربڕینـی ڕستەیەك لە سەرەتاوە ئاوازی دەنگمان نزمە، دواتر بەتێپـەڕبوونی کـات ئاوازەکـە

بەرز دەبێتەوە و دووبارە نزم دەبێتەوە تا دەگاتە ئاستی بێدەنگی و سەرئەنجام ئاوازەکە دەوەستێت. ئەو دەستەواژانەی کە بەم شێوەیە دروست دەبن واتە ئاوازی دەنگ لەکاتی دەستپێکردندا نزمە و دواتر بەرز دەبێتەوە و سەرئەنجام دێتە خوارەوە و دەوەستێت، دەوترێت ڕستەی هەواڵی وەکو ئەم ڕستەیە:




بەلام ئەگەر لە دەربڕینی دەستەواژەیەکدا ئاوازی دەنگمان لە نزمەوە بۆ بەرز دەست پێبکات و دواتر لە سەرەوە بوەستێت و نەیەتە خوارەوە و نزم نەبێتەوە ئەوا بەو ڕستەیەی کە دروست دەبێت دەوترێت ڕستەی پرسیاری وەکو ئەم ڕستەیە:




**فرنگیس به بازار رفت؟** **فەرەنگیس بۆ بازاڕ ڕۆیشت؟**

ئەگەر هاتوو لە لە دەربڕینی بەشێك لە ئاخاوتنەکەدا ڕیتمی دەنگەکە یەك شێوە و فۆرم بێت، ئەوا ناتەواو بوونی ئاخاوتنەکە پیشان دەدات.

**٢ ــ ئاواز لە ڕستەی پرسیاری تایبەتیدا:**

لە زمانی کوردیدا، ڕستەی پرسیاری تایبەتی ئاوازێکی ئاسایی هەیە کە هەمان ئاوازی ڕستەی هەواڵی وەردەگرێت، هێڵی ئاوازەکەی بەم شێوەیە | ↙ |، واتە لەگەڵ ئاوازی ١ (کەوت) دەردەبڕرێت. کاتێك ڕستەیەکی هەواڵی دەکرێ بە ڕستەی پرسیاری تایبەتی، وشەی پرسیار لەشوێنی ئەو کەرەستە دادەنرێت کە پرسیارەکەی لێ دەکرێت، هەمان ئاوازی ١ (کەوت)ی ڕستە هەواڵییەکەی بۆ بەکار دێت. نموونە:

**أ _ || منداڵەکە یاری دەکات. ||**

**ب _ || کێ یاری دەکات؟ ||**

**ج _ || منداڵەکە چی دەکات؟ ||**

لەم ڕستانەی سەرەوەدا ڕستەی (أ) ڕستەیەکی هەواڵییە و ڕستەکانی (ب و ج) ڕستەی پرسیاری تایبەتین، بەهەموویان هەمان ئاوازی (١ کەوت) وەردەگرن.

هەروەها لە زمانی فارسیدا جملە پرسشی آزاد، لەم جۆرە ڕستەیەدا کە یەکێك لە وشە پرسیارییەکانی وەکو (کجا، کی، آیا، چە، چند، ....) تێدایە. ئەم ڕستەیە بە ئاوازی (افتان _ کەوت) گۆ دەکرێت.

**پ _ آیا داود بە دانشگاه رفتە؟**

**پ _ داود کجا رفتە؟**

**جیاوازی ئاوازی ڕستەی پرسیار لە زمانی کوردی و فارسیدا:**

١ _ ئاوازی ڕستەی پرسیار لە زمانی کوردیدا بەم شێوەیە دەستنیشان کراوە:

ئاوازەی ١ (کەوت)     ئاوازەی ٢ (بەرز– هەڵس)     ئاوازەی ٥ (هەڵس– کەوت)

ئاوازەی ٣ (نزم – هەڵس)     ئاوازەی ٤ (کەوت – هەڵس)

بەڵام ئاوازی ڕستەی پرسیار لە زمانی فارسیدا تەنها بۆ دوو جۆر دەستنیشان کراوە:

خیزان _ هەڵس

افتان _ کەوت

٢ _ لە زمانی کوردیدا ڕستەی پرسیاری گشتی کە ئامرازی (ئایا)ی تێدایە، ئاوازی ٣ (نزم–هەڵس) ی هەیە.

**|| ئایا باخەکە گەورەیە؟ ||**

لێرەدا ئەم ڕستە هەواڵییە بە هۆی بەکارهێنانی ئامرازی (ئایا) بووە بە ڕستەیەکی پرسیاری گشتی، ڕستەکەش ئاوازی ٣ (نزم _ هەڵس) ی هەیە.

بەڵام لە زمانی فارسیدا، ڕستەی پرسیاری (بله، خیر _ گشتی) کە ئامرازی (آیا)ی تێدایە، ئەم ڕستەیە بە ئاوازی (افتان _ کەوت) گۆ دەکرێت.

**پ _ ئایا داود به دانشگاه رفته؟** ↙

٣ _ لە زمانی کوردیدا، ڕستەی پرسیاری تایبەتی ئاوازێکی ئاسایی هەیە کە هەمان ئاوازی ڕستەی هەواڵی وەردەگرێت، هێڵی ئاوازەکەی بەم شێوەیە | ↙ | ، واتە لەگەڵ ئاوازی ١ (کەوت) دەردەبڕێت.

بەڵام لەزمانی فارسیدا جمله پرسشی آزاد _ پرسیاری تایبەتی، لەم جۆرە ڕستەیەدا کە یەکێك لە وشە پرسیارییەکانی وەکو (کجا، کی، آیا، چه، چند، ....) تێدایە. ئەم ڕستەیە یان بە ئاوازی (خیزان _ هەڵس) یان بە ئاوازی (افتان _ کەوت) گۆ دەکرێت.

**پ _ آیا داود به دانشگاه رفته؟** ↖

**پ _ آیا داود به دانشگاه رفته؟** ↙

**پ _ داود کجا رفته؟** ↖

**پ _ داود کجا رفته؟** ↙

کەواتە ئاڕاستەی گۆڕانی ئاواز لە ڕستەی پرسدا جێگیر نییە، ئەگەر قسەکەر بیەوێت وەڵام لە گوێگر وەربگرێت، ئەوا ڕستەی پرس لەگەڵ بوونی وشەی پرس بە ڕێچکەی ئاوازەی (خیزان _ هەڵس) گۆ دەکرێت، جگە لەمەش، ڕەنگە هەمان ڕستە بە ئاوازەی کەوت گۆ بکرێت.

**٨ – کردەکانی ڕستەی پرس:**

هەموو وتەیەکی کاریگەر جگە لە واتا پیتییەکەی هێزێکی ڕەوانبێژیشی لەگەڵدایە، دیارە لە زۆر باردا ئەم هێزە ڕەوانبێژییە بەهۆی هێز و ئاوازەوە پێکدێت. قسەکەر دەتوانێت بەهۆی ئەو هێزە ڕەوانبێژییەی کە لە وتەکانیدا هەیە، کردەی قسەیی جیاواز و باوەڕ و هەڵوێستی خۆی بگەیەنێت.

تیۆری کردە قسەییەکان لەسەر چەند بنەمایەك بەندە، یەکێك لەو بنەمایانە ئەوەیە هەموو گوتنێك بۆ ئەنجامدانی نیاز و مەبەستی قسەکەرە، هەموو گوتنێك

وەسفی بارودۆخێکی تایبەت دەکات، بەڵام لەزۆر باردا مەبەستێکی قووڵتر لەدوای ئەو وەسفەوەیە، ئەویش مەبەستی قسەکەرە، قسەکەر کە وتەیەك دەردەبڕێت لەوانەیە مەبەستی (ئاگادارکردنەوە، هەڕەشەکردن، پۆزش هێنانەوە، گلەییکردن،....هتد) بێت، ئەم مەبەستانە بریتین لە کردەی قسەیی (**عومەر مەحمود کەریم، ٢٠١٢: ٢٠-٢١**).

کەواتە ئەوەی کە هۆکاری ئەو کردە ناڕاستەوخۆییانەیە، ئەو هێزە ڕەوانبێژییە کە وا دەکات دەربڕینەکان بەباشترین شێوە دەربڕدرێن و مەبەستێکی تر بگەیەنرێت و هەردوو یان هەموو بەشداربووانی ئاخاوتنیش باش لە کردە ناڕاستەوخۆکان تێدەگەن.

"لە کردەی قسەیی ناڕاستەوخۆدا مەبەستەکان بەشێوەیەك دەپێچرێنەوە، کە قسەکەر تێیدا خۆی پابەند دەکات بە ماگزیمەکانی ڕێزگرتنەوە و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ویستەکانی ناخاتە ڕوو، بەڵکو لەڕێی هێزی واتایەکی نافۆرمییەوە مەبەستەکانی دەگوێزرێنەوە و لە کردەیەکی نافۆرمیشدا جێبەجێیان دەکات. ئەم پرۆسەیە بەتایبەتی بۆ ڕستەی پرسیاری فەرمان دەگونجێت، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتە سیمانتیکی و دەرکەوتە پراگماتیکییەکانیان."(**ئاڤێستا کەمال مەحمود،٢٠٠٩: ١٤٩**)

**لەم ڕووەوە دەکرێت بڵێین کردەی قسەیی ڕستەی پرس دوو جۆرە:**
**کردەی ڕاستەوخۆی ڕستەی پرس:**
**کردەی ناڕاستەوخۆی ڕستەی پرس:**

کردەی ڕاستەوخۆی ڕستەی پرس بریتییە لەو مەبەستە ئاشکرایەی ڕستەی پرسیار کە مەبەست لێی تەنها پرسیارکردنە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لای بەرامبەر، لێرەدا ئەوەی کە مەبەستمانە کردەی ناڕاستەوخۆی ڕستەی پرسیارە، واتە ئەو کردانەی کە بەهۆی پرسیارکردنەوە دەگەیەنرێن کە مەبەست لێی دەستکەوتنی وەڵام یان زانیاری نییە لای بەرامبەر یان بە بەڵێ و نەخێر وەڵام نادرێتەوە، کردەی قسەیی ناڕاستەوخۆ پەیوەندیی بەهێزی ڕەوانبێژی وتە و

ڕستەکانەوە هەیە، ئەو کردانەش کە بەهۆی ڕستەی پرسیار دەگەیەنرێن چەندین مەبەست دەگرێتەوە، لەوانەش (داواکردن، پۆزشهێنانەوە، سەرزەنشتکردن، ناڕەزایی دەربڕین، توانج لێدان، ...هتد)

"سیستمی کەرەستە ناکەرتییەکان وەك (هێز، ئاواز، وەستان) جیاوازی لەنێوان کردەی قسەیی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆدا دەکات، واتە لەنێوان ئەوەی دەکرێ واتای وتەیەك وەکو واتای پیتی، دەقاودەق وەربگیرێ، یان وەکو واتای پراگماتیکی.
بەپێی هەندێك توێژینەوە هەر گوتنێك بە تۆنی نزم دەر ببڕدرێت بەڕێژەی (٧٣٪) خوێندنەوەی ناڕاستەوخۆی بۆ دەکرێت، هەروەها هەرگوتنێك بە تۆنی بەرز دەرببڕێت ئەوا بەڕێژەی (٥٤٪) خوێندنەوەی ڕاستەوخۆی بۆ دەکرێت." **( عومەر مەحمود کەریم،٢٠١٢: ٢١)٠**

**٩ – بەراوردی ئاوازی کردە ناڕاستەوخۆکانی ڕستەی پرسیار لە زمانی کوردی و فارسیدا:**
لێرەدا کردە ناڕاستەوخۆکانی ڕستەی پرسیار لە زمانی کوردی و فارسی لەگەڵ هێڵکاری ئاوازی دەربڕینیان بەراورد دەکەین:

**١– ئاگادارکردنەوە.**
لە زمانی کوردیدا ئاوازی ڕستەی ئاگادارکردنەوە لە سەرەتادا بەرزە و لە کۆتاییدا نزمە.



**١٩ – چۆن کاری وا دەکەیت؟**

بەڵام لە زمانی فارسی پێچەوانەیە:

**٢٠_ مگر نمی دانی که دست دزد را قطع می کنند؟**
**٢ _ داواکردن:**

**ئاوازی ڕستەی داواکردن لە زمانی کوردیدا لە سەرەتاوە بەرزە و لە کۆتاییدا نزم دەبێتەوە.**

**٢١ – پێنووست پێیە؟**

**بەڵام لە زمانی فارسیدا ئاوازی داواکردن لە سەرەتاوە نزمە و لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.**

**٢٢ – آیا بهتر نیست برویم؟ ئایا باشتر نییە بڕۆین؟**

**٣ _ هاندان:**

هاندانی گوێگرە بە ئەنجامدانی کارێك، کە بە قازانجی قسەکەر دەگەڕێتەوە.(**عەبدولواحید موشیر دزەیی**،٢٠١٣: ٤٤)

**٢٣ – ئیشێك بۆ برای خۆت دەکەیت؟**

ئاواز لە سەرەتادا نزمە، لەسەر فرێزی ناوی (برای خۆت) بەرز دەبێتەوە، دواتر نزم دەبێتەوە.لێرەدا قسەکەر خۆی خۆشەویست کردووە وەکو برا لەلای گوێگر، بۆ ئەوەی هانی بدات بۆ ئەنجامدانی کارێك.

ئاوازی ڕستەی هاندان لە زمانی فارسی تاڕادەیەك ئاوازەکە لەیەکەوە نزیکە:

**٢٤ _ چە کسی بە خانە کعبە رفتە و مشمول لطف خداوند نشدە؟**

**٤_ شانازیکردن:**

قسەکەر ڕستەیەکی پرسیار بەکاردەهێنێت، شانازی بەخۆیەوە دەکات.لە هەردوو زمانی کوردی و فارسیدا ئاواز لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٢٥– لە من باشترتان بینیوە؟**

**٢٦ – آیا حکومەت مصر مال من نیست؟ ئایا حکومەتی میسر هی من نییە؟**

**٥_ جێخۆشکردن/ موجامەلە:**

لـە زمـانی کوردیـدا ئـەم ڕسـتانە ئاوازەکـەیان لـە سـەرەتادا بـەرزە، دواتـر نـزم دەبێتەوە، واتە ئاوازی ٢ (بەرز _ هەڵس)ە.

**٢٧ – چایەکت بۆ بێنم؟**

**بەڵام لە زمانی فارسیدا ئاوازەکەیان پێچەوانەیە.**

**٢٨ – چای میل دارید؟ حەزت لە چا هەیە؟**

**٦ _ گاڵتە پێکردن:**

ئاوازی ئەم جۆرە ڕستەیە لە زمانی کوردیدا لـە سـەرەتا بـەرزە و لـە ناوەڕاسـت و کۆتاییدا نزم دەبێتەوە.

**٢٩ – تۆ دەوێریت کاری وا بکەیت؟**

بەڵام لە زمانی فارسیدا ئاوازەکەی پێچەوانەیە.

**٣٠ – مگر تو نمی گفتی کە من شیرم و از پس همە دشمنان بر می آیم؟**

**مەگەر تۆ نەتدەگوت کە من شێرم و بە هەموو دوژمنان دەوێرم؟**

**٧ _ پاڕانەوە:**

ئـاوازی ئـەم ڕسـتەیە لـە سـەرەتای پاڕانـەوە لەسـەر کـەی بـەرزە و دواتـر نـزم دەبێتەوە

**٣١ – خوایە گیان، کەی ڕزگارمان دەکەیت؟**

بەڵام لە زمانی فارسیدا بەپێچەوانەوە ئاواز لە سەرەتادا نزمە و لـە کۆتاییـدا بـەرز دەبێتەوە.

**٣٢ – آیا مارا بخاطر کار نادان هلاک می کنی؟(اعراف:١٥٥ )**

**٨ _ خۆزگە خواستن:**

مەبەستی خۆزگە خواستن دەگەیەنێت بۆ ئەنجامدان یان ئەنجام نەدانی کارێك.

٣٣ – چۆن ئەو کچە باشەمان لە دەست دەرچوو؟

ئاوازی ڕستەکە لە سەرەتادا لەسەر(چۆن) بەرزە و دواتر نزمە تا کۆتایی.

بەڵام لەزمانی فارسیدا لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٣٤ – آن مردان خدا جویی کجا رفتند؟**

ئەو پیاوانەی ڕوو لە خودا بۆ کوێ ڕۆیشتن؟

**٩ _ دوودڵی نیشاندان:**

**٣٥ – نازانم بیڵێم یان نەیڵێم؟**

تاڕادەیەك ئاوازی ئەم دوو جۆرە ڕستەیە لە هەردوو زماندا لەیەك دەچن.

**٣٦ – نمی دانم از دست او به کجا بگریزم؟ خراسان یا عراق؟**

**نازانم لە دەستی ئەو بۆ کوێ بڕۆم؟ خراسان یان عراق؟**

**١٠ _ بیر هێنانەوە:**

**٣٧ – چەند خۆشبوو کاتێك خوێندنمان تەواو کرد؟**

**ئاوازی ڕستەکە لە سەرەتادا بەرزە و دواتر نزمە تا کۆتایی.**

بەڵام لە زمانی فارسیدا بەپێچەوانەوە لە سەرەتادا نزمە و لە کۆتاییدا بەرزە.

**٣٨ – مگر ندیدی کە پروردگارت با اصحاب فیل چە کرد؟**

**٢٢ _ ترساندن و هەڕەشەکردن:**

**٣٩ – نەتبینی خوا چی بەسەر هێنان؟**

ئاوازی ڕستەکە لە سەرەتادا لەسەر ڕستەی یەکەم (نەتبینی) نزمە و لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

بەهەمان شێوە ئاوازی ئەم ڕستەیە لە زمانی فارسیدا لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٤٠ – بروم بگویم؟ یا : می خواهی بە همە بگویم؟**

**بڕۆم بیڵێم؟ یا : دەتەوێت بە هەمووان بڵێم؟**

**١٢ _ بیان عجز و ناتوانی _ دەربڕینی نەتوانین :**

ئاوازی ئەم ڕستەیە لە زمانی کوردیدا لە سەرەتا بەرزە و دواتر نزم دەبێتەوە..

**٤١ – چۆن دەتوانم سوپاسی تۆ بکەم؟**

بەڵام لە زمانی فارسیدا لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٤٢ – چ طور میتوانم از تو تشکر کنم؟ چۆن دەتوانم سوپاسی تۆ بکەم؟**

**١٣ _ گەورەیی و شکۆ:**

**٤٣ – خودا چەندە ناز و نیعمەتی بۆ مرۆڤ خولقاندووە؟**

ئاوازی ڕستەکە لەسەر (چەندە ناز و نیعمەت) بەرزە و دواتر نزم دەبێتەوە.

بەڵام لە زمانی فارسیدا پێچەوانەیە لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٤٤ – این چە لطفی است کە خدا بە بندگانش شامل آبی و خاکی و آسمانی شود؟**

**ئەمە چ لوتفێکە کە خودا بۆ بەندەکانی خەلقی ئاوی و خاکی و ئاسمانی کردووە؟**

**١٤ _ سەرسوڕمان :**

**٤٥ – چی بوو ئێمەت بیر کەوتەوە؟**

ئاواز لە سەرەتادا بەرزە و دواتر نزم دەبێتەوە تا کۆتایی.

بەڵام لە زمانی فارسیدا بەپێچەوانەوە ئاوازی ئەم جۆرە ڕستەیە لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٤٦ – چە شد کە یاد ما کردی؟ چی بوو کە ئێمەت بیر کەوتەوە؟**

**١٥ _ پیشاندانی زۆری:**

ئاواز لە سەرەتای ڕستەکە لەسەر وشەی پرسی (چەند جار) بەرزە، دواتر لەسەر بەشەکانی تری ڕستەکە نزم دەبێتەوە.

**٤٧ – چەند جار بەتۆم وت کە ئەم کارە نەکەیت؟**

بەڵام لە زمانی فارسیدا ئاوازەکەی پێچەوانەیە لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٤٨ _ چقدر بە تو گفتم کە این کار را نکنی؟ چەندە بەتۆم وت کە ئەم کارە نەکەیت؟**

**١٦ _ نائومێدی:**

**٤٩ – ئیتر چ کارێك بکەم؟**

ئاوازی ئەم ڕستەیە سەرەتا نزمە و دواتر واتە لەسەر (چ کارێك) بەرز دەبێتەوە و لەسەر کردارەکە نزم دەبێتەوە. واتە ئیتر کارێك لە دەستم نایەت یان هیچ کارێك نەماوە من بیکەم.

بەڵام لە زمانی فارسیدا لە سەرەتادا نزمە و لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٥٠ – دیگر چه کار کنم؟** **ئیتر چ کارێك بکەم؟**

**١٧ _ زیادەڕەوی:**

**٥١ – جا کێ لە ئێوە دڵسۆزتری بینیوە؟**
ئاواز لە سەرەتادا نزمە لە ناوەڕاستدا بەرزە و لە کۆتاییدا نزم دەبێتەوە.

بەڵام لە زمانی فارسیدا ئاوازی ئەم جۆرە ڕستەیە لە سەرەتا نزمە و لە کۆتاییدا بەرزە.

**٥٢_ وقتی که تو می توانی همه دنیا را به کشتن بدهی عزرائیل چه کاره است؟**
**کاتێك كە تۆ ئەتوانیت هەموو دنیا بدەی بە کوشت ئیزرایل چی کارەیە؟**

**١٨ _ مەرج:**
بۆ دەربڕینی مەرجیش لە پرسیار سوود وەردەگیرێت.

**٥٣ – ئەگەر دادپەروەری هەیە، ئەی ئەم هەموو زوڵمە چییە؟**
لە ڕستەی یەکەمدا ئاواز لە سەرەتاوە نزمە و لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە. بەڵام لە ڕستەی دووەمدا بەپێچەوانەوە ئاواز لە سەرەتادا بەرزە و لە کۆتاییدا نزم دەبێتەوە.
لە ڕستەی یەکەمدا ئاواز لە سەرەتاوە نزمە و لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە، بەڵام لە ڕستەی دووەم ئاواز لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٥٤ – اگر عدالتی هست، این همه ظلم برای چیست؟**

**١٩_ دڵنیای هەواڵ :**

**٥٥ – بۆچی نەگریم؟**

لە زمانی کوردیدا ئاوازی لەسەر وشەی پرسی (بۆچی ) بەرزە و دواتر نزم دەبێتەوە بەڵام لە زمانی فارسیدا بەپێچەوانەوە لە سەرەتادا نزمە و لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٥٦ – چرا گریە نکنم؟ بۆچی نەگریم؟**

**٢٠ _ شکاندنەوە و سووکایەتی پێکردن:**

ئاوازی ڕستەکە لە سەرەتادا نزمە، لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٥٧ – تۆ خۆت بە چی دەزانیت؟**

لە هەردوو زماندا ئاوازی ئەم جۆرە ڕستەیە لە کۆتاییدا بەرز دەبێتەوە.

**٥٨ – تا کی می خواهی بە این کارهای احمقانە ادامە بدهی؟**

**سەرچاوەکان:**

**بەزمانی کوردی:**

**ئاڤێستا کمال محمود** (٢٠٠٩) پراگماتیکی ڕستەی پرسیار و فەرمان لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی.

**ئەبوبەکر عومەر قادر** (١٩٩٣) پرسیار لەزمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، ز.سەلاحەدین.

**بەکر عومەر عەلی** (١٩٩٢) بەستن و کرتاندن لە کوردیدا، نامەی ماستەر، ز. سەلاحەدین.

**تالیب حوسێن علی** (٢٠١٥) دەنگسازی _ چەند بابەتێکی فۆنۆلۆجی کوردی، چ١ هەولێر.

دارا حمید محمد (٢٠١٢) شیکاریی ڕستەی ئاڵۆز لە ڕوانگەی پراگماتیکەوە، نامەی دکتۆرا، ز. سلێمانی.

**ڕەحمان ئیسماعیل** (١٩٩٨)، پەیڕەوی فۆنیمە ناکەرتی یەکان لە کوردیدا، نامەی دکتۆرا، ز.بەغداد.

**ساجیدە عەبدوڵا فەرهادی** (٢٠١٣) چەند لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی، هەولێر.

**عەبدولواحید موشیر دزەیی** (٢٠١٣) هێز و کاریگەری پرسیار لە دیمانـەکانی ڕاگەیانـدن دا، گ. ز. سەلاحەدین، ژ ٥٤.
**عومـەر مـەحمود کـەریم** (٢٠١٢) هێـز و ئـاوازە _ تێڕوانینێکـی پراگمـاتیکی، گ. ئەکادیمیای کوردی، ژ.٢٢.
**غازی فاتیح وەیس** (١٩٨٤) فۆنەتیك، چاپی یەکەم ، بەغدا.
**قـەیس کاکـل تۆفیـق** (١٩٩٥) جۆرەکـانی ڕسـتە و تیـۆری کـردە قسـەییەکان، نامـەی ماستەر، ز.سەلاحەدین.
**محەمەد ئەمین هەورامانی** (١٩٨١) زاری زمانی کوردی لە تەرازووی بـەراوردا، دەزگـای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا.
**محەمەد معروف فەتاح** (٢٠١١) زمانەوانی، چاپی سێیەم، هەولێر.
**نەوزاد ئەنوەر عومەر** (٢٠١٤) هەندێ لایەنی کۆمەڵایەتی پراگماتیك لە زمـانی کوردیـدا، نامەی ماستەر، ز. سلێمانی.
**وریا عومەر ئەمین** (٢٠٠٩) ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر.
**یارا قادر حەمەد مەلا زادەیی** (٢٠١٣) مۆرفۆسینتاکس لە شێوەزاری کۆیەدا، چاپخانەی کەمال، سلێمانی.

**سەرچاوەکان بە زمانی فارسی:**

**بهمن محتشمی** (١٣٧٠)، دستور کامل زبان فارسی، تهران.
**برویز** ١٣٩٢ دستور زبان فارسی، چاپ حیدری، چاپ بیست و چهارم، تهران.
**حسن انوری، حسن احمدی کیوی** (١٣٩٣)،دستور زبان فارسی ١، چاپ سوم، تهران.
**حسن انوری ، یوسف عالی** (١٣٩١)دستور زبان فارسی ١، دانشگاة پیام نور، چاپ ٣، تهران.
**خسرو غلامعلی زادة** (١٣٨٢) ساخت زبان فارسی، چاپ چهارم، تهران.
**سیروس شمیسا** (١٣٧٥)، معانی، چاپ چهارم، تهران، میترا.
**شـهلا حمیـد محمـد** (٢٠٠٩)، بررسـی تطبیقـی آرایـش سـازةها در زبانهـای فارسی و کردی، پایان نامه کارشناسی ارشد، دانشگاه صلاح الدین.
**علی محمد حق شناس** (١٣٧٦)،آواشناسی (فونتیک)، چـاپ ششـم، چاپ نقش جهان، صحافی هما.

**فریدون و دیکران** (١٣٨٨)، دستور توصیفی زبان فارسی، تهران.
**مهری باقری** (١٣٩٢) مقدمات زبان شناسی، چاپ هڤدهم، چاپ صبا، تهران.
**میر جلالدین کزازی** (١٣٩١) معانی (زیبا شناسی سخن پارسی)، چاپ نهم، چاپ نیکا چاپ، تهران.
**نوید فازل** (١٣٩٢)، دستور زبان پارسی، چاپ یکم، تهران.

**پەراوێزەکان:**

(١) ئاوازەکانی هەڵسوکەوت بەم شێوەیە دیاریکراون (تالب حسێن،٢٠١٤: ١٦٥)
ئاوازەی ١ (کەوت) ئاوازەی ٢ (بەرز _ هەڵس) ئاوازەی ٥ (هەڵس _ کەوت)
ئاوازەی ٣ (نزم _ هەڵس) ئاوازەی ٤ (کەوت _ هەڵس)

(١) نیشانەی ئاوازی (خیزان _ هەڵس) بەم شێوەیە: ↖
نیشانەی ئاوازی (افتان _ کەوت) بەم شێوەیە: ↙

## ملخص البحث

المتكلم باية لغة لاينطق كلماتها وجملها بشكل افقي على وتيرة واحدة اثناء التكلم . بل ينطقها بشكل تتخللها الارتفاعات والانخفاضات التي تعبر عن المعنى الدلالى للجمل والكلمات. فمعنى الجمل والكلمات تتغير بتغير محل النبرة على الكلمة ولحن الجملة. النبرة هي قوة اضافية تبذل على احد مقاطع الكلمة . اللحن هو طريقة لفظ الجملة .

هذا البحث محاولة لتحديد دور النبرة واللحن في جملة السؤال في اللغتين الكوردية والفارسية وتبيان التشابه والاختلافات بين هاتين اللغتين في هذا المجال.



## Abstract

Stress is the relative emphasis that given to certain syllables in a word, or to certain words in a phrase or sentence. intonation is variation of spoken pitch that is not used to distinguish words; instead it is used for a range of functions such as indicating the attitudes and emotions of the speaker, showing the difference between statements and questions, and between different types of questions, focusing ...etc.

This paper which is the third chapter of a thesis submitted for an M.A degree is a comparative research deals with stress and intonation in both Kurdish and Persian languages.

# لێڵیی زمانی و
# کاریگەری لەسەر تێگەیشتن

**م. ی. ئەمیر مستو محەمەد**
بەشی شوێنەوار ـ کۆلێژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

**م.ی. سارا حسێن خالید**
پەروەردەی دەشتی هەولێر

**پێشەکی:**

لێڵـی وەک دیاردەیـەکی زمـانی بـە شـێوەیەکی گشـتی لـە ئاسـتی سیمانتیکدا لێکدانەوەی بۆ دەکرێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە لێڵـی لـە ئاستەکانی تری زماندا نەبێت، چونکە ئاستەکانی زمان هـەموویان وەک ئەڵقەی زنجیر چوون بە ناویەکدا بـە لابردنـی ئەڵقەیـەک ئـەو زنجیرەیە تێکدەچێت. لێڵـی لـە هـەر ئاسـتێک لـە ئاسـتەکانی زمـان کاردەکاتـە سـەر ئاستەکانی تریش و ئاستی تێگەیشتنیش لێڵ دەکات. ڕوونی و ناڕوونیی ئاخـاوتن کاریگـەری دەبێـت لەسـەر تێگەیشـتنی بەرامبـەر بەتایبـەتی لـە کاتی قسەکردنی ڕووبەڕوودا. بۆیە پێویستە بە شـێوەیەکی ڕوون و بێ تەمومژی واتایی لە چوارچێوەیەکی سادەی ئاخاوتندا بدوێین بۆ ئەوەی بەرامبەر بە باشی لە ئاخاوتنەکە بگات.

توێژینەوەکـەمان بـاس لـە لێڵیـی زمـانی لـە ئاسـتەکانی زمـان و کاریگەری لەسەر تێگەیشتن دەکات. ڕێبازی وەسفی شیکاری گیراوەتـە بەر. ناوەڕۆکی بابەتەکە لە چەند بەشێک پێکهاتووە: بەشی یەکەم- باس لە چەمکی لێڵی و تێگەیشـتن و هۆکارەکانی دروسـتبوونی لێڵی دەکات. بەشـی دوەم- بـاس لـە جۆرەکـانی لێڵیـی زمـانی لـە ئاستەکانی زمـان و ڕێگاکانی ڕەواندنـەوەی لێڵی دەکات. لـە کۆتاییدا ئـەو ئەنجامـەی پێی گەیشتووین و سـەرچاوەکان و کورتەی باسـەکە بـە زمـانی ئینگلیزی و عەرەبی خراونەتە ڕوو.

## بەشی یەکەم
## لێڵی و کاریگەری لەسەر تێگەیشتن

### ١–١ چەمکی لێڵی:

لێڵی دیاردەیەکی زمانەوانییە، بە (تەمومژی واتا یان تەمی واتا)یی ناسراوە. پێناسەی جۆر بەجۆری بۆ کراوە، بەپێی پێویست ڕوون نەکراوەتەوە، چونکە لێڵی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە ئاخاوتنەوە هەیە، واتە زیاتر لە ئاخاوتندایە نەک نووسین و کاریگەریی زۆری لەسەر تێگەیشتن هەیە. گوێگر کاتێک قسەی بۆ دەکرێت پێویستە بە شێوەیەک بێت، کە ئالۆزی لە مێشکی دروست نەبێت، شتەکانی لا ڕوون بێت زۆر دوور نەکەوێتەوە لە مەبەستی سەرەکی ئاخاوتنەکە، بەڵام بەهۆی لێڵیی زمانی (لێڵی لە ئاخاوتندا) وا دەکات گوێگر چەندان لێکدانەوە بۆ ئاخاوتنەکان بکات و دوور بکەوێتەوە لە مەبەستی سەرەکی ئاخاوتنەکە. زۆرجار لێڵی دەبێتە هۆی هەڵە تێگەیشتن، بۆیە پێویستە ئاخێوەر بە شێوەیەکی ڕوون و دوور لە لێڵی زمانی بدوێت (قسە بکات).

لێڵی دیاردەیەکی زمانەوانییە و زۆربەی زمانەوانان دواون لە بارەیەوە و چەندان پێناسەیان بۆ چەمکی لێڵیی یان لێڵیی واتایی کردووە. لێڵیی واتایی (وشەکان بەتەنها واتایان لێڵە، لە بەکارهێناندا و بە هاوڕێیەتی کردنی لەگەڵ وشە و کەرەستەی تر واتاکانیان ڕوون دەبێتەوە. ئەم ڕوونبوونەوەیەش بە گوێرەی وشەکان دەگۆڕێت. ئەو وشانەی شاوشەن لە پەیوەندی گرتنەوەدا یاخود ناو نان لە گشت پارچەکانی شتێک ناوە واتاکانیان لێڵترە لەو وشانەی خوار خۆیان یاخود ئەوانەی، کە ئەمان دەیانگرێتەوە.[1] یان لێڵی بریتییە: لەوەی کە وشەیەک یان گرێیەک یاخود ڕستەیەک، کە گوزارشت لە واتایەک یان زیاتر دەکات.[2]. یان لێڵی لەوانەیە لە وشەیەک یان لە پێکهاتەی ڕستەیەکەوە بێت.[3]. یان لێڵی بریتییە: لە دەربڕینێک زیاتر لە مانایەک ببەخشێت.[4].

ئەگەر وشەیەک یاخود ڕستەیەک یاخود دەربڕاوێک دەربڕا زیاتر لە واتایەکی هەبوو ئەوا ئەو دەربڕاوە لێڵی واتایی هەیە، بەڵام ئەم لێڵییە نابێتە هۆی نادروستی دەربڕاوەکە بە تایبەتی لە ڕووی ڕێزمانییەوە، چونکە دەتوانین ڕوونکردنەوەی زیاتر بدەین (بەپێی بارو دۆخ) بە دەربڕاوەکە بۆ ڕوونکردنەوەی لێڵییەکە.
بە بڕوای ئێمە لێڵی بریتییە (لەو دەربڕاوە زمانییەی، کە زیاتر لە واتایەک هەڵدەگرێت و پێویستە دەوروبەر گوتنەکە ڕوونی دەکاتەوە).

**١-٢ چەمکی تێگەیشتن:**

کردەی تێگەیشتن کردارێکی میکانیکی ناو مێشکە و گوێگر بەپێی ئەو دەربڕاوانە (ئەو کەرەستە زمانی و نازمانییانە)ی لە لایەن ئاخێوەرەوە پێی دەگات وەریدەگرێت. پێناسەی جۆربەجۆری بۆ کراوە. تێگەیشتن بریتییە لە توانای تێگەیشتن و لێکدانەوەی زمان، چ وتراو یان نووسراو یان هێما و کردەی نازمانی بێت [٥]. یان تێگەیشتن پەیوەندی بە توانای تێگەیشتنی گوێگرەوە هەیە، بۆ لێکدانەوەی دروستە جۆربەجۆرەکانی ئەو دەربڕاوەی، کە گوێی لێدەبێت. هەندێک جار لایەنی دەروونی و لێکدانەوەی دەوروبەر و بەکارهێنانی زمان بە مەبەستەوە تێگەیشتن ئاڵۆزتر دەکات.[٦] هەندێک لە زمانەوانەکان بۆ تێگەیشتن لە واتای وشە بە باش دەزانن، کە واتاکە کەرت بکرێت بۆ پارچە واتای بچووکتر (سیمای جیاکەرەوە) ئەم ڕێگایە پێی دەوترێت (شیکاری پێکهێنەرانە) [٧].
بۆ نموونە:-

| نێر | مێ | |
|---|---|---|
| پیاو | ژن | هەراش |
| کوڕ | کیژ | لاو |

بە بڕوای ئێمە: تێگەیشتن ئەو میکانیزمە خودکردیەیە، کە مرۆڤ یان گوێگر بۆ شتە زمانی و نازمانییەکان وەریدەگرێت. بەپێی

هەستەوەرەکان (بیستن و بینین و بەرکەوتن و تامکردن و بۆنکردن) یان بریتییە لەو تێڕوانینەی، کە گوێگر بۆ شتە زمانی و نازمانییەکان هەیەتی بە شێوەیەکی ڕوون و بێ گرفت لێکدانەوەیەکی دروستی بۆ دەکات . یان لێکدانەوەیەکی دروستە بۆ دەربڕاوە جیاجیاکان.

هەندێک جار لێڵی و ناڕوونی و تێنەگەیشتن لە شتەکان پەیوەندی بەکولتوور و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە، چونکە لە جیهاندا زمان و ناونانی دەربڕاوەکان وەک یەک نییە تا تێگەیشتنەکانمان بۆ شتەکان وەک یەک بێت. بۆ نموونە لە کولتووری کوردەواریدا کاتێک نزیکی بانگ دەبێتەوە کەسێک بەکەسێک دەڵێت (کاتژمێر چەندە ؟) کەسی بەرامبەر تێدەگات کە مەبەستی قسەکەر چییە دەیەوێت بزانی بانگی داوە یان نا، بۆیە لە وەڵامدا دەڵێت (هێشتا نوێژ نەبووە) ئەمە بەپێی کولتووری کوردەواری شتێکی ڕوونە و لێڵی تێدا نییە، بەلام ئەگەر کەسێکی بیانی یان کەسێک شارەزای کولتووری کوردەواری یان ئیسلامی نەبێت ئەمە لەلای نەک لێڵیی زمانی ، تێگەیشتنی هەڵەش دروستدەکات. بۆیە پێویستە لە کاتی ئاخاوتندا بە شێوەیەکی دروستی واتایی و ڕێزمانی بدوێین بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی دروستی واتایی و ڕێزمانی بێتە ئاراوە.

### ١–٣ هۆکارەکانی دروستبوونی لێڵی:

هۆکارەکانی دروستبوونی لێڵی زۆرن لێرەدا هەندێک لەوانە دەخەینە ڕوو.

١- جیاوازیی زارو شێوەزار [٨]:

بوونی زارو شێوەزار لە زمانی کوردیدا بووە بە هۆی دروستبوونی لێڵی زمانی، چونکە لە زمانی کوردیدا چەند زارێک هەیە. بۆ نموونە: تەرزە، زبر

تەرزە  کرمانجی ناوەڕاست بە تەرزە دەڵێت تەرزە.
کرمانجی ژووروو بە تەرزە دەڵێن تەزرە.
زبر  کرمانجی ناوەڕاست: (شتێکی گرنج گرنج) دەڵێن زبر.

کرمانجی ژووروو: (خۆڵو خاشاک) دەڵێن زبر.

گۆیژ کرمانجی ناوەڕاست: دەڵێن گێوژ

کرمانجی ژووروو: دەڵێن گۆیژ

بوونی ئەم شێوە زارە جیاوازانە وایکردووە، کە لێڵیی زمانی دروستبێت. ئاستی تێگەیشتن ئاڵۆز دەبێت بەتایبەتی کاتێک کەسێک بیەوێ فێری زمانی کوردی بێت.

٢- هاوبێژیي واتایی:

ئەم جۆرە دەبێتە هۆی لێڵیی واتایی بە تایبەتی لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا بۆ نموونە: هەردوو وشەی (بیر و شیر) وا ڕێک کەوتوون، کە هاوبێژی وەک خۆیان هەبێت.

بیر بیر واتە هزر

بیر واتە بیری ئاو

ئەمانە هاوبێژن (هاوبێژی هاوپیت) هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نییە. واتایان جیاوازە.

شیر شیر واتە شمشێر

شیر واتە شیری خواردنەوە

هاوبێژی لێڵیی زمان ئاڵۆز دەکات. پێویست نییە بۆ زمان (تەنها بۆ یاریکردنی وشە دەست دەدات)، چونکە دەکرێت بۆ هەموو بیرێک وشەیەک هەبن کۆمەڵگە لە سەری ڕێک کەون.

**جۆرەکانی هاوبێژی:**

أ- ئەو وشانەن، کە لە وتندا لە یەک دەچن، بەڵام جیاواز دەنووسرێن (لە کوردیدا نییە)

ب-هاوپیت: ئەو وشانەن کە لە نووسیندا وەک یەکن، بەڵام جیاواز دەوترێن. هەمانە، قازی، خانە، ڕەشە....

پ - هاوبێژیی تەواو: ئەو وشانەن، کە لە نووسین و وتندا وەک یەکن. نموونە. ئاش (جێی هاڕین) ئاش (چێشت) ئازار (ئێش) ئازار (ناوی مانگ)[٩].

٣- فرەواتــایی:

لێرەدا دیسان لێڵی لە سەر ئاستی مۆرفۆلۆجییە، فرەواتا خۆی بریتییە لەوەی، کە وشەیەک زیاتر لە واتایەک لە خۆ بگرێت، بەڵام ئەو واتایانە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە و لە یەکەوە نزیکن بۆ نموونە: وشەی (زار) (دەم) هەم بەواتای دەمی مرۆڤ دێت، هەم بەواتای دەمی ئەشکەوت یان دەمی گونیە دێت[١٠]. لە فرەواتاییدا پەیوەندییەکی پتەو هەیە لە نێوان بڵاویی وشە و فرەواتایدا. تا وشەیەک باوتر بێت لە زمانێکدا تا زۆرتر بەکاربێت واتای زیاتر دەبێت. فرەواتایی کەموکورتی نییە لەزماندا، بەڵکو تایبەتیەتی و گرنگێتییە، ئەگەر فرەواتایی نەبێت، دەبێت بۆ هەموو واتایەک وشەیەک هەبێت [١١].

٤- جێناوەکان:

جێناوەکان (کەسی سەربەخۆ، کەسی لکاو، خۆی، هەیی، نادیار، نیشانە...هتد) دەبن بەهۆی دروستکردنی لێڵی لە زماندا بە شێوەیەکی گشتی. ڕستە و دەربڕاوەکان بەبێ بوونی جێناوەکان بەردەوام نابێت، جێناو واتا بەخشی واتا ڕێکخەری ڕستەن یان بەشێوەیەکی تر جێناوەکان دەوری ڕێکەوتنی کەرتەکان دەگێڕێت. کەرەستەیەکی سەرەکی زمانن، کە هەندێک جار کورتبڕی دروستدەکەن، یان دەبێتە ئەنافۆڕ بۆ ئاماژەبۆکراوەکەی و بەمەش لێڵی دروست دەکات [١٢].

<u>پەری</u> دەیزانی، کە <u>ئەو</u> یەکەمە.

(j)i i

لە ڕستەکەدا (پەری) و (ئەو) دەگونجێت ئەنافۆڕبن بۆ یەکتری بگەڕێنەوە، ئەمەش دەکەوێتە سەر ئاستی تێگەیشتنی هاوبەشەکانی ئاخاوتن (قسەکەر و گوێگر)ی ئاخاوتن، دەشگونجێت ئەنافۆڕ و ئاماژەبۆکراو نەبن و هەریەکەیان بۆ کەسێکی سەربەخۆ بگەڕێنەوە، ئەمەش لەبەر ئاڵۆزی وردی ئەنافۆڕە، چونکە ئەنافۆڕ بابەتێکە زیاتر پەیوەندی بە ئاستی بەکارهێنان و تێگەیشتنەوە هەیە، واتە (ئەو)

نازانرێت مەبەست (پەری)یە یان کەسێکی تر، سەرەڕای ئەوەش دەبنە هۆی دروستکردنی لێڵی لە ڕستەدا.

یان جێناوی نیشانە (ئەوە، ئەمە) کە بۆ شت بەکاردێن هەندێک جار لێڵی دروست دەکەن و لە کاتی داواکارییەکە نازانرێ مەبەست چییە[١٣].

نموونە: ئەوە کراسەکەی منە، بۆ تۆ.

(ئەوە ) ئاماژەبێت بۆ (کراس)و کراسەکە دیاری نەکرابێت، ئەوە گوێگر نازانێت مەبەست کام کراسەیە (سوورەکە، ڕەشەکە، سپییەکە، .. .هتد).

٥- ئاوازە [١٤]:

گۆڕینی لەرینەوەی ژێیەکان دەبێتە هۆی گۆڕینی ئاوازی ڕستە، هەر ئاوازێکیش واتاییکی جیا بە ڕستەکە دەبەخشێت، واتە دەبێت لە کاتی قسەکردندا ئاوازە بدرێت بە دەربڕاوەکە بۆ ئەوەی تێگەیشتنی لێڵ دروست نەبێت لای گوێگر. وریا عومەر ئاوازی ڕستە بە هۆیەکی دیکەی لێڵی زمانی دادەنێت.[١٥]. بۆ نموونە: ڕستەی (هەرچواریان هاتن) دوو واتا لەخۆ دەگرێت: هەموو چواربوون و هاتن (بۆ ئەم واتایە وزەی زیاتر دەخرێتە سەر (هەر) ) زیاتر بوون لە چوار و تەنها چواریان هاتن (بۆ ئەم واتایە وزەی زیاتر دەخرێتە سەر (چوار)).

٦- پێشکەوتن و گۆڕانی زمان:

ئەو پێشکەوتن و گۆڕانانەی کە بەسەر زماندا دێت، لێڵیی زمانی دروستدەکەن بەتایبەتی لە کاتی وەرگێڕاندا[١٦]. بەهۆی ئەو پێشکەوتن و گۆڕانگارییانەی بەسەر کۆمەڵگەدا دێت، هەمیشە کاریگەری دەبێت لەسەر زمان، زمان سروشتی وایە هەمیشە لە گۆڕان و نوێبوونەوەدایە و شتی تازە وەردەگرێت، وشە نوێکان شوێنی وشە کۆنەکان دەگرێتەوە. ئەمەش لێڵیی زمانی دروستدەکات. بەتایبەتی بۆ کەسانی نەخوێندەوار و بەتەمەن زۆر گرفت دروستدەکات. بۆ نموونە: (وەرەقە، بلۆک، دەفتەر) دوو واتایان هەیە:

وەرەقە: لە کۆندا بە واتای (کاغەزی نووسین)
لە نوێدا بە واتای (پارە)
بلۆک: لە کۆندا بە واتای ( بلۆکی دیوار)
لە نوێدا بە واتای (بلۆکی پارە )
دەفتەر: لە کۆندا بە واتای (دەفتەری نووسین)
لە نوێدا بە واتای (پارە )

٧- گرتنەوە:

گرتنەوە هۆکارێکی ترە بۆ دروستکردنی لێڵی زمان، چونکە دەشێت بەشێک لە گشت نەزانرێ مەبەست کامەیە و کاتێک باسی گشت دەکرێت دیار نییە مەبەست چییە، لای گوێگر ڕوون نییە هەموو مەبەستی قسەکەر تێگەیشتنی بەرامبەرە. بۆیە پێویستە بە ڕوونی بدوێت و لە گشتەکە بەشەکەی بۆ دیاری بکات، کە ئەمەش بە کەمی لە گرتنەوە دەردەکەوێت.

بۆ نموونە: باوکم پێداویستی قوتابخانەی بۆ کڕیم.

لە نموونەکەدا (پێداویستی قوتابخانە) گشتە و هەموو شت دەگرێتەوە، بەڵام نازانرێت چی و چییە؟ دەگونجێت هەموو شتی بۆ نەکڕیبێت (باوکی) بۆیە ناڕوونە.

باوکم پێداویستی قوتابخانەی بۆ کڕیم.



## بەشی دووەم

### ٢-١ ) جۆرەکانی لێڵی لە زماندا:

جۆرەکانی لێڵی دابەش دەبن بەسەر چەند ئاستێکدا، بێگومان واتاش زۆر کاریگەری هەیە.

### ١- لێڵی فۆنۆلۆجی:

هەریەکە لە هێز و ئاوازە ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕن لە دروستکردنی لێڵی فۆنۆلۆجیدا، واتە ئەگەر هێزو ئاواز دیاری نەکرێت، لە سەر وشەکە ئەم دیاردەیە لە زمانی کوردیدا زۆر بەرچاو دەکەوێت بەتایبەتی لە قسەکردندا نەک لە نووسین[١٧]. بۆ نموونە: وشەی وەک (ماوە) چەند واتایەکی هەیە و بەهۆی هێز و ئاوازەوە دەتوانین دیاری بکەین یان لە ڕستەدا واتاکەی ڕووندەبێتەوە.

ئازاد ماوە. بەواتای ئازاد نەمردووە. ( زیندووە)

ماوەت ماوە. واتای ماوەی نێوان دوو شت. (کات)

ماوەی نانەکەم بۆ بێنە. بەواتای ئەو شتەی نانی پێدا دەدەی بەسەر ساج یان ناو تەنوور.

یان درەختەکە سەوز بوو. دوو واتای هەیە.

١- ئەگەر هێز کەوتە سەر (بوو) ئەوە دەگەیەنێت، کە درەختەکە سەوز نییە و لە ڕابردوودا سەوز بووە نەک ئێستا.

٢- ئەگەر هێز کەوتە سەر (سەوز) ئەوە واتای وایە، کە درەختەکە سەوزە.

هەروەها وریا عومەر لە ڕستەی (نەکەی دەتکوژم) دوو واتای تەواو دژیەک دیاری دەکات، بەپێی ئاوازەکەی دەزانین، کە کام واتا دەگەیەنێت[١٨].

ئەگەر بیکەی دەتکوژم. واتە دەبێت کارەکە بکرێ.

ئەگەر نەکەی دەتکوژم. واتە دەبێت کارەکە نەکرێ.

**٢- لێڵی مۆرفۆلۆجی:**

لێڵی لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا وشەیەک یان مۆرفیمێک (بەتەنها) ببیسترێ یان بخوێندرێتەوە گوێگر یان خوێنەر زیاتر لە واتایەک تێی بگات. بۆ نموونە: ڕواندن، بار، لایدا...هتد




وشە هەیە تەنها لە نووسیندا لێڵە بە بیستن لێڵییەکەی دەڕەوێتەوە. وەک (سەوزە) لە وتندا گەر هێز (stress) خرایە سەر برگەی یەکەم دەبێتە سیفەتێک و دەخرێتە پاڵ شتێک وەک (گیا سەوزە sa'wza)، ئەگەر هێز خرایە سەر برگەی دووەم واتای (خواردەمەنی سەوزە sa wz'a دەگەیەنێت). هێز لە نووسیندا دەرناکەوێت بۆیە وشە بەتەنها بەرچاو کەوت بە لێڵی لە قەڵەم دەدرێت، بەڵام لە وتندا لێڵییەکەی نامێنێت [١٩].




**٣- لێڵی لێکسیکی:**

لێڵی لێکسیکی جۆرێکی تری لێڵی واتاییە، (ئەوەی واتاسازی لێکسیکی گرنگی پێدەدا توانای وشەکانە[٢٠]. لێڵی لێکسیکی پەیوەستە بە خودی وشەکانەوە، سۆسێر لەبارەی لێڵی لێکسیکییەوە دەڵێت (ڕستەیەک بە لێڵی لێکسیکی دادەنرێت، ئەگەر لێڵییەکەی لە یەکێ لە وشەکانیەوە سەرچاوەی گرتبوو لێڵییەکەش بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە وشە لێڵەکە زیاتر لە واتایەک دەبەخشێت.) [٢١]، تراگ دەڵێت: لێڵی بە پلەی یەکەم لێکسیکییە. [٢٢].

هەموو وشەیەکی زمانی لە فەرهەنگی زماندا هەیە، پەیوەندیدارە بە واتایەک یان ناوەڕۆکێکی واتایی (زیاتر) هەڵدەگرێت، ئەگەر ئەم پەیوەندییە لەدەستبدات لە فەرهەنگ دەچێتە دەرەوە، بۆیە ئەرکی هەموو یاسایەکی ڕۆنانی ڕستە جگە لەشێوازی ڕیزکردن و ڕێککەوتنی بە شێوەیەکی ئەبستراکت دەبێت یەکانگیر بێت لەگەڵ فەرهەنگی وشەکان (واتاکانیان) [٢٣]. لێڵی لێکسیکی (فەرهەنگی) کاریگەرترە یان بڵاوترە لە لێڵییەکانی تر، چونکە لێڵی لێکسیکی دەبێتە هۆی لێڵی بۆ ئاستەکانی تری زمان بەتایبەتی لێڵی ڕێزمانی، چونکە لێڵی ڕێزمان بەهۆی لێڵی لێکسیکی دروستدەبێت، ئەگەر وشە فەرهەنگییەکە خۆی لێڵ بێت دەبێتە هۆی لێڵی ڕێزمانیش.

کێشی لێڵی فەرهەنگی هەمیشە لە ڕوانگەی فرەواتایی و ڕەگەز دۆزییەوە سەیر ناکرێت، باشترین ڕۆنان کە ئەم ڕێڕەوە بنوێنێ ئەوەیە، کە (وشە لە دەرەوەی چوارچێوە بێ واتابێت) ئەمەش بەرەو ئەوەمان دەبات بڵێین: کە وشە واتاکەی ڕوون نابێتەوە تەنها لە بەکارهێنان نەبێت، واتە واتای وشە بریتییە لە کۆی بەکارهێنانی[٢٤]. بۆ نموونە وشەی ( مێز) چەند بەکارهێنانێکی هەیە:

مێزی نان خواردن.

مێزی دانوسان (گفتوگۆ).

مێزی خشتەی ماتماتیک.

مێزی نووسین.

هەموو وشەیەکی فەرهەنگ (لێکسیک)ی لە بواری بەکارهێناندا واتاکەی ڕوونتر دەبێتەوە هەرچەندە لە فەرهەنگدا واتای وشە ڕوونکراوەتەوە.

کێشەی لێڵیی فەرهەنگی لە کوێوە سەر هەڵدەدات؟ کاتێک سەر هەڵدەدات لای زۆربەی زمانەوانەکان، کە وشەیەک زیاتر لە یەک شیکردنەوە و مانای واتای زیاتری هەبێت. ئەمەش دروستبوونی لێڵی زیاتر دەکات. دروستبوونی لێڵی زۆر کات لەوەوە سەرچاوە دەگرێت

لێکدانــەوەکان بــەپێی کــات و چوارچێــوەی ئاخاوتنەکــە لێکنەدرێنــەوە. بلۆفیڵد دەڵێت: واتـای دەربڕینێکـی زمـانی بـەپێی شـوێنەکە (بـارودۆخ) دەستنیشـان دەکرێت [٢٥]. لێڵیی لێکسیکی بریتییـە: لـەو وتـە یـان وشـە دەربـڕاوەی، کـە زیـاتر لـە واتایـەکی هەیـە و لـە بەکارهێنانـدا واتاکـەی ڕووندەبێتەوە.

## جۆرەکانی لێڵی لێکسیکی:

١- لێڵی لێکسیکی کەتیگۆری:

لــەم جــۆرەدا زیــاتر جــەخت لەســەر لێڵــی بەشــەکانی ئاخــاوتن دەکرێتەوە. وشە هەیە دەکرێت لە ڕستەیەکدا (ناو) بێت و لە ڕستەیەکی تردا (ئاوەڵناو) بێت، یان لە ڕستەیەکی تـر (ئاوەڵکار) بێت..وەک (جوان، شیرین، نازدار، ئازاد...هتد) [٢٦].

جــوان جــوانــــــــە.
ناو ئاوەڵناو مۆرفیمی کاتی ئێستا

جــوان جــــوان دەڕوات.
ناوە ئاوەڵکاری چۆنیەتی چۆنیەتی ڕۆشتنەکە دەردەخات

٢- لێڵی لێکسیکی تەواو:

ئــەم جــۆرە زۆر فراوانــە و ڕاســتەوخۆ پەیوەســتدارە بــە واتــاوە. سۆسێر دەڵێت: ئەم جـۆرە لێڵییـە بەتـەواوی لـە لێڵی کـەتیگۆری جیایـە. ئەم جۆرەیـان ئـەو کاتـە دروسـتدەبێت، کـە وشـەیەک زیـاتر لـە واتایـەک ببەخشــێت لــەم ڕوانگەیــەوە ئــەم جــۆرە لێڵییــە هــەم پەیوەســتە بــە واتاسـازییەوە هـەم پەیوەسـتە بـە چوارچێوەی بـەکارهێنانی وشـەکەوە. کـەوابێت ئـەم جـۆرە لێڵییـە لێڵییـەکی سـیمانتیکی و پراگماتیکییـە. ئـەم جۆرە لێڵییە بە تەواوی پەیوەندی بە لێڵییەوە هەیـە، کەواتـە دیاردەیـەکی زمانەوانییە و بەشێوەیەکی سەرەکی لە فرەواتـا و هـاوبێژ و گرتنـەوەوە دەردەکەوێت، [٢٧]، لە هۆکارەکانی دروستبوونی لێڵـی بـە تـەواوی باسـی

فرەواتا و هاوبێژ و گرتنەوەوە کراوە. بۆ نموونە: کاتێ باسی هاوبێژی بکەین دوو وشە وەک یەکن چەند واتایان هەیە وەک (یار)..

یار ←—— خۆشەویست

یار وەک پاشگر دەنووسێت بە ڕانەبردووی (کڕین )

کڕ+ یار ←—— کڕیار

هەرچی پارەوانی یان بەشێک لە پارەوانی، کە پێی دەوترێت پارەوشە خۆی لە خۆیدا لێڵی وشە دروستدەکات.[٢٨]

**٤- لێڵی سینتاکسی (ڕستەسازی):**

ئەم جۆرە لێڵییە زۆر بڵاوە، (دەکرێت لێڵی ڕێزمانی بە لێڵی پێکهاتەی (ڕۆنانی) دابنرێ و ئەوکاتەش پەیدا دەبێت، کە پێکهاتەیەک زیاتر لە خوێندنەوەیەکی بۆ بکرێت[٢٩]. یان لێڵی ڕستەی (ڕێزمانی) ئەم جۆرە لێڵییە کاتێک پەیدا دەبێت، کە ڕستەیەک یان فرێزێک زیاتر لە واتایەکی هەبێت، بەهۆی هۆکارێکی ڕێزمانی دروستدەبێت[٣٠]. هەندێک زمانەوانی وەک لیۆنز و لۆبنیر و کریستاڵ باوەڕیان وایە، کە لێڵی سیمانتیکی (واتایی) ئەوە دەگەیەنێت، کە ناکرێت هەردەم ڕستە (بنج و سیما)ی وەک یەک بێت، بەڵکو خودی لێڵی واتایی دوو خوێندنەوە و دوو واتا و دوو بنج بۆ یەک بێت، بەڵکو خودی لێڵی واتای دوو خوێندنەوە و دوو واتا و دوو بنج بۆ یەک سیما دەگەیەنێت، ئەم دیاردەیە لە ڕێزمانی بونیادگەری فەرامۆش کرابوو، بەڵام لە ڕێزمانی گواستنەوە و پێکهێنەر، چۆمسکی ئەوەی خستەڕوو، کە هەر ڕستەیەک بنج و سیمای هەیە. لە ڕستەی لێڵدا هەردەم ژمارەی واتاکان لە سیماکان زیاتر دەبن [٣١]. یان لێڵی ڕستەسازی بە هۆی پێوەندیی نێوان بەشەکانی ڕستە دروستدەبێت و ئەم جۆرە لێڵییە ناگەڕێتەوە بۆ تاریکی تاکە وشەکان، بەڵکو بۆ پەیوەندیی نێوان کەرەستەکانی ڕستە [٣٢].

لێڵی ڕێزمانی بریتییە: لەو ئاڵۆزی واتاییەی، کە بەهۆی ڕیزبوونی کەرەستەکانەوە دروستدەبێت. زیاتر لە خوێندنەوەیەک هەڵدەگرێت و

پەیوەستدارە بە لێڵی مۆرفۆلۆژی و لێکسیکیش، وشەکان کاتێک لە چاڵی ڕیزبوونە ڕێزمانییەکە دادەنرێت دەشێت لێڵی دروستبکەن. بۆنموونە: پەری ماوە. واتاکەی ڕوون نییە، دوو واتا هەڵدەگرێت یا (پەری زیندووە.) یا (پەری مردووە. )

پەری زیندووە. واتاکەی ڕوونە و لێڵی تێدا نییە.

**جۆرەکانی لێڵی ڕێزمانی:**

١- لێڵی ڕۆنانی (پێکهاتە):

ئەم جۆرە لێڵییە، لە یەکێکە سیما و سیفەتەکانی زمانی سروشتی بە هۆی فرێزەوە بەدیاردەکەوێت [٣٣]. ڕیزبوونی کەرەستەکان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە دیاریکردنی واتا، (واتای ڕستە بەهۆی واتای ئەو کەرەستانەی کە پێکیدەهێنێت لەگەڵ ڕۆنانی ڕستەسازی ڕستەکە دەستنیشان دەکرێ [٣٤] لێڵی ڕۆنانی دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی دوو پەیوەندیی جیاواز لە نێوان بەشەکانی ڕستە، ڕۆنانی ژێرەوە (بنج Deep structure) وە دەرنەکەوتنی ئەم جیاوازییە لە ڕۆنانی سەرەوەدا (سیما Surface structure)[٣٥].

بۆنموونە: پەری و کاروانی خوێندکارم چوونە دهۆک. ڕستەکە دوو واتای جیاوازی هەیە:

پەری و کاروان هەردووک خوێندکارمن.

هەر کاروان خوێندکارمە .

لێڵی ڕۆنانی دکرێت بە دوو بەشەوە:

أ- **لێڵی پێکهاتەیی**: لەم جۆرە لێڵییەدا وشەکان خۆیان لە واتادا لێڵ نین بەواتای ئەوەی وشەکان (نە هاوبێژ، نەفرەواتا )ن، بەڵکو لێڵییەکە لەو پێکهاتە گرووپگرووپەوە دروستدەبێت، کە ڕەگەزەکانی ڕستەیەک دروستدەکەن بۆیە بە لێڵی پێکهاتەی دادەنرێت، لە زمانی کوردیدا ئەم جۆرە لێڵییە زیاتر بەهۆی دیارخەرەکانەوە دروستدەبێت [٣٦].

بۆ نموونە: باوکی کوژراوەکە و بکوژەکە لەوێ بوون.

ئەگەر سەیری نموونەکە بکەین دەبینین وشەی (باوک) ناڕوونە، دوو خوێندنەوە هەڵدەگرێت ئەگەر گرووپگرووپی بکەین دەگونجێت (باوک) (باوکی کوژراوەکە) بێت بەتەنها. دەشگونجێت (باوک) هەم باوکی (کوژراوەکە) بێت و هەم (باوکی بکوژەکە)ش بێت. واتە بڵێین (باوکی کوژراوەکە) و ( باوکی بکوژەکە) لەوێ بوون.

**ب- لێڵی پۆلی (کەتیگۆری):** پۆل جودا یاخود بەشە جیاوازەکانی ئاخاوتن لەم جۆرە وارێک دەکەوێت، کە وشەیەک لە ڕستەدا زیاتر لە بەشە ئاخاوتنێک بنوێنێت، ئەم جۆرە زیاتر پەیوەستە بە ڕیزبوونی وشەکان لە ڕستەدا [٣٧]. بۆ نموونە وشەی (شیرین، بەناز، نازدار..هتد ) لە ڕستەدا دەتوانن زیاتر لە بەشە ئاخاوتنێ بنوێنێ وەک:

شیرین زیرەکە.
ناو

کولیچەکە شیرینە.
هاوەڵناو

منداڵەکە شیرین دەڕوات.
هاوەڵکار

٢- لێڵی گوێزانەوەیی:

ئەم جۆرە لێڵییە لە ئەنجامی ئەوەوە دێ، کە ڕۆنانەکە لە بنچینەدا لە دوو ڕۆنانی جیاواز گوازراوەتەوە[٣٨]. خودی ئەم جۆرە لێڵییە پەیوەستە بە ڕۆنانی ژێرەوە، لەم بارەیەوە لیۆنز بانگەشەی ئەوە دەکات، کە ڕستەیەک بە لێڵ دادەنرێت، ئەگەر دوو ڕۆنانی ژێرەوەی (بنج)ی لە خۆ گرت. یان لە ئەنجامی سەپاندنی هەندێ یاسای گوێزانەوە... یاسای جیا دوو ڕستەی جیا (لە بنجدا) دەکەن بە هاو سیما [٣٩]. بۆنموونە: (لێی دا ) دەکرێت دوو واتای هەیە:

کەسێ لە کەسێکی دا.

بە واتای دەسکەوتی زۆر.

ئەم جۆرە لێلییە پەیوەندی بە یاساکانی گوێزانەوەوە هەیە.

ڕستە کاتێ ڕۆنانی سەرەوەی دەبینین واتایەک یان زیاتر دەدات ئەمەش بە چەند ڕێگایەکی گوێزانەوەدا ڕۆشتووە. ڕۆنانی ژێرەوە کە وشەکان هەر خۆیانن و واتاي خۆیانیان هەیە. پاشان دەگوێزرێنەوە بۆ ڕۆنانی ناوەند و لەوێشەوە بۆ ڕۆنانی سەرەوە، لێرەدا وشەکان چاڵەکانی پێکهێنانی ڕستە پڕ دەکەنەوە و واتایی ڕستەی دروستدەکەن و واتا و مەبەست لە ڕۆنانی سەرەوە بە دەست دەکەوێت. هەندێک جار واتا و مەبەستەکە لێڵە و پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە. بۆ نموونە: پێم دەکرێت.

به من دەکریَ | ڕۆنانی ژێرەوە
پیَ م دە کریَت | چەند گۆڕانکارییەک ڕوودەدات. ڕۆنانی ناوەند
پێـم دەکرێت. | ڕستەی تەواو و واتا بەخش، بەلاَم دوو واتای هەیە.

دەتوانم ئیشێ بکەم.
کاتم هەیە.

ڕێگاکانی ڕەوانەوەی لێڵی:

چەند ڕێگەیەک دەبنە هۆی ڕەوانەوەی لێڵی، کە لە ئاخاوتن یان نووسین بەکاربێت تاڕادەیەکی زۆر لێڵی نامێنێت.

١- دەوروبەر:

دەوروبەر مەبەستمان لە دەوروبەری ئاخاوتنەکەیە، ئەو کات و شوێنەی، کە ئاخاوتنەکەی تێدا ڕوودەدات بخرێتە ڕوو لێڵی واتایی (زمانی) نامێنێت. سەلام ناوخۆش دەڵێت: دوان لە چوارچێوە لە دیاریکردنی واتای وشە و فرێز و ڕستەدا زۆر گرنگە، چونکە پێش هەموو شت چوارچێوە (کات و شوێنی ئاخاوتنەکە) لێلیی دەق لە زماندا ناهێڵێت[٤٠].

هەدسن دەنووسێت بەبێ چوارچێوە فۆڕمی زمانەوانی بە تەنها ناتوانێت شرۆڤەی ئەو هەموو واتایانە بکات، کە ئێمە لە زمان بەدەستیان دەهێنین. لێڵی لێکسیکی کە هەریەک لە فرەواتا و هاوبێژی سەرچاوەی دروستکردنی ئەو لێڵییەن دەکرێت بە چوارچێوە چارەسەر بکرێت [٤١]. بۆ نموونە: مامم ئازاد بوو. ڕستەکە لێڵە دەکرێت بە چوارچێوەی کات و شوێنی قسەکردنەکە لێڵییەکەی نەهێڵرێت.
مامی من ئازاد بوو لە زیندان. یان
ئەوە مامە ئازادم بوو.
پێویستە هەردوو جۆری چوارچێوە لەیەک جودا بکرێتەوە: ئەوانیش چوارچێوەی زمانەوانی و چوارچێوەی نازمانەوانی، چونکە هەندێ ڕستە هەن تەنها بە چوارچێوە زمانەوانی لێڵییەکەی لاناچێت، بەڵکو هەندێک جار پێویستمان بە هۆکاری نازمانەوانیش دەبێت بۆ لابردنی لێڵی. لە بارەی چوارچێوەی زمانەوانییەوە پاڵمەر و کریستاڵ دەڵێن ئەم چوارچێوەیە بە کۆ_دەقییەوە هەردوو پەیوەندی سیگماتیکی و پارادیگماکی بەشەکانی ڕستە دەردەخەن.
ڕستەی (فڕاندی) ڕستەیەکی لێڵە دەکرێت ئەم چەند واتایە لەخۆ بگرێت.

کۆترەکەی فڕاند (فڕی)
پارەکەی فڕاند (بردی یان دزی)
کچەکەی فڕاند (هەڵیگرت)

بەڵام ئەگەر لەجیاتی (فڕاندی) بڵێین (ڕفاندی) کە هاوواتایەکی پارچەییە لەگەڵ (فڕاندی). پێکدەهێنێ، ئەوا ڕستەکە لێڵی نامێنێت، تەنها واتای (بردن) دەگەیەنێت:

پارەکە کچەکەی ڕفاند.

هەرچی دەوروبەری نازمانەوانییە، ئەوا بەشێوەکی سەرەکی پێیدەوترێت دەوروبەری شوێنی (کەوتگە)، واتە ئەگەر (کات )و (شوێن)ی دەوروبەری ئاخاوتنەکە دیاری بکەین ڕوونی و ناتەمومژی نامێنێت لە دەربڕاوەکەدا[٤٢].

ناردینی بۆ سلێمانی.
پێی لێناین خواردنەکە دوێنێ.

٢- فەرهەنگ:

فەرهەنگ و گەڕانەوە بۆ واتاکانی تری وشە لە فەرهەنگ هۆکارێکی ترە بۆ لابردن و ڕەواندنەوەی لێڵی، واتە هاوبەشی ڕەواندنەوەی لێڵی دەکات، ئەگەر بە شێوەیەکی دروست و وەک خۆی وشە فەرهەنگییەکە بەکاربێت. هەرچەندە فەرهەنگ سەرچاوەیەکە بۆ دروستکردنی لێڵی بەتایبەتی لە فرەواتایی و هاوبێژی وشەکان، بەڵام بە یارمەتی چوارچێوەی وشەکە و بەکارهێنانی دەتوانین ڕەواندنەوەی لێڵییەکە چارەسەر بکرێت.
بۆ نموونە: وشەی

جوان: قەشەنگ، شۆخ دەتوانین بڵێین: کچەکە جوانە یان کچەکە قەشەنگە.

گەورە: بەتەمەن. بەرپرس، کەتە، باوکی بەرپرس. یان باوکی بەتەمەنە. لێرەدا هیچ ناڕوونییەک نامێنێت. لێڵی دروست نابی ئەگەر واتای دووەمی وشە فەرهەنگییەکە بەکار بێت.

٣- ڕێگای گرووپ گرووپکردن (کەوانە): [٤٣].

جیا کردنەوە و گرووپگرووپ کردنی دەربڕاوەکە لێڵی نایەڵێت. بۆ نموونە:

نازدار و پەری خوشکی چوون بۆ زانکۆ. ئەگەر سەیری ئەم ڕستەیە بکەین لێڵی تێدایە، چونکە نازانرێ نازدارو پەری هەردووکی خوشکی ئەون یان هەر پەری خوشکیەتی یان نازداریش بۆیە گەر جیابکرێتەوە بە گرووپ گرووپ ئەوا ڕوونترە واتاکەی وەک:
(نازدار) و (پەری خوشکی) چوون بۆ زانکۆ.

٤- هێزو ئاوازە:

هەر یەک لە هێزو ئاوازە ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕن لە ڕەواندنەوەی لێڵیدا، ئەگەر شوێنی هێزەکە دیاری کرابێت کە لە زمانی کوردیدا زۆر ڕۆڵ دەگێڕن. هێز: (ئەو هێزەیە کە دەکەوێتە سەر بڕگەیەک لە بڕگەکانی وشە) [٤٤]. واتە ئەو وشەیەی کە بریتیی بێت لە بڕگەیەک یان دوو بڕگە زیاتر بڕگەیەکیان هێزی دەکەوێتە سەر و بە گۆڕینی ئەو هێزە لە سەر بڕگەکان واتای وشەکەش دەگۆڕێت لە ڕووی زمانەوانییەوە، واتای گۆڕینی هێز لە کوردیدا دوو گۆڕانی لێدەکەوێتەوە، لەلایەک واتای وشەکە دەگۆڕێت و لە لایەکی دی تەنها لە ئاخاوتندا نەک نووسین هەستی پێدەکرێت. ئەم وشانەی خوارەوە بەهۆی جێگۆڕکێی هێزەوە ئەو دوو گۆڕانکارییەی بە سەردا دێت.

نووستن

مردن

برایەتی

ئازایەتی

ئەگەر هێز بکەوێتە سەر دوا بڕگە هەر یەک لەم وشانە دەبنە چاوگ یان ناو، بەڵام ئەگەر هێز لەسەر یەکەم بڕگە بوو ئەوا وشەکان دەبنە ڕستە، بڕوانە [٤٥]، هەروەها دەکرێت بڵێین ئەم وشانە دەبنە وشەی فەرهەنگی و هەریەکە واتای خۆی هەیە.

نووستن = خەوتن

مردن = کۆچی دوایی کرد

برایەتی = برایی

ئازایەتی = سەربەستی

کەواتە لە زمانی کوردیدا بۆ نەهێشتنی لێڵی پێویستە شوێنی هێز لە ئاخاوتندا دیاری بکرێت.

ئاوازە پەیوەستە بە گۆڕینی پلەی (نەغمەی) ڕستەیەک یاخود وشەیەک بە بێ دەستکاریکردنی وشە و بڕگە و فۆنیم و مۆرفیمی ئەو

ڕستە و وشەیە[٤٦]. پەیوەندیی نێوان لێڵی و ئاوازە دەکرێت بڵێین ئاوازە: بریتییە لە وەستان لە نێوان وشەکاندا[٤٧]بە وەستان لە نێوان وشەکان واتای وشەکان زیاتر ڕووندەبێتەوە و لێڵی نامێنێت. بۆ نموونە:

دەرگاکە دادەخەیت   دوو واتای هەیە.

بێزەحمەت دەرگاکە دادەخەیت.

دەرگاکە دادەخەیت؟ (پرسیار کردن)

ئەگەر وەستان لە نێوان (بخۆ و  دەتکوژم) هەبێت واتای وایە پێویستە (نانەکە بخۆ.) هەر ئاوازێکی دەربڕاو پەیوەستە بە ئەرکێکی یان واتایەکی گشتی یان بەواتایەکی زمانی دیاریکراو ئەمەش بەپێی هەڵوێست و دەوروبەری ئاخاوتن دێتە ئاراوە، لەگەڵ ئەوەشدا زانایانی زمان سەبارەت بە چەمک و تێگەیشتن لە واتا و مەبەستی گوتەیەک یان دەربڕاوێکی زمانی ئاماژە بە چەند لایەنێکی دیکە دەکەن، کە پەیوەندییان بە جۆری پلەی دەنگ و خێرایی قسەکردنەوە هەیە، لەگەڵ ئەو بارودۆخەی، کە پەیوەستن، بەلایەنی دیکەی بەکارهێنانی زمانەوە، وەک جووڵە و  بزاوتنی دەموچاو و دەست و سەر...هتد. ئەمانە تێکڕا لەگەڵ ڕەوتی قسەکردندا دەتوانن جۆری ئەو هەڵوێستە دەربخەن، کە گوتەکەی تێدا دەربڕاوە. بە واتایەکی تر دەشێ لە ڕێگەی هێما زمانی و نازمانییەکانەوە واتایەکی سەربار بخرێتە سەر واتای گشتیی گوتەکە[٤٨].

## ئەنجام

١- لێڵی کێشەیەکی زمانییە کاتێک سەر هەڵدەدات، کە دەربڕاوەکە زیاتر لە واتایەکی هەبێت، هەموو ئاستەکانی زمان دەگرێتەوە، کاریگەری لە سەر تێگەیشتن هەیە وادەکات تێگەیشتن قورستر و ئاڵۆزتر بکات.
٢- لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا فرەواتا و هاوێژ هۆکاری سەرەکین بۆ دروستبوونی لێڵی.
٣- لە لێکسیکیدا (فەرهەنگ) لێڵی لە ئاستەکانی تر زۆرترە، بەڵام بە نووسینی هاوواتایی وشەکە لێڵییەکەی دەرەوێتەوە.
٤- لێڵی ڕێزمانی زیاتر لە ڕۆنانی سەرەوەی ڕستەکەدا دروستدەبێت، کە ڕستەکە دوو واتا یان زیاتر وەردەگرێت، واتە دوو واتا یان زیاتر لە یەک بنچینەدا هەیە.
٥- زارو شێوە زار هۆکارێکی سەرەکین بۆ دروستکردنی لێڵی.
٦- لێڵی بە شێوەیەکی گشتی لە قسەکردندا ڕەنگ دەداتەوە، چونکە قسەکەر دەتوانێ بە مەبەست یان بێ مەبەست لێڵییەکە دروست بکات، ئەگەر لە (نووسین)یش خاڵبەندی دانەنرێت لێڵی دروست دەبێت.
٧- چارەسەری لێڵی بە پلەی یەک بە هۆی ڕوونکردنەوەی چوارچێوەی قسەکردنەوە دەبێت و دانانی کات و شوێن و مەبەستی قسەکردنەکە بە ڕوونی دیاری بکرێت لێڵی نامێنێت.

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**

(١) فەرهاد تۆفیق، پەیوەندییە سیمانتیکییەکان و هەندێک دیاردەی واتایی لەزمانی کوردیدا، نامەی ماجستێر کۆلێژی زمانی، زانکۆی سلێمانی،٢٠١٠، ل١٠٧.

(2) A Dictionary of Linguistics and Phonetics, Crystal, David First Edition, Blackweell, publishing., .P,21, 2003.

(3) A Dictionary of Grammatical Terms in Linguistics, Trask ،R.Routledge, London and New York.,.P,131, 1993.

(٤) وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەک، هەولێر، ٢٠٠٩،ل٢٩٣.

(5) A Dictionary of Linguistics and Phonetics, Crystal, David Edition First , Blackweell, publishing., .P,83,2003

(٦) بێستون حەسەن ئەحمەد، کۆمەڵە وشە و پێکەوەهاتن لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کولێژی زمان، زانکوی سلێمانی، ٢٠١١، ل١٦٦ ـ ١٦٧.

(٧) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١، ل١٧٦.

(٨) بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر زارو شێوەزار بڕوانە (عەبدولواحد موشیر دزەیی)، ٢٠١١.

(٩) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١،ل١٧٤.

(١٠) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگی (یەکەم، دووەم، سێیەم) چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠،ل٢١٩.

(١١) محەمەد مەعروف فەتاح، زمانەوانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١، ل١٧٤.

(١٢) سارا حسین خالید مەعروف، ئەنافۆر لەزمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٣،ل٢٤ـ٢٩.

(١٣) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگی (یەکەم، دووەم، سێیەم) چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠،ل٢٢٠.

(١٤) بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئاوازە بڕوانە: (تالب حسین علی، زانستی زمان و زمانی کوردی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٤، ل ٢٣٠ –٢٥٥).
(١٥) وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەک، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٩٦.
(١٦) پەروین مستەفا عەلاف، واتا و وەرگێڕان (لێکۆڵینەوەی واتاسازی)، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٩، ل١٤١.
(١٧) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگی (یەکەم، دووەم، سێیەم) چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠،ل٢٢٢.
(١٨) وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەک، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٢٩٠.
(١٩) وریا عومەر ئەمین: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٣.
(٢٠) یوسف شەریف، زمانەوانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١١، ل١٥٣.
(٢١) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگی (یەکەم، دووەم، سێیەم) چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٢٢٠.
(22) A Dictionary of Grammatical Terms in Linguistics, Trask, R. Routledge, London and New York.,.P,13, 1993.
(٢٣) دیار عەلی کەمال کەریم، ڕێزمانی کوردی لە ڕوانگەی بەرهەمهێنان و گوێزانەوە، نامەی ماستەر، کۆلێژی پەروەردە زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٢، ل٨٣.
(٢٤) کلۆد جیرمان – ڕیمۆلۆ بلان، واتاسازی، وەرگێڕانی، یوسف شریف، ٢٠٠٦، ل٢٩-٣٠.
(٢٥) کلۆد جیرمان – ڕیمۆلۆ بلان: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣.
(٢٦) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگی (یەکەم، دووەم، سێیەم) چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل٢٨٨-٢٨٩.
(٢٧) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٩-١٣٠.
(٢٨) یوسف شەریف، زمانەوانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠١١، ل١٦٧.
(29) A Dictionary of Linguistics and Phonetics, Crystal, David Edition First, Blackweell, publishing., .332,P, 2003.

(٣٠) سەباح رەشید قادر، هاوبێژی و فرەواتایی لە گیرەکدا، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب زانکۆی سلێمانی٢٠٠٠، ل٣٣.
(٣١) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگی (یەکەم، دووەم، سێیەم) چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل٢٢٣.
(٣٢) شلێر رەسول محەمەد بەرزنجی، یاساکانی دارشتنی لارستەی دیارخەری لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٤،ل١٣٥.
(٣٣) سەباح رەشید قادر، هاوبێژی و فرەواتایی لە گیرەکدا، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب زانکۆی سلێمانی٢٠٠٠، ل٣٣.
(٣٤) تالب حسین علی، هەندێ لایەنی پەیوەندیی نێوان رستە و واتا لە کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی ئاداب زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٨، ل٦٣.
(٣٥) وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەک، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٩٧.
(٣٦) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگی (یەکەم، دووەم، سێیەم) چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل٢٢٣.
(٣٧) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٣-٢٢٤.
(٣٨) سەباح رەشید قادر، هاوبێژی و فرەواتایی لە گیرەکدا، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب زانکۆی سلێمانی٢٠٠٠، ل٣٥.
(٣٩) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگی (یەکەم، دووەم، سێیەم) چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل٢٢٥.
(٤٠) سەلام ناوخۆش، زمانناسی و هەندێک بابەتی زمانناسی کوردی، هەولێر،٢٠٠٣، ل٦٤.
(٤١) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگی (یەکەم، دووەم، سێیەم) چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٠، ل٢٣٢.
(٤٢) سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٢ -٢٣٤.
(٤٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٦.
(٤٤) غازی فاتیح وەیس، فۆنەتیک، بەغداد، ١٩٨٤، ل٨٤.

(٤٥) بڕوانه (غازی فاتیح، ١٩٨٤، ل٨٦_ وریا عومەر ئەمین، ٢٠٠٩، ل٢٨٨).
(٤٦) غازی فاتیح وەیس، فۆنەتیک، بەغداد، ١٩٨٤، ل٩٣.
(٤٧) وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەک، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٩٤.
(٤٨) تالب حسین علی، هەندێ لایەنی پەیوەندیی نێوان ڕستە و واتا لە کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٨، ل٢٣٢-٢٣٣.

**ملخص البحث**

إن الغموض مصطلح لساني، فهو يطفو على السطح جليا في اللغة الكوردية نظرا لتعددية استعمال مفردات من قبيل مشترك اللفظ وتعدد المعاني، لكونهما عاملين مهمين في ولادة بيئة الغموض الدلالي. ويتألف البحث من فصلين: تناول الفصل الأول مفاهيم الغموض والفهم الدلالي؛ فضلا عن أسباب ظهورها. أما الفصل الثاني فتطرق إلى أنواع الغموض الدلالي وطرق توضيحه أو إزالة الغموض الدلالي. وفي ختام البحث ذكر نتائج البحث والمصادر التي عضد منها البحث طروحاته.

## Abstract

Research Summary:

The ambiguity is a linguistic term. This term is a frequency in the Kurdish language because of the frequent use of common items such as verbal and multiplicity of meanings, since they are important factors in the building birth of semantic ambiguity environment. The research consisted of two chapters: The first chapter dealt with concepts of ambiguity and semantic interpretation, The second chapter highlights the sorts of semantic ambiguity and ways to clarify it. At the end, we pointed to the conclusion and the resources.

# مەنفا لە شیعری سەدەی نۆزدەمی کوردیدا

پ.ی.د. موحسین ئەحمەد عومەر

بەشی فەرەنسی/ کۆلیژی زمان/ زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

## پێشەکی

ئـەم تۆژینەوەیـە بابـەتێکی تێماتیکییـە لـە بـارەی چـەمکی "مـەنفا" لـە شیعری[*] سـەدەی نـۆزدەمی کوردیـدا: بـە تایبـەتی لـە شـیعری نـالی و حـاجی قادری کۆیی. مەنفا لـە ئـەدەبی کـوردی مێژوویێکـی هەیـە، بـەپێی سـەرنجدان و وربوونــەوەکانی خــۆم، مــەنفا وەک دیاردەیــەکی ئــەدەبی یــان وەک دیــاردە و کێشەیەکی ژیاریی کە کۆمەڵێک رەهەند و مانـا دەبەخشـێ، لـە چەنـد ئامـاژە و سـەرنجدانێکی کـورت لـەم لاو لـەولا، شـتێکی ئـەوتۆی لەسـەر نەنووسـراوە، بـە تایبەتیش بۆ ئینسان و کۆمەڵی کورد، کە دەزانـین کـورد بـە درێژایـی مێـژووی نوێی لە ناو پێکهاتەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئاڵۆز ژیاوە، بێ هیچ گومانێک تاکەکانی کورد، بـە تایبـەتی رۆشـنبیر و ئـەدیب و هونەرمەنـدەکانی، دووچـاری مەنفا و ئازاری مەنفا بوونەتەوە. دوو قەسیدەکەی نالی و حـاجی قـادری کـۆیی دوو نموونـەی بەرجەسـتە و کـۆنکرێتن بـۆ ئـەم دیاردەیـە، ئەمانـەش قـووڵی و ئاڵۆزیی دیاردەی "مـەنفا" لـە ئـەدەبی کـوردی، لـە مێـژوو و یاداشـتی ئینسـانی کـورد پیشـان دەدەن، کـە دەمێکـە بـەو ئـازارەوە ئاشـنایە و هـەوڵی جـوان و نایابیش هەیە بۆ وێناندن و بەرجەستە کردنی لە ناو ئەدەب و زماندا.

بێگومان دەبێ مێـژووی مـەنفا لـە ئـەدەب و کولتـووری کـوردی زۆر لـەوە کۆنتر بێ، بەڵام تـا ئێسـتا وەک تێکسـتی ناسـراو (وەک ئـەم دوو قەسـیدەیەی نالی و حاجی قادری کۆیی) لەبەر دەست نییە، لێرەشـەوە دەبـێ ئـەو پرسـیارە بکرێ، کە مەنفایەکی تری مەجازی هەیە، ئەمەیان هیچ شوێن گۆڕینی جوگرافی تێدا نییە، زیاتر وەک حاڵەتێکی روحی و وجودی دێـتە بـەرچاو، مێـژووی ئـەم جۆرە مەنفایە دەگەڕێتەوە پێش ئەمانەی نالی و حاجی قادری کۆیی، دەشێ لـە

سەرجەم شیعری کوردی بدۆزرێتەوە، لە بابەتاهیری عوریانەوە تا دەگاتە ئەمڕۆ، هەر بۆ نموونە قەسیدەی "گڵکۆی تازەی لەیل"ی ئەحمەد بەگی کۆماسی، وەک نموونەیەکی ناوێزە دەشێ هەڵگری ئەو مەنفا مەجازییە بێ، کە پچڕانێکی مەزن لەمەڕ عەشق و خۆشەویستی پیشان دەدا، شاعیر خۆشەویستەکەی لە دەست چووە، هەست بە تەنها مانەوە و سەرگەردانی دەکا. سەرگەردانی روخسارێکی تری مەنفایە، مەنفای لەم جۆرە مێژوویێکی هەیە و لەو باوەڕەدام ئەم بوارەش وەک دیاردەیەکی ئەدەبی و هەروا وەک کێشەیەکی وجودی پێویستی بە تۆژینەوەی زیاترە. ئەم لایەنە ئامانجی یەکەم و راستەوخۆی ئەم تۆژینەوەیە نییە، بەڵکو وەک زەمینەیەکی بەرجەستە و ماددی بۆ ئەم تۆژینەوەیە، لێکۆڵنیەوەیە لە دوو قەسیدەکەی نالی و حاجی قادری کۆیی، کە لە روانگەی ئێمەوە دوو شاکاری مەزنی ئەدەبی کوردی سەدەی نۆزدەمن.

**مەنفا چییە؟ پێناسە و شیکردنەوە:**

"مەنفا" وەک وشە و زاراوە، لە زمانی کوردی دەرکەوتنێکی زۆر لەمێژینەی نییە، دەشێ لە دوو سەد ساڵی رابردوو تێپەڕ نەکات، لەوانەیە کەمتریش بێ، بێگومان رەگە عەرەبییەکەی لەگەڵ ئایین بۆ کۆن دەگەڕێتەوە، بەڵام وەک بەکارهێنان لە ناو زمانی کوردی تازەیە، لەو ماوەیەی سەرەوە تێپەڕناکات. لە سەردەمی نالی و حاجی قادری کۆیی زیاتر "غوربەت و غەریبی" بەکارهاتوون هەروەکو لە شیعری ئەم دووانەدا هاتووە. لەگەڵ بە کوردی کردن و بووژانەوەی زمانی کوردی لە سەدەی بیستەم، زۆر وشەی دی بۆ ئەم زاراوەیە دانراوە، وەک: "تاراوگە" کە لە روانگەی ئێمەوە زۆر روون نییە و ئەو مانا ئاڵۆزە ناخاتە روو وەک غوربەت و غەریبی و مەنفا. من بە پێویستم زانی لەم تۆژینەوەیە زیاتر مەنفا بەکاربهێنم کە مانا و رەهەندی زۆری هەیە.

لە زمانی فارسی، لە فەرهەنگی فرانسی — ارسی ناسراوی سەعید نەفیسی بەرامبەر بە زاراوەی Exil وەک ناو نووسراوە: دوری از دیار، جلای وگن، غربت، نفی بلد، تبعید، بە مانا مەجازییەکەی بە جیهانی ژێرەوەش

دەگوترێ: عالم سفلی، عالم ناپایدار، سرای سپنج. بەرامبەر Exilé غریب، تبعید شده. وەکو فرمانیش تبعیدکردن، گوشەنشین هاتووە. ( Said Naficy. 1988.)

لە زمانی عەرەبی بەرامبەرەکەی "منفی" یە کە ناوی بەرکارهیو لە "نفی"یەوە هاتووە، واتە ئەو کەسەی مەحکوم کراوە بە دەرکردن و دوورخستنەوە، لە رووی زمانەوەش پێچەوانەکەی "مثبت و موجب"ە.

لە زمانی کوردیدا زۆر وشەی نزیک هەیە کە مانای مەنفا و تەبعید و غوربەت دەدا. وشەی غەریبی و غوربەت دوو وشەن لایەنی سایکۆلۆژی و عاتیفی حاڵەتی مەنفا و کەسی دوورخراوە زۆر پیشان دەدەن. بەڵام وشەی سەرهەڵگرتن، دوورخستنەوە، دەرکردن، سوورگوم کردن، دەربەدەرکردن، دەربەدەربوون، ئاوارە، ئاوارەبوون، سەرگەردانی، نەفیکردن، هەریەک لەمانە بە کۆنتراستی جیاواز و تایبەت، حاڵەتی مەنفا دەخەنەروو.

لە زمانی فرانسی مەنفا بەرامبەرەکەی Exil ە، لە وشەی Exsiliumی لاتینییەوە هاتووە کە بە مانای "دوورخستنەوە Bannissement و بە مانای شوێنی دوورخستنەوە Lieu dexil دێ. ئەم وشەیە لە ساڵی ١٠٨٠ زایینییەوە لە زمانی فرانسی و لاتینی دەرکەوتووە. لە فرانسیی کۆن دەنووسرا Exill ، کە بە مانای غەم و پەژارە، بەدبەختی، ئازار و تلانەوە و دوورخستنەوە هاتووە: Bannissement Detresse, malheur, tourement، بەپێی فەرهەنگی ئەکادیمی فرانسی زاراوەی Exil بۆ کەسێک یان کۆمەڵە خەڵکێک بە کاردەهێنرێ حوکمدرابن و وڵاتی خۆیان بەجێهێشتبێت، یان بە ئارەزووی خۆیان رۆیشتبن. کەسێک دوورخرابێتەوە بە هۆی کاری سیاسی، یان بە هەر هۆکارێکی دی سەری خۆی هەڵگرتبێ. ئەو کەسەی بە تەنیا دەژیێ و گۆشەنشینە. ( Jean Francois Feraud.1787)

ئەم دوو مانایە لە ساڵی ١٩٩٤ەوە لە لایەن ئەکادیمی فرانسی بەرامبەر بەم زاراوەیە دانراوە. ((مەنفا چەمکێکی "مفهوم – notion " ئاڵۆزە. گەلێ جار وەک مێتافۆر "مەجاز" ێک لە ئەدەب و هونەردا بەکارهاتووە بۆ دەربڕین و پیشاندانی لەدەستچوون، شوێن گۆڕین، پچڕان و دابڕانی عاتیفی و دوورکەوتنەوە و سەرهەڵگرتن، یانیش وەک بوونی نێوان و مەسافەیەک بەرامبەر

بە کۆمەڵگە و چینی باڵا هاتووە. لە رووی ئیتیمۆلۆژییەوە وشەی مەنفا Exil لە زمانی لاتینی لە Esilio ەوە هاتووە کە بە مانای "بازدان بۆ دەرەوە" دێ. پێچەوانەکەی بریتییە لە Resilio و Resilience کە بە مانای "بازدان بۆ دواوە یان گەڕانەوە بە بازدان" دێ. کەواتە مەنفا Exil بە مانای "تێهەڵدان یان فڕێدان بۆ دەرەوەی شوێنێک دێ یان تێهەڵدان بۆ دەرەوەی ئەو خاکەی بە نەریت لێی دەژین. لێرەوە پێچەوانەی Resilience دەبێتە توانای خۆدۆزینەوە لە ناو جیهان.)) (Claudio BOLZMANN. P.1)

نووسەری فرانسی بێرنار مێرور لە یەکێ لە وتارەکانی کە لە بارەی مەنفایە بە ناوی "مەنفا، یاداشت، ناسنامە "Exil, Mémoire, Identité لە پێناسەیەکی دروستی مەنفا دەگەڕێ و دەڵێ: ئەنسکلۆپێدیای جیهانی"م کردەوە بەڵام هیچم دەست نەکەوت، هیچ. سەرەنجام ناچار بووم بۆ سەرچاوە و تێکستە ئەدەبییەکان بگەڕێمەوە، لەم رووەشەوە راستەوخۆ دەبێ بگەڕێینەوە بۆ تێکستە بەراییەکانی ئەدەب وەک ئۆلیسیسی هۆمێر یان رۆمانێکی تازەی وەک "مرۆڤی یەکەم"ی ئەلبێرکامو. ((دوای دەرچوون لە جەنگی ترۆی "ترواده" کەشتییەکەی ئۆلیسیس بەرەو "ئیساکا" دەچێ، بە ناو فەزایەکی نەناسراودا تێدەپەڕێ، بە درێژایی ئەو رێکردنە پڕ لە سام و گرفت و چەرمەسەرییە، لە هەموو چرکەیەکدا بیرەوەری و یاداشتەکانی وڵاتیان لە لا رەش دەبێتەوە، ئارەزووی گەڕانەوە و عەشق و سووتانیان بۆ وڵات زۆرتر دەبێ، لەم رێکردنەدا، رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خراپە، نەناسراو، نەزانراو دەبێتە کێشەی یەکەمیان. ئایە ئەمە مەنفا نییە؟ ئایە ئەمە وەسفی مەنفا نییە؟ ئێمە چۆن باسی مەنفا بکەین؟)). (Jean Pierre Vernant. 1999)

مەنفا بە پلەی یەکەم حاڵەتی "لە خۆ بێگانەبوون"ە، ئەمەش چەند رەهەندێکی جوگرافی و دەروونی و ژیاری لێ دەبێتەوە، لە خۆ بێگانەبوون هەڵکەوتێکی گشتگیرە و دەشێ لێکدانەوەی زۆری بۆ بکرێ. بێرنار مێرور لە هەمان بابەتی پێشوو چەمکی مەنفا زیاتر شی دەکاتەوە: ((مەنفا دوو مانا دەبەخشێ، یەکەم حاڵەتی ئەو کەسەی کە دەسەڵات دووری دەخاتەوە بۆ وڵاتێکی دی دوور لە وڵاتی خۆی، حاڵەتی دووەم هەموو نیشتەجێبوونێک لە

شوێنێک کە کەسی دوورخراوە دەیەوێ یان ئارەزووی لێیە لێی دانیشێ. حاڵەتە سەرتاپاگیرییەکە ئەوەیە زۆر مانا دەبەخشێ وەک: ناچارکردن، حرمان، حوکمدان و دوورخستنەوە.)) Bernard Méreur. 2010. P.1

مەنفا جیاوازە لە کۆچکردن Immigration یان کۆچکردن و سەرهەڵگرتن بە بڕیاری پێشوەختە و پلان بۆ دانراو. ئەگەرچی دەشێ دواتر لەسەر ئاستی تاکەکەس، هەمان ئەو خەسڵەتی دەروونی و روحی لەخۆبێگانەبوونە Depaysement لە لای کەسی کۆچکردوو سەرهەڵبداتەوە. دەستەواژەی کۆچکردن درەنگتر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم لە زمانی فرانسی بەدیارکەوتووە، بە پلەی یەک پەیوەندی بە "کارکردن" ەوە هەیە لە وڵاتێک کە هی ئەو کەسە خۆی نییە، ئەمەش لەگەڵ گەشەسەندنی پەیوەندییەکان لە نێوان وڵاتان سەری هەڵداوە. کۆچ و کۆچکردن لە زمانی کوردیش، دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی لە سەدەی بیستەم تێناپەڕێ، بەڵام وشەی کۆچ و کۆچەر بە مانا نەریتییەکەی، وەک ئاماژە بۆ کۆمەڵی نەریتی کوردی کۆنترە.

لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی کێشەی مەنفا، سروشتی مەنفا خۆیەتی کە کەسی مەنفی یان دوورخراوە یان ئەو کەسەی بە ئارەزووی خۆی مەنفای هەڵبژاردووە، ناچارە لە وڵاتێکدا بژیێ کە هەموو نەریت و فەزای ئەو شوێنە بۆ ئەو بێگانەیە، سەرەنجام دوورکەوتنەوە لە نەریت و فەزای وڵاتی خۆی کە پێشتر پێی ئاشنا بووە، نێوان و پچڕان و دابڕانێک دروست دەبێت، ئەو کەسە لە نێوان دوو فەزا و دوو شوێن بە تەنیا دەمێنێتەوە، نە سەر بە شوێنی مەنفایە نە سەر بە زێد و وڵاتی خۆی دەمێنێتەوە. لەم نێوانە حاڵەتی سەرلێشێوان، بزربوون، لەخۆبێگانەبوون، سەرگەردانی عاتیفی سەرهەڵدەدا. کەواتە مەنفا بریتییە لە دابڕان و پچڕانێکی دوو لایەنە، ئەمەش وەک بەرجەستەکردنێک وایە لە "زەمەن و شوێن و لە مێژوو". یەکێ لەو نموونە بەرایی و هەرە جوانانەی کە بە قووڵی ئەم حاڵەتە دەردەبڕێ، هەڵکەوتی مەنفای شاعیری رۆمانی "ئۆڤید Ovid"ە.

ئۆڤیدی شاعیر لە ساڵی ٨ ی زایینی لە لایەن ئیمپراتۆری رۆمانی "سیزار ئۆگوست" بۆ شاری تۆمیس Tomis دوور دەخرێتەوە. (شاری تۆمیس کەوتۆتە

مۆلداڤیای ئێستا لەسەر لێواری رۆژئاوای دەریای رەش) ئۆڤید تا کۆتایی ژیانی لەو شارە دەمێنێتەوە، ئەمەش حەڤدە ساڵ درێژە دەکێشێ. بە هۆی ئەوەی شیعری ئۆڤید لەگەڵ سیاسەتی خێزانی ئیمپراتۆر نەگونجاوە، ئۆڤید ناچار دەکرێ وڵات بەجێهێڵێ و مافی گەڕانەوەشی نەبووە لە شاری "تۆمیس" شوێنی دوورخرانەوەی دەربچێ. بەڵام ئەو مافی هاووڵاتیبوونی لێ نەسەندراوەتەوە و دەتوانێ نامە بۆ رۆما بنێرێ و نامەشی بە دەست بگات. ((بەڵام هەمیشە وەک دوورخراوەیەک، وەک مەنفییەک خۆی دەناسێنێ، ئەو نە دەبێتە هاووڵاتی شاری تۆمیس، نە جارێکی دی دەتوانێ وەک رۆماییەک بێ، ئەو بە تەواوی لە ناو دابڕان و بزربووندا دەژیێ. لە لای ئەو کەسی دوورخراوە وەک مردنێکی سیڤیل – مەدەنی دێتە بەرچاو. ئەو لە شاری تۆمیس –یش هەر بە وەختی شاری رۆما دەژیێ: لە کتێبی "غەمبارەکان Tristes دا دەڵێ: ئێستا لە رۆما بەهارە، بەڵام ئێرە هەردەم زستانە. ئێستا لە رۆما وەختی ئەم جەژن و ئەو جەژنە، کەچی من لێرە تەنیام... هەموو بوونەوەرێک دواجار لەگەڵ هەڵکەوت و چارەنووسی ژیانیان رادێن، هەرچەند ئەو چارەنووس و مەرجانە سەخت و ناخۆشیش بن. بەڵام هەرچی منم، من رانایێم.)) (Francois Hoff. 2009. p.1)

ئەمەش وەک باسکردن و وەسفکردنی ئەو حاڵەتەی مەنفا وایە کە شێوەی ئەستەم و مەحاڵی هەیە. هەر لە بارەی ئەمەوە، ئۆڤید لە شوێنێکی تر لەگەڵ کتێبەکەی قسە دەکا و دەڵێ: ((تۆ بێ من دەچیتە رۆما.) (Tr. I, I,I,98.III.7) ئەمەش سەختی و قورسایی شوێن و فەزای مەنفا پیشان دەدا، لە هەمان کات سەرەتای لە دایکبوون و دەرکەوتنی "نووسین بۆ خۆ یان بۆ خود – زات" یشە.

مەنفا زەمەنی پێشوو و زەمەنی بەرایی هەیە. زەمەنی بەرایی پێش کەوتنە مەنفا بە زەمەنێکی ئاشنا یان ناسراو و یان وەستاو دادەنرێ، زەمەنێک کە ناوەڕۆکەکەی پڕە لە یاداشت، ئەم یاداشتانەش هەردەم وەک ناسنامەیەک دەمێننەوە، هەمیشە لە لایەن کەسی دوورخراوە یان لە ناو تێکستی ئەدەبی بە ئایدیالیزمی دەکرێ، وەک سەرچاوەیەکی خەیاڵفڕین و قووڵبوونەوە و نغرۆبوون سەیری دەکرێ، وەک بەهەشتێکی لە دەستچوو تەماشا دەکرێ، بەهەشتێک،

جیهانێک کە هەردەم دەبێتە ئامانجی گەڕانەوە، بەڵام وەک واقیع، لە کاتی گەڕانەوە بۆی، حاڵەتی شاگەشکە و لە خۆبێگانەبوونەوەی دووەم لە لای کەسی دوورخراوە سەرهەڵدەداتەوە.

لە مەنفادا، یاداشت دەبێتە کارێکی بەرجەستە و تۆمارکردن لە ناو جیهان و مێژوو. دابڕانێک لە ناو جیهان و مێژوو کە بە زۆر شێوازی جیاجیا درێژە بە خۆیان دەدەن. یاداشتی مەنفا وەک "مۆتۆرێک" وایە هەردەم لە دروستکردنەوە و داهێنانەوەی رابردوو و ئێستا و ئایندەدایە. ئەمەش ئاودیوبوونێکە بەسەر دابڕان، بەڵام ئەم دابڕانە هەردەم وەک گرفتێک دەمێنێتەوە و هەڵکەوتی ناسنامە لە لای کەسی دوورخراوە وەردەگرێ. ((ئەزموونی مەنفا ئەزموونێکە دینامیکی و پڕ لە ناکۆکی، واتە یەکانگیر و نایەکانگیر. هاتووچوونێکە لە نێوان ئێرە و ئەوێ، لە نێوان رابردوو و ئایندە، لە نێوان نۆستالژی و ئومێد، لە نێوان دوورخستنەوە و گەڕانەوە بۆ ناوەوە، لە نێوان "من" و "ئەوانی دی". ئیتر هەموو بەدبەختی "دەرەنجامە نێگەتیڤەکان" و دەوڵەمەندییەکەی "دەرەنجامە پۆزەتیڤەکانی" لەم پێکهاتەیەدایە. هەر بە هۆی ئەم هەڵکەوتە تایبەت و ناوێزەشەوە دەبێتە سەرچاوەیەکی داهێنانی ئەدەبی.)) ( Petruta SPANU. 3. 2005.p.166.)

مێژووی مەنفا لە ئەدەبی جیهانی ئامادەگی و مێژوویێکی کۆنی هەیە. دەشێ هەروەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا شاعیر ئۆڤید کە لە ساڵی ٨ی زایینی لە رۆما دووردەخرێتەوە بە سەرەتایەکی روون و کۆنکرێت دابنرێ کە بۆتە هۆی داهێنانی بەرهەمێکی ئەدەبی زۆر ناوێزە و قووڵ و پڕ لە هەڵچوون و سووتان. بەڵام بێگومان، ئەم سەرەتایە دەبێ هێشتا کۆنتر بێ. نموونەی زۆر لەم رووەوە لەبەر دەستە، وەک داستانی گەلگامش و کتێبە ئایینییەکان و ئەدەبی یۆنانی و ئێرانی و هیندی کۆنی پێش زایین. لە لایەکی ترەوە، دەشێ مرۆڤ خۆی، ژیانی لەسەر زەوی ژیانێک بێت لە مەنفا هەروەکو لە کتێبە ئایینییەکان (تەورات و ئینجیل بە پلەی یەکەم)دا هاتووە، مرۆڤ فڕێدراوەتە سەر زەوی، ئەم فڕێدانە هەمان فڕێدرانە بۆ مەنفا، دەرکردن و دوورخرانەوەیە بۆ سەر خاکی مەنفا ـ لەم حاڵەتەدا بەهەشت دەبێتە خاکی یەکەم، خاکی

ئاشنای مرۆڤ، ئامانجیش گەڕانەوەیە بۆی، ئەمەش دەبێ وەک مەنفای دووەم سەیر بکرێ. لێرەوە ئامانجی ئەم تۆژینەوەیە قووڵبوونەوەی زیاتر نییە لەم لایەنەوە، مەبەستی سەرەکی ئێمە بە پلەی یەکەم، بێگومان پەیوەندیی مەنفایە بە داهێنانی ئەدەبی و هونەری، یان بە گشتی پەیوەندیی نێوان نووسین و مەنفایە، کە تا رادەیەکی زۆر هەمان پەیوەندی لە نێوان زمان و مەنفاش هەیە، چونکە دواجار هەموو مەنفایەک لە ناو زمان بەرجەستەکردنەکانی خۆی پیشان دەدا.

( (ئەزموونی نووسین، نووسین لەسەر خۆ "خود، زات" کە هەمان ئەزموونی نووسەری مەنفایە، ئەوسا دەکرێ و بەرجەستە دەبێ کە پەیوەندییەکان لە ناودەچن. ئەمەش وەک کارێکی هەڵکۆڵین و گەڕان وایە. نووسین لەسەر خۆ "خود، زات، من" هەردەم خۆدوورخستنەوەیەکە لە کۆمەڵ و شێوازی دەربڕینی ئەو کۆمەڵە کە نووسەر یان ئەدیب لێی دەرهاتووە. ئەمەش وەک دڵنیایی کردنەوەیەکە لەسەر بێوێنەیی و تایبەتمەندی ئەم دوورخستنەوەیە کە وەک زمانحاڵێک دێتە بەرچاو. بۆیە نووسین هەردەم وەک دروستکردنی نێوانێکە، بوارێکە لە نێوان "خۆ" و ئەوانی دی. لە لایەکی ترەوە، مەنفا لەوانەیە وەک مەنفای زمان یان زمان وەک مەنفا بێتە بەرچاو. (...) بە گشتی نووسین، بە هەموو مانایەک واتە خۆمەنفاکردن لە ناوژیان. نووسەر و شاعیر، ئەوەی دەزانێ کە بە هەڵبژاردنی زمان و زمانی دەربڕینی "شێوازی خۆی" تایبەت بە خۆی، دەشێ رووبەڕووی تێنەگەیشتن ببێتەوە، ئەمەش فۆرمێکی پڕ لە ئازاری مەنفایە. ئەگەر بەدبەختی مەنفا ئەوە بێ پێش هەموو شتێک لە ئەوانی دی نەگەی، قسە بکەی بێ ئەوەی گوێت لێ بگرن، بەردەوام لەسەر مانا پراکتیکییە کۆمەڵایەتییەکان بکەویە هەڵەوە، بەردەوام وەک بێگانەیەک سەیر بکرێی، لەم حاڵەتەدا نووسەر دەتوانێ وەک مەنفییەک یان دوورخراوەیەک لە خۆی بڕوانێ.)) (Petruta SPANU. 2005.p 166-167.

دواجار لە کێشەی مەنفا و داهێنانی ئەدەبی یان "نووسین" زمان بۆ شاعیر و نووسەر لە یەک کاتدا مەنفا و وڵاتیشە، وڵاتی لەدەستچوو، بەڵام ئەدیب ئەم وڵاتە لەدەستچووە بە وڵاتێکی دیی ئایدیالیزمی دەگۆڕێتەوە. وڵاتی

دڵخوازی ئەو کە تێیدا ئاسوودەیە و یەکانگیرە، بەڵام ئەم وڵاتە هەردەم وڵاتێکی ناسک و لاوازە Fragile ، لەم نێوانە هەردەم حاڵەتێکی وەک مێتامۆرفۆز هەیە، واتە هەردەم "گۆڕینێک — حلول" هەیە، ئەدیبی دوورخراوە و نیشتەجێ لە مەنفا رووودەکاتە مەنفایەکی تر، ئەمەش وەک گەڕان وایە لە وڵات، لە یاداشت، لە ناسنامە، لە وڵاتی دڵخواز، دواجار بە دروستکردنی مەنفایەکی دی کۆتایی دێ کە داهێنانە، ئەمەش واتە زمان و نووسین. ((نووسەر، شاعیر، "ئەدیب" ئەو کاتە هەست بە مەنفا دەکا، لەو ساتەوەی رستەی خۆی دادەڕێژێ یان قەسیدەی خۆی دەنووسێ، ئەو دەزانێ دروستکردنی وڵاتی دڵخوازی خۆی پەیوەندی بە نووسینەوە هەیە. مەنفا و داهێنان، بۆ ئەو، ئەوەندە لەو نزیکن وەک هاوتای یەکتر دێنە بەرچاو، لە لایەکی ترەوە، بۆ هەموو دوورخراوەیەک، زمانی دایک کە بەردەوام قسەی پێدەکا، وەک وڵات دێتە بەرچاو، وەک خاکی دایک و خەون وایە.)) ( Petruta SPANU. 2005.167).

لە حاڵەتێک ئەگەر ئەو زمانەی پێی دەنووسێ زمانی دایک نەبێ، ئەوە ئەو زمانە هەردەم وەک ئەو خاکەی مەنفایە دێتە بەرچاو کە شاعیر بە ئارەزووی خۆی هەڵیبژاردووە. ئەمەش لە هەموو حاڵەتێک وەک مەنفای ناو مەنفا وایە. بەڵام ئەم دوو مەنفایە هەمان هەڵکەوتیان نییە، مەنفای زمان مەنفایەکی دینامیکییە، بەڵام مەنفای جوگرافی مەنفایەکی پێچەوانەیە.

وێنەی خاکی دایک لە ئەدەبی مەنفا لە مەنفا شێوەی جیاجیا وەردەگرێ، لە لای ئۆڤیدی شاعیر "ئەسەف و شەکوا — Lamentation et regret " ئەو تایبەتمەندییە دینامیکییەیە کە شیعری ئەوی لەسەر بنیاتنراوە، بەڵام لە لای دانتێ ((مەنفا سەرچاوەی ئیلهام و بەخششە. ئەو هەوڵی نەداوە نۆستالژیای خۆی پیشان بدا، بەڵکو بە پێچەوانەوە وەک هەوڵێکی پڕ لە گرفت و کێشەی قووڵ سوودی لێ وەرگرتووە، هەڵبەت لە بنیاتنانی "کۆمێدیای ئیلاهی" دا.)) (Petruta SPANU. 2005.p.168).

لە ئەدەبی کوردی، تێکستی مەنفا زۆرە، دەشێ هەموو قەسیدەیەکی لاواندنەوە، لاواندنەوەی کەسێکی لەدەستچوو، یان هی وڵات، بە چەشنێک

خەسڵەتی مەنفا پیشان بدەن، بە تایبەتی ئەو مەنفایەی کە بە مەنفای مەجازی ناسراوە، ئەمەش دەشێ لەگەڵ هەر مەنفایەکی ناوەوە "روحی و دەروونی" یەک بگرێتەوە. بەڵام نموونەی بەرجەستە و بێ وێنە لە شیعری کوردی سەدەی نۆزدەم، دوو چامەکەی نالی (قوربانی تۆزی رێگەتم...) و حاجی قادری کۆیی (وتم بە بەختی خەواڵوو....)، دەشێ چامە وەڵامەکەی "سالم" یش بۆ نالی هەر لە ریزی ئەو مەنفایەی دابنێین کە بە مەنفای مەجازی ناسراوە، بەو مانایەی لەدەستچوونی وڵات بە مانا سیاسییەکەی (جێگیربوونی دەستەڵاتی عوسمانییەکان لە سلێمانی) کە وەک ئاشووبێکە بۆ سالم، هەر ئەو مەنفایە پیشان بدا.

نالی و حاجی قادری کۆیی، بە پێچەوانەی ئۆڤید و دانتێ، سەرەڕای تایبەتمەندی و خەسڵەتی گشتی شیعری و ئەدەبییان، لەو خاڵە یەک دەگرنەوە کە وڵاتی ناو یاداشتی ئاشنا و رابردوو و وەستاو و لەدەستچوویان، شێوەی خەون و وڵاتی ئایدیالی و ئۆتۆپیایی وەردەگرێ، ئەمەش هەر ئەو وڵاتە لەدەستچووەی سەردەمی مناڵییە، وێڕای لەدەستچوونی جیهانی مناڵی، ئێستا دەبێتە مەنفا بۆ سەردەمی مناڵی. ئەوان هەموو ئەم لەدەستچوونەیان (وڵات، مناڵی) لە ناو زمان و بە داهێنان دروستکردۆتەوە. دواجاریش ئەوان هەر لە ناو ئەو وڵاتە دەمێننەوە، "وڵاتی زمان" کە جێگاو مەنفای هەمیشەیی شاعیر و نووسەرەکانە. ئیتر کێشەی سەرەکی لێرەوەیە کە ئیشکالییەتێکی گەورە دروست دەکا، ئایا وڵاتی ئایدیالی کە بە پەخشان یان شیعر لە شێوەی وێنەی شیعری و گێڕانەوە دادەڕێژرێ، لە شێوەی وڵاتی ئایدیالی بوونی هەیە، ئایە ئەمە هەمان وڵات نییە شاعیر بە دوایدا وێڵە، بێگومان، دەرچوون و رووکردنە مەنفا بۆ خۆی گەڕانە لەو وڵاتە بێ هاوتایە کە هەمان وڵاتی سەردەمی منداڵی و منداڵییە، دۆزینەوەی خەونە لەدەستچووەکان. دواجار ئەم وڵاتە بوونی تەنیا لە ناو زمان و داهێنانی ئەدەبی بەرجەستە دەبێ، ئەمەش ئەو بەرجەستە عاتیفی و مێژوویەیە کە پڕە لە یاداشت، هەڵکەوتی گەڕان بە دوای ناسنامە وەردەگرێ. ئەو وڵاتەی لە داهێنانە شیعرییەکانی ئەوان هەیە وڵاتی مەجازی و

رەمزییە، ئەمەش وەک بیناکردنێک وایە لەسەر یاداشتی ئاشنا و وەستاوی رابردووی وڵاتی جوگرافی.

لە مێژووی فەلسەفەی نوێ، مەنفا بایەخێکی زۆری پێدراوە، بە رادەیەک لە کەسی دوورخراوە کێشەی "بوون" خۆی رەپێش دەکا، واتە کێشەی سەرەکی و پرسیاری سەرەکی فەلسەفە خۆیەتی. لە لای فەیلەسوفە کۆنەکان هوشیاریی ئینسان خۆی لە خۆیدا بەستراوەتەوە بەم پرسیارەی سەرەوە، وەک لە لای "سان ئۆگوستین" کە روانینە فەلسەفییەکانی تا رادەیەکی زۆر تێکەڵە بە روانینی ئایینی، پێی وایە ئینسان مەحکوم کراوە بە گەڕان و وێڵبوون، ئەو لە دنیایەک دەژیێ هەردەم بە دوای ئاسوودەییدا دەگەڕێ، بەڵام ئاسوودەیی لەم دیوی مەنفاش نییە، ئێرە و ئەوی پڕە لە کوێرەوەری: ((بەڵام من دەکەومەوە ئەو بنی دنیایە و قورساییم بارگرانییەکە لەسەرم، دەبمەوە نێچیر و خۆراکی راهاتنەکانی خۆم، ئەم راهاتنانەم دەمگرن، سەرەڕای فرمێسکەکانم، لە پەل و پۆم دەخەن و بەرم نادەن، هەموو شتێک قورسە و بارگرانییەکی راهاتنە! من نامەوێ ببمە ئەوە کە لێرەم، نامەوێ ببمە ئەوەی ئەوێش، لە هەر دوو لا کوێرەوەرییە.)) (Olivia Bianchi. 2006. P. 2) .

ئەم هەستەی سان ئۆگوستین کە تێکەڵەیەکە لە روانینی فەلسەفی و ئایینی، مەنفا لە روانگەی ئەو دوورخستنەوەیەکی تراژیدییە، فێری ئەوەمان دەکا بە دوای خودا بگەڕێین، بەو پێیەی ژیانی ئینسان لەسەر زەوی، ژیانێکە لە ناو مەنفا.

لوکرێس Lucrece لە کتێبی "De Natura Renum "، ئەویش پشتگیری لەم روانینە دەکا و پێیوایە ئینسان بە درێژایی ژیانی لە ناو مەنفا دەژیێ. ((هەر یەک لە ئێمە وەختی خۆی بەوە بەسەر دەبا رابکا.)) (Olivia Bianchi. 2006. P. 2.)

ئەم هەلکەوتە پێویستە لەگەڵ لە "نامۆبوون – اغتراب – Alienation"، تێکەڵ نەکرێ، ئەمەیان هەڵکەوتێکی تری هەیە دەشێ هەمان شت لە مەنفاشدا هەبێ، بەڵام بە گشتی هەروەکو هیگل باسی دەکا، نامۆبوون بە پلەی یەکەم ((پەیوەندی بە لە دەستدانی ناسنامەوە هەیە.)) ئیتر ئەو ناسنامەیە هەر

چییەک بێ، دەروونی، جوگرافی، سیاسی یان کۆمەڵایەتی. ( Olivia Bianchi. 2006. P. 3.)

لە لای "زیگموند فروید" مەنفا ئەو کاتە مانایەکی دەبێ کە ئێمە پەناگایەک دەدەینە زمان یان ئاخاوتن، ئەمەش هەمان پەیوەندی بە بەرجەستەکردنەکانی مەنفاوە هەیە لە کاری ئەدەبی، بە ئایدیالیزمی کردنی روانینی کەسی دوورخراوە و دەرکەوتنی لە ناو زمان، لە لای فروید مەنفا پەیوەندی بە "ئاشنا و نائاشنا"وە هەیە. فروید لە یەکێ لە وتارەکانی خۆی بە ناوی "بێگانەبوونێکی پڕ لە دڵەڕاوکە — Lenquietante étrangeté – غرابة مقلقة، کە لە ساڵی ١٩١٩ بڵاوی کردۆتەوە، باس لە دڵەڕاوکە دەکا، وەک ئەوەی لێکدەداتەوە ئینسان لە "ماڵی خۆی " نەبێ. لە لایەکی ترەوە کەسی مەنفا هەڵکەوتێکی هەیە "بێوێنە و تایبەت — Singulier "، سەرەنجام ( (هەموو بێوینە و تایبەتێک بێگانەبوونە بەڵام هەموو بێگانەیەک بێوێنە و تایبەت نییە: ئەم هەستی بێگانەبوونە ئەو کاتە خەست دەبێتەوە و گەشە دەکا کە زمانی بێگانە شوێنی زمانی دایک دەگرێتەوە، زمانی بێگانە لێرەوە وەک ئەوە وایە ببێتە یان جێگای زمانی باوک بگرێتەوە)) (Francesco Sinatra.1996. P. 62) .

لە لای فروید ( (لەخۆبێگانەبوون بەرامبەرەکەی یان هاوتاکەی بێگانەبوونە لە ئەویتر: ئەمەش واتە بێگانەبوونێکی دوو روویی یان دوو لایەنی، جیاوازییەک پیشان دەدا، وەک برزبوونەوە و هەڵکشانی هەستی بێگانەبوون لە خۆ کە لووتکەکەی هەستی نامۆبوونە Alienation. کەسەکە وەک یەکێکی تر خۆی دێتە بەرچاو.)) (Francesco Sinatra. 1996. p.64) .

لەم هەڵکەوتەدا مەنفا یان مەنفی وێڕای بوونی ئەم تایبەتمەندییە دەروونییە، بە پلەی یەکەم پەیوەندی بە "لەخۆبێگانەبوونەوە" هەیە بە مانا جیۆپۆلیتیکەکەی، بەم پێیە لە روانگەی فروید مەنفا و لەخۆبێگانەبوون کە هەردووکیان تێکدەکەنەوە وەک دڵەڕاوکە و نیگەرانی دێتە بەرچاو، ئەمەش بە سێ هەنگاو تێدەپەڕێ. ( (هەنگاوی یەکەم: پچڕان لەگەڵ ئاشنایی و زمانی دایک و لە بیرکردنی رەگ و ریشەی بەرایی. هەنگاوی دووەم: گەڕان بە دوای ئەویتر، بێگانەبوون و گەڕان بە دوای زمانی دایک و خۆدامەزراندن لە ناو ئەم

دووانە. هەنگاوی سێیەم: گونجانەوە لە ناو ئاشنایی و بێگانەیی و زمانی دووەم و خۆبەرجەستەکردنەوە ....)) (Francesco Sinatra. 1996. P. 64) .

ئەمەش تا رادەیەکی زۆر هەمان ئەو پرسیارانەیە کە لە فەلسەفەی وجودی دەکرێ، سارتەر لە کتێبی "بوون و نەبوون Lêtre et le néant " کە باس لە "بوون بۆ خۆی" Lêtre pour soi دەکا، هەمان کێشەی مەنفا دەورووژێنێ، دەبێتەوە پرسیاری یەکەمی ئینسان، بە هەمان شێوە پرسیاری یەکەمی فەلسەفە. لە لای هایدگەریش، بەڵکو پێش سارتەریش بە قووڵی باسی ئەم دیاردەی کردووە، "زمان و زەمەن و دڵەڕاوکە" پرسیارە سەرەکییەکانی ئینسانن، ئێرە چییە؟ ئەی ئەوێ چییە؟ بۆ لێرەین؟ بۆ لەوێین؟....هتد. بەم شێوەیە مەنفا میتافیزیکای خۆی هەیە، ئەم میتافیزیکایەش تەنیا دەشێ لە زمان و کاری ئەدەبی و داهێنانی ئەدەبی بەرجەستە بکرێ، ئەمەش بۆ خۆی وەک خۆدۆزینەوە و ئاودیوبوونێکە بەسەر مەنفا، دۆزینەوەی ناسنامە، گەڕانەوە بۆ ناو یاداشتی لەدەستچوو، گەڕانەوە بۆ وڵاتی دڵخواز، نەهێشتنی پچڕان و دابڕان و سڕینەوەیان.

**مەنفای نالی و حاجی قادری کۆیی:**

ئەوەی بۆ ناوەڕۆکی ئەم تۆژینەوەیە گرینگە بە پلەی یەکەم هەندێ وردەکارییە لە بارەی ژیانی ئەم دوو شاعیرە لە کوردستان و ساڵی ڕۆیشتنیان بۆ دەرەوە و ئەو ماوەیەی لە مەنفادا ژیاون. لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی کۆنکرێتمان لەبەر دەست نییە، ناچارین بە وردی باس لە تەواوی ژیانی نالی و حاجی قادری کۆیی بکەین، روانینی تەواوی ئەو سەرچاوانەش بخەینە روو کە لەم بارەیەوە هەندێ روونکردنەوەیان پێشکەش کردووە. ئەم سەرچاوانەش سەرەڕای لاوازییان، هەندێ لایەنی ژیانی ئەمانە روون دەکەنەوە.

ئەوەی لێی دڵنیاین، نالیی شاعیر، بەپێی زۆربەی روانین و سەرچاوەکان لە تەواوی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا ژیاوە، بە پێچەوانەوە، حاجی قادری کۆیی هاوچەرخی کۆتاییەکانی ژیانی نالی بووە و لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم ژیاوە.

بەپێی گشت سەرچاوەکان نالی لە (١٨٠٠ یان ١٨٠١ یان ١٧٩٧ لە دایکبووە لە ساڵی ١٨٥٦ یان ١٨٥٥ یان ١٨٥٨ کۆچی دوایی کردووە. ئەمەش

بەپێی لێکدانەوە و ساغکردنەوەی ژیانی نالی لە لایەن مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، عەلائەدین سەجادی و د. کەمال فوئاد و د. مارف خەزنەدار. عەلی موقبیل...هتد. ((دیوانی نالی. ١٣٨٨. لا. ١٦ و ١٧)

هەر لە هەمان سەرچاوەدا هاتووە، گوایە نالی پەیوەندییەکی زۆر تایبەتی لەگەڵ سولەیمان پاشای بابان و ئەحمەد پاشای بابان بووە. ئەمەش دەشێ یاریدەدەر بێ بۆ روونکردنەوەی هەندێ لایەنی ژیانی نالی. ((سولەیمان پاشای بابان لە ساڵی ١٢٣٤ ی کۆچی تا ساڵی ١٢٥٤ی کۆچی حوکمڕانی سلێمانی کردووە.)) (دیوانی نالی. ١٣٨٨ لا ١٧و ١٨) ئەمەش واتە، تا ساڵی ١٨٣٩ لە حوکمڕانی ماوەتەوە و هەر لەو ساڵەشدا کۆچی دوایی کردووە. لە دوای سلێمان پاشا، ئەحمەد پاشا لە ١٨٤٠ فەرمانڕەوای سلێمانی بووە، دوایی لێیان خستووە و لە بەغدا بانگیان کردۆتەوە لە جێگای ئەو مەحمود پاشا کراوەتە حاکمی سلێمانی، هەمان ساڵ مەحمود پاشا لێ خراوە ئەحمەد پاشا بووەتەوە حاکمی سلێمانی، لێرەوە بەردەوام حاکمی سلێمانی بووە تا ساڵی ١٨٤٦، ئەو ساڵەی کە دوور دەخرێتەوە بۆ ئەستەنبۆل.

ئەم لێخران و دانانەوە بەڵگەیەکن بۆ ئەو ناکۆکییانەی بابانەکان هەیانبووە لەگەڵ پاشاکانی بەغدا و ئەستەنبۆل و ئێران، ئەحمەد پاشا بەپێی هەموو لێکدانەوەکان تا ساڵی ١٨٤٦ فەرمانڕەوایی کردووە. دوای ئەمە دەبێ رووی لە ئەستەنبۆل کردبێ و پاشان کراوەتە والیی یەمەن و دواجاریش بۆتە والیی ئەرزەرۆم.

گەڕیدەی فرانسی ئۆژێن فلاندا و پاسکال کۆستا، لە ساڵی ١٨٤١ لە تەبریزەوە راستەوخۆ لە رێگای مەهابادەوە دەگەنە سلێمانی، لەوێ چاویان بە ئەحمەد پاشا کەوتووە و باس لە پێشوازیی گەرم و سەخاوەتی ئەحمەد پاشا دەکەن و دەڵێن: (لەگەڵ گەیشتنمان بۆ سلێمانی ئەو نامە راسپاردەیەی پێمان بوو گەیاندمانە لای ئەحمەد پاشا، بە فەرمانی ئەحمەد پاشا لە ناو خانووێکی زۆر گەورە دابەزین کە لە هەموو لایەکەوە رووخابوو...هتد)) ( .Eugene Flandin (.P.487

ئەمەش بەڵگەی ئەوە بووە، لەو ساڵەدا ئەحمەد پاشا حاکمی سلێمانی بووە و هێشتا لەو شارەدا بووە. دوانزە ساڵ دواتر یان زیاتر، بە گوێرەی

سەرچاوەکەی شۆدزکۆ ساڵی ١٨٥٣ ئەحمەد پاشا لە پاریس بووە، گوایە بۆ چارەسەری نەخۆشی لە لایەن بابی عالییەوە نێردراوەتە فرانسا. ئەحمەد پاشا لە لای شۆدزکۆ باس لە نالی دەکا و دەڵێ ئێستا لە دیمەشق دەژیێ. شۆدزکۆ دەڵێ: ((... لە سوریا، لە دیمەشق، زانایەکی کوردی بە ناوبانگ دەژیێ ناوی مۆلا خضر Molla Hizir باشتر بە نازناوە ئەدەبییەکەی ناسراوە (نعلی افندی Neali Effendi) کە خۆی بۆ لێکۆڵینەوەی دیالێکتی کوردستان — نیشتمانەکەی تەرخان کردووە.)) (عومەر، ٢٠١٢ لا. ٣٥٦.)

لە لایەکی ترەوە لە بارەی دەرچوونی نالی لە سلێمانی بە ڕای عەلائەدین سەجادی ((نالی لە ساڵی ١٨٣٠ دا (...) ئەچێ بۆ حەج و سولەیمانی بەجێ دێڵی، حەج ئەکا و ئەگەڕێتەوە بۆ "شام" چەند ساڵێک لەو ناوەدا ڕاییواردووە، هەوای مەڵبەندی ئەکەوێتە سەر لە ١٨٣٤ دا (...) نامە شیعرەکەی ئەنووسێ بۆ سولەیمانی. کە وەڵامەکەی لەو ساڵە وەرئەگرێتەوە تەماشا ئەکا چەپگەردی ڕۆژگار و ستەمی تورکەکان نایەڵن بچێتەوە سولەیمانی لە ١٨٣٥ بارگەی ئەپێچێتەوە و ئەچێ بۆ ئەستەمول لەوێ لە لای ئەحمەد پاشای بابان ئەبێ.)) (سەجادی، ١٩٧٣ لا. ٥)

پێناچێ ئەم ڕوانینە دروست بێ. سەرلەبەری ناتەواوە و هیچ قووڵبوونەوەیەکی تێدا نییە. چونکە ئەو سەردەمە هێشتا ئەحمەد پاشا هەر لە سلێمانی بووە و هێشتا نەچۆتە ئەستەنبۆل، بێجگە لەمەش هێشتا سلێمان پاشا حاکمی سلێمانی بووە.

لە لایەکی دی نابێ نالی لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی نۆزدەم کۆچی دوایی کردبێ هەروەکو تەواوی سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەکەن گوایە لە یەکێ لەم ساڵانە (ساڵی ١٨٥٦ یان ١٨٥٥ یان ١٨٥٨) بووە. چونکە ئەحمەد پاشای بابان لە پاریس لە ساڵی ١٨٥٣-١٨٥٤ بە شۆدزکۆی گوتووە ئێستا نالی لە دیمەشقە. ئەمەش ئەو ڕایە پشتڕاست دەکاتەوە نالی درەنگتر کۆچی دوایی کردبێ. هەر لەم بارەیەوە لە دیوانی نالی (ئاماژە بەوە کراوە (حاجی مەلا عەبدوڵای جەلی زادە (...) گێڕاویەتییەوە (...) کەوا لە ساڵی ١٢٨٨ (١٨٧١

— ١٨٧٢. ز) نالی لە مەکە بینیوە. کە دیویشیە زۆر پیر بووە.) (دیوانی نالی، مودەریس. ١٣٨٨. لا. ٢١)

ئەم روانینەش وێڕای جیاوازی بە ماوەیەکی کەم لەگەڵ ئەو سەرچاوە عوسمانییە تێکدەکاتەوە کە بە ناوی (عوسمانلی موئەلیفلەری) لە لایەن بورسەلی موحەمەد تاهیر ئەفەندی نووسراوە کە لە ساڵی ١٩١٥ بە سێ بەرگ بڵاوکراوەتەوە. گوایە نالی لە ساڵی ١٢٩٠ (١٨٧٣) لە حەج سەردانی ئەستەنبۆلی کردووە هەر لەو ساڵەدا کۆچی دوایی کردووە. بورسەلی دەڵێ: ((نالی مەلا خضر. ١٢٩٠-١٨٧٣. لە گوندەکی سولەیمانی لە دایک بووە. تەحسیل و تەربیەی خۆی لە سولەیمانی و قەزای قەرەداغ وەرگرتووە. لەگەڵ دیوانی خۆی بە کوردی بە هەر سێ زمان شیعری نووسیوە. لە ساڵی ١٢٩٠ (١٨٧٣) لە حەج دەگەڕێتەوە لە ئەستەنبۆل دەمێنێتەوە. شاعیران و زانایانی هاودەمی خۆی پێی سەرسام بوونە و گەلەک ڕێزیان گرتووە. دوای کەمێک وەفاتی کردووە، لە گۆڕستانی قەرەجە ئەحمەد نێژراوە.)) (لەوەندی ١٩٩٢. سوێد. لا ٥.)

بە پێچەوانەی تەواوی ئەم سەرچاوانەی سەرەوە، مەسعود محەمەد لە کتێبی (چەپکێک لە گوڵزاری نالی) بە درێژی باس لە ژیانی نالی دەکا و گومان لە هەموو سەرچاوە کوردییەکان دەکا چۆن بەو ئاسانییە دەڵێن نالی لە ١٨٠٠ یان لە ١٨٠١ یان لە ١٧٩٧ لە دایک بووە و لە ساڵی ١٨٥٥ دا کۆچی دوایی کردووە. بەپێی لێکدانەوەی هەندێ ئاماژەی لەم لاو لەولا، وەک ئەو بەڵگە کۆنکرێتیانەی لەسەرەوەش باسیان کراوە، وەک ئەمەی شۆدزکۆ، دیتنی نالی لە مەکە لە لایەن باپیرە گەورەی خۆی، لەو باوەڕەدایە نالی لە ١٧٩٧ لە سلێمانی لە دایک بووە لە ١٨٧٣ کۆچی دوایی کردووە، لەمەش پشتی بە سەرچاوەکەی بورسەلی بەستووە کە لە سەرەوە باسمان کردووە.[*] روانینەکانی مەسعود محەمەد تا رادەیەکی زۆر لەگەڵ ئەو بۆچوونەی ئێمە یەک دەگرێتەوە، نالی پێش مردنی سەردانی ئەستەنبۆلی کردووە، ئەوپەڕی ساڵێک لەو شارەدا ژیاوە و بەسەردا کۆچی دوایی کردووە، ئەگینا تەواوی ژیانی ئاوارەیی خۆی لە شام و مەکە بەسەربردووە.

بەڵام لە بارەی دەرچوونی لە سلێمانی، کە بۆ ئەم بابەتەی ئێمە بایەخی زۆرە، دەشێ نالی لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابان سلێمانی بەجێهێشتبێت.، واتە لە ساڵی ١٨٤٦. لەوانەشە کەمێک زووتر. هەروا دەبێ چامە شیعرییەکەشی لە کۆتایی ساڵانی پەنجاکان، زۆرتر ڕێی تێدەچێ لە ١٨٥٨ تا ١٨٦٠ بۆ سالمی نووسیبێ، بێگومان سالمیش بە ڕای سەجادی لە ساڵی ١٨٦٦ کۆچی دوایی کردووە. ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر گونجاوە. ئەو سەردەمەش شاری سولەیمانی تەواو هەڵکەوتی سیاسی و کۆمەڵایەتی تێکچووە و هەر لە ساڵی ١٨٥٢ ەوە دەستەڵاتی عوسمانی لێ جێگیر دەبێ، بەم جۆرە سەردەمی زێڕینی بابانەکان هەر لەو ساڵەوە کۆتایی هاتووە.

هەڵبەت نووسینی قەسیدەیەکی لەم جۆرە ناشێ لە تەمەنی ٣٥ ساڵیدا نووسرابێ وەک چۆن سەجادی بۆی چووە، هەروەها ناشبێ دوای یەک دوو ساڵ دوورکەوتنەوە نووسرابێ، دەبێ لە تەمەنێکی گەورەتر نووسرا بێ، چونکە لە شیعرەکەی نالی شەوق و سووتانێکی زۆر سەرنجڕاکێشی شیعری هەیە پێناچێ ئەم شەوق و سووتانە بە کاریگەری دوورکەوتنەوەی یەک دوو ساڵ دروست بێ. دەشێ ئەم قەسیدەیە بە لای کەمی دە تا پانزە ساڵ دوای دوورکەوتنەوە لە سلێمانی نووسرابێ. ئەمەش لەگەڵ ئەو گریمانەیە تێکدەکاتەوە کە نالی لە سەروبەندی دوورخرانەوەی ئەحمەد پاشا لە ١٨٤٦ یان زووتر لە ١٨٤٤ یان ١٨٤٥ لە سلێمانی دەرچووبێ، لە ساڵانی ١٨٥٨ بۆ ١٨٦٠ ئەم قەسیدەیەی نووسیبێ. پاشان ناوەڕۆکی قەسیدەکەی سالمیش گەواهی ئەوە دەدەن کە ئەم دوو قەسیدەیە لە دوای جێگیربوونی دەستەڵاتی تورکەکان لە کوردستان بە ماوەیەکی زۆر نووسراون، واتە زۆر درەنگ دوای ساڵی ١٨٥٢، چونکە سالم باس لە ئاشووبی تورکەکان دەکا لە سولەیمانی. بۆیە زیاتر ڕێی تێدەچێ لە کۆتایی ساڵانی پەنجاکانی سەدەی نۆزدەم نووسرابێ، ئەو سەردەمەش لەگەڵ عەشق و سووتانی نالی بۆ سولەیمانی و وەسفی سالم بۆ ئاشووبی تورکەکان لەم شارە تێکدەکاتەوە. بۆیە دەتوانین بڵێین نالی لە تەمەنێکی گەورە ئەم قەسیدەیەی نووسیوە، لە ١٨٥٨ بۆ ١٨٦٠. دەشێ کەمێک درەنگتریش بێ. ژیانیشی لە نێوان ساڵانی ١٨٠٠ تا ١٨٧٣ بووبێ. لە ساڵی ١٨٤٦ لەگەڵ

ئەحمەد پاشای بابان یان کەمێ زووتر لە سولەیمانی دەرچووبێ. جارێکی تر نەیتوانیوە بگەڕێتەوە.

بە پێچەوانەوە، حاجی قادری کۆیی ساڵی لەدایکبوونی دیار نییە. ((بە لای زۆربەی سەرچاوەکان حاجی قادر لە ساڵی ١٨١٦ یان ١٨١٧ لە دایک بووە، هەندێکیش پێیانوایە ساڵی ١٨٢٤ یان ١٨٢٥ لەدایکبووە. (بە رای ئێمە ئەمەیان دروستترە ئەگەر درەنگتریش نەبووبێ، پێدەچێ حاجی قادری کۆیی لە ساڵانی سییەکانی سەدەی نۆزدەم لە دایک بووبێ، لە هەموو حاڵەتێک ئەمەش وەک گریمانەیەک دەمێنێتەوە) ساڵی ١٨٦٣ یان ١٨٦٤ چۆتە ئەستەنبۆل. حاجی قادری کۆیی لە ساڵی ١٨٩٧ لە ئەستەنبۆل کۆچی دوایی کردووە. میقداد مەدحەت بەدرخان لە ژمارە ٣ی رۆژنامەی کوردستان ساڵی ١٨٩٨ دا دەڵێ حاجی قادری کۆیی ساڵی پار کۆچی دوایی کردووە، لە ژمارە چواریش قەسیدەیەکی ئەوی بە ناوی "زەمانە" بڵاوکردووەتەوە.)) (دیوانی حاجی قادری کۆیی. ٢٠٠٧ لا ١٨-١٩.)

سەرەڕای ئەم مەزەندەیەی ساڵی چوونی حاجی قادری کۆیی بۆ ئەستەنبۆل، هەرگیز بە تەواوی نازانین لە چ ساڵێک بە شێوەیەکی کۆنکریت لە دایک بووە و لە کۆیە دەرچووە، دەشێ لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی نۆزدەم یان زووتریش دەرچووبێ، دەشێ درەنگتر دەرچووبێ، دەبێ نووسینی ئەم قەسیدەیەش بە لای کەمی دوای پانزە ساڵێک بێت لە دوورکەوتنەوەی لە کۆیە، چونکە ئەم وەسف و شیعرییەت و ئەم داڕشتنە هونەرییە، هەروەکو ئەمەی نالی، سووتان و شەوقێکی لە بن نەهاتووی تێدایە بۆ وڵات، لەگەڵ ئەو پچڕانە جوگرافی و زەمەنی و دەروونییە دەگونجێ. ئەوان هەستیان کردووە ئەو غوربەتەی تێیدا ژیاون دوای ئەو زەمەنە زۆرە، یاداشتی خاکی دایک وردە وردە خەریکە دەسڕێتەوە و نامێنێ، هەستی غەریبی و غوربەت وەک وزەیەکی دینامیکی خەیاڵی شیعری ئەوان داگیر دەکا، لێرەوە گەڕانەوە بۆ ئەم خاکە، بۆ ئەم نیشتمانە، سەرەڕای هەموو خەوشێک، شێوەی وڵاتی خەونەکان و وڵاتی دڵخواز، ئەو وڵاتەی ئەوان بۆی وێڵن وەردەگرێ، دواجار ئەم وڵاتە تەنیا خۆی لە ناو زمان بەرجەستە دەکاو هەر لە ناو زمانیشدا دەمێنێتەوە، ئەمەش بۆ

خۆی هەڵکەوتێکی گەڕانەوەی مەجازییە بۆ وڵات و بۆ سەردەمی ژیان و منداڵی. ژیاندنەوەی رابردوو، رابردوویێکی ئاشنا و لەدەستچوو و وەستاو، کە هەردەم وەک هێڵێکی سەرەکی لە ئەدەبی مەنفا دێتە بەرچاو، لە ناو زمان، بە کاری ئەدەبی و هونەری، هەوڵێکە بۆ بەدەستهێنانەوەی، ئەمەش وەک ژیاندنەوەیەکە کە هەردەم هەڵکەوتێکی هەیە رووی لە ئایندەیە، چوون بەرەو ئایندە.

### دوو قەسیدەکەی نالی و حاجی قادری کۆیی- شیکردنەوە:

کێشەی سەرەکی زمان و سترەکتوری شیعر و شیعرییەتی نالی و حاجی قادری کۆیی راستەوخۆ دەمانباتەوە بۆ سەر کێشەی جیاوازی و تایبەتمەندییەکانی نێوان "هونەری شیعر Poesie la" و "شیعر [*] " Vers و شیعری مەنزوم poétique کە دەشێ وشەی "شیعری مەنزوم یان هۆنراوە- نەزم"یشی بۆ دابنێین. لەم رووەوە ئەزموونی نالی زیاتر "شیعر"ە، هەرچی هی حاجی قادری کۆییە زیاتر شیعری مەنزوم یان هۆنراوەیە. ئەم دوو ئەزموونە زۆر لێک جیاوازن، هۆکاری سەرەکی ئەمەش بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ خاسیەت و تایبەتمەندی تەعلیمی (بە هۆی ناوەڕۆکی سیاسی یان نیشتمانی) شیعری حاجی قادری کۆیی، بەو مانایەی شیعرییەتی حاجی قادر لەسەر شیعرییەتێکی پڕ — Poéticité Intégrale دانەمەزراوە، بەڵکو ئامانجی شیعرییەتی ئەو: مێژوو، بووژانەوەی میللی و زیندووبوونەوەی نەتەوایەتی بووە، ئەم سیفەتە تەعلیمییە لە شیعری نالی بوونی نییە، نالی پێش ئەوەی مەلا یان کوردپەروەر بووبێ شاعیر بووە، حاجی قادر پێش ئەوەی شاعیر بێ رابەرێکی میللی و مەدەنیخواز بووە. شیعری حاجی قادری کۆیی وەک فۆرم شیعرە و هەموو خاسییەتێکی شیعری کێش و سەرواداری vers rytmique هەیە، هەر لەم خاڵەشدا بە تەنیا لەگەڵ نالی بەشداری لەو شیعرییەتەدا دەکات، لە رووی دووەمەوە وەک خەیاڵ و ئەندێشەی شیعری کە لە شیعردا جێگای تایبەتمەندی خۆی هەیە دوور دەکەوێتەوە لە نالی. بەڵام حاجی قادر تەنیا لەم چامەیە (وتم بە بەختی خەواڵوو...) لە چوارچێوەی "شیعری مەنزوم و هۆنراوە" دەرچووە و

دێتە ئاست و پایەی شیعرییەتی نالی کە ئێمە بە "شیعرییەتی پڕ" ی دادەنێین. هۆکاری ئەمەش بە پلەی یەکەم ناوەڕۆکی ئەم چامەیەیە کە تێمی سەرەکی مەنفایە و وەسفی جیهانێکی لەدەستچوو و ئاشنا دەکا، کە شوێنی جیهانی منالّی و گەورەبوون و لە دایکبوونە، شاعیر ئەوەندە بە جوانی باسی ئەم شوێنە دەکا وەک جیهانێکی بێوێنە و یۆتۆپیایەک دێتە بەرچاو، ولآتی خەون و ولآتی دلّخواز، بەهەشت، شاعیر شەوق و سووتانێکی ئێجگار مەزنی تێدایە بۆ بینین و گەڕانەوە و نیشتەجێبوون لەم جیهانە. بەلآم کە ئازارەکانی رابردووی بە بیردێتەوە و هوشیار دەبێتەوە و هەست بەو دابڕان و پچڕانە زەمەنی و روحییە دەکا، ولآتی دلّخواز بە "جابولقا" دەچوێنێ، گەڕانەوە بۆی بێسوودە، چونکە جارێکی دیکە سەرلەنوێ دەبێ لێی دووربکەوێتەوە و بکەوێتەوە مەنفا.

بە گشتی لەم چامەیە شاعیر بە تەواوی کەسێکی مەنفی و دوورخراوەیە، لە خۆ بێگانەبوون و لەدەستچوونی یاداشت و بێ ناسنامەیی هەستی پێدەکرێ. هەموو ئەم تایبەتمەندییە، لەگەڵ لایەنی "فۆنیکی Phonique " کە هونەری داڕشتنی قەسیدەکەیە، مەزنی ئەم چامەیە پیشان دەدا وەک " قەسیدەیەکی پڕ Poème Intégrale "ی سەر بە شیعری پڕ Poésie Intégrale.

بۆ زیاتر روونکردنەوە و تێگەیشتن لە جیاوازی و تایبەتمەندییە شیعرییەکانی نالی و حاجی قادری کۆیی، پشت بە شیکردنەوە و لێکدانەوەی "ژان کۆهێن" دەبەستین کە لە کتێبە بە ناوودەنگەکەی "سترەکتوری زمانی شیعری Structure du langage poétique ، "بنچینە تیۆرییەکانی زمانی شیعری" داڕشتووە. ژان کۆهێن باس لە سێ جۆر شیعر "قەسیدە" دەکا:

١- قەسیدەی پەخشانی Poème en prose (دەشێ پەخشانە شیعریش گونجاو بێ.)

٢- پەخشانی کێش و سەروادار Prose versifié (یان شیعری مەنزوم یان هۆنراوە)

٣- شیعری پڕ Poèsie Intégrale. (یان قەسیدەی پڕ.)

پاشان چوارەمیشی لە پەراوێزی ئەمانەوە بۆ زیاد کردووە ناوی ناوە:

٤- پەخشانی پڕ Prose Intégrale.

هەموو ئەم جۆرە قەسیدە و شیعرانە بە دوو تایبەتمەندی و خاسییەت، جیاوازییەکانی نێوانیان دەردەکەوێ و دەتوانرێ دەستنیشان بکرێن، ئەمانەش خاسییەتی:

١- فۆنیکی Phonique (دەنگ و ئاواز)

٢- سێمانتیکی Sémantique. (خەیاڵی شیعری، ناوەڕۆکی شیعری یان جیهانی قەسیدەکە)

سەرەنجام ئەم دابەشکردنە دەشێ بەم چەشنە لێکبدرێتەوە و تایبەتمەندیی جیاوازییەکان دەستنیشان بکرێن:

١- قەسیدەی پەخشانی (یان پەخشانە شیعر): دەشێ ناوی لێ بنرێ "قەسیدەی سێمانتیکی" لەبەر ئەوەی لایەنی فۆنیکی (دەنگ و ئاواز) پشتگوێ خراوە. نموونە وەک شیعرەکانی رامبۆ و لۆتریامۆن.

٢- پەخشانی کێش و سەروادار: دەشێ بە قەسیدەی فۆنیکی (خاوەن دەنگ و ئاواز)ی دابنێین کە ئەمەیان تایبەتمەندی سەرەکییە تێیدا. لایەنی سێمانتیکی نوقسانە. (واتە تەنیا وەک فۆرم شیعرە: (شیعری مەنزوم یان هۆنراوەیە.)

٣- شیعری پڕ: Poésie Intégrale ، دەشێ ئەمە ناوی لێ بنرێ شیعری سێمانتیکی و فۆنیکی، چونکە وەک خەیاڵ و وەک زمان هەموو تایبەتمەندییەکی شیعری تێدایە، خەیاڵ و ئەندێشە و ئاواز و دەنگ و کێش و ریتم و سەروا...، هتد.

٤- پەخشانی پڕ Prose Intégrale ، ئەمەش ئەو جۆرە پەخشانەیە وەک شیعری پڕ هەردوو خاسیەتی هەڵگرتووە سێمانتیکی و فۆنیکی. نموونە وەک پەخشانەکانی بۆدلێر. (Jean Cohen. 1966. p. 9-10.)

بەپێی ئەم دابەشکردنە ئەزموون و شیعر و شیعرییەتی نالی دەچێتەوە سەر جۆری "شیعری پڕ" یان "قەسیدەی پڕ" کە هەموو تایبەتمەندییەکی شیعری تێدایە، وەک خەیاڵ و زمان لەسەر ئاستی سێمانتیکی و فۆنیکی، واتە وەک خەیاڵ و وەک داڕشتنی شیعری یان هونەری شیعری. ئەمەش هەرە باڵاترین جۆری شیعر و شیعرییەتە کە تا ئێستا لە مێژووی شیعر و ئەدەب پێی

گەیشتبین. بە پێچەوانەوە، تایبەتمەندی و خاسییەتی شیعری حاجی قادری کۆیی بەرامبەر بە جۆری دووەم دەوەستێ کە "پەخشانی کێش و سەروادارە" یان قەسیدەی فۆنیکییە کە لایەنی سێمانتیکی نوقسانە، (واتە لە رووی خەیاڵ و ناوەرۆکەوە شیعری نییە بەڵکو تەنیا وەک هۆنینەوە شیعرە: (شیعری مەنزوم یان هۆنراوە) هۆکاری ئەمەش لە چاو ئەزموونی نالی، دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندی و خەسڵەتی تەعلیمی شیعری حاجی قادری کۆیی، کە هەروەکو لەسەرەوە گوتمان ئەو پێش ئەوەی شاعیر بێ رابەرێکی میللی و مەدەنیخواز بووە، بەڵام نالی پێش ئەوەی مەلا و رۆشنبیر بووبێ، شاعیر بووە. هەر ئەم لاسەنگیەشە لە شیعری حاجی قادر رێگای ئەوەی پێ نادا بچێتە ئاست و جۆری "قەسیدەی پڕ یان شیعری پڕ — واتە لایەنی فۆنیکی و سێمانتیکی هاوتای یەکتربن". لەم بارەیەوە ژان کۆهێن دەڵێ بەرهەمهێنانی شیعری پڕ یان قەسیدەی پڕ لەسەر دوو ئاستی زماندا دەکرێت: ( ئاستی فۆنیکی و ئاستی سێمانتیکی، بێگومان ئاستی سێمانتیکی بە پەلی یەکەم دێ لە دیاریکردنی شیعرییەتی هەر قەسیدەیەک، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە پەخشانە شیعر یان قەسیدەی پەخشانی تەنیا وەک شیعری مەنزوم یان هۆنراوە یان نەزم" هەیە بەڵام شیعری Lettriste [(*)] تەنیا وەک ئاواز بوونی هەیە، شیعری پڕ دەتوانێ بەسەر ئەم جۆرە "هۆنراوەیە" تێپەڕێ، چونکە هونەرێکی کامل و پڕ ئەبێ هەموو سەرچاوە و ماتەریالی پێکهاتەکانی خۆی بەکاربهێنێ.) ( ( Jean Cohen. 1966. P. 52)) سەرەنجام لە ئەزموونی حاجی قادری کۆیی کێشەی خەسڵەت و تایبەتمەندی تەعلیمی رێگای پێی نادا لەم پڕی و کاملییە وەک ژان کۆهێن دەیڵێ نزیک بێتەوە، ئەم خەسڵەتە بەسەر تەواوی شیعر و ئەزموونی شیعری حاجی قادری کۆیی زاڵە، بەڵام ئەو لە قەسیدەی (وتم بە بەختی خەواڵوو...) لەم لێکدانەوەیە دەردەچێ و وەک (ریزپەڕییەک) هاوتا لەگەڵ نالی هەنگاو دەنێ، خەسڵەتی سەرەکی ئەم قەسیدەیە: شیعرییەتی پڕ و قەسیدەی پڕە کە لە رووی سێمانتیکی و فۆنیکی هاوسەنگە و دوورکەوتنەوەیە لە تەنیا سیفەتی هۆنینەوە (شیعری مەنزوم یان هۆنراوە) ئەمەش بەو کاریگەرییە کە هەموو ناوەرۆکێکی سیمانتێکی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە و وەزیفەکەی بۆ خۆیەتی و لەگەڵ

لایەنی فۆنێکی تێکدەکاتـەوە. بـەڵام ئـەزموونی نـالی بـە گشـتی دەکەوێتـە بـەر جۆری "قەسـیدەی پـڕ" بـەڵام ئەمـەش مانـای ئـەوە نییـە نـالیش لـە یـەک دوو قەسیدە لەم تایبەتمەندییەی خۆی دەرنەچووە.

حاجی قادری کـۆیی بـە چەشـنێک وێنانـدنی وڵاتـی کـردووە، وەک وڵاتـی خەون و یۆتۆپیا دێتە بەرچاو، پڕە لە هێزێکی خۆشەویستی دەگمـەن و پـڕ لـە وزە و شەوق و سووتان، بەڵام شەوق و سووتانێکیشە لە هەمان کات بۆ زەمەن و سـەردەمێکی لـە دەسـتچوو، فـەزا و خـاکێکی لـە دەسـتچوو کـە گەڕانـەوەی مەحاڵـە، ئـەم مەحاڵـەش خـۆی لـە خۆیـدا چارەنووسـی شـاعیر خۆیـەتی، لـە بنچینـــەدا هەوڵێکـــە بـــۆ رزگـــاربوون لـــە دڵەڕاوکـــە و نیگـــەرانی، نیگـــەرانی بەجێهێشتنی ئەم جیهانە سەرسوڕهێنەرە، ئەم فەزا و جوگرافییە پڕ لە خەونـە، کە ئەو رۆژگارێک تێیـدا بەختـەوەر بـووە. لـەم قەسـیدەیە هەسـت بـە پچـڕان و دابڕانێکی پڕ لە ئازار دەکەین کە ئەمـەش لـە خۆیـدا هەڵکـەوت و میتافیزیکـای مەنفایە، وێڵبوون لە نێوان ئاشنا و نائاشنا. وەسـفی لەخۆبێگانەبوونـە، شـاعیر هەموو وەسفەکانی خۆی بە سێ هەنگاو داڕشـتووە، هـەنگـاوی یەکـەم: وەسـفی وڵاتی لەدەستچووە کە لە شێوەی خەون و یۆتۆپیا باسـی دەکـا. ئـەم وەسـفەی حاجی قادر وەک وەسـفەکەی شـاعیر شـارل بـۆدلێر —ە لـە قەسـیدەی (داوەت Invitation) کە باس لە وڵاتی کۆکان Cocagne دەکا، وڵاتی خـەون و ئاواتـەکان و ئارەزووەکـان، کـە هەمیشـە مـرۆڤ بـە دوایـدا وێڵـە، هـەرچی ئەمـەی حـاجی قادرە، سیفەتی مەنفای زیاترە، ئەگەرچی لەمەی بۆدلێریش هەسـت بـە مـەنفای مەجازی دەکرێ، بەو مانایەی مرۆڤ لەم جیهانە هەردەم وێڵە و لـە مـەنفایـەکی وجودیدا دەژیێ، بەڵام ئەمەی حاجی وێنەی خاک و دایک و وڵاتی دڵخـواز و لـە دەسـتچوونی رۆژگـاری منالّییـە، لـە لایـەکی تـرەوە وەک یاداشتێکیشـە بـۆ ناسنامەیەک کە حاجی قـادری کـۆیی بـۆی گـەڕاوە و لـە نەبوونیـدا هەسـتی بـە حرمانێکی زۆر کردووە. پاشان هـەروەکو لـە روانینەکـەی فرویـددا هـاتووە، لـەم قەسیدەیەدا شاعیر باس لە جیهانێکی ئاشنا دەکا لە ناو فەزایەک کە مەنفایە و ئەو لێی نائاشنایە، شاعیر هێشتا لە نـاو فـەزا نائاشـناکە جێگیـر نـەبووە، وەک پرۆسەیەک ئەم کردەیە هێشتا بەردەوامە. لە لایەکی ترەوە، ئەم وەسفە پـڕ لـە

شیعرییەتە کە بە رای ئێمە وەسفێکە هیچ خەسڵەتێکی رۆمانسییانەی نییە، بەڵکو وەک خەسڵەتێکی واقیعی و زۆر باڵا دێتە بەرچاو، چونکە ئەو باس لە جوگرافیا و فەزایەکی ئاشنا دەکا هەوڵی داوە بە شێوەیەکی پڕ لە غەرابەت Exotique باسی بکا و بینرخێنێ. پاشان شاعیر بە شێوازێکی زۆر نوێ وەسفەکانی داڕشتووە کە بە شێوەی وەسفی ئینتیباعیە – ئەمپرێسیۆنیزمی Description Impressioniste، وەک وێنەکێشانی پانۆرامایەک دێتە بەرچاو بەڵام بە وشە و وەسفی شیعری، وێنەکێشانی تابلۆیەک بە وشە، شاعیر باس لە جیهانێکی زۆر ئاڵۆز دەکا، ئەم جۆرە وەسفەش وەک ئەوە دێتە بەرچاو، شاعیر توانای بەسەر ئەو ئاڵۆزییە شکاوە باس لەو جیهانە ئاشنایە دەکا "دیمەنی پانۆرامای بەرامبەری"، وێڕای وردەکاریی: (پێکهاتەکانی بریتین لە رووناکی و سێبەر و خاک بە هەموو پێکهاتەکانی، چیا و دۆڵ و دەشت و با و ئاو و خۆڵ و تیشک و هەورە تریشقە و بۆران و ئاسمان... پەیوەندییە ئینسانییەکان وەک ئەشک و غوربەت و بۆن... دێهاتی و راوکەر و ئەسپ... رەنگەکان...هتد) و ریتمێکی خێرا، دیمەنێکی گشتی ئەو پانۆرامایە پێشکەش بکا بێ ئەوەی هیچ بەجێبهێڵێ. ئەمەش ئەو توانا مەزنەی شاعیرە کە توانیویەتی بە وشە و وەسفی شیعری، ئینتیباعێکی گشتی پڕ لە شیعر بۆ وڵاتی خەون و وڵاتی دڵخواز و لە دەستچووی خۆی پێشکەش بکا، لە بنچینەدا ئەم وەسفە وەسفی مەزنی دابڕان و پچڕانی دەروونی شاعیرە، وەسفی ئازاری شاعیر خۆیەتی، وەسفی ئازار و دوورەوڵاتییە، وەسفی شەوق و سووتانی شاعیرە، وەسفی گەڕان و وێڵی شاعیر خۆیەتی کە هێشتا جێگیر نەبووە لە ناو نائاشنایی، بەڵام جیهانی ئاشنای لەدەستچوو وەک سەرچاوەی جیهانێکی نهێنی وایە بۆ شاعیر، مەڵبەندی هەڵقوڵانی خەیاڵ و ئەندێشە، هەوڵیداوە لەوێوە ئەو جیهانە سەرلەنوێ داڕێژێتەوە. لێرەوە هەنگاوی یەکەم تەواو دەبێ. هەنگاوی دووەم: وەک دەرهاتنە لە ناو خەیاڵی شیعری و شاعیر پرسیار دەکا. ئەمەش وەک هوشیاربوونەوەیەک وایە بەسەر هەستی پچڕان و دابڕانی شاعیر، بەسەر جیهانێک کە ئیتر لە دەستچووە، شاعیر بە راستی هەست بە برینەکانی مەنفای خۆی دەکا. هەست دەکا ئەوەندە دوور کەوتۆتەوە، هیچ ئاشنایەتیەک ئیتر

نەماوە، گەڕانەوەی بۆ ئەم جیهانە بێ سوود دەبینێ، وەک ئـەوە وایـە جـارێکی تر بچێتەوە مەنفا و ڕووبەڕووی نائاشنایی ببێتەوە، جارێکی دیکە بکەوێتەوە ناو لەخۆبێگانـەبوون و دڵەڕاوکـەی تـر. حـاجی قـادر زۆر بـە جـوانی وەسـفی ئـەم هەستەی خۆی کردووە:

**کە بێی و بچیەوە ئێستا کە ئەننە دیسان**

**سەفەر دەکەی لە وەتەن دەچیە شاری جابولقا.**

لێرەوە جابولقا بۆ خـۆی جیهـان و ڕەمـزی وڕێنەیـە، جیهـانی بێهوودەیـە، جابولقا شارێکی خەیاڵییە لـە داسـتانی "هـەزار و یـەک شـەوە" تـەنیا وەک نـاو هەیە، شوێنێکی نادیار و نەناسراوە و بوونی نییە. ئەم شوێنە نەناسراوە هەمان مەنفایە، جیهانی نائاشنا، جیهانی سەرگەردانی. بەم پێیە شوێنی مەنفا هاوتـای جابولقایـە، شـاعیر هـەر لـەوێوە پلانـی گەڕانـەوەی هەیـە بـۆ وڵات، بـەڵام ئـەو گەڕانەوەش وەک سەرهەڵگرتنێکی تر بۆ وڵاتی وڕێنە دەبینێ، بۆیـە پێیوایـە بـۆ ئەو پاراستنی ئەو جیهانـەی رابـردوو لـە نـاو شـیعر و زمـان کـە هاوتـای وڵاتـی دڵخوازن هیچ جیاوازییەکی نییە. لێرەشەوە هەنگاوی سـێیەم دەسـت پێـدەکات. ئەم هەنگاوەش، زیاتر وەسفێکی ئاساییە و وەک ئارامبوونەوە و کۆتایی هێنانـە بە داستانەکەی خۆی لە نێوان جیهانی ئاشنا و نائاشنا کە مەنفای شاعیرە.

بە سەرنجدان لە شیعرییەتی ئەم قەسیدەیە، ئـەوەی زۆر گرینگـە، جێگیـر بوونی شاعیرە لە ناو زمان، زمانی دایک کە هەمان خـاک و جوگرافیـا و فـەزا و ڕۆژگاری لە دەستچووە. دواجار زمان بۆتە مەنفا و دوا پەناگای شاعیر و وڵاتـی دڵخواز. هەست دەکەین شاعیر بەرامبەر بەم ڕوانینە هەسـتیار بـووە، زانیویـەتی دواجار شوێن و پەناگای جێگیری ئەو، ئەو زمانەیە کە هەستی پچڕانـی مـەنفای خۆی پێ دەربڕیـوە. زمـان و زەمـەن بـۆ کـاری ئـەدەبی وەک یـەک وان، ئـەوان بوونێکیان هەیە تەنیا دواجار لەسەر ئەم ئاستەدا دەمێننەوە، ژێـرار ژێنێـت لـەم بارەیەوە دەڵێ: (شێواز و بوونی کاری ئەدەبی بە شێوەیەکی جەوهەری لەسـەر ماهیەتی زەمەنییە.) ((Gentte. 1969. P. 127))

بێگومان هەمان لێکدانەوە بۆ قەسیدەکەی نالیش ڕاستە، بـەڵام ئـەزموونی نالی زۆر لەسەرەوەی ئەمەی حاجی قادرە. قەسـیدەکەی نـالی سـەر بـە خـەیاڵ

(سێمانتیک) و هونەرەکانی شیعر (فۆنیکی)ی یەکانگیر و پڕە. لەم نێوانەدا هەست بە هاوسەنگی و گونجانێکی نایاب دەکەین. بەرزیی ئاستی خەیاڵ و زمانی هونەری نالی وێڕای سووتان و شەوقێکی زۆری بۆ وڵات، قورسایی یاداشت و ئازاری وڵات کە هەمان ئازاری مەنفایە، هەموو ئەمانە بە ریتمێکی سادە و هونەری و داڕێژراوە و هەست بەو ریتمە خێرایە ناکەین کە لە لای حاجی قادر هەیە، پاشان نالی هەمان شێوازی ئەمپرێسیۆنی — ئینتیباعی بەکارنەهێناوە وێنەی تابلۆ و دیمەنی وڵات بکێشێ بە وشە، بەڵکو ئەو راستەوخۆ لە دیمەنێک بۆ یەکێکی تر، لە شتێک بۆ شتێکی تر دەچێ، ئەو لەگەڵ با و بە ریتمی با قسە دەکا، با شوێنی شاعیری گرتۆتەوە و دەگەڕێتەوە وڵات، ئەو بایە هەر رۆحی شاعیر خۆیەتی، رۆحی شیعری و خەیاڵی شیعری شاعیر خۆیەتی، رایسپاردووە بگەڕێتەوە وڵات و رۆژگاری بەسەرچوو. بگەڕێتەوە بۆ ناو رابردووی وەستاو و دیمەنە کۆنەکانی سەردەمی لاویی خۆی، جیهانی ئاشنا. ئەمەش لە بنچینەدا هەر وەسفی مەنفای شاعیرە. لە وەسف و پێچواندنەکان و هونەرەکانی شیعر و شیعرییەتی نالی و رەوانبێژی و روونبێژییەکەی، هەست بە توانا و شارەزاییەکی بێهاوتا و بێنموونە دەکەین، پاشان هەست بە هەستیارییەکی زۆر دەگمەن دەکەین کە شاعیر وێنەکانی بە شێوەیەکی ئەبستراکت و زۆر باڵا داڕشتووە. وێنە و بەرجەستەی با وەک پێچواندنێک رەمزی بەردەوامی ئەبەدییەتە، با رەمزی دڵەڕاوکە و نیگەرانیشە، رەمزی توخمێکی بنچینەیی ژیان و گەردوونیشە، با واتە جوولە و بزووتنەوە. هەردەم لە داهێنانی [*] ئەدەبی و هونەری سوودی لێ وەرگیراوە، لە لای زۆر لە شاعیرانی گەورە وەک وێنەیەکی رەمزی و پێچەوانەوە وەرگیراوە، بە تایبەتی لە لای شاعیرانی رۆمانسی، با هاوتای هەموو بزووتنەوەیەکی کۆسمیکییە، سەرچاوەی جوولە و دینامیزمی گەردوون و بوونە. لە ئەدەبیاتدا بە گشتی و لە شیعردا بە تایبەتی باو بۆران و گەواڵە و هەوا و هەموو توخمە نزیکەکانی وەک رەشەبا و شەماڵ و کزەبا و نەسیم، هەورەتریشقە، تۆفان و هتد... بزوێنەری خەیاڵ و ئەندێشەی مرۆڤن، بۆیە هاوتای جوولە و بزووتنەوەن. با هەڵکەوتێکی کۆسمیکی هەیە و بۆ خۆی هەیە لە خۆیدا پەیدا دەبێ، تەنیا ئەو کاتانە فۆرم

وەردەگرێ کە بەر شتێک دەکەوێ وەک تۆز و غوبار. با هەردەم وەک بوونی ئینسان دێتە بەرچاو، وەک روح و هەناسە. ((با بۆ جیهان، هەناسە بۆ ئینسان، درێژبوونەوەی شتە بێ پایانەکانە، هەموو ئەمانە ئینسان هەڵدەگرن وای لێ دەکەن لە هەموو هێزەکانی گەردوون بەشداری بکەن. (...) هەوا، بەرزی، رووناکی، بای بەهێز و کزەبا، شەماڵ و سروە، با وەک هەناسەیەکی پاک بێگەرد و بە توانا، هەموو ئەمانە تێکەڵن یان تێکەڵ دەبن بە مێتافۆرە شیعرییەکان.)) (Bachelard. 1990. P. 272-273)

کێشەی با پەیوەندی راستەوخۆشی بە فەزا و دیمەنی بۆشایی و درێژبوونەوەی فەزا Etendue هەیە، لە بنچینەدا پەیوەندی سەرسامبوونی ئینسانە بە فەزا و بۆشایی کە با یەکێکە لە پێکهاتەکانی، ئەم بایەش هەمان بای هەناسە و ژیانە کە وێناندن و بەرجەستەی هەیە لە کاری ئەدەبی، لەم بارەیەوە ژێرار ژێنێت دەڵێ (جۆرێک لە هەستیاری بەرامبەر بە فەزا هەیە، یان باشتر جۆرێک لە سەرسامبوون بە شوێن هەیە، ئەمەش یەکێک لەو رووە جەوهەرییانە کە پۆل ڤالێری ناوی لێ دەنێ " حاڵەتی شیعری Letat poétique، لێرەوەیە کە خەسڵەتەکانی فەزا دەتوانن شوێنێک داگیربکەن [*] یان لە ناو کاری ئەدەبی نیشتەجێ بن...) ((Genette. 1969. P. 44)). لە لایەکی ترەوە ئەم کێشەیە گرێدەداتەوە بە زمان و زمانی ئەدەبی، ئەمەش هەر دەمانگەڕێنێتەوە بۆ کاری ئەدەبی لەمەڕ پەیوەندی بە فەزاوە کە با یەکێکە لە پێکهاتەکانی دەڵێ: (پێش هەموو شتێک فەزایەکی سەرەتایی یان فەزای یەکەمین و جەوهەری هەیە کە بە چەشنێک ئەو فەزایە زمان خۆیەتی. گەلێ جار تێبینی ئەوەمان کردووە کە پێدەچێ زمان بە شێوەیەکی سروشتی توانای تەعبیرکردنی زۆرتر بێ لەو پەیوەندییە کە لەگەڵ فەزادا هەیە وەک لە هەر پەیوەندی و شتێکی تر...) ((Genette. 1969. P. 44))

لەم پەیوەندییەدا با وەک ئەو زمانە و فەزای گەردوونی دێتە بەرچاو، دیاردەیەکی دینامیکی و بەردەوامی گەردوونییە و لە پەیوەندییەکی یەکانگیردایە لەگەڵ ئینسان، تێکەڵبوونی بە خەیاڵی شاعیر نالی هەر ئەو دینامیکییە خەیاڵییە و ئەو هەستە پڕ لە جوانی و سووتانە پیشان دەدەن، کە

شاعیر وەک کەرستەیەک پەنای بۆ بردووە. پاشان قورسایی و بارگرانی مەنفا و دابڕانی لە خاکی دایک بەرامبەر بە ناسکی جیهانی شیعری و دەروونی شاعیر دەوەستێتەوە، ئەم دووە هاوتای یەکن و یەکتری تەواو دەکەن.

سەرەنجام ئەم بایەی نالی هەمان روح و هەناسەی خۆیەتی، دینامیکی ئەندێشەی ئەوە ناوەندی خەیاڵی شیعری و وێنەکانی داگیر کردووە، نالی هەموو خۆی داوەتە دەستی بیگەڕێنێتەوە ناو ئاشنایی و ناو جێگیری. تەواوی قەسیدەکە لەسەر ئەم لایەنە جوانیناسییە داڕێژراوە، مەزنی ئەم قەسیدەیەش هەر بۆ ئەم لایەنەی دەگەڕێتەوە کە تەواوی ساختمانی قەسیدەکەی داگیرکردووە.

لە دواین دێڕەکانی پرسیاری ئەوە دەکا ئایا بواری ئەوە هەیە بگەڕێتەوە یان دەبێ چاوەڕێ بکا تا ئایندەیەکی دووری نادیار (یەومی نەفخی سوور)، مەبەست لەمەش رۆژی زیندووبوونەوەیە کە رۆژێکە دیار نییە کەیە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەو پچڕانە مەزنەیە کە مەنفا هەیبووە لەسەر شاعیر، پچڕانێکی برینداکەر و پڕ لە تراژیدی. دواجار مەزنیی ئەم لەدەستچوونە بە بیناسازییەکی خەیاڵی پڕ لە شەوق و سووتان بەرجەستەکراوە، ئەمەش هەمان ئەو بیناسازییەیە کە شاعیر لە ناو زمان و بە زمان دایڕشتووە کە دواجار بە شێوەیەکی مەجازی شێوەی وڵات دەخاتە روو، وڵاتی لە دەستچوو، بەڵام ئەم وەسفی وڵاتی لەدەستچووە، بە سەرنجدان لە هەستیاری و هونەر و دنیابینیی نالی دوا پەناگەی شاعیرە کە زمانە.

سەرەنجام ئەم دوو مەنفایە وەک تراژیدیایەک و وەک بەرجەستەکردنێک لە ناو زمان و فۆرمی شیعری درێژە بە خۆیان دەدەن. سەیرکردنەوە و دواندنە لەگەڵ "خۆ- خود- زات" پشکنینی ناوەوەیە، گەڕانەوەیە بۆ ناوەوە، دواجار خۆیان لە فۆرمی وڵات و پەناگا و گەڕانەوەی ئایدیالی دەنوێنن.

**چامەکەی نالی**

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور
وەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور

ئەی لوتفەکەت خەفی و هەوا خواهـ و هەم دەمە
وەی سروەکەت بەشارەتی هەر گۆشەی حوزوور
ئەی هەم میزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان
تۆفانی دیدە و و شەرەری قەلبی وەک تەنوور
گاهێ دەبی بە ڕەوح و دەکەی باوەشێنی ڕۆح
گاهێ دەبی بە دەم، دەدمێنی دەمی غوروور
مەحوی قەبووڵی خاتری عاتر شەمیمتە
گەردی شەماڵ و گێژی جنووب و کزەی دەبوور
سووتا ڕەواقی خانەی سەبرم وەکو دەروون
نەیماوە غەیری گۆشەی زکرێکی یا سەبوور
هەم هەم عنانی ئاهم و هەم هەم ڕکابی ئەشک
ڕەحمێ بەم ئاهـ و ئەشکە بکە، هەستە بێ قسوور
وەک ئاهەکەم ڕەوان بە هەتا خاکی کۆی یار
وەک ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی "شیوەسوور"
بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کەدووراتی سەر زەمین
شادبن بە وەسڵی یەکدی، کە تۆی تاهر ئەو تەهوور
ئەمجا مەوەستە تا دەگەییە عەینی سەرچنار
ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنوور
چەشمەیێکە میسلی خۆر کە بە سەد جێ لە ڕۆشنی
فەورانی نووری سافە لەسەر بەردی وەک بلوور
یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا
ئەستێرەکانی رادەکشێ وەک شهابی نوور

یا چەشمەساری خاتری پڕ فەیزی عارفە
یەنبووعی نووری دا دەڕژێنێ لە کێوی توور
دەم وت دووچاری خۆمە ئەگەر "بەکرەجۆ"ی ئەشک
نەبوایە تیژ و بێ سەمەر و گەرم و سوێر و سوور
داخل مەبە بە عەنبەری سارای "خاک و خۆڵ"
تاکوو نەکەی بە خاکی سولەیمانییا عبوور
یەعنێ ریازی رەوزە کە تێدایە چەند دەمێ
مشکین دەبێ بە کاکۆڵی غیلمان و زوڵفی حوور
شارێکی پڕ کەرەم و عەدل، لە جێگایەکی خۆش و نەرم
بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شاری شارەزوور
خاکی میزاجی عەنبەر و داری رەواجی عوود
بەردی خەراجی گەوهەر و جۆباری عەینی نوور
شامی هەموو نەهار و فسووڵی هەموو بەهار
تۆزی هەموو عەبیر و بوخاری هەموو بخوور
ئەهلێکی وای هەیە کە هەموو ئەهلی دانشن
هەم نازمی عقوودن و هەم نازری ئوموور
سەیرێ بکە لە بەرد و لە داری مەحەڵلەکان
دەورێ بدە بە پرسش و تەفتیشی خوار و ژوور
داخۆ دەروونی شەق نەبووە پردی سەرشەقام؟
پیر و فتادەتەن نەبووە داری "پیرمەسوور"؟!
ئێستەش بە بەرگ و بارە عەلەم داری "شێخەباس"
یا بێ نەواو بەرگە گەڕاوە بە شەخسی عوور؟

ئایا بە جەمع و دائیرەیە دەوری "کانی با"
یاخۆ بووە بە تەفرەقەو و شۆڕش و نشوور؟
"سەیوان" نەزیری گونبەدی کەیوانە سەبز و ساف
یاخۆ بووە بە دایرەی ئەنجمی قوبوور؟

**ئێستەش پڕە لە ئاهووی بەڕ کانی ئاسکان**
**یاخۆ بووە بە مەلعەبەی گورگ و لوورە لوور؟**
**ئێستەش سروشکی عەشقی هەیە "شیوی ئاودار"؟**
**یاخۆ بووە بە سۆفی وشکی لە حەق بە دوور؟!**
**قەلبی منەووەرە لە حەبیبانی نازەنین**
**یا وەک سەقەر پڕە لە رەقیبانی لەندەهوور؟**
**داخۆ دەروونی سافە گوڕەی ماوە "تانجەڕۆ"؟**
**یاخۆ ئەسیری خاکە بە لێڵی دەکا عوبوور؟**
**سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو "خانەقا" بکە**
**ئایا رەبیعی ئاهووە، یا چایری ستوور؟**
**سەبزە لە دەوری گوڵ تەڕە وەک خەتی رووی یار**
**یا پووشی وشکی زۆرە وەکو ریشی "کاکەسوور"؟**
**دەست بەندیانە دێن و دەچن سەر و نارەوەن**
**یا حەلقەیانە وەک سۆفی مل خوار و مەندەبوور؟**
**مەیلێ بکە بە سەبزە درەختانی حەوشی مەدرەسە**
**ئەوراقیان مقدەمەی شینە، یا، نە سوور؟!**
**حەوزی پڕی کە نائبی دیدەی من لەوێ**
**لێڵاوی دانەهاتووی وەک سەیلی "شیوەسوور"؟**

**چاوێ بخە لە سەبزەی سێرابی دایرەی**
**جێ جیلوەگاهی چاوەکەمە، نەرمە یا نە زوور؟**
**ئێستەش کەناری حەوشە کە جێ بازی کەوشەکە**
**یاری تێدایە؟ یا بووەتە مەعرەزی نفوور؟**
**توخوا ! فەزای "دەشتی فەقیان " ئەمێستەکەش**
**مەحشەر میسالە؟ یا بووەتە چۆڵی سەلم و توور؟**
**واسڵ بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم**
**چی ماوە، چی نەماوە؟ لە هەیوان و تاق و ژوور**

ئەو غاری یارە ئێستە پڕ ئەغیارە یا نەخۆ
هەر غاری یارە؟ یا بووەتە غاری مار و موور؟
زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکو خەیاڵ
ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خوتوور؟
لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی قەهری هجرەتە
دڵ رەنگە بێ بە ئاو و بە چاوما بکا عوبوور !
ئایا مەجالی روخسەتە لەم بەینە بێمەوە؟
یا مەسلەحەت تەوەقوفە تا یەومی نەفخی سوور !
حاڵی بکە بە خوفیە کە ئەی یاری سەنگ دڵ
"نالی" لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور.

**گوتم بە بەختی خەواڵوو...**

**حاجی قادری کۆیی**

گوتم بە بەختی خەواڵوو بەسە ئەتۆبی خودا
لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا
گوڕەی بەهارییە ئێستێکە شاخ و داخی وڵات
پڕە لە لالە و نەسرین و نەرگسی شەهلا
لە گرمە گرمی سەحاب و لە هاژەی باران
چیایە پڕ لە هەرا و نواڵە پڕ لە سەدا
پڕە لە سەیل و لە گوڵاو و کانی رووی زەمین
پڕە لە بەرق و بریقەی برووسکە جەوی سەما
شکۆفە درهەمی شاباشی بایی وەعدە دەکا
لە شەوقی مەقدەمی خەملیوە دار و بەردی چیا
پیاڵەی زەڕی نەرگس لەسەر کەفی سیمین
پڕە لە شەبنمی وەک دوڕ و لوئلوئی لالا
گوڵیش بە پەنجەی فەیرووزە جامی یاقووتی
لە بۆ نیساری موهەییایە پڕ لە زەڕڕی تەڵا

لە شادی وەک سەفی شایی لە کێو و کەژ ئەزهار
هەژا بە خەڵعەتی گوڵگوون و کەوتە رەقس و سەما
چەمەن لە لالە میسالی خەتی روخی دولبەر
سیاهـ چادری لێ بۆتە خاڵی سەر گۆنا
لە کن بنەوشە و خاو و هەڵاڵ و بەیبوونی
هەڵاڵی پێستەیی خاوە عەبیر و موشکی خەتا
چیا لە تەوقە سەری داڕژاوە تا کەمەری
چو زولفی سونبولی دەرهەم چوو پەرچەمی بەڕەزا
بە جۆشی ئاگری گوڵناری کانی هەڵدەقوڵا
میسالی دیدەیی وامیق لە حەسرەتی عەزرا
قەڵابی زیوی ڕووخاوە هەرەس بە تۆپی نەسیم
سوپاهی لالە و گوڵ چادری لە جێ هەڵدا
لە گوڵەشینی کە قاز و مراوی دێن و دەچن
نەزیری ماهـ و ستارەن لە قولزوومی مینا
شنەی نەسیمە سەدای ئاوی سافی سەر قەڵبەز
بە ورشەورشی گیا شەنگەبی بووە شەیدا
لە پیرە پیڕ و لە سمکۆڵی پیرە گا کێوی
دەلەرزێ گاوی زەمین و دەترسێ گاوی سەما
لە دەنگ و دووکەڵی شینی تفەنگی نێچیرەوان
میسالی سونبولی زوڵفی کە تێک بچێ بە سەبا
چیایە شێخ و کەوای سەوزە مێزەری بەفرە
سیواکی چووزەرە ڕێواسە تەیلەسانی گەڵا
چەمەن لە لالە و ڕیحان و نەستەرەن ئیمڕۆ
سوپهر و سوبح و شەوە و ئافتابی وەختی زوحا
چنار و عەرعەرە دەفزەن هەزار نەغمەسەرای
گیاشی زاکیرە تەسبیحی شەبنمی لە ملا
لە ژووری مێگەلی هەورە لە ژێری مێگەلی مەڕ

شەبیهی گوڵشەنی خەزرایە توودەیی غەبرا
لە کێو و کەژ کە سەر ئێوارە دێتەوە ماڵات
لە دەوری چادری ساحێبی مەوجیدا وەستا
لە حیلەحیلی کەحێل و لە بارەباڕی مەڕان
لە دەنگی قۆڕەیی گاجووت و بۆڕەیی مانگا
لە گورگە لوور حەپەی سەگ لە قاڕەقاڕی بزن
لە عەکسی دەنگی دووبارەی کە دێتەوە لە چیا
لە ئۆحەئۆحەیی گاوان و قیڕەقیڕی شوان
لە بگرە بەردەی کابان دەبێتە حەشر و حەلا
مەلائیکەی سەر تاق و رەواقی مینایی
دەبێتە جونبوش و لەرزین، دەکەونە حەولەلا
کە هەڵکرا شەوێ ئاگر لە کوللی رەشماڵەک
خجل دەبن لە زەوایایی خەیمەیی واڵا
عوتارید و زوحەل و ئافتاب و ماهی تەمام
خولاسە سابیت و سەییارە تا دەگاتە سوها
سەبا دەزانێ ژیانم لە دووریان مەرگە
دەسا وەرە بە کزی خجل بکە عیسا
ئەگەر منم لە فیراقیان کزەم لە جەرگەوە دێ
ئەگەر دڵە وەکوو جەرگم دەڵێی ئەوا سووتا
لە پاشی ئەم هەموو داستانە بەختی خاب ئالوود
میسالی ئەژدەری نوستوو بە رق لە خەو هەستا
جەوابی دامەوە، ئەمما جەوابەکی وا رەق
نەما مەجالی مەقال و موباحەسە لەم لا
گوتی هەتاکوو خەزان و بەهار و زستانە
مەداری عەیشی مەوالیدی عالەمی غەبرا
بەهاری وا هەموو ساڵێکی دێتەوە ئەمما
ئەوانی دەچنە دیاری مەمالیکی عوقبا

یەکێکی نایەتەوە، چوونیان هەر چوونە
لە شێخ و عالیم و جاهیل، لە پادشاهـ و گەدا
مەکانە شەوقی بە عێلاتە، پەشمە، کۆنەهەوار
حەیاتە زەوقی بە ئەحبابە بایە ئاب و هەوا
رەفیقی کۆنە نەماون، جوانەکان پیرن
بە شەق دەڕۆن و لە داری دیارە شەققی عەسا
لە دووسەدی یەکەکی زەحمەتە بناسیەوە
مەگەر بە ناو و نیشان و بە خزم و باب و برا
کە بێی و بچیەوە ئێستا کەئەننە دیسان
سەفەر دەکەی لە وەتەن دەچیە شاری جابولقا
خولاسەی قسە، ئێستێکە مەسڵەحەت ئەمەیە
بڵێی بە وەجهی نەسیحەت، بە کاغەز و ئینشا
ئەمان کوڕانی رەفیق و برادەرانی وڵات
بە ئێوە هەر کە گەیی ئەم کەلامی بێ سەر و پا
لە پاش ئەوەی کە تەسیحە و موتاڵەعەی بکرێ
بە یادی من لەبەری کەن لە ڕووی میهر و وەفا
هەتا لە خیتتەیی بێگانە فەخری پێوە بکەم
لە بەینی زومرەیی ئەحیا و مەجمەعی مەوتا
ونی مەکەن وەکوو ئاساری "نالی" و "کوردی"
لە سەهوی دیدە بپۆشن گوزەر بکەن لە خەتا
نییە لە مومکینی ئیمکان خەتا و سەهوی نەبێ
بە غەیری خواجەیی دیوانی عەللەمەلئەسما
ئەوی حەسوود و جەهوولن لەئیم و رەخنەگرن
لە عەیب و رەخنەیی عالیم بەری دەبن ئودەبا
ئەمانە زادەیی ئەفکار و خۆشەویستی منن
ئەگەر قەبیح و کەریهن ئەگەر شەل و ئەعما
میسالی فەرخەیی ژیشک کە پێی دەڵێ دایکی

ئیلاهی قاقووە یا خەز سەمموورە یا دیبا
شەبیهی جۆڵە کە ڕازی نەبێ بە سەردری خۆی
مەڵێن فەساحەتی وردی بە فارسی ناگا
بەلاغەتێکی هەیە هیچ زوبانێ نایگاتێ
لە بێ تەعەسوبی کوردانە بێ ڕەواج و بەها
کە خۆتی تێ نەگەیێنی لە نیکتەکانی نەگەی
دەڵێی هەمووی هەزەیانە خودا بەڵای لێ دا
بەڵام ئەوانی کە سەڕڕافی زێڕ و زیوی قسەن
بە شەهـ ڕەوانی دەزانن چ سککەیێکە ڕەوا
چ حیکمەتێکە کە ئاساری کوردە نامووسی
نە کیمیا نە عەنقا لە بەینی ئێمە نەما
ئیلاهی نەیخەیە بەر چەنگی مەندەبووری لەئیم
نقوودی حاجی کە نەیدیوە خوسرەو و دارا
ئومێدی وایە نەسیبی کەریمەکەی وابێ
بە خێری دایکی و بابی لە ڕێی خودا بیبا
گەلێ قسەم لە دڵا بوو حیکایەتم مابوو
کەچی لە بەختی کەچم خامە نووکی لێرە شکا.

پەراوێزەکان:

(*) لە یەکێ لە لێکۆڵینەوە بەراییيەکانم بە ناوی "ئایا رێباز و بزووتنەوەی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا هەیە؟" لەگەڵ ئەو روانینەدا بووم کە سەرەتاکانی ئەدەبی نوێی کوردی و نوێبوونەوە لە ئەدەبی کوردی لە ساڵی ۱۹۰۰ ەوەیە، بەڵام ئێستا، وێڕای لێکۆڵینەوە لە شیعری نالی و حاجی قادری کۆیی، بە تایبەتی یەکەمیان، ئەم روانینەی سەرەوەم گۆڕاوە، لەو باوەڕەدام نوێبوونەوە لە سەرجەم ئەدەبی کوردیدا لەگەڵ فەرمانڕەوای بابانەکان دەست پێدەکات (بنیاتنانی شاری سلێمانی ١٧٨٤)، ئێمە سەردەمی بابانەکان وەک سەردەمی زێڕینی کوردی بە هەمان شێوەی هەڵکەوتی سەدەی نۆزدەمی فرانسی و رووسی و ئەلمانی و سەردەمی زێڕینی ڤیکتۆری ئینگلیزی کە سەردەمی لەدایکبوون و بووژانەوەی ئەدەبی ئینگلیزییە لە قەڵەم دەدەم، ئەمەی کوردیش بە هەمان شێوە سەردەمێکی زێڕینە نەک هەر بۆ ئەدەبیاتی کوردی بەڵکو بۆ تەواوی شارستانی کوردی، ئەمەش زۆر بوار دەگرێتەوە. هەر لەبەر ئەم دیاردەیەشە، ناونیشانی ئەم لێکۆڵینەوەیەم بریتییە لە "شیعری سەدەی نۆزدەمی کوردی" چونکە پێموایە، ئەدەبی کوردی کۆن، لە کۆنەوە دەست پێدەکات تا بابانەکان، لێرەشەوە لەگەڵ دەرکەوتنی نالی، ئەدەبی نوێ لەگەڵ ئەزموونی نالی و کوردی و سالم دەست پێدەکاو لەگەڵ ئەزموونی حاجی قادری کۆیی تەواو دەبێ، ماوەی نێوان ۱۹۰۰ تا ۱۹٦۰ سەردەمی نوێبوونەوەی دووەمە کە لەگەڵ پیرەمێرد و شێخ نوری شێخ سالح و زۆری تر دەست پێدەکات و لەگەڵ گۆران و ئیبراهیم ئەحمەد کۆتایی پێدێ. هەمان ئەو سەردەمەی دووەمە بە سەردەمی سەرهەڵدانی رێکخراو و گەشەسەندنی ناسیۆنالیزمی کوردی دادەنرێ، هەروا سەردەمی نوێبوونەوەی ئەدەبیات و زمانیشە. نیوەی دووەمی ئەم سەردەمی نوێبوونەوەی دووەمە، واتە لە دوای ساڵانی چلەکان تا ۱۹٦۰، لە پاڵ بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی بزووتنەوەی دیکەی فیکری و ئەدەبی تێدەکەوێ وەک ئیدیۆلۆژیی چەپ و سۆسیالیزم، ئەمەش لە کۆتاییيەکانی ئەزموونی گۆران و ئیبراهیم ئەحمەد و زۆری تر دەردەکەوێ. لێرەشەوە، لە دوای ئەم سەردەمە ئەدەبیات و زمانی کوردی و تەواوی کۆمەڵی کوردی دەچێتە ناو سەردەمێکی تری نوێتر کە دەتوانین ناوی لێ بنێین سەردەمی ئەدەبی نوێ و هاوچەرخ، بەرهەمە ئەدەبی و فیکری و زمانەوانییەکان و مێژووییيەکانی ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکان و تا رادەیەکیش نەوەدەکانی سەدەی بیستەم بەرهەمی ئەم گەشەسەندنە نوێیەن، ئەمەش لێکۆڵینەوەی تری هاوچەرخ و تازەی دەوێ، بەو هیوایەین لە ئایندە لێکۆڵینەوەی وردتر و قووڵتر لەم بارەیەوە پێشکەش بکەین.

(*) لە لایەکی ترەوە مەسعود محەمەد پێی وایە نالی نەقشبەندی نەبووە بەڵکو قادری بووە ئەگەرچی ئەو لە تەکیەی مەولانا خالیدش خوێندوویەتی. ئەو پێی وایە بۆ زانینی ئەمە دەبێ بزانین نالی لە لەلای کام مەلا خوێندوویەتی.

(*) جیاوازی و تایبەتمەندییەکانی نێوان شیعر و شیعری مەنزوم یان هۆنراوە لە رووی سترەکتوری شیعری و شیعرییەتەوە، بابەتێکە لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە و تیۆری زۆر هەڵدەگرێ، پێویستی بە تۆژینەوەی سەربەخۆیە و لێرە بواری ئەم قووڵبوونەوەیە نییە، تەنیا بە پێویستمان زانی ئەم جیاوازییانە وەک سەرەتایەک بخەینە روو، تایبەتمەندییەکانی شیعری نالی و حاجی قادری کۆیی پێ دەستنیشان بکەین.

(*) شیعری Lettriste یان شیعری Lettrisme ئەو جۆرە شیعرەیە کە لەسەر بنچینەی ئاواز و رێکخستنی مۆسیقی وشەکان نووسراوە، ئاوازی وشە خەسڵەتی یەکەم و کۆتاییە.

(*) بێجگە لەم قەسیدەیەی نالی، با ، شەماڵ، لە لای شاعیری گەورە بێسارانی ئامادەگییەکی زۆری هەیە.

(*) لە بارەی فەزاو هاوشێوەکانی لە ناو کاری ئەدەبی و زمانەوە کە پەیوەندی بەو حاڵەتە شیعرییەوە هەبێ کە پۆل ڤالێری باسی دەکا، ناوبراو باس لە فەزای ئەدەبی دەکا کە هەر هەمان فەزای زمانە، ئەو دەیبەستێتەوە بە فەزای ئینسانی یەکەم کە هەر زمان خۆیەتی کە دەشێ زمان لە هەموو ماتریالێکی تر زیاتر فەزای ئینسانی و پەیوەندی لەگەڵ فەزا و پێکهاتەکانی زیاتر و باشتر پیشان بدا، ناوبراو باس لە تابلۆ و پەیکەر دەکا کە گوایە بەو هونەرە دادەنرێ کە دەشێ جوان تەعبیر لەو فەزایە بکا، بەڵام ئەو پێی وایە ئەم هونەرانە خۆیان بەشێکن لە فەزاو شوێن، هەرچی زمانە جەوهەر و هەڵکەوتێکی تری هەیە، فەزای ئیسنان زیاتر لە زمان و کاری ئەدەبی بەرجەستە دەبێ، بۆیە پرسیاری ئەوە دەکا و دەڵێ دەبێ فەزایەکی تایبەت بە کاری ئەدەبی هەبێ. بڕوانە: Genette, Gerard. Figures II. Essais.Editions du Seuil. 1969

**بیبلۆگرافیا:**

1- Said Naficy. Dictionnaire Français Persan. 2 tomes. Editions Safi Alishah. 1988.
2- Jean François Feraud. Dictionnaire critique de la langues française. 1787.
3- Claudio BOLZMANN. Rupture, Epreuves, Prévues, Resistances. HES-SO/Genève.
4- Jean Pierre Vernant. Lunivers des dieux. Récits grecs des origines. Paris. Seuil. 1999
5- Bernard Méreur. Exil, mémoire, identité. Science Humaines, numéro 173. 2010.
6- François Hoff. Le Poète chez les Barbares. 2009.
7- Petruta SPANU. Exil et littérature. Acta lassyensia Comparationis. 3. 2005.
8- Olivia Bianchi. Penser lexil pour penser lêtre. Le portique En ligne. 1-2006.
9- Francesco Sinatra.Etrange Singulier ou la passion de lexil. Filigrano. numéro 5. 1996.

١٠- دیوانی نالی. ئامادەکردنی مەلا عبدالکریمی مودەریس. فاتیح عبدالکریم. پێداچوونەوەی موحەمەدی مەلا کەریم. نشر انا. سنه. ١٣٨٨.

11- Eugene Flandin. Voyage en Perse pendant les années. Tome 1 1840-1841.

١٢- د. عومەر، د. موحسین ئەحمەد، لێکۆڵینەوە کوردییەکان. بەرگی یەکەم. بڵاوکراوەی ئەکادیمی کوردی.هەولێر. ٢٠١٢.

١٣ سەجادی، عەلائەدین، دوو چامەکەی نالی و سالم. بەغدا. چاپخانەی مەعاریف. ١٩٧٣

١٤- لەوەندی، مەحمود، نالی لە چاڤکانیەکە ترکیدە. گۆڤاری وان. ژمارە ٢ ساڵی، سوێد. ١٩٩٢.

١٥- دیوانی حاجی قادری کۆیی. لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: سەردار حمید میران. کەریم شارەزا، پێداچوونەوەی: مسعود محەمەد. سنه. ٢٠٠٧.

16- Jean Cohen, structure du langage poétique. Champs essais. Flammarion. 1966.
17- Bachelard, Gaston. Lair et les songes. Essai sur limagination du mou-vement. Paris. José Corti. 1943. 1990 .
18- Genette, Gerard. Figures II. Essais.Editions du Seuil. 1969.

## ملخص البحث

تتناول هذه الدراسة المنفى في الشعر الكوردي في القرن التاسع عشر وتحديدا في التجربة الشعرية لكل من الشاعر نالى و حاجى قادرى كويى. المنفى لديه ارث تاريخي في الوعي الانساني على مر العصور. البداية الحقيقية الاولى لظهور المنفى تبدء مع الاعمال الشعرية للشاعر الروماني اوفيد في السنة الثامنة الميلادية. الا ان شعر المنفى ظهر لاول مرة في الادب الكوردي في اواسط القرن التاسع عشر لدى نالى وفي اواخر القرن التاسع عشر في شعر حاجى قادرى كويى. يعد مفهوم المنفى في كلتا القصيدتين المعروفتين في الادب الكوردي عبارة عن انقطاع وضياع مع عالم مثالي يود الشاعر العودة اليه والعيش فيه، وهو عالم خيالي و غريب. يبين لنا الباحث من خلال هذا التحليل الادبي، ان عالم الموصوف في شعر نالى و حاجى قادى كويى سيبقى في اللغة تحديدا ويظل في نهاية المطاف الموطن المثالي للشاعر.

## Abstract

Cest une recherche thématique concernant lexil dans la poésie kurde du XIXème siècle, surtout dans lexpérience poétique de Nali (1797-1873) et Hadji Kadiri Koyi (1825-1897). Lexil a une histoire dans la conscience humaine et dans lhistoire générale, qui remonte à l antiquité gréco-romaine. Première apparition concrète débute avec les œuvres poétiques dOvide, poète roman, exilé lannée 8 ap. j. c. Mais dans la littérature kurde moderne, ce thème apparait pour la première foi au milieu du XIXème siècle chez Nali et avec lexpérience poétique de Koyi vers la fin de même siècle. Dans ces deux poèmes connus de la littérature kurde, lexil est ressenti et imaginé comme une rupture et disparition dun monde souhaité, dans lequel le poète veut y revenir et vivre, cest un monde dimagination, un monde exotique et rêvé. L auteur soutien lidée que ce monde enfin nexiste pas que dans la langue, et cela reste en fin le pays imaginé de poète.

# بەراوردی نموونەکانی بیری سۆفیگەری لە نێوان حەللاج و مەلای جزیری دا

**محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم**
پەیمانگای ڕاهێنان و گەشەپێدانی
پەروەردەیی – هەولێر

**پێشەکی:**

ڕەوتــی ســۆفیگەری ناوەنــدێکی بەرفراوانــی بڵاوبــوونەوەی هــزر و بیــری خواناســییە لە نێــو میللەتانــدا. بەهەمــان شــێوە هۆکــارێکی گرنگــی دروســـتبوونی ئەدەبـــی هاوبەشــــە لەنێـــو گەلانـــی دنیـــادا. ئەم ڕەوتە، بنەمـاگەلێکی هـزری و ڕەفتـاریی تـایبەتیی خـۆی هەیە و لە هەمـوو دنیـادا لێکچـوونێکی زۆری هەیە. هەر بـۆیەش پەیڕەوانـی ئەم ڕەوتە لە نەتەوەی جیـاواز پێکـدێن و سـۆفییەکی شـارەزا و خوێنـدەواری کـورد، لە ڕووی بیرکردنەوەوە، جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ سۆفییەکی دیکەی شارەزا و خوێندەواری عەرەب یان فارس یان هەر نەتەوەیەکی دیکە.

ئەم حـــاڵەتی لەیەکچـــوونە لە نێـــوان گەورە شـــاعیرانی بـــواری سۆفیگەریدا بەدی دەکرێت. بەشێوەیەک، بەشێکی زۆری بیری سۆفیگەری لەناو شیعرەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە و بەمەش هاوبەشییەکی بابەتیی زۆر لە نێوان بەرهەمەکانیاندا پەیدابووە. ئەم لەیەکچوون و هاوبەشییانە زادەی بیــری هــاوبەش و تێپەڕبــوونی کەســی ســۆفییە بە هەمــان قۆناغەکــانی خواناســی کە هەر ســۆفییەک پێیــدا تێپەڕیــوە. بـۆیە ئەم هاوبەشــییانە بە کاریگەری و کاریگەربوونی ئەدەبی دانانرێن.

بەڵام ئەگەر لێکچوونەکــان کەوتە بــواری وێــنەی شــیعری و بیــری ئەدەبیی تـایبەتی کە بەرهەمـی بیرکـردنەوە و عەقڵـی تاکەکەسـییە و مـافی ڕەوت و هــزری گشــتیی بەســـەرەوە نیـــیە، ئەوکــات لێکچوونەکـــان بە کاریگەری و کاریگەربوون دادەنرێن.

ئامـــانجی لێکــۆڵینەوەکە: ئەم لێکــۆڵینەوەیە هەوڵـــی ئەوە دەدات کە کــاریگەربوونی مەلای جزیـری بە بۆچوونەکـانی حەلـلاج لەبـواری وێنەی

شـیعری و بیـرە تایبەتییەکـانی بخـاتەڕوو، لە هەمـان کاتیشـدا جیـاوازییە وردەکانی مەلای جزیریش دەخاتەڕوو کە چۆن سۆفیگەرییەکی کوردانەی جـوانی پێشـکەش بە دنیـا کـردووە جیـا لە سـۆفیگەریی تاڕادەیـەک توندڕەوانەی عەرەب و فارس بەرانبەر بە بنەما عەقیدەیی و شەرعییەکانی ئیسـلامەتی. ئەو بیـرانەی سـۆفیگەریش دەخـاتەڕوو کە لای حەلـلاج زۆر زەقن و مەلای جزیری خۆی لێ پاراستوون.

گرنگیی لێکۆڵینەوەکە: گرنگیی لێکۆڵینەوەکە لەوەدایە دەریدەخات کە مەلای جزیری، خاوەنی سۆفیگەرییەکی تایبەتیی خۆیەتی کە لەگەڵ ژینگە و زمـان و بیـری ئـایینی گـونجێنراوە. هەروەهـا پـایەی مەلای جزیـری لە بواری سـۆفیگەری ڕوونتـر دەکاتەوە. ئەمەش چـونکە بە ئەسـتێرەی هەرە گەشی سۆفیگەریی جیهان (حەللاج) بەراوردی دەکات.

ڕێبـازی لێکـۆڵینەوەکە: ڕێبـازی بەراوردکـاری لەنێـوان بەرهەمەکـانی هەردوو شاعیر بەکارهاتووە کە سەر بە دوو زمان و نەتەوە و سەردەمی جیاوازن. ناوەندی هـاوبەش لە نێوانیاندا، بریتییە لە ڕەوتـی سۆفیگەری و ئەو بیرکـردنەوانەی لە گۆشـەنیگای ئەم ڕەوتەوە بەسـەر بەرهەمەکانیـان زاڵ بووە. بۆ هەڵێنجانی زۆرترین بۆچـوونی حەلـلاج، نمـوونە لە شـیعر و پەخشانەکانی وەرگیراوە.

بونیادی لێکۆڵینەوەکە: لێکۆڵینەوەکە کراوەتە دوو بەش. بەشی یەکەم دوو بەندی تێدایە. بەندی یەکەم لە ئەدەبی بەراوردکاری و قوتابخانەکانی دەدوێـت و لەو ڕوانـگەیەوە هـۆی کـارکردن بە ڕەوتـی بەراوردکـاری فەڕەنسی و ئەمریکی، ڕوون دەکاتەوە.

بەنـدی دووەمـیش دوو تەوەرەیە: تەوەرەی یەکەم: لە کەسـایەتیی حەلـلاج و ژیـانی دەدوێت و پەیوەنـدیی بە ڕووداوەکـانی سـەردەمەکەی و هۆکـاری کـوژرانی ڕوون دەکـاتەوە. تەوەرەی دووەمـیش بـاس لە کەسایەتیی مەلای جزیری دەکات.

بەشـی دووەمـیش بەراوردی بەرهەمەکـانی مەلای جزیـری و بۆچوونەکـانی حەلـلاج دەکـات. لەڕووی وێنەی شـیعری و لەڕووی بیـری تایبەتییەکانییەوە.

لە کۆتـایی لێکـۆڵینەوەکەش، دەرەنجامەکـان و سـەرچاوەکان و پوختەی لێکۆڵینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراوەتەڕوو.

## بەشی یەکەم

### ١-١ قوتابخانەکانی ئەدەبی بەراوردکاری:

بەهۆی بوونی گۆشەنیگای جیاوازی ڕوانین بۆ دیاردەی لێکچوونی نێوان شیعری دوو شاعیری جیاواز، قوتابخانەی جیاوازی ئەدەبی بەراوردکاری سەریان هەڵداوە. گرنگترینیان قوتابخانەکانی (فەڕەنسی و ئەمریکی و سلاڤی)ن.

### قوتابخانەی فەڕەنسی:

کۆنترین قوتابخانەی ئەدەبی بەراوردکارییە. تائێستاش لە لێکۆڵینەوە بەراوردکارییەکاندا پشتی پێدەبەسترێت. (ڤان تێیگم) یەکێک لە گەورە ڕابەرانی قوتابخانەکەیە و پێیوایە (ئەدەبی بەراوردکاری بریتییە لە لێکۆڵینەوەی بەرهەمە ئەدەبییە جیاوازەکان و دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوانیان).

قوتابخانەی فەرەنسی لەسەر چەند بنەمایەکی سەرەکی دروست بوو، ئەوانیش (کاریگەری و کارتێکردن، پەیوەندیی مێژوویی)ن. واتە بەپێی ئەم قوتابخانەیە کاتێک دەتوانین دوو بەرهەمی ئەدەبی بەراورد بکەین، ئەگەر هاتوو پەیوەندیی مێژوویی نێوانیان و کاریگەری و کارتێکردنەکە بسەلمێندرێت.

بەپێی قوتابخانەی فەرەنسی ئەو دوو بەرهەمەی کە بەراورد دەکرێت، دەبێت هەریەکەیان بە زمانێکی جیاواز نووسرابێت و سنووری سیاسی و جوگرافیی جیاوازیان هەبێت. هەروەها بەپێی ئەم قوتابخانەیە ئەو نووسەرانەی کە بە زمانی تر دەنووسن و بەزمانی نەتەوایەتی نانووسن، بەرهەمەکانیان بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە و بەراورد ناکرێت و بە بەرهەمی نەتەوەییش لەقەڵەم نادرێت، چونکە (هەر بەرهەمێکی ئەدەبی بە موڵکی ئەو نەتەوەیە دادەنرێت کە بە زمانی ئەوەوە نووسراوە)[1]، بەمەش بواری لێکۆڵینەوە تەنگ دەبێتەوە و ناتوانێت بەتەواوی وەڵامی پێداویستی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بداتەوە. بۆیە قوتابخانەی ئەدەبیی تر لە بواری ئەدەبی بەراوردکاریدا سەرهەڵدەدەن.

**قوتابخانەی ئەمریکی:**

ئەو قوتابخانەیە هاوشان و لە پاڵ قوتابخانەی فەرەنسیدا گەشەی کردووە، کاتێک کە قوتابخانەی فەرەنسی نەیتوانی وەک پێویست وەڵامی پێداویستییەکانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بداتەوە، قوتابخانەی ئەمریکی لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم لەسەر دەستی (رینێ ویلیک) پەیدا بوو. ئەو قوتابخانەیە لە قوتابخانەی فەرەنسی جیابووەتەوە. پشت بە پەیوەندیی مێژوویی نابەستێت. قوتابخانەی ئەمریکی وا دەبینێت کە سنووری ئەدەبی بەراوردکاری لەوە فراوانترە کە لە لێکچوون و جیاوازی نێوان ئەدەبی دوو نەتەوە بکۆڵێتەوە بە گەڕان بەدوای هۆکارەکانی کاریگەربوون. ئەم قوتابخانەیە بایەخ بە ڕوخسار و لایەنی ئیستاتیکای دەق دەدات. خاڵی جیاوازیی لەگەڵ قوتابخانەی فەرەنسی، ئەوەیە قوتابخانەی ئەمریکی جگە لە لێکچوونەکان، جیاوازییش وەکو بنەمایەک وەردەگرێت بۆ لێکۆڵینەوە و بەراوردکردنی بەرهەمەکان[٢].

**قوتابخانەی ڕووسی (سلاڤی):**

قوتابخانەی سلاڤی شان بەشانی قوتابخانەی فەرەنسی و ئەمریکی، سوودی زۆری لێ وەرگیرا لەمەیدانی ئەدەبی بەراوردکاریدا. بۆ لێکدانەوەی دیاردەی لێکچوونی ئەدەبی، پەنا دەباتە بەر تیۆری کۆمەڵایەتی و ئابووریی مارکسیزم. پێیوایە نەتەوە جیاوازەکان لەکاتی تێپەڕبوونیان بە هەمان ئاستی ئابووری، هەمان دەرکەوتەی ڕۆشنبیرییان دەبێت.[٣].

ئەم قوتابخانەیە لە بەراوردکردنی بەرهەمەکاندا (پشت بە هۆکاری ناوەخۆیی دەبەستێ، چونکە بەپێی بۆچوونی ئەوەوە ئەدەب کۆڵەگەیەکی سەرەکییە لە ڕۆشنبیری نەتەوایەتی و لایەنێکە لە سەرخانی کۆمەڵ، ئەویش ڕەنگدانەوەی ژێرخانی هەمان کۆمەڵە، جۆرو ڕێژەی پەرەسەندنەکانیان دەستنیشانیان دەکات)[٤]

قوتابخانەی سلاڤی پێیوایە کە مەرج نییە ناوەندی گوێزانەوە یان هۆکاری کاریگەربوون هەبێت. بەڵکو لێکۆڵینەوەکانی ئاستی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی، جۆرو ئاستی بەرهەمی ئەدەبی دیاریدەکەن.

بۆیە هەموو میللەتە جیاوازەكان، ئەگەر لەهەمان ئاستی گەشەسەندنی كۆمەڵایەتیدا بن، بەرهەمەكانیان بەیەك دەچێت.

ئەم لێكۆڵینەوەیە سوود لە هەردوو قوتابخانەی فەرەنسی و ئەمریكی وەردەگرێت. چونكە لەلایەك ناوەندی گواستنەوەی هاوبەش، كە سۆفیگەرییە، بوونی هەیە. لەلایەكی تریشەوە خاڵی جیاوازی لە نێو هەناوی لێكچوونەكاندا هەن. بۆیە هەردوو قوتابخانەكە لێكۆڵینەوەكە دەوڵەمەند دەكەن.

**٢-١ ناساندنی كەسایەتیی (حەللاج) و (مەلای جزیری):**

**١-٢-١ حەللاج:** [٥]

ناوی (حوسێنی كوڕی مەنسوورە) و نازناوی (ابوالمغیث)ە، لە گوندی (طور) لە باكووری ڕۆژهەڵاتی ئێران لە ساڵی (٢٤٤ ك) بەرانبەر (٨٥٨ ز) لەدایك بووە. باوكی حەللاج بەهۆی ئەوەی كە نەیتوانیوە باجی پێویست بە دەسەڵاتداری ئەوكاتی ناوچەكە (عمر بن لیث الصفار) بدات، كوژراوە. دوای كوژرانی باوكی، حەللاج لەگەڵ خێزانەكەی بەرەو عیراق كۆچ دەكەن و لە شاری (واسط) بۆ ماوەیەك دەمێننەوە و پاشان حەللاج دەچێتە (توستەر) لە ئێران بۆ فێربوون لەلای گەورە شێخی سۆفییەكانی ئەو سەردەم (سهل بن عبدالله التستری).

حەللاج لە ڕێڕەوی سۆفیگەریدا زۆر گەڕاوە و دواجار لە بەغدا چووەتە لای گەورە ڕابەری سۆفیگەری لە عیراق (شێخ جونەیدی بەغدادی). ماوەیەك لەلای شێخ جونەید دەمێنێتەوە، پاشان سەفەری حەج دەكات. لەدوای تەواوبوونی حەج ناگەڕێتەوە عیراق و بەرەو ئەهواز دەڕوات. لەوێوەش دەچێتە خوراسان و پاشان دەچێتە وڵاتی هیندستان. لەو وڵاتەدا، لە ڕەوتە سۆفیگەرییە هیندییەكان سوودمەند دەبێت و خەڵكێكی زۆر بەهۆیەوە دەبنە موسڵمان.

لە ساڵی (٢٩٠ك.) بەرانبەر (٩٠٣ ز) دەگەڕێتەوە شاری بەغدا و بەیەكجاری نیشتەجێ دەبێت و دەست بە ڕێنمایی ئاینی دەكات.

لە ساڵی (٣٠١ ك) بەرانبەر (٩١٣ ز) دەستگیر دەكرێت و ماوەی دوو ساڵ لەناو كۆشكی خەلیفە دەستبەسەر دەبێت، پاشان لە بەندیخانەی

تـاییەت بەنـد دەکرێـت. لە سـاڵی (٣٠٩ ک) دادگـایی دەکرێـت و بڕیـاری لەخاچدرانی بۆ دەردەکرێت.

دوای لەخاچدرانی، نووسەرە گەورەکانی بواری سۆفیگەری پاڵپشتی) حەللاج (یان کردووە و وتەکانیان ڕاڤە کردەوە. بەگشتی لەلای پەیڕەوانی سۆفیگەری، حەلـلاج ئەستێرەیەکی گەشـی سـۆفیگەری و ئەدەبەکەیەتی و شەهیدی عیشقی خواییە. لەلای شێخ و شارەزایانی سۆفیگەریش، حەلـلاج خواناسـێکی زۆر لەخـوا نزیـک بـووە، بەڵام لەوەدا هەڵەی کـردووە نهێنیـی نێوان خۆی و خوای ئاشکرا کردووە و بۆ هەمووانی باس کردووە.

### ٢-٢-١ مەلای جزیری:[٦]

ناوی شێخ ئەحمەدە، خەڵکی جزیر و بۆتـانە، نازنـاوی شـیعری (مەلا، مەلی، نیشانی) بووە. زۆرجار (ئەحمەد) یشی بەکارهێناوە. لەبـارەی سـاڵی لەدایکبــوون و مــردنییەوە بۆچــوونی جیــاواز هەیە، بەڵام لە هەموویــان وردتـر بۆچـوونی هەریەک لە (مەکەنزی) و (مەلا ئەحـمەدی زڤنگـی) و (د. مارف خەزنەدار)ە.

لێکۆڵینەوەکەی (مەکەنزی) لەبـارەی (ژیـانی مەلای جزیـری و فەقـێ تەیران) نووسیویەتی، ئەنوەر سوڵتانی بۆ زمانی کوردی وەریگێڕاوە و لە گۆڤـاری (کوردناسـی)[٧] بڵاویکـردووەتەوە. ئامـاژە بە دێـڕە هـۆنراوەیەکی (فەقێ تەیران) دەکات و لە ڕوانگەی ئەوەوە سـاڵی کۆچی دوایـی جزیـری دەستنیشـان دەکات.

دیـارە کە فەقـێ تەیـران قوتـابی و هـاوڕێی مەلای جزیـری بـووە، لە دوای کـۆچی دوایــی (مەلا) دا، شــین گێــڕییەک دەنووســێت لە دێڕێکیــدا حیسابی ساڵی مردنەکە بە پیتی ئەبجەدی دیاریدەکات و دێڕەکە ئەمەیە:

((هەفت عەین و لام ژ هەڤ بوون جودا شین و گری دیسا تێدا))

ئینجا دوای شیکردنەوەی ئەم حیسابی ئەبـجەدە، ڕوون دەبێتەوە کە مەلای جزیری لە ساڵی (١٠٥٠ ک) وەفاتی کردووە. واتە مـاوەی ژیـانی لە (٩٨٠ – ١٠٥٠ک.) بـــووە کە بەرانـــبەر (١٥٧٠– ١٦٤٠ز.) یە. ســــوڵتانی ئاماژەی بەوە نەداوە مەکەنزی لەسەر چ بنەمایەک سـاڵی لەدایکبـوونەکەی دەستنیشـان کردووە.

دکتـــۆر مـــارف خەزنەدار لەڕوانـــگەی بۆچـــوونی مەلا ئەحـــمەدی زڤنگیـــیەوە، ســـاڵی لەدایکبـــوونەکەی بە (٩٧٥ ک) بەرانـــبەر (١٥٦٧ ز) دەستنیشان کردووە و کۆچی دواییەکەشی بە (١٠٥٠ ک) بەرانبەر (١٦٤٠ ز) دانـاوە. بەگشـتی ئەم بۆچوونـانە لەیەکتـری نـزیکن و وەک وردتـرین بۆچوون کە تا ئێستا چەسپێنرابێت، پشتیان پێ دەبەسترێت.

مەلای جزیری سۆفییەکی خوانـاس و مەلا و زانـایەکی گەورە بـووە. مەلای مەدرەســـەی ســـۆر (مزگەفتـــی ســـۆر) بـــووە و ســـەدان فەقێـــی پێگەیانـدووە. جـگە لە زمـانی عەرەبـی، فارسـی زانێکـی باشـیش بـووە و ئاگاداری بەرهەمی شاعیرانی فارسی بووە، بەتایبەتی حـافزی شـیرازی. لە دیوانەکەیدا ئاماژە بە حافز دەکات و شیعرەکانی خۆی لە شـیعرەکانی ئەو بەچاکتر دادەنێت.

## بەشی دووەم

بەراوردی نموونە هاوبەشەکانی نێوان حەللاج و مەلای جزیری

**نموونەی یەکەم:**

حەلـلاج (منێتی) خۆی بە ڕێگری گەیشتن بەخوا دەزانێت و داوا لە خــوا دەکــات کە ئەو منێتیــیە لە نێوانیانــدا لابــدات. منێتــی مــرۆڤ لە سۆفیگەریدا ئەو خەسڵەت و نەریتانەن کە مرۆڤ خۆی بەهۆیانەوە پێناسە دەکـات و سـنووری نێـوان خـۆی و کەسـانی دیـکە دەکێشـێت. حەلـلاج دەیەوێــت ئەو تایبەتمەنــدییانەی نەمێنێــت و بەو چەشــنە بێــت کە خــوا دەیەوێت. دیارە ئەمەشی بۆ نەلواوە چونکە ئەو مرۆڤە و مرۆڤێتییەکەی ڕێگری ئەو بەیەکتر گەیشتنەیە. دەڵێت:

((بيني وبينک إني ينازعني          فارفع بلطفک إنيي من البين))[٨]

واتە: لەنێوان من و تۆدا (منێتی) یەک هەیە ململانێم لەگەڵدا دەکات، بە بەخشندەیی خۆت ئەو منێتییە لەو نێوانە لابدە.

ئەو مـرۆڤێتییەی حەلـلاج بەدەسـتییەوە دەنـاڵێنێ، لە سـۆفیگەریدا بە (نەفس) ناودەنرێت. لەبارەی ئەو نەفسـەوە کە مـرۆڤ ڕووزەردی مەیدانی بەخواگەیشتن دەکات، جزیری دەڵێت:

((زوهرەو و عیقدا ثورەییا کەشفی بوون ئەو دشەرق
سایەیا بەختێ مە دایی ما لسەر پەردە و نیقاب))[٩]

جزیری دەڵێت: ئەسـتێرەی زوهـرە و کۆمەڵە ئەسـتێرەی پێروو زۆر جـوان و ڕوون بەردەوام لە دەرکەوتـن و بریسـکانەوە دان، ئەوە بەختــی ڕەشــی مـنە بـووەتە پەردە و پێچە. ناهێڵێـت ئەو بریسـکانەوەیە ببیـنم. لە ڕوونکردنەوەی وشەی (بەخت) دا لە هەمان قەسیدە دەڵێت:

((دێوی مەلعون و منافق ئەی خودێ ڕووڕەش کری
ما ببالا هەڵکشیتن عاقیبەت چی بت صەلاب))[١٠]

(هەژار) لە ڕاڤەکردنــی ئەم دێـڕە دا وشــەی (دێـو) کە بەدبەختیــی مــرۆڤە، بە نەفســی مــرۆڤ لێکـدەداتەوە. (مەلا ئەحـمەدی زڤنگـی)[١١] ش وشـەکە بە (شـەیتان) لێکـدەداتەوە. بەڵام بە بۆچـوونی ئـێمە مەبەسـتەکە نەفســی مــرۆڤە. چــونکە نەفــس لەلایەک خــۆی بە دڵســۆزی مــرۆڤ

نیشـاندەدات و لەلایەکـی دیکەشـەوە دژایەتـی دەکـات و لە خـوا دووری دەخاتەوە. بەمەش دەبێتە (مونافیق). لە سۆفیگەریشدا گرفتی مرۆڤ لەگەڵ نەفسی خۆیەتی و لەسەریەتی لەسەر چاکە ڕایبهێنێت.

لە دێڕێکی تری قەسیدەیەکی دیکەدا، مەلای جزیری لەبارەی هەمان بابەتەوە دەڵێ:

((جانێ خوە مە کر دانەیی داڤا کو ڤەدایی

ئاهو سیفەت ئەو پێ حەسیا ڕاهی خەطا گرت))[١٢]

واتـا: ئێمە گیـانی خۆمـان هێنا تـا بیکەینە نێچیری ئەو داوەی کە تۆ داتنابوویەوە، بەڵام ئەو وەک ئاهوو، زوو هەستی کرد و بەڕێگای هەڵەدا ڕایکرد.

لێرەدا دەردەکەوێت کە هەم حەلـلاج و هەم مەلای جزیـریش، پێیـان وایە کە خواوەند نزیک و ئاشکرایە و خۆی دەیەوێت مرۆڤەکان لێی نزیک ببنەوە، بەڵام نەفسی مرۆڤ و خۆپەسەندیی مرۆڤ ناهێڵێت لە خوا نزیک بێتەوە و بەو مەرامە بگات.

**نموونەی دووەم:** حەللاج نمـوونەی خوانـاس بە پەپوولە دەهێنێتەوە کە بەدەوری ئاگرەوەیە، دەڵێت: ((الفراش يطير حـول المصـباح الـى الصـباح ويعود الى الأشكال فيخبرهم عن الحال بألطف المقال ثم يمرح بالدلال طمعا فـي الوصـول الـى الكمـال، فضـوء المصـباح علـم الحقيقـة وحرارتـه حقيقـة الحقيقة والوصول اليه حق الحقيقة، لم يرض بضوئه وحرارته، فيلقى جملته فيـه... مـن وصـل وصـار الـى النظـر، اسـتغنى عـن الخبـر. ومـن وصـل الـى المنظور، استغنى عن النظر))[١٣]

واتە: ڕوونــاكیی چــرا، زانســتی ڕاســتییە، گەرمیــیەکەی ڕاســتێتی ڕاسـتییە، گەیشـتن بە ئـاگرەکەی خـودی ڕاسـتییە. پەپـوولە بە ڕوونـاکی و گەرمییەکە ڕازی نەبوو، بۆیە خۆی خستە نـاو ئـاگرەوە... کەسێک بگـات و تەماشـا بکـات، پێویسـتی بە بۆباسـکردن نابێـت. کەسـێکیش گەیشـتە لای بینراو، ئیتر پێویستی بەتەماشاکردن نابێت.

مەلای جزیـری لە دیوانەکەیـدا لە دەیـان دێڕ هـۆنراوەی جیـاواز ئەم وێـنەیە بەکـاردێنێتەوە و هەمـان بیـرۆکەی فەنـابوون بە وێـنە و شـێوازی جیاجیا دەخاتە ڕوو. بۆ نموونە دەڵێت:

((پەروانە لەو دصوژی ژ لەمعەیا جەذباتێ
فیدا كرن عومر و ژی د كەشفا سوبوحاتێ
كودا ژنووڤە ڤەژی باقی بت د حەیاتێ))[١٤]

مەلای جزیـری پێیـوایە كە بریسـكەی ئـاگر، پەپـوولە كەمەنـدكێش دەكات و جوانی و گەورەیی ناوەوەی ئاگری بۆ ئاشكرا دەكات. ئەویش ژیـانی خـۆی فیـدا دەكـات و خـۆی دەخـاتە نـاو ئـاگرەكەوە بـۆ ئەوەی سـەرلەنوێ ژیـان لەو جیهـانە پـڕ لە پـاكی و جـوانییەی ئەودیـو ئـاگرەوە بەسەر ببات. دیارە ئەمەش هەمان مەبەستەكەی حەلـلاجە كە پێی وابـوو ئاگری مۆم خودی حەقیقەتە و هەركەسێک بە خودی حەقیقەت بگات ئیتر ژیانێكی نوێ لەگەڵ ئەودا دەستپێدەكاتەوە.

**نموونەی سێیەم:** حەللاج لە شیعرێكی سێ دێڕیدا هەندێک مەبەست دەخاتە ڕوو كە ئەمانەن:

یەكەم: دڵـی خـۆی بە كێـوی (طـور) دەچوێنێـت و دەڵـێ كە خـوا لە دڵمەوە بۆم دەردەكەوێت و قسەم لەگەڵدا دەكات.

دووەم: پـلەی پێغەمبەرایەتـی بە ڕێزلێنـانێكی تـایبەتی دادەنێـت بـۆ هەندێک لە بەندەكانی خودا. بەڵام پلەی فەنابوون و یەكگرتن و تێكەڵبـوون بەخوا، لە پێغەمبەرایەتی بە گەورەتر دادەنێت.

سێیەم: ئەگەر مرۆڤ كەوتە بەر میهـری خـودایی، دەنگـی خـودای بـۆ هات یان دەركەوتنی خودای بینی، ئەوا فەنـا دەبێت (نامێنێت) و لە بوونی خوداییدا دەتوێتەوە، ئیتر بیستن و بینین و هەستەكانی بە هەستی خودایی كاردەكەن.

دەڵێت:

((عقد النبوة مصباح من نور معلق الوحي في مشكاة تأمور
بالله ينفخ نفخ الروح في خلدي لخاطري نفخ اسرافيل في الصور
إذا تجلى بطوري ان يكلمني رأيت في غيبتي موسى على الطور))[١٥]،[١٦]

واتە: ملـوانكە (گرێبەسـت) ی پێغەمبەرایەتـی و سـرووش چرایەكـی نوورینە، لە دەلاقەی شاردنەوەی نهێنییەكان هەڵواسراوە. بە فەرمانی خـوا فووی گیـان كرایە دڵمەوە لە بەهێزیدا وەک فـووكردنی ئیسـرافیل بـوو لە

(صــو)ر. ئەگەر لە (طـور)ی منـدا دەربکەوێـت تـا بمـدوێنێت، لە نەمانمـدا مووسا لەسەر (طور) دەبینم.

حەلـلاج لە وەڵامـی پرسـیاری خەڵکـی لە بـارەی بیسـتنی موسـا بـۆ دەنگی خودا، دەڵێت:

((... متى كان موسى يطيق حمل الخطاب لو بإياه (كذا) كان! لكنه بالله -عز وجل- قام وبه سمع))[١٧] ئەو کاتەی کە موسـا توانیویەتی گوێ بـۆ خـودا بگرێـت، ئەوە موسـای مـرۆڤ نەبـووە. بەڵکـو هەر لەگەڵ بیسـتنی قسەی خودا یەکسـەر فەنا بووە و بووەتە بەشێک لە خـودا، بە وەسـتانی خودایی وەستاوە و بە گوێی خودایی بیستوویەتی بۆیە بەرگەی گرتووە.

لە دێڕی سێیەمی شیعرەکەدا دیارە حەلـلاج پێیوایە خـودا لە طوری دڵـیـیەوە قسـەی لەگەڵـدا دەکـات، ئەو بـۆیە دەتوانێـت بەرگە بگرێـت و ببیستێت، چونکە لەوکاتەدا بووەتە مووسا لەدۆخی بیستنی دەنگی خـودا دا.

لەم مەبەستەدا مەلای جزیری زۆر قووڵ بووەتەوە، هەڵبەتە هەمـوو شـاعیرانی بـواری سـۆفیگەری لە مەبەسـتی فەنـابوون و یەکێتیـی بـوون (وحدة الوجود) دا قسـەیان هەیە، بەڵام ئەوەی مەلای جزیری کردوویـەتی تەواو وێنەکـانی وەک وێـنە شـیعرییەکانی حەللاجـن. بـۆ ئەم مەبەسـتە غەزەلێکی تەرخان کردووە، بەڵام بە داهێنانی شاعیرانەی خۆی، قووڵتر لە حەلـلاج و بە بەکارهێنـانی هەمـان وێنەی شـیعری، لە یەک دێڕدا، هەمـوو مەبەستەکانی گەیاندووە. دەڵێت:

((طورم ب دل و پەیرەوی مووساییم ئەز
ئاتەش پەرس و نووری تەجەللاییم ئەز))[١٨]

دەڵێت:

دڵی من طورە، من پەیڕەوی (موسا) م.

لێرەدا دوو واتا هەیە:

یەکەمیـان ئەوەیە وەک موسـا لە کێـوی طـور وەسـتاوم و وەک ئەو گوێ لە قسەی خودا دەگرم.

دووەمیان: دەیەوێت بڵێ ئەوکاتەی مـرۆڤ تێکەڵی خـودا بـوو، ئیتـر گرنگ نییە بە چ ئاینێک ڕوو لەو دەکات، چونکە ئەوکات ئاینەکان بایەخیان

نامێنێت و ئەو دەکەوێتە پلەیەک لە سەرووی ئاینەوە. ئەوە هەمان ئەو مەبەستەیە کە حەللاج گوتی پێغەمبەرایەتی گرێبەستێکی تایبەتیی نێوان خودا و مرۆڤەکانە و خۆی دەزانێ لەبەرچی کەسێک دەکاتە پێغەمبەر و یەکی تر هەڵنابژێرێت، من کە تێکەڵی خودا دەبم، دەکەومە پێش پێغەمبەرەکانەوە و دەبمە موسا لەساتی گوێگرتنی لەدەنگی خودا (نەک موسایەک لەدۆخی ئاسایی مرۆڤبووندا).

مەلای جزیری بە پارێزگارییەکی زیاترەوە، سنووری پێغەمبەرەکان نابەزێنێت، بەڵام جیاوازیی ئاینەکان ناهێڵێت و ئەوان بە شتێکی تایبەت بە خودا دەزانێت و پێیوایە مرۆڤ کە لە خودا نزیک بوویەوە، ئیتر ئاینەکان دەبن بەیەک و لەدوای پلەی نزیکی لەخوداوە جێدەمێنن.

جوانییەکی تری کارەکەی مەلای جزیری لەوەدایە، وەک حەللاج نالێ کە فەنابووم ئیتر دەبمە خودا، بەڵکو دەڵێ کە فەنابووم، دەبمە ئاگرپەرست. دیارە ئاگر مەبەستی ئەو دیمەنە پیرۆزەیە کە لە کێوی طور خودا نیشانی موسای دا. بەمەش واتاکە دەبێتە ئەوەی کە فەنابووم، هەر خودا پەرستم، بەڵام بە نووری ئەو دەبریسکێمەوە. ئەمە ڕەنگە کاریگەریی زانایی مەلای جزیری بێت لە قووڵیی شەرع و زانستەکانی و نەیتوانیبێت وەک حەللاج ڕێگا بەخۆی بدات هەموو شتێک بڵێت، بەڵام بەم ڕەفتارە بەرزە ئەدەبییەی، توانیویەتی سۆفیگەرییێکی کوردانە دابهێنێت کە پڕیەتی لە ڕێز و شەرم بەرانبەر بەخوا و پێغەمبەرەکان.

**نموونەی چوارەم:** حەللاج لە گوتارێکیدا پێیوایە خودا دڵی ئەوی زەوت کردووە و تێیدا نیشتەجێ بووە. دیارە کە ئەم حزوورە بەردەوامە زۆر سەختە. ئیتر نە حەللاج لەگەڵ خۆی دەبات تا ڕزگاری بێت، نە دڵەکەی دەداتەوە تا بکەوێتەوە دۆخی ئاسایی. حەللاجیش لەوە دەترسێت خودا دڵەکەی بداتەوە و وازی لێبهێنێت. واتا نە بەرگەی لەگەڵ خوابوون دەگرێت و نەبەرگەی دووری لە خوا. دەڵێت:

((ایها الناس اغیثوني عن الله. فإنه اختطفني مني ولیس یردني علي، ولا اطیق مراعاة تلك الحضرة واخاف الهجران فأكون غائبا محروما...))[١٩]

واتا: خەڵکینە ڕزگارم کەن لەدەست خوا، ئەو منی بردووە و نامداتەوە دەست خۆم. منیش توانای بەرگەگرتنی ئەو ئامادەبوونە

بەردەوامەم نییە و دەشترسم لێم دووركەوێتەوە، بە تەنیا و بێبەش بمێنمەوە...

لە بارەی دڵ بردنەوە، مەلای جزیری دەڵێ:

((سەبرو قەرارم كو بر جان و جگەر هور دكر

زولمی وە رەنگ كی دكر جان دبر و دل تەبا))[20]

لەم دێڕەدا تەواوی بوونی مەلای جزیری زەوت كراوە، بوونی ماددی و مەعنەوی كە دڵ و گیانە، هەروەها توانا و بیركردنەوە و هەڵچوونەكانیشی بردووە و تەنیا پەیكەری مرۆڤێكی بۆ هێشتووەتەوە. بۆیە لێقەومانەكەی مەلای جزیری زۆر گەورەیە، بەڵام ئەم سكاڵا و گلەییيەی كە دەیكات، كورتخایەنە و درێژە بە ناڕەزایی نادات. یەكسەر پەشیمان دەبێتەوە و لە دێڕی دوای ئەودا دەڵێ: من هەرچی هەمە هەر هی ئەوە، بۆیە مافی خۆیەتی هەرچی بیكات و كۆتایی بەگلەیی كردنەكە دێنێت. دەڵێت:

((جان و دلێ من ئەوە حور وەشێ من ئەوە

پادشەهێ من ئەوە ئەز ل دەرێ وی گەدا))

ئینجا ئەو دەستكەوتە مەزنەی باس دەكات كە لە ئەنجامی ئەو دڵ بردنەوە دەستی دەكەوێت و دەبێتە بەشێك لە ئاهەنگی توانەوە لە بۆتەی عیشقی یاردا، دەڵێت:

((یارێ كو دی ئەم گەدا دەست ب دەستێ مە دا

ئەم ب سەمایێ برین رەقس و سەماژی وەما))

دووبارە ئەم ئەدەب نواندنەی مەلای جزیری و ڕازی بوونەكەی بە كۆیلەیی بۆ یار و چێژ بینینی لە توانەوەكەی، لە حەللاج جیای دەكاتەوە و لە دووتوێی هەمان وێنەدا شێوازێكی تایبەتیی خۆی پێدەدات.

لە چەند دێڕێكی تردا مەلای جزیری هەمان مەبەستی حەللاج دووبارە دەكاتەوە، بەڵام ئەمجارەیان گەرمتر و نزیكترە لە شێوازی حەللاج و وەك ئەو پەنا دەباتە بەر خەڵك لەدەست زوڵمی یار، دەڵێت:

((خەلقۆ لمن كن شیرەتێ ئەو دلبەرا زەررین كەمەر

من دی د حالی غەفلەتێ هات دەر ژ بورجێ وەك قەمەر

هات دەر ژ بورج و پەنجەران   دل گرت و دا بەر خەنجەران
ئەڤ رەنگە حالی دلبەران   لەو عاشقان خون بوون جگەر))[٢١]

**نموونەی پێنجەم:** حەللاج پێیوایە نابێت نهێنیی پەیوەندی نێوان خۆی و خودا ئاشکرا بکات، چونکە بەو ئاشکرا کردنە خەڵکانی تر دێنە ناو و بەشداری خۆشەویستییەکە دەبن کە شایستەی ئەوە نین. چونکە ئەوان خودا لەڕێگەی سڕینەوەی بوونەوەرەوە دەناسن و لەنێو بوونەوەر نایبیننەوە. لەم بارەیەوە دەڵێت:

((لو شئت كشفت أسراري بأسراري   وبحت بالوجد في سري وإضماري
لكن أغار على مولاي يعرفه   من ليس يعرفه إلا بإنكار))[٢٢]

واتە: ئەگەر بمەوێت بەو هێزە نهێنییانەی کە هەمە، نهێنییەکانم ئاشکرادەکەم. باسی مەستیی خۆشەویستییە نهێنییەکەم دەگێڕمەوە. بەڵام دڵم نایەت بەهۆی قسەکانمەوە کەسانێک گەورەکەم بناسن، کە تەنیا بە داماڵینی لە شتەکانی تر دەیناسن.

مەلای جزیری هەمان مەبەست بە وێنەیەکی شیعری جوان دەخاتەڕوو. ئەو بەزەیی بە بولبول دێتەوە کە بەنەزانی لە گوڵستاناندا بەدوای گوڵ دەگەڕێت لە کاتێکدا کە گوڵ لەلای مەلایە. بەڵام زوو لە درکاندنی ئەو نهێنییە پەشیمان دەبێتەوە و هەڵەکەی دەخاتە ئەستۆی قەڵەمەوە. دەڵێت:

((وی د دەستێ من گولا گەش پور خوناڤ
حەیف بولبول چوو گولستانی غەلەط
هێژ سەهوا خامەیی بوو وەرنە من
ئەڤ غەلەط ناکر د دیوانێ غەلەط)) [٢٣]

**نموونەی شەشەم:** خستنەڕووی یەکێتیی بوون (وحدة الوجود):

دەتوانین بڵێین کە تەواوی پەخشان و شیعرەکانی حەللاج گوزارشتن لە بیرۆکەی یەکێتیی بوون. بەڵام هەندێک لەو گوزارشتانە لۆژیکیانەن و هەندێکیان بە هەڵچوونی شاعیرانەوە نووسراون. لە گوتارێکدا زۆر بە شێوەیەکی لۆژیکییانە هەوڵی شیکردنەوەی ئەو بیرۆکەیە دەدات. دەڵێت:

((النقطة اصل كل خط، و الخط كله نقط مجتمعة. فلا غنى للخط عن النقطة ولا للنقطة عن الخط. وكل خط مستقيم او منحرف فهو متحرك عن

النقطة بعينها، وكل ما يقع عليه بصر احد فهو نقطة بين نقطتين، وهذا دليل على تجلي الحق من كل ما يشاهد، وترائيه عن كل مـا يعاين. ومن هذا قلت: ما رأيت شيئا إلا ورأيت الله فيه)). (٢٤)

واتە: خـاڵ بنچینـەی هەمـوو هێڵـێکە، هێڵـیش هەمـووی خـاڵی کۆبـووەوەیە. نە هێـڵ بـێ خـاڵ دروسـت دەبێـت و نە خـاڵ بـێ هێـڵ دەردەکەوێت. هەموو هێڵێکی خوار یان ڕاست بە هێڵدا دەڕوات. هەرچی چاو ببینێت خاڵێکە لە نێوان دوو خاڵدا. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە خـودا لە هەموو شتێکدا دەردەکەوێت، لەوەوە من دەڵێم: خودا لە هەموو شتێکدا دەبینم.

مەلای جزیریش بۆ شیکردنەوەی مەسـەلەی یەکێتیی بوون، پەنا دەباتە بەر باسی خەت و نوقتە. دەڵێ:

((حەرف ژ یەک بوونە فەسڵ گەر ببەری وان ب ئەسڵ
حەرف دبت یەک خەتەک خەت کو نەما نوقتە ما))(٢٥)

هەروەها لەبارەی بینینی خودا لە هەموو شتێکدا، دەڵێت:

((تەنها نە لمن لامیعی حوسناتە شەفەق دا
عالەم بخوە وێ حوسن و جەمالێ د خوەدا گرت)) (٢٦)

**نموونەی** حەفتەم: لەبارەی نزیکبوونەوەی بەندە لەخودا و هیدایەتی خوایی بۆ ئەو نزیکبوونەوەیە، حەللاج دەڵێ:

((عجبت منک ومني يا منية المتمني
ادنيتني منک حتی ظننت انک اني
وغبت في الوجد حتی افنيتني بک عني)) (٢٧)

واتە ئەی ئـاواتی ئـاواتخوازان، سـەرم لە پەیوەنـدیی مـن و تـۆ سوڕماوە، منت لەخۆت نزیک کردەوە تا وامزانی تۆ منیت. لە مەستیی خۆشەویستیت ون بووم تا بەهۆی تۆوە لەخۆم دابڕام و نەمام.

مەلای جزیری لەم مەبەستەدا، هەمان بۆچوونەکەی حەللاج دووبارە دەکـاتەوە، بەڵام بە داهێنـانێکی شـاعیرانەوە چیرۆکـی مـاتەمینی حەلـلاج دەخاتە ناو مەبەستەکەوە. خۆی وەک نێچیری جوانیی یار دادەنێت، بەڵام دان بەوەدا دەنێت کە ئەو نێچیربوونە، سەرکەوتنی لەدوادایە. دەڵێت:

((مە دزانی کو تو دێ عاقبة الأمر چکی
لەبی لەعلی شەکەرین ئاە کو مەغرور کرین
ذەررەیەک بووم د هەوایا تە د ویرانەیەکی
میثلی رۆژی ب شوعاعا تە خوە مەشهورکرین
ژ (انا الحق) ب لەبێن لەعل خەبەردار کرین
بگولابا سەری زولفا خوە تە مەنصور کرین)) [٢٨]

**نموونەی هەشتەم**: حەللاج پێیوایە کە ئاینەکان هۆکارن بۆ گەیشتن بە خودا و ناکرێت مرۆڤ بەزۆر پەیوەستی ئاینێک بکرێت، دەڵێت:

((تفكرت في الأديان جد محقق     فألفيتها اصلا لها شعب جما
فلا تطلبن للمرء  دينا فإنه     يصد عن الأصل الوثيق وإنما
يطالبه اصل يعبر عنده     جميع المعالي والمعاني فيفهما)) [٢٩]

واتە: بە وردی لە ئاینەکانم کۆڵییەوە، بینیم بنچینەیەکە و لقی زۆری هەیە. ئاینێک بۆ مرۆڤ دەستنیشان مەکە، چونکە لە بنچینە پتەوەکەی دووری دەخاتەوە. مرۆڤ لای بنچینەی ئاینەکان هەموو گەورەیی و مانایەک بەلایدا تێپەڕ دەبێت و هەموو شتێک تێدەگات.

لەبارەی ئەم مەبەستەوە، مەلای جزیری پێی وایە دڵی مرۆڤ پارسەنگی باوەڕە و خودا لەوێدا دەناسرێت و دەپەرسترێت. دەڵێ:

((دل کەعبەیە مەولایە لێ     نارێ کەلیم، ئیسایە لێ
بانگی (انا الله) دایە لێ     هەم کەعبە و هەم طورە دل)) [٣٠]

هەروەها لەبارەی ئاینەکانەوە، پێیوایە هەمووی یەکن و ئەو ئارەزووی خۆیەتی کامەیان هەڵدەبژێرێت، گرنگ ئەوەیە کە دڵی پڕە لە خودا پەرستی. دەڵێت:

((دل گەشتەمە ژ دێری، ناچم کەنیشتەیی قەط
میحرابی وی بمن ڕا،   وەر دا بچینە لالەش)) [٣١]

**نموونەی نۆیەم**: لە ئاستی دڵ پەیوەستبوون بە خوداوە، حەللاج پێیوایە نابێت باسی باوەڕ و بێ باوەڕی بکرێت، چونکە هەردووکیان هەوڵن بۆ وەسفکردنی خودا، خوداش لە وەسفکردن بەرزترە. مرۆڤ کە لە دڵەوە بەخودا گەیشت، هیچ بایەخێک بۆ ئەوە نامێنێتەوە ئیماندار بێت

یان کافر. بۆ سەلماندنی بێ بایەخیی هەردوو وشەی (کفر) و (ئیمان) لەئاست نزیکی لە خواوە، دەڵێت:

((کفرت بدين الله والکفر واجب علي وعند المسلمين قبيح))[٣٢]

لەم بارەدا مەلای جزیری ڕووگەی ئیمان و کوفر وەک یەک دەزانێت، هەروەها پاداشت و سزاش وەک یەک دادەنێت چونکە هەردووکیان لەلای خواوەن. دەڵێت:

((هەردو بورهێن تە نە میحرابی چە ئیمان و چە کوفر
بود و نابود کویەکن ئەڤ چە ثواب چە عیقاب)) [٣٣]

**نموونەی دەیەم:** حەللاج پێیوایە خواوەند بە ویست و بژاردەی خۆی، نیشانەکانی گەورەیی خۆی بۆ هەندێ کەس دەردەخات. ئەم دەرخستنە هەندێ جار لە نموونەی ئەوەندە بچووک و بێ بایەخە، وادەکات مرۆڤ باوەڕی پێ نەکات و ڕەتی بکاتەوە. هەندێ جاریش نموونەی ئەوەندە بەرزو بێ وێنەیە، درکی پێناکرێت و سەر لە مرۆڤ دەشێوێنێت. بۆیە نە ئەوەی باوەڕ دەکات کارێکی باشی کردووە و نە ئەوەی ڕەتدەکاتەوە کارێکی خراپی کردووە.

لەم بارەیەوە دەڵێت:

((... اما بعد الحمد لله الذي يتجلى على رأس ابرة لمن يشاء، ويستتر في السماوات والأرضين عمن يشاء. حتى يشهد هذا بأن لا هو، ويشهد ذلك بأن لا غيره. فلا الشاهد على نفيه مردود. ولا الشاهد بإثباته محمود....))[٣٤]

واتە: ئیتر، سوپاس بۆ ئەو خودایەی لە سەر نووکی دەرزییەک خۆی دەردەخات بۆ کەسێک کە بیەوێت. خۆیشی لە هەندێ کەس پەنهان دەکات لەهەموو زەمین و ئاسمانەکاندا نایبینن. تا ئەو ئاستەی ئەمەیان دەڵێت خودا بوونی نییە و ئەویتر دەڵێت جگە لەخوا بوونی نییە. بۆیە نە ئەوەی گەواهیی نەبوونی دەدات قسەکەی ڕەتدەکرێتەوە، نەئەوەش کە گەواهیی بوونی دەدات ستایش دەکرێت.

لەم بارەیەوە مەلای جزیری پێیوایە ئەگەر مرۆڤ بریسکەی نووری خوایی دیت و دوای کەوت، کارێکی هەڵەی نەکردووە. با لە ڕواڵەتیشدا خەڵکی بە هەڵەی بزانن و ڕەفتارەکانی لەگەڵ نەریتی کۆمەڵایەتی و ئاینیی خەڵک نەگونجێت. نموونەش بە شێخی سەنعان دەهێنێتەوە کە لەبەر کچە

فەلەیەک ڕەنجی چەند ساڵەی خواپەرستی بە با دەدات و دەبێتە فەلە. مەلای جزیری هەڵوێستەکەی شێخی سەنعانیش بە هەڵە نازانێت، بەڵکو ئەویش بە پێغەمبەر موسا دەچوێنێت کە چاوی بە ئاگر کەوت و بریسکەی نووری خوایی بینی، لەو شەوە تاریکەدا یەکسەر ڕایکردە ناو دۆڵەکە و ژن و منداڵەکانی جێهێشت. دەڵێت:

((مەی نەنوشی شێخی صەنعانێ غەلەط
ئەو نەچوو نێڤ ئەرمەنستانێ غەلەط
میثلێ موسی وێ تەجەللایا تە دی
ئێ تودی کانێ خەطا هانێ غەلەط)) (٣٥)

هەر لە درێژەی ئەو باسەدا نموونەی مەجنوون دەهێنێتەوە کە بەهۆی عەشقی لەیلاوە عەقڵی لەدەست دا و ڕووی کردە بیابان، ئەویش کارێکی هەڵەی نەکردووە. لێرەدا مەجنوون بەخۆی دەچوێنێ و کۆی بابەتەکە دەکاتە پاساوی شیعرە پڕ لە جۆش و خرۆشەکانی خۆی. بەمەش وەڵامی هەموو ئەوانە دەداتەوە کە ڕەنگە بڵێن چۆن دەکرێت مەلایەکی وەک شێخ ئەحمەدی جزیری ئەم چەشن و بابەتە شیعرانە بنووسێت! دەڵێت:

((سطوەتا لەیلی یەقین مەجنون تەپاند
وەرنە قەیس ناکەت بیابانی غەلەط
وەک نیشانی نەقش و نیشانەک تەدی
ئێ کو نیشانەک تەدی کانێ غەلەط
ئەز گەهام ئاڤا حەیاتێ خەف ژ دل
خوضر ڤاژی چوویە حەیوانی غەلەط)) (٣٦)

**نموونەی یانزدەیەم:** حەللاج و مەسەلەی حلول.

مەسەلەی حلول، یان ئەو بیروباوەڕەی پێیوایە خودا دەچێتە لاشەی هەندێ کەسی تایبەتەوە. هەڵگرانی ئەو باوەڕە بەو چەشنە ڕاڤەی خودا دەکەن کە لە دۆخی خوداییدا لە ئاسمانە و هەموو سیفەتە خواییەکانی هەیە و نادیترێ، لەو دۆخەدا پێیدەڵێن (لاهوت)[٣٧] واتا دۆخی خوایەتی. مرۆڤیش بە هەموو خەسڵەتە مرۆڤینییەکانییەوە، پێیدەگوترێت (ناسوت)

واتـا مرۆڤێتـی. بە ڕای ئەو بیروبـاوەڕە، دۆخێکـی تـری خـوایی هەیە تێیـدا دەچێتە لەشی مرۆڤێکەوە، واتا لاهـووت و ناسـووت یەکدەگرن. ئەم دۆخە پێیدەگوترێت (حلول) واتا توانەوە لە یەکتریدا.

کریستیانەکان پێیانوایە کە خودا لەگەڵ مەسیح بەیەکەوە لەو دۆخەدا بـوون، بـۆیە مەسـیح توانیـویەتی چەشـنێک مـوعجیزە ئەنجـام بـدات کە پێغەمبەرەکانی تر نەیانتوانیوە.

بیروباوەڕی حلول لە ئاینە هیندییەکانیشـدا هەیە. لێکۆڵینەوەکـان وای دەبینن کە حەللاج لە هیندەوە ئەو بیروباوەڕانەی بۆ دروست بووە.

حەللاج باسی لاهووت و ناسووت بەم چەشنە دەکات:

(دخلت بناسوتي لديک على الخلق

ولولاک لاهوتي خرجت من الصدق

..........................

ظهرت لخلق والتبست لفتية

فتاهوا وضلوا واحتجبت عن الخلق)[٣٨]

واتای دێڕی یەکەم: بەو ناسووت بوونەمەوە کە لەلای تۆیە، چـوومە ناو خەڵک. ئەگەر لەبەرتۆ نەبێ ئەی لاهووتەکەم، بێ باوەڕ دەبم.

دەڵێـت: مـن بەناسـووتی تـۆوە چـوومە نـاو خەڵـک بـۆیە سـەریان لە کارەکـانم سـوڕما، واتە تـۆ بوویـت خوایەتیـت بەمـن دا و مرۆڤێتـی منـت پۆشی و چوویتە ناو خەڵکەوە. لێرەدا خـۆی سـەری لێدەشـێوێت. ئەوەنـدە لەگەڵ زاتی خودا تواوەتەوە، نازانێت خـۆی خـودایە یـان خـودا ئەوە. بەڵام هەر زوو لە نیوەی دووەمـی دێڕی یەکەمـدا ئەوە پشتڕاسـت دەکاتەوە کە ئەگەر هێزی خوایەتی نەدیتبا ئەوا کافر دەبـوو بە بـوونی خـوا. ئەو دەڵێت بۆیە باوەڕی بە خوا پتەوە، چونکە خودا خۆیەتی.

لە دێڕی دوای ئەودا، ئەو بۆچوونەی تەواو شیدەکاتەوە و دەڵێ:

ئەی خـودایە، تـۆ خـۆت بـۆ هەنـدێ کەس دەردەخەیـت تـا لەتـۆدا ون دەبن و سەریان لـێ دەشـێوێت. خۆشـت لە هەنـدێک کەس ون دەکەیـت، تـا ئەو ئاستەی باوەڕیان بە بوونت نامێنێت.

ئەو مەبەستەی دووەم، لە دیوانی حەللاج دا زۆر دووبارە بووەتەوە. بەڵام مەبەستی یەکەم (حلول) چەند جارێک باسی کراوە.

بـۆیە لێـرەدا ڕوونە کە حەلـلاج خـودای لەلا خـودایە و خۆیشـی خۆیەتی. بەڵام توانای زمانیی مرۆڤ ناتوانێت چۆن سکاڵای دابڕان بکات و چۆنیش چێژی نزیکی ڕاڤە بکات. ئەو ئازادیی تەواوی بەخۆی داوە لە چۆنییەتی ڕاڤەکردنی ئەو حاڵەتانەی کە هەستی پێکردووە. هەوڵیشی داوە لە دووتوێی بیروباوەڕێکەوە قسەیان لێوە بکات بۆئەوەی ئاسانتر بگەنە بیری خەڵکەوە.

ئەو جۆرە دەربڕینانە لە نووسینەکانی حەللاجدا زۆرن، بەڵام زیاتر سـەرەڕۆیی و قسـەی نائاگـای سـۆفییانەن نەک خسـتنەڕووی بیـر و باوەڕێکی ڕوون. بە پێچەوانەی ئەمەوە، کاتێک کە حەللاج بەڕوونی قسە لەبارەی زاتی خواوە دەکات، ئەوە خۆی بە بەندەیەکی کز و بێدەسەڵات دەخاتە ڕوو وەک خواناسێکی عاشق و شەرمن دەپاڕێتەوە. بۆیە دەتوانین بڵێـین مەسـەلەی حلـول بەلای حەلـلاجەوە مەسـەلەیەکی بیروبـاوەڕ و فەلسـەفەیی نیـیە، بەڵکـو کەرسـتەیەکی دەربـڕینە بـۆ گوزارشـتکردن لە مەبەستەکانی.

هەمـان مەبەستی ناسـووت و لاهـووت لای مەلای جزیـری ئامـاژەی بۆ کراوە. بەڵام لەگەڵ دوو جیاوازی:

یەکەمیان: مەلای جزیری تەنیا دۆخەکە ڕاڤە دەکات و ناڵێت مـن لەو حاڵەدام.

دووەمیـان: حـاڵی تێکەڵبـوونی ناسـووت و لاهـووت دەداتە پـاڵ یـار، یاریش لە شیعرەکانی سۆفیگەریدا مرۆڤ نییە و خودایە.

دەڵێت:

(ئینسان بمن ناسووتە گەوهەر دنێڤ صەدەفێ
ژ عیلما جەبەرووتە شەمس هاتییە شەرەفێ
(تنزل) ژ لاهووتە مەحبووبە جام د کەفێ) [٣٩]

لەبارەی یارەوە دەڵێ:

(سولتان ژ بالا هاتە خوار لاهووت ب ناسووتێ ڤەشار
پەیوەستە بوو نوقطا مەدار دەورا عورووجی گەڕ وەدا
دەوران گەهاندن هەر طەرەف عاشق گەڕاندن صەف ب صەف
مەحبوب ب فینجانا صەدەف دوڕ دانەیا سەبیالەدا
ساقی کو دا من ئەو سولاف فەیضا مەیا گولگون و صاف
زائیل کرن شوبهە و خیلاف عیلمەک ژ بەژنی روقعەدا) [٤٠]

دیـارە ئەو ڕاڤەیەی یـار، لە یـاری زەمینـی و مـرۆڤ ناوەشـێتەوە. چـونکە مەلا دەڵـێ کـاتێ شـەرابی بەمـن دا و لەو فەیـز و بەرەکەتەم خـواردەوە، ئیتـر هەرچـی گومـان و دوودڵییە لەلام نەمـا و بـوومە خـاوەن عیلمێکی خوایی.

جیاوازیی مەلای جزیری لەگەڵ حەلـلاج ئەوەیە، حەلـلاج ڕاسـتەوخۆ مەبەستەکان بەوپەڕی زیادەڕۆییەوە دەردەبڕێت، ترسی نییە و دەیەوێت خەڵک لێی تێبگەن. مەلای جزیری مەبەستەکان بە خـوازەیی دەردەبڕێت و سـنووری ئەدەب لەگەڵ خـودا و بیـرو بـاوەڕەکەی ناشـکێنێت. ئەو، شێوەیەکی خوازەیی وای بەکار هێناوە، بۆگەیشتن بە وێنە شیعرییەکەی و بۆ گوزارشتکردن لە جوانیی یارەکەی، گەیاندوویەتییە کەمـاڵی خـودایی تـا خەڵک تێبگات مەلای جزیری دڵی بە کەسێکی کەم بـایەخ نەداوە. لەلایەکی ترەوە و بە دەربڕینە سۆفییانەکەوە، بۆ گوزارشـتکردن و نزیککردنەوەی جوانیی خودایی لە عەقڵی مرۆڤ، خوای بە یارێکی یەکجار شۆخ و شـەنگ و کامـڵ چوانـدووە. تـا خەڵـک تێبگـات ئەو خـودایەی مەلای جزیـری عاشقیەتی، چەندە جوان و شایستەیە.

**ئەنجام:**

• لەم لێکــۆڵینەوەیەدا دەردەکەوێــت مەلای جزیــری کــاریگەریی ڕاسـتەوخۆی نووسـینەکانی حەللاجـی بەسـەرەوە بـووە. ڕەنگە لە باسـی بیری سۆفیگەرییەوە سوودی لە ئەدەبیاتی فارسی بینیبێت، بەڵام لە وێنە شیعرییەکان، کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی حەللاجی بەسەرەوە دیارە.

• مەلای جزیــری بە داهێنــانی ئەدەبیــی تــایبەتیی خــۆی و بە پابەنـدبوونی بە بیروبـاوەڕی ئیسـلامەتی بەو چەشـنەی کە لە کتێبەکـانی خوێنـدنی مەلایەتیدا هـاتووە، توانیـویەتی سـۆفیگەرییەکی کوردانەی پڕ لە ڕێـز و ئەدەب دەرهەق بە بنەمـا ئایینییەکـان، پێشکەشـی ئەدەبـی کـوردی بکات.

• حەلـلاج و مەلای جزیـریش، هەردووکیـان باوەڕیـان بە بۆچـوونی (حلوول) نەبووە بە واتا فەلسەفییەکەی. بەڵام چەمکەکەیان بەکارهێناوە بۆ گوزارشتکردن لە ڕادەی نزیکبوونەوەیان لە خودا.

## پەراوێزەکان:


١) مارف خەزنەدار (د.)، ئەدەبی بەراوردکاری و پەیدابوونی لای ئێمە، ئەکادیمی، کۆواری کۆڕی زانیاری کوردستان، ژ: ٥، ٢٠٠٧، لا: ١٤.

٢) خانزاد عەلی قادر (د.)، ڕەنگدانەوەی لەیلاو مەجنوون لە ئەدەبی کوردیدا، هەولێر، ٢٠١١، لا: ١٦.

٣) بڕوانە: عیماد وەیس خالید، بەراوردی داستانی (داستانی شێخی سەنعان) ی عەتتاری نیشاپووری وفەقیێ تەیران، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی دهۆک، ٢٠٠٣، لا: ٤٣ – ٤٥.

٤) داود سلوم (د.)، دراسات في الأدب المقارن التطبيقي، دار الحرية، بغداد، ١٩٨٤، ص:٢٧.

٥) ل. ماسنيون و ب. كراوس، اخبار الحلاج، منشورات الجمل، المانيا، ١٩٩٩، ص: ٨٧.

٦) بۆ زانیاری لەبارەی ژیانی مەلای جزیری، بڕوانە: (ژیان و بەرهەمی مەلای جزیری، شایەتنامەی ژیانی، ک. ئەییوبی) لە کتێبی (چەند وتارێکی کوردناسی، ئەنوەر قادر محمد لە ڕووسییەوە کردوویە بە کوردی، لا: ٢٠٥ – ٢٤٨).

٧) گۆڤاری کوردناسی، ژمارە ١،ساڵی ٢٠٠٥، ل٢٠١٦.

٨) ديوان الحلاج و كتاب الطواسين، ط٣، ل ٨٥.

٩) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، ل ٨١.

١٠) هەمان سەرچاوە، ل ٨٦.

١١) العقد الجوهری في شرح ديوان الشيخ الجزري، احمد بن الملا محمد الزفنگي، ج١، ط٢، مطبعه الصباح، ١٩٨٧. لا: ٨٥.

١٢) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، ل ١١٧.

١٣) ديوان الحلاج و كتاب الطواسين، ط٣، ل ١٥٤.

١٤) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، تهران، ١٣٦١، ل: ٥٧٩.

١٥) ديوان الحلاج و كتاب الطواسين، ط٣، ل ٢٩.

١٦) ماسنیۆن لە لێکۆڵینەوەکەیدا لەجیاتی (بطوري) نووسیویەتی (لروحي). بەڵام لە سەرچاوەکانی تر (بطوري) هاتووە. بڕوانە: شرح ديوان الحلاج، د.كامل مصطفى الشيبي، دار الجمل، بغداد،٢٠٠٧. ل: ٢٣٥.

١٧) هەمان سەرچاوە. ل ٢٣٩.

١٨) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، ل ٢٣٩.

١٩) اخبار الحلاج، ل. ماسنیون و ب. کراوس، دار الجمل، ط١، المانیا، ١٩٩٩، ل ٢٧.
٢٠) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، ل ٢١.
٢١) هەمان سەرچاوە، ل ٢٣١.
٢٢) کامل مصطفی الشیبی (د.) و بولص نویا الیسوعی، دیوان الحلاج و کتاب الطواسین، منشورات الجمل، ط٣، بغداد، ٢٠٠٧، ص: ٥٥.
٢٣) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، ل ٣٠٠.
٢٤) اخبار الحلاج، ل ١٩.
٢٥) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، ل ٢٢.
٢٦) هەمان سەرچاوە، ل ١١٦.
٢٧) دیوان الحلاج و کتاب الطواسین، ط٣، ل ٨١.
٢٨) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، ل ٣٨٤.
٢٩) دیوان الحلاج و کتاب الطواسین، ط٣، ل ٧٧.
٣٠) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، ل ٣٥٤.
٣١) هەمان سەرچاوە، ل ٢٦٩
٣٢) دیوان الحلاج و کتاب الطواسین، ط٣، ل ٤١.
٣٣) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، ل ٦٦.
٣٤) اخبار الحلاج، ل ٦٢.
٣٥) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، ل ٢٩٥.
٣٦) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٦.
٣٧) بڕوانە: لاهوت: http://www.almaany.com/ar/dict/ar-ar
٣٨) دیوان الحلاج و کتاب الطواسین، ص:٧٠.
٣٩) دیوانی مەلای جزیری، لێکدانەوەی هەژار، لا: ٥٨١.
٤٠) هەمان سەرچاوە، لا:

**ملخص البحث**

هـذا البحـث الموسـوم (مقارنـة الأمثلـة للفكـر التصـوفي بـين أشـعار وكتابات الحلاج وأشعار الملا الجزيري)، بحث في الأدب المقارن. يهدف الى ايجـاد أوجـه التشـابه والإخـتلاف بـين الحـلاج والمـلا الجزيـري فـي فكـرهم التصوفي.

الفكـر التصـوفي، فكـر إنسـاني مشـترک بـين الشـعوب والأجيـال. ومـن طبيعة الفكـر المشـترک ان يخلـق مواضـيع مشـتركة ومتقاربـة بـين الشـعوب والأجيال المختلفة.

تـأتي أهميـة هـذا البحـث مـن حيـث محـاولتـه إيجـاد مـا يتميـز بـه المـلا الجزيـري مـن أسـلوبه الخـاص لطـرح الأفكـار مختلفـا عـن الأسـلوب المباشـر لحلاج.

يتكـون البحـث مـن فصـلين. الفصـل الأول تعريـف بـالأدب المقـارن وشخصية الحلاج والملا الجزيري. والفصل الثاني فصل تطبيقـي يقـارن بـين الأمثلة المتشابهـة والمختلفة بين كتابات الشخصيتين. وينتهي البحث بعرض قائمة المراجع والملخص باللغتين العربية والإنجليزية.

## Abstract

This research investigated (Comparing The Examples of The (Sufism) Thoughts Between The Poems and The Writings of (Hallaj) and (Malay Jaziri), in comparative literature. The purpose of the current study is to identify the similarities and differences between Hallaj and MalayJaziri in their mystical thoughts.

Sufism is a common human thought which is shared by peoples and generations. Also, common thinking creates common subjects and thinks between peoples

The importance of the current study is tries to find out the smilarites and differences, especially shows the difference points of Malay Jaziri about the Sufism which is relied on.

The research consists of two chapters. The First Chapter is the definition of the comparative literature and the character of Hallaj and Malay Jaziri. The Second chapter is an applied chapter which compares the similar and different examples between the poems and writings of the two characters.

The research ends with a list of the resources and abstracts in Arabic and English language.

# شیکردنەوەی سۆز لە دیوانی 'حەز دەکەم ئەوەندە بژیم'ی سەباح ڕەنجدەردا[1]

**م. ی پەروین عەبدوڵلا خدر**
بەشی زمانی کوردی
کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پوختە:**
سۆز، تێم (ڕامانی سەرەکی)ی دەروونی و مەعنەویی شیعرە و توخمێکی بنچینەییە لە هەموو بەرهەمێکی ئەدەبیدا. هەربۆیە تاوتوێ و شیکردنەوەی سۆز لە شیعردا پێویستە. ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە شرۆڤەی توخمی سۆزە لە شیعری (سەباح ڕەنجدەر)دا، لە گۆشەی جیاجیاوە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا وەرگرتن و گواستنەوە و جۆرەکانی سۆز شەرح دەکرێت، زیاتر لەسەر گواستنەوەی سۆز، واتە بابەتگەلی پەیوەندیدار بە خزمایەتیی سۆز لەگەڵ توخمگەلی دیکەی وەکو وێنە، زمان، ئەزموون و بەردەوامیی سۆز لە دیوانی "حەز دەکەم ئەوەندە بژیم"ی (سەباح ڕەنجدەر)دا تاوتوێ دەکرێت.

ئەم لێکۆڵینەوەیە توخمی سۆز و هاوئاهەنگیی ئەو توخمە شیعرییە لەگەڵ توخمەکانی دیکەی شیعری (سەباح ڕەنجدەر) لە کۆمەڵە شیعری (حەز دەکەم ئەوەندە بژیم)دا تاوتوێ دەکات. هەرچەند لە سەرلەبەری ئەزموونی پتر لە سی ساڵ شیعرنووسینی (سەباح ڕەنجدەر)دا سۆزی جیاواز بەرچاو دەکەوێت، کە جۆرەکانی سۆز بەپێی دۆخ و کەشی شیعرەکانی ئەو شاعیرە نوێخواز و پێشڕەوەی کورد دەگۆڕێن. میتۆدی لێکۆڵینەوە لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەیە لەبارەی چەمکی سۆز، وەکو توخمێک لە توخمە پێکهێنەرەکانی شیعرەوە.

**وشە سەرەکییەکان:**

(سەباح ڕەنجدەر)، شیعر، سۆز، وەرگرتنی سۆز، گواستنەوەی سۆز، بەردەوامیی سۆز

## پێشەکی:

سۆز، دژکردەوەی مرۆڤە، کە لە بەرانبەر ئەزموونە دەروونی و ژینگەییەکانیدا لە خۆی نیشان دەدات. شیعر بە زاڵبوونی هەست و سۆز بەسەر ڕۆحی شاعیردا دەست پێدەکات و چۆنێتیی ڕووبەڕووبوونەوەی شاعیر لە بەرانبەر ڕووداوەکاندا بەیان دەکات. هەرچەند بزوێنەری سۆزی شاعیر پەیوەندیی بە هۆکارگەلی دەرەکی و ژینگەییەوە هەیە، بەڵام پەیوەندییەکەی بە دەروونی شاعیرەوە زیاترە و لەڕاستیدا ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە دەروونی شاعیرەوە هەیە، چونکە "هەست و سۆز کاتێک سەر هەڵدەدەن، کە مەیلە هەردەمی، یان کاتییەکانی تاک لە ناکاودا، یان نەزۆک دەبن، یان ئاسان دێنە بەرچاو. کەواتە پەیوەندییان بە چییەتیی بزوێنەری دەرەکییەوە زۆر کەمترە لە پەیوەندییان بە دۆخە گشتییە دەروونییەکەی ژیانی تاکەوە لە کاتی سەرهەڵدانی بزوێنەرەکەدا.[٢]

هونەر بەگشتی و شیعریش وەک جۆرێک لە هونەر، گۆڕەپانی گواستنەوەی سۆزە. تۆلستۆی پێی وایە وەرگرتنی سۆزی شاعیرانە پشت بە لێهاتوویی مرۆڤ دەبەستێت و دەڵێت: "چالاکیی هونەر لەسەر بنەمای ئەو لێهاتووییەی مرۆڤ هەڵچنراوە، کە تاکێکی مرۆڤ بە وەرگرتنی هەستە شرۆڤەکراوەکانی مرۆڤێکی دیکە، لە ڕێگەی دیتن، یان بیستنەوە، دەتوانێت هەمان هەستی کەسی دەربڕ، یان شرۆڤەکەر لە ئەزموونی خۆیدا دووبارە بکاتەوە."[٣]

بەهۆی بەربڵاوی و گرنگایەتیی لایەنە سۆزدارییەکانی شیعرەوە، لێرەدا هەموو ڕێدۆزە سۆزدارییەکان لە دوو بواردا کۆ دەکەینەوە: وەرگرتنی سۆز و گواستنەوەی سۆز. لە بواری یەکەمدا هۆکارگەلی

وەکو جۆری سۆز (کەسی، گشتی، جۆری) و ئاستی سۆز (قووڵ، ڕووکەشی) تاوتوێ دەکرێن. لە بواری دووەمیشدا ڕێدۆزەکانی وەکو خزمایەتیی سۆز لەگەڵ توخمەکانی دیکەی وەکو وێنە، زمان، ئەزموونی شیعری و... جۆرەکانی سۆز و بەردەوامیی جۆرە سۆزێکی تایبەت لە سەرلەبەری شیعردا هەڵدەسەنگێنرێن.

## پێشینەی ئەم لێکۆڵینەوەیە:

لە کۆمەڵێک کتێبی وەکو **نۆستالژیا لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا**[٤]، بەرهەمی (سۆران مامەند عەبدوڵڵا) و **لیریکای شاعیری گەورەی کورد، مەولەوی**[٥]، بەرهەمی (ئەنوەر قادر محەمەد) و **دەروونشیکاریی شیعر**[٦]، بەرهەمی (پێشڕەو عەبدوڵڵا) و چەند وتار و لێکۆڵینەوەیەکی دیکەدا ئیشارە بە گرنگیی سۆز لە چەند لایەنێکی هونەری شیعردا کراوە، بەڵام بەپێی بەدواداچوونی توێژەری ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەو کتێب و وتارانەی ئیشارەیان پێکرا، هیچکامیان سۆزیان نەکردووەتە تەوەرەی سەرەکیی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان؛ بەتایبەتی لەبارەی شیعری کوردییەوە هیچ لێکۆڵینەوەیەک لەسەر بنەمای سۆز نەکراوە، کە بە شێوەیەکی تایبەتی هەردوو لایەنی (وەرگرتن) و (گواستنەوە)ی سۆزی تێدا تاوتوێ کرابێت.

## بەشی یەکەم: شیکردنەوەی سۆز لە شیعردا

### ١. پێگەی سۆز لە شیعردا:

سۆز لە شیعردا خاڵی دەستپێکی پەیوەندی و هاوئاهەنگیی مرۆڤی شاعیر و جیهانی دەوروبەری و دەقەکەیەتی. شاعیر بە چەکی سۆز بەرەنگاری هەمووی ئەو شتانە دەبێتەوە کە دەبنە بەربەست لە بەردەم هاوئاهەنگیی نێوان پاژەکانی دەقەکەی و خۆی و جیهاندا.

ڕووداوە خۆش و ناخۆشەکانی ژیان و دەوروبەری شاعیر کۆمەڵێک هەست و سۆزی بزوێنەر لە مێشکیدا بەجووڵە دەخەن. ئەو هەست و سۆزانە کە دەخرێنە چوارچێوەی دەربڕینەوە، کەلامێکیان لێ بەرهەم دێت، کە سەرلەبەری پێکهاتەکەی بۆنی سۆز لەخۆی دەگرێت. سۆزی شاعیر، ئەو توخمە پێکهێنەرانەی شیعر کە لە یەک سەرچاوەی سۆز و هەستەوە سەریان هەڵداوە، بە دەقدا بڵاو دەکاتەوە، بە چەشنێک کە هەر توخمێک تێکەڵ بە توخمێکی دیکە دەبێت و پێکهاتەیەکی ئۆرگانی پێکدێنێت. دەکرێ بڵێین سۆز، هەودایەکە بۆ پێکەوەگرێدانی سەرلەبەری توخمە پێکهێنەرەکانی شیعر و، لە ڕاستیدا گرنگترین هۆکاری پەیوەندیی نێوان پاژەکانی شیعرە و هەر بەم هۆیەوە سەرلەبەری توخمە پێکهێنەرەکانی شیعر بە شێوەیەکی هاوئاهەنگ لەپێناو سۆزدا دەجووڵێن. شاعیر لەژێر کاریگەریی سۆزدا شیعرەکەی لە کەشێکی یەکپارچەدا دەکات بە دەقێک، کە لە نێوان وێنە، هزر، پەیڤ، ئەزموون و وێناکردنیاندا هاوسەنگییەک دروست دەکات.

شیعری ڕاستەقینە ڕاستەوخۆ لە هەستی کەسێکەوە هەڵدەقوڵێت؛ واتە کۆی شتەکان، دۆخ و زنجیرە ڕووداوەکان دەبن بە فۆڕمی سۆزێکی تایبەت؛ بە جۆرێک کە لە کاتی هاتنە ئارای ڕاستییە دەرەکییەکاندا، هەمووی ئەو شت و دۆخ و ڕووداوانە لە ئەزموونی هەستەکەدا لەناو دەچن و بەخێرایی لە شێوەی سۆزدا هەڵدەچن. هارت کرەین(i)، شاعیری ئەمریکایی لەو بارەیەوە دەڵێت: "وێنەکان کە هەر لە خۆیانەوە [بە گوێرەی لۆجیکی زانستی، یان باو] هیچ پێوەندییەکان بە

یەکترەوە نییە، کاتێک لە خولگەی سۆزێکی تایبەتدا، کە پێوەندییەکی تایبەتی بە هەردووکیانەوە هەیە، لێک هەڵدەپێکرێن، دەبنە هۆی وەبەرهاتنی گیان و دەربڕینێکی ورد لە پێناسەی ئەو سۆزەدا." (٧)

هونەر بە گشتی و هونەری شیعر بەتایبەتی، ڕۆحێکی داهێنەر و ڕەهای بەگەڕکەوتووە، کە پڕە لە هەست و سۆز. توخمی سۆز نەک هەر کەرەستە و بنەمایەکە لە بەر دەستی شاعیردا بۆ ئەوەی هاوئاهەنگی و یەکپارچەیی دەقەکەی خۆی پێ ڕێکبخات، بگرە هێزی کاریگەری دەقی ئەدەبییە لەسەر خوێنەر و دژکردەوەی خوێنەر لە بەرانبەر ئەو دەقە ئەدەبییەدا. دەیڤید بڵایک(ii) لە کتێبی **خوێندنەوەکان و هەستەکان: بەرکوڵێک لەسەر ڕەخنەی زەینی**دا بە شێوەیەکی گشتی پێی وایە، بەرهەمی ئەدەبی هەبوونێکی سەربەخۆی نییە، کاردانەوەکەی تەنیا لەو کاریگەرییەدایە کە لەسەر نووسەران و خوێنەرانی خۆی دایدەنێت. (٨). کەواتە، ئەو کاریگەرییانەی دایاندەنێت، زۆر گرنگن و شایانی لێکدانەوە و خوێندنەوەن. کە سۆز گرنگترین توخمی کارتێکەری درک و وەسفی بەرهەمی هونەری و شیعرە.

(سەباح ڕەنجدەر) لە پێشەکیی دیوانی **'حەز دەکەم ئەوەندە بژیم'**دا کە نموونەی شیکراوەی سۆز لە شیعرەکانیدا بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە لەو دیوانە هەڵدەبژێرین، دەڵێت: "بەر لەوەی هۆگری نووسینی شیعر ببم، هۆگرییەکی ڕاستەقینە و هەستگەرمییەکی زۆرم بۆ خودی شیعر لا پەیدا ببوو."(٩) واتە پێش ئەوەی شیعر بنووسێت، سۆزێکی گەرمی بۆ شیعر لا دروست بووە. دواتریش هەر ئەو سۆزە وای لە (سەباح ڕەنجدەر) کردووە، کە هەست و سۆزەکەی بکات بە دەق، وەک دەڵێت: داهێنەر ئەوکاتە هەست بە ژیان و دۆخ دەکات، کە هەستەکانی خۆی لە ئەشقی پەتیدا بنووسێتەوە..

لایەنە سۆزدارییەکانی شیعر گەلێک بەرین و بەرفراوانن، هەربۆیە دەکرێت لە ڕەهەندی جیاجیاوە شرۆڤەی ئەم توخمە لە شیعردا تاوتوێ بکرێت. بەڵام دەکرێ سەرلەبەری ئەو ڕەهەندانە لە دوو بواردا چڕ

بکرێنەوە: وەرگرتنی سۆز و ڕاگواستنی سۆز. (سەباح ڕەنجدەر) دەڵێت: "ئەو تێگەیشتنەی شاعیر بە هۆی زەین و هەستەکانییەوە تێبینیی دەکات لە کـــردەی بەنووســـینکردندا دەبێـــتە وێـــنە و ئاســـۆ و دووری و پەیوەندییەکی فراوان و کاراتر وەردەگرێت و دەگاتە خاڵی گەشـەکردنی پەیوەنـدیی زەیـن و هەسـتەکانی زمـان. ئەم خـاڵی گەشـەکردنە لە پەیوەنـدیی زەیـن و هەسـتەکانەوە دروسـت دەبێـت و دەخـرێتە کـار و تاقیکردنەوەوە. لە خرانە کار و تاقیکردنەوەدا زەین و هەستەکان ئاستی بێئاگایی زمان دەگوازنەوە بۆ ئاستی بەئاگایی زمان. ئاستی بەئاگایی زمـان لە وێنەی بێگەرددا دەردەکەوێت و هەستیاریی دەروونیی وشـە دەناسـێنێت و هەوڵـی خۆدەرخسـتن و شێوەڕێکخسـتن لە خـانەی بـاڵادا دەدات."[10] ئەوەی لەم بۆچوونەی (سەباح ڕەنجدەر)ەوە تێبینی دەکرێت، بە تەواوەتی لە مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوەیە نزیکە و ئەوەمـان بۆ ڕوون دەکـاتەوە، کە تـوخمی سـۆز کـاریگەری لەسـەر هەمـوو تـوخمە پێکهێنەرەکانی دیکەی شیعر هەیە و سۆز و جیلوەکانی ژیانی مرۆڤ بەسەر توخمەکانی دیکەی شیعردا زاڵە.

**٢. وەرگرتن و گواستنەوەی سۆز لە شیعری سەباح ڕەنجدەردا:**

دەستڕاگەیشتن بە حەقیقەتی هەر وتەیەک لە ڕێی واتـا و پێکهـاتە بەرچاوەکەیەوە، بەبێ ڕوانین و ڕامانێکی هەستیار و سۆزدار ناکرێت و تەنـــانەت لە نەشـــیان و مەحاڵیشـــەوە نـــزیکە. هەربـــۆیە لە زۆربەی هەرەزۆری ئەو پێناسانە، یان باشتر بڵێین، ئەو تیۆرییانەدا، کە لەبارەی شیعرەوە خراونەتەڕوو، شیعر بە هەستی سۆزداری هزرێکی بە ڕیتم و ئاواز وەسف کراوە. شاعیر لە ڕێی وەرگرتنی سۆزی وێناکراوی بە ڕیتم و ئاوازەوە خوێنەری خۆی دەگوازێتەوە بۆ قووڵایی نیگایەک، کە لە ڕێی هەستەوە نەبێ، شیاوی درککردن نییە. "پەیوەندیی نێوان شاعیر و شـــیعرەکەی، پەیوەنـــدییەکی شـــێوەییە، کە پەیوەنـــدیی بە هـــزر و جەسـتەی شـاعیرەوە هەیە."[11] هـیچ هزرێکـی قـووڵ و بەهێـز بەبـێ

نیگایەکی پڕ لە سۆز بەرهەم نایەت و هیچ داڕشتنێکی شاعیرانەش بەبێ ڕەنگدانەوەی ئەو نیگا بەسۆزە بە ئاکام ناگات. "مرۆڤ بەبێ سۆز وەک لاشەی وێرانبوو وایە، پێکهاتووە لە ماسوولکە و جومگە و دەمار."(١٢) کاتێک کە خۆری وتە لە تویێ تیشکی سۆزەوە خۆی بڵاوکردەوە، هەسارە سارد و سڕەکەی لۆجیک و ئایدیا و هزر دەخاتە وەسوەسەی داهێنانی بوونەوەرێکی نوێوە، کە پێیدەگوترێت شیعر.

لە شیعری (سەباح ڕەنجدەر)دا گەڕانێکی بەردەوام بەدوای خۆی، وەک مرۆڤدا هەیە، کە بۆ ئەو گەڕانە ڕێگای شیعری بە هەنگاوی سۆز گرتووەتە بەر. لە خوێندنەوەی شیعرەکانیدا درک بەو ڕاستییە دەکرێت، کە مرۆڤ دەتوانێت بە ناخی خۆی بگات. واتە مرۆڤ دەتوانێت خاوەنی سۆزێک بێت، کە لە ڕێی ئەو سۆزەوە تا قووڵایی هەموو شتەکان، تەنانەت تا قووڵایی ناخی خۆی بچێت و لەوێدا هەست بە بوونی خودا و کەلامی خودا بکات، یان پێی بگات و تێکەڵاوی ببێت.

**ئەی شیعر ئەی ناوی خۆم**
**پەروەردەت کردم چۆن ببمە کوڕە گەورەی بنەماڵەت**
**بۆ خوانی**

| **ئاو** |
|---|
| **ئاگر** |
| **با** |
| **خۆڵ** |

**داوەت کراوم**
**گۆرانیم گوت و بە ناخی خۆم گەیشتم**
**بە ناخی خۆم بگەم بە**

| **تەورات** |
|---|
| **ئینجیل** |
| **قورئان** |

**دەگەم**

وەرگرتنی ئەو سۆزەی کە شاعیر پێی بە ناخی خۆی و کەلامی خودا گەیشتووە، بار و حاڵەتێکی کتوپڕ نییە و بە خوێندنەوەی ئەزموونی زیاتر لە سی ساڵ شیعرنووسینی (سەباح ڕەنجدەر) دەبینین لە چەندین بواری جیاجیادا جۆر و ئاست و هۆکارەکانی سۆزی ئەزموون کردووە. لە ئەزموونە سەرەتاییەکانی ئەم شاعیرەوە تا ئێستا سۆزێک بەردەوامە، کە تێیدا مرۆڤ کەوتووەتە بەر سەرنجی "سەرسامی" و لە دواین دیوانیشیدا، واتە دیوانی **"حەز دەکەم ئەوەندە بژیم"**، کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا تاوتوێ دەکرێت، هەمان سۆز بەردەوامە.

لەو واتا سۆزدارانەی لە شیعری شاعیری **"حەز دەکەم ئەوەندە بژیم"**دا بەردەوامە و لە دیوی ناوەوەی وشەکان و دێڕەکانیدا نهێنە و دەچێتە فۆڕمی دەربڕینی عیرفانی ڕۆژهەڵاتی گۆی زەوییەوە، سۆزەکانی "جۆش" و "خەم"ـە، کە هاوئاهەنگ لەگەڵ یەکتر لەلایەن شاعیرەوە وەردەگیرێن و لە پەیڤی جیاجیادا وێنا دەکرێن. وشەکانی **"زەنگ، زایەڵە، دەنگ، جۆش، یاد، دروود، پەیام و ستایش"** لە یەکەم شیعری دیوانی **"حەز دەکەم ئەوەندە بژیم"**دا سۆزێکی پڕ لە جۆش و خرۆشن، کە لە ناخی "هەواڵێک و داوایەک"ی خەمباردا وەردەگیرێن، بۆ ئەوەی لە **"بستە خاکێکی مرادخواز و ماندوودا"**بە شادی بگوازرێنەوە و بۆ ئەو گواستنەوەیەش داوا و تەمەننای هەشتا ساڵ تەمەن و ئەزموون بکات:

**هەشتا ساڵ دەزوو بە دەرزی وەکردنێکە**
**بە سەر ڕاوەشاندنی پڕ خەمەوە**

لەو ئەزموونە هەشتا ساڵە داواکراو و خوازراوەی شاعیردا بەردەوام **"مووچڕکێک و سۆزێکی تایبەت"** ئاشق، کە لێرەدا شاعیرە و نموونەی جۆری مرۆڤە پێدەگەیەنێت. بەڵام ئەم پێگەیشتنە، پێگەیشتنێکی ئاسایی نییە، پێگەیشتنێکە لە **"پرس و ڕا بە هێزی ئومێد"**ەوە دەگات بە

"**دۆنایدۆنی**" دوو جەمسەری فکریی دنیا؛ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، کە لە ڕۆژهەڵات "ئەڤین و ئومێد" وەکو چۆنییەتیی بنچینەیی و بایەخداری سۆزی مرۆڤ دەبنە بنەمای لادانی زۆربەی کێشە و گرفتەکانی ژیان و ئەم وشانە خۆیان بە هەڵقوڵاوی چاوگەیەک دەزانن، کە لە ئاسمانەوە هاتووە و لە ناوەکانی "**تەورات، ئینجیل، قورئان**"دا هەرمان بووە. بۆیە سۆزی کەلامی شاعیری ئەم باسەی ئێمە، گەیشتن بەو چاوگەیە، یان ڕوونتر بێژین، گەیشتن بەو کەلامە ئاسمانییانە بە چوونە ناو "ماڵی ڕۆشن" وەسف دەکات:

**دەستم بگرە با بچمە ماڵی ڕۆشن**
**ماڵم لە سێبەری باڵندەیەک دانا**
**گوتی لەبەر خاتری تۆ بۆ ماوەیەک فڕین دوا دەخەم**
**تا پشوو دەدەیت و تێرخەو دەبیت و خەونێک دەبینیت**
**خەونی**

| تەورات |
|---|
| ئینجیل |
| قورئان |

**ئەریَ شادیی بێهوودەی خەونەکانم چی لێ بکەم**

لە دەربڕینی ئەم ڕستە شیعرەدا کە دەڵێت، **ئەریَ شادیی بێهوودەی خەونەکانم چی لێ بکەم** هەست بە خەمێک دەکرێت، کە ئەویش "شادیی بێهوودەی خەونەکانم"ە و لە ڕاستیدا ئەو "شادی'یە بە هۆی "بێهوودە"بوونییەوە دروستکەری "خەم"ێکە و لێرەدا لێکدژییەک لە هەردوو سۆزی "شادی" و "خەم"دا بەدی دەکرێت، کە خۆی لە جسناتی ئەو لێکدژییە بەردەوامەی ناو هزری عیرفانی ڕۆژهەڵاتییە. ئەم لێکدژییەی نێوان سۆزی خەم و شادی لە شیعری کوردیدا ڕیشەدارە و لە ئەوپەڕی خۆیدا دۆنایدۆن لە نێوان خەم و شادیدا ڕوو دەدات و خەم دەبێ بە شادی و شادی دەبێت بە بێهوودەیی، کە هەر خەمە. بۆ نموونە، مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێت:

**سەدای زیل و بەم مەینەت سەد تەرزەن**
**خەفەت شادیشەن، خەم دەماخ بەرزەن** (١٣)

وەک پێشتر باس کرا لە دوو جەمسەرە فکرییەکەی دنیادا جیهانبینییەکان لەمەڕ پێکهاتەی گەردوون و ژیانەوە جیاوازن. لە ڕۆژهەڵات "ئەڤین و ئومێد" وەکو چۆنییەتیی بنچینەیی و بایەخداری سۆزی مرۆڤ دەبنە بنەمای لادانی زۆربەی کێشە و گرفتەکانی ژیان، بەڵام لە ڕۆژئاوا بە گوێرەی بنەمای فکری یۆنانی کەونارا جیهان لە چوار توخم پێکهاتووە، کە هەرچواریان ماددین و پێکهاتوون لە "ئاو، ئاگر، با، خۆڵ". ئەم بۆچوونە ڕۆژئاواییە لە کۆنەوە لە لای بیرمەندانی ڕۆژهەڵاتیش بووەتە جێی تێڕامان. ئیبن سینا، پزیشک و فەیلەسووفی ناوداری ئێرانی لە کتێبی قانوونەکەیدا دەڵێت، جەستەی مرۆڤ لە دوو توخمە قورسەکەی "ئاو و خۆڵ" دروست بووە و ڕۆحیشی لە دوو توخمە سووکەکەی "ئاگر و با". (١٤) بە گوێرەی ئەم تیۆرییە (سەباح ڕەنجدەر) لە ڕێی "ئومێد"ەوە کە سۆزێکی بەردەوامە لە سەرانسەری دیوانەکەی "**حەز دەكەم ئەوەندە بژیم**"دا پرسیار دەکات و ڕای "**هێزی ئومێد**" وەردەگرێت بۆ ئەوەی شێوەگۆڕین و دۆنایدۆنێک لە هەبوونی خۆیدا ئەنجام بدات و ساغ بێتەوە لەسەر ئەوەی کە "**ئاو، ئاگر، با و خۆڵ**" بێت، یان "**تەورات، ئینجیل و قورئان**"؟ بەڵام شاعیر پێش ئەوەی وەڵام بداتەوە "کامیان بێت"، حەز دەکات، لەو شوێنانە دوور کەوێتەوە کە لە جیاتی پرسیاری هەبوون بە هەر جۆرێکی جیاواز، باسی کوشتنی لێیە:

**سەرێک بکێشە ماڵێک کە بڕیاری کوشتنی**
**مانگ و بازی دڵ و بازی کێوانی تێدا نەدراوە**

دیارە بزوێنەری ئەم سۆزە ئەو کەشە سیاسی و کۆمەڵایەتییە پڕ لە شەڕ و ئاژاوە و تیرۆر و تۆقاندنەیە، کەوا مرۆڤەکان لەسەر بیروڕای جیاوازی ئایینی، فتوای کوشتنی یەکتر دەردەکەن. بەڵام (ڕەنجدەر) بە خولقاندنی "بارێکی تایبەت"، وێنایەکی یەکجار بەرزی سۆزدارانە لە زمانی شیعردا دەئافرێنێت و دەڵێت:

**چەند ڕووخۆشانە دەفی ڕوومەتی خودا**
**پەنجەی باریک کردوومەتەوە**
**هەموو ڕازێکی خستووەتە دڵم**
**لەمەوبەدوا ژیان بە سادەیی وەردەگرم**
**سادەیی گیانی خودایی ئاراستە دەکات**
**لە دڵ و گیان و چاومان ڕادەمێنین**
**دڵ و گیان و چاومان**
**پڕاوپڕ دەبن لە هێزی درێژکردنەوەی ژیان**

وێنای "**ڕووخۆشانەی دەفی ڕوومەتی خودا**" کاریگەرترین سۆزە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت خۆی پێ لە دووڕییانی "کامیان بم" ڕزگار بکات و لە "سادەیی ژیانەوە" بە سادەیی "گیانی خودایی" بگات و "دڵ و گیان و چاو"ی پڕبن لە "هێزی درێژکردنەوەی ژیان". لێرەدا دیسان سۆزی "ئومێد" لە واتای "درێژکردنەوەی ژیان"دا بە شێوەیەکی زۆر ڕۆحانی لە لایەن شاعیرەوە ڕادەگوێزرێتە دەروونی خوێنەرەوە.

لە دیوانی "**حەز دەکەم ئەوەندە بژیم**"دا ئەو سۆزانەی هەست بە بەردەوامییان دەکرێت، بریتین لە: ئومێد، شادی، نۆستالژی، ئەڤین، مەستی، تاسە و بنەماڵە ــ وەک ناوەندی هەموو سۆزەکان. (سەباح ڕەنجدەر) بۆ گواستنەوەی ئەو سۆزانە لە ناخی خۆیەوە بۆ ناخی خوێنەر، شیعر بە ماڵ و کەسوکار و درەختی بنەماڵەی خۆی لەقەڵەم دەدات و دەڵێت:

**دیوان و ماڵم سەرڕێژن**
**لە تیشکی خودا و پیاڵەی پڕی بەزەیی**
**دەستی ڕەشی دەسیسە ناتوانێت بیانشارێتەوە**
**بەیانییەک بە ئومێدی**
**مەحاڵ دەستەمۆکردن لە خەو هەڵدەستم**
**دەچمە ناو پەڕی گڤبوونەوەی کەڵەباب لە کاتی بانگدان**
**بیر لە تۆ دەکەمەوە ئەی کەسوکار و درەختی بنەماڵەم شیعر**

شاعیر بە بیرکردنەوە لە شیعر، نامومکین دەستەمۆ دەکات، لە شیعری **"ژیان لە دوو سەدە"**دا شیعر دەبێتە "برای خوێنی و شیری"ی شاعیر، خودا لەبری هەموو شتێک شیعری پێدەبەخشێت، کەچی ئەو سوپاسی ئەو "بەشە باشە"ی خۆی دەکات. چونکە دەتوانێت هەر بە شیعر هەموو شتێک وەربگرێت و هەموو شتێکیش لە خۆیەوە بگوازێتەوە بۆ دیتران.

یەکێکی دیکە لە سۆزە درێژخایەن و قووڵەکانی ناو شیعری (سەباح ڕەنجدەر) سۆزی نۆستالژییە. نۆستالژی، هەستکردنە بە حزوور و بیرهاتنەوەی ڕابردوو. هەروەها گەڕانەوەیە بۆ ڕابردوو، وەکو شتێکی هەردەم هەبووی ئامادە. کەسانێک گوتوویانە ڕابردوو، تێپەڕیوە، ئەوەی کە ماوە هەر ئێستایە و هیچی دیکە نییە. کەسانێکی دیکەش دەڵێن شتێک بە ناوی ساتی ئێستا لەگۆڕێدا نییە و تێگەیشتنی ئێمە لە هەبوونی خۆمان کۆی ئەزموونەکانی ڕابردوومانە لەگەڵ کۆی بۆچوونەکانمان دەربارەی داهاتوو. هۆگرانی فەلسەفە باسەکە درێژ دەکەنەوە و هەرکامەیان بەرگری لە یەکێک لەو دوو بۆچوونە دەکەن، بەڵام کۆمەڵێک بیرۆکەی لۆجیکی لەبارەی کردەوەی مێشکەوە، برەو بە بۆچوونی دووەم دەدەن: واتە هەستکردن بەوەی کە من پێشتر ئەم چرکەیە و ئەم دیمەنەم دیتووە و ژیانی من، یان چارەنووسی من سیناریۆیەکە، پێشتر لەسەر تەختەبەردێکی پارێزراو نووسراوەتەوە. ئەو جۆرە ئەزموونە چرکەییانە دەبنە هۆی ئەوەی کە ڕابردووش بەقەدەر ئێستا لە زەیندا ئامادە بێت. (سەباح ڕەنجدەر) لە شیعری **"مانەوە لەژێر ڕووناکیدا"** دانیشتن لەژێر درەختی نزیک کانی و ئاو بە نەوای بەختیاریی خودایی دەزانێت، چونکە سیمای کەسوکاری خۆی لەو کانی و ئاوەدا دەبینێتەوە و، ئارەزوو دەکات لە ناو ڕووناکیی شۆڕشگێڕدا بمێنێتەوە و دڵناسکانە لە یادی کۆچی سووری یارانیدا دەگری. ئارەزووی "مانەوە" کە سۆزی نۆستالژی بە سەرانسەری شیعرەکەدا دەپژێنێت، خۆی ئارەزوویەکی نۆستالژییە، ئاخر نۆستالژی،

سەرباری چۆنایەتییە فرە بەسۆزەکەی، لایەنێکی هزرییشی تێدایە، ئەو هزرەی لە ڕەوتی زەماندا بەرهەم هاتووە و کە ئاوڕ لە پشتە سەرمان دەدەینەوە، مەتەڵۆکە پێچەڵپێچەکانی پێشتری ئاسان کردووەتەوە و بە ئاسانی دەتوانین ڕوونیان بکەینەوە. سۆزی نۆستالژی لە شیعرەکانی "چاوەڕوانیی تێکشکاو"، "بەدوا ڕۆیشتن" ،"ڕاهێنانی دەنگ"، "مانەوەی وێنەیەک"، "گەرمبوونەوەی یادەوەری"، "مانەوە لەناو ڕووناکیدا" و دەتوانین بڵێین لە سەرانسەری دیوانەکەدا بەردەوام دەبێت.

بنیاتنانی سۆز لە شیعری (سەباح ڕەنجدەر)دا، بنیاتنانی جوانییە لە ناحەزیدا، بنیاتنانی "ئەشق"ـە لە ساکاریدا و بنیاتنانی باشەیە لە خراپەدا و بنیاتنانی شادییە لە خەمدا و سەرەنجام بنیاتنانی خودایە لە ژیانێکی شادماندا.

**جوانی هەموو کات هی من بووە**
**بە تاسەی خودایی بە سینگمەوە نووساندووە**
**بۆ دواجاریش ئاوڕێک لەم تۆپەڵە ڕیخۆڵەیەی**
**ناو زگی مریشک دەدەمەوە**
**ژنەکەم بۆ پشیلەی فڕێ دا**

*

**توو خوای جوان وەرە خەونم**
**بۆ ئەوەی ساکارانە بڕوانمە زەوی**

*

**چاکەیەکی زۆری شاعیرە**

| | |
|---|---|
| **مەنگۆلی** | **و** |
| **دڵڕەش** | **و** |
| **بەدگۆ** | **و** |
| **دەروونکلۆر** | |

**ەکانم لەسەرە**
**بەوەی زۆر گێچەڵیان پێکردووم**

*

**زوو هاتییە ناوچەوانم و چاوم بە جوانیی خودا کەوت**
**ژیانێکی شادمانم لەگەڵتدا بردووەتە سەر**

**٣. جۆرەکانی سۆز لە شیعری سەباح ڕەنجدەردا:**

لە زمانی یۆنانیی کۆندا سێ وشەی ئیرۆس (Eros)، فیلیا (Phily) و ئاگاپیـــا (Agapi) هەرکامەیـــان دەربـــڕی جۆرێـــک لە بەیـــانکردنی خۆشەویستی بوونە. ئیرۆس، سۆز و خۆشەویستیی ئارەزوومەندانە بووە بۆ ماددە و جەستە؛ فیلیا، هۆگرییەکە لە ناخی مرۆڤدا هەست بە شتێک دەکات، ئەم وشەیە بە واتای خۆشەویستی بووە، وشەی فەیلەسووف (philosophia) بە واتای خۆشەویستی بۆ زانست، لە دوو وشەی فەیلۆ و سۆفیا، واتە هۆگری و زانست پێکهاتووە؛ ئاگاپیا بە واتای سۆزی ڕۆح و گیان بووە. [١٥] بەڵام لەم لێکۆڵینەوەیەدا مەبەست لە جۆرەکانی سۆز ئەوەیە کە ئاخۆ سۆزەکانی شاعیر تایبەت بە خۆین، یان تێیاندا هەست بە تێکڕای مرۆڤ دەکرێت. واتە لەم لێکۆڵینەوەیەدا جۆرەکانی سۆز، دوو جۆرە سۆزی کەسی و گشتین.

جۆرەکانی سۆز لە شیعری (سەباح ڕەنجدەر) لە یەکەم نیگادا وەکو سۆزی کەسی دێنە بەرچاو، چونکە لە ئاوێنەی کەسیی خۆیەوە باس لە وەرگرتنی سۆز دەکات، کەچی لە شیکردنەوەی نیشانەگەلی زمانیی شیعرەکانیدا دەدرەکەوێت، بەشی زۆری جۆری سۆزەکانی ناو شیعری (ڕەنجدەر) گشتین و پەیوەندییان بە درک و تێگەیشتنی گشتیی مرۆڤەوە هەیە، کە بیر لە شیعر دەکاتەوە، وەک "**کەسوکار و درەختی بنەماڵە**" بیری لێدەکاتەوە. بنەماڵە چەمکێکی گشتییە.

**درەختی ئادەم و حەوا**
**لەناو کتێبی حەز دەکەم ئەوەندە بژیم**
**چ دڵناسکانە لە کۆچی سووری یاران کەوتە گریان .**
یان
**چراکان لە گەڵتدا ڕێ دەکەن**
**بەخشندە بە**
**بەسەر ڕێبوارانی دڵشکاو دابەشیان کە**

لەو نموونانەی سەرەوەدا دەبینین کە وەرگرتن و گواستنەوەی جۆری سۆز لە شیعری (ڕەنجدەر)دا لە وێنەیەکی کەسێکدا وێنایەکی گشتی پێشان دەدات.

**٤. ئاستی سۆز لە شیعری سەباح ڕەنجدەردا:**

سۆز، خۆی لە چەند ئاستێک پێکدێت، هەستی سۆز وەکو تێکەڵکردنی ڕەنگەکان وایە. [١٦] ئاستی سۆز لە شیعری (سەباح ڕەنجدەر)دا لە قووڵایی هزردایە. شاعیر بە لەبەریەکهەڵکێشانی سۆزە شیعرییەکانی خەم و شادی، ئومێد و سەرسامی و ژیانی ئێستا و نۆستالژیا وا دەکات کە خوێنەر بیر بکاتەوە و تووشی ڕامان ببێت. بۆ نموونە:

**مێژوو لەناو خوێنمان قاقا پێدەکەنێ و دەنگی خۆش نییە**

سۆزی پێکەنین بەلای مرۆڤەوە خۆشە، بەڵام پێکەنینی "دەنگناخۆش" وێنایەکی نەسازە و ئەم نەسازییە وادەکات خوێنەر بە شێوەیەکی قووڵ بیری لێ بکاتەوە:

**لە تەمەنێکی گەرم بە سەرسووڕماوی مامەوە**
**ئادەم بە چ زمانێک قسەی دەکرد**
**تەورات / ئینجیل / قورئان**

لەم کۆپلە شیعرەدا سۆزی سەرسووڕمان و سەرسامی لە ئاستێکی زۆر قووڵدا بەکار دێنێت بۆ وروژاندنی پرسیارێکی زۆر گرنگ، کە هەر خوێنەرێک دەخاتە قووڵایی ڕامانەوە. زمانی ئادەم چی بوو؟ ئادەم بە چ زمانێک لەگەڵ خودا دەدوا؟ کە لە ناخی ئەم پرسیارە قووڵەوە پرسیارێک دێتە گۆڕێ بەقەدەر تەمەنی هەبوون قووڵە، ئەویش ئەوەی کە خودا بە چ زمانێک قسەی لەگەڵ ئادەم دەکرد؟ بزوێنەری سۆزدارانە و هزرمەندانەی ئەم پرسیارە، هەم ڕووی لە فرەییی ئایینەکانی مرۆڤە و هەمیش هۆکارێکی فەلسەفی ـ سیاسی دێنێتە بەرپرسیار، کە بۆچی زمانی کوردی، زمانی هیچکام لە کتێبە

ئاسمانییەکان نییە؟ نە تەورات، نە ئینجیل، نە قورئان، کەچی هەر ئەو سێ کتێبەش بەسەرهاتی قسەکردنی ئادەم و خودا پێکەوە دەگێڕنەوە. تۆ بڵێی بە زمانی کامیان بووبێت.

**٥. بەردەوامیی سۆز:**

لە هونەردا دەرچوون لە ڕێسا و چوارچێوەکانی زمان و گرێبەستە باوەکان و چوونە ناو دنیای خەیاڵەوە سەرباری بەربڵاوییە ڕواڵەتییەکەی دەبێتە هۆکاری لەبەریەکهەڵوەشانی پاژەکانی بەرهەم، بەڵام سۆز تایبەتمەندییەکە، سەرلەبەری پاژە لێکهەڵوەشاوەکان لە شوێنێکدا لێک گرێ دەداتەوە. بەرهەم ئەوکاتە پێی دەگوترێت بەرهەمی هونەری، کە توخمێکی سەرەکیی هەبێت و ڕۆحی پێبەخشیبێت و لە ئاڵۆزکاوی و ناتەبایی وێناکانی و پاژەکانی دەرباز بووبێت. سۆز، ئەو توخمە سەرەکییەیە، کە چۆنییەتییەکی تۆکمە بە بەرهەمی هونەری دەبەخشێت. بێنێدێتۆ کرۆچی(iii) دەڵێت: "ئەو شتەی کە لە بەرهەمگەلی ڕەسەنی هونەریدا سەرنجمان ڕادەکێشێت، فۆرمێکی بەتەواوەتی خەیاڵییە، کە حاڵەتێکی گیانداری بە خۆیەوە گرتووە و ناوی لێدەنێین، زیندوویی، تۆکمەیی و پایەداریی گشتیی بەرهەمی هونەری. کەچی لە بەرهەمگەلی جەڵەبیی هونەریدا چەندین حاڵەتی جۆربەجۆری ڕۆحی دەبینین، کە نەک هەر پێکەوە هاوئاهەنگ نین، بگرە دەڵێی چین چین کەوتوون بەسەر یەکدا و بە شێوەیەکی ناڕێک و ناتەبا وەدیار کەوتوون"[١٧] لە بەرهەمگەلێکدا کە سۆز تێیاندا لاواز و جەڵەبی بێت، تۆکمەیییەکەیان حاڵەتێکی ڕووکەشی و ڕواڵەتی هەیە و لە ڕاستیدا لەو هەودا پتەوە بێبەشن، کە یەک بە یەکی پاژەکان بە یەکەوە گرێ دەدات. ژان کۆهێن(iv)، ڕەخنەگری فەرەنسی دەڵێت: "قووڵترین بەستێنی هەر شیعرێک، دۆزینەوەی تۆکمەییە لە ڕووکاری سۆزەکەیدا، تەنانەت ئەگەر لە ئاستی نێوەرۆکەکەیشیدا بزر بووبێت." [١٨] شاعیر هەستی سۆزەکەی بە شێوەیەکی یەکسان بەسەر سەرلەبەری شیعرەکەیدا تا

کۆتـــایی دابەش دەکـــات و خـــوێنەری ئەو چەشـــنە شـــیعرانە لە خوێندنەوەیانـدا تووشـی لێکـدژی و نـاکۆکیی دوو هەسـتی جیـاواز و نەساز نابێت، کە هەرکامیان ئەوی دی بخاتە ژێر هەیمەنەی خۆیەوە و کـارتێکەرییە سـۆزدارییەکەی کەم بکـاتەوە. لێـرەدا شـیعری **"گەرمـایی ناوچەوان"** لە دیوانی **"حەز دەکەم ئەوەنـدە بژیم"**ی (سـەباح ڕەنجدەر) بە نمـوونەی بەردەوامیـی سـۆز لە سەرانسـەری شـیعرێکی تـوکمەدا دەخوێنینەوە:

**لەرزی دیدار لەسەری پەنجەی پێمەوە دەبێتە ڕووداو**
**بە تەواوی دەمار و خوێنمدا**
**مێرووله و هەڵبەز و دابەز دەکات**
**لە چاومدا دەبێتە ئاگری بێئامان و هەواڵی مەرگ**
**لە ڕووناکیی دیداردا چاوم سووتا**
**لەمەوبەدوا هیچ مووچرکێک بە چاومدا تێناپەڕێت**
**دیمەنی ناشیرینیش سەر و دڵم ناگرێت**
**تەنیا دەست لە چرچ و لۆچی ناوچەوانم دەخشێنم**
**کە بە دڵی دیدار بە ڕێگادا بڕۆم**
**درەختەکانی ئەم دەست و ئەو دەستم چاوڕوونمن**
**لە گەڵمدا دەڕۆن و ڕوانینەکانم ناشێوێنن**
**نەبینین باڵندە لە ئاسمان وڕ و کاس و تاساو دەکات**
**ئای چاوم چەند ئارەزووی فرمێسکی شکۆی هەیە**
**چ شینایی ئاسمانی لەناوبرد**
**لە ڕووناکیی دیداردا داڵ دای لە دەمار و خوێنم**
**کلۆش بۆ گەنمی ڕژاوی گیانم باری**
**ناسینی بەهار لە دڵی نواڵەدا بوو**
**ویستم بیناسم نەمناسی**
**لەمەوبەدوا لە سێبەری خۆم وچان و پشوو دەدەم**
**بۆ دیدار و خەونبینینیش دەچمە ناو ڕووناکییەکی شەرمن**

شاعیر دیدارێکی کردووە. خۆشیی دیدارەکە لەرزێکی خستووەتە سەرتاپای جەستەیەوە. دیدارەکە دیدارێکی هێند خۆش و ڕووناک بووە، کە خۆشی و ڕووناکییەکەی چاوی وەگێڕەوەی دیدارەکە، واتە شاعیری نابینا کردووە. بەڵام نەک نابینایەکی ماددی، وەکو ئەوەی کە چاوی شاعیر بەڕاستی کوێر بووبێت، بگرە مەبەست لە نابیناییەکە ئەوەیە کە ئیدی دیداری هیچ شتێکی دیکە هێندە خۆش نابێت کە شیاوی دیتن بێت. ئیتر بیر لە دیداری جوان و ناشیرین ناکاتەوە، تەنیا بە خەیاڵ بیر لە پاتبوونەوەی ئەو دیدارە پڕ لە چێژ و سۆزە دەکاتەوە. دوای ئەو دیدارە تەنانەت درەخت و باڵندە و ئاسمانی شینیش نابینێت، لەو دیدارەدا دەبوو بەهار بناسێت و نەیناسیوە، ئیتر لەبن سێبەری خۆی، واتە لە تەنیایی خۆیدا دەژی، نایەوێت هیچ کەسێک ببینێت، بۆ خەونبینینیش دەچێتە ناو ڕووناکییەکی شەرمنەوە. کە ئاوەڵناوی شەرمن بۆ ڕووناکی بۆ نیشاندانی تەریکییەکەیەتی.

لەم شیعرەدا هەستی نوقمبوون لە ڕووناکیی دیداردا سەرتاپای سۆزی دەروونی شاعیری داگیر کردووە. لە سەرەتاوە تا کۆتایی شیعرەکە، یەک بە یەکی دیمەنە شیعرییەکان تەزووی ئەو سۆزی دیدارەیان تێدایە و سۆزی دیدار ڕووناکییەکە سەرلەبەری پێکهاتەی شیعرەکەی ڕوون کردووە و وەکو پەیکەرێکی تۆکمەی وشە خستوویەتە بەر دیدی خوێنەر. واتە وەک خۆی دەڵێت "**لەرزی دیدار لەسەری پەنجەی پێمەوە دەبێتە ڕووداو**" تەزووی سۆزی دیدار لە سەرەتاوە تا کۆتایی شیعرەکەی کردووە بە ڕووداوی لێکگرێدراو.

گرنگیی هەڵسەنگاندنی جۆر و ئاست و بەردەوامیی سۆز بۆ ئەوەیە کە نیشان بدەین توخمی سۆز چەندە بەسەر توخمە پێکهێنەرەکانی دیکەی شیعردا زاڵە، یان خزمایەتیی توخمی سۆز لەگەڵ باقیی توخمە پێکهێنەرەکانی شیعر، وەکو وێنە، زمان، هزر، مۆسیقا، کەشسازی، ئەزموونی شیعری و... هتددا چۆنە.

## بەشی دووەم:
## پەیوەندیی سۆز بە توخمە پێکهێنەرەکانی تری شیعرەوە

### ١. پەیوەندیی سۆز و وێنە:

ئافراندنی وێنە یەکێک لە توخمە کاریگەرەکانی بەهێزکردنی زمانی شیعرە، چونکە وێنە بە چەشنێک خوێنەر ڕادەتڵەکێنێت، کە سەرنجی بە لای دەقەکەدا چڕتر دەکات و هێزی زمانیش لە گەیاندن و گواستنەوەی سۆزدا زیاتر دەکات، شێخ نووری دەڵێت: "ئەو تەئسیرەی لە قسەیەکی جوان بۆمان حاسڵ دەبێت، لەگەڵ چاوپێکەوتنی لەوحەیەکی دنیایەکی جوان و گوێگرتن لە مۆسیقایەکی خۆش عەین تەئسیری هەیە."[١٩] ئەزموونەکانی شاعیر دەبنە هۆی بزواندنی زەینی خۆی و بەهۆی کاریگەریی ئەو بزواندنەوە، وێنەکان کارتێکەریی سۆزدارانە بەدی دێنن. لە بارێکی تایبەتی سۆزدا، شاعیر دەکەوێتە کەشێکەوە کە تۆڕێک لە وێنە و توخمگەلی پەیوەندیدار بە وێنەی تێدایە. گرنگیی ئەو تۆڕی وێنانە و توخمە پەیوەندیدارەکانیان لەوەدایە، کە وێنەکان لەگەڵ سۆزی شاعیردا تێکهاڵاون و پێکەوە پەیوەند دراون:

**درەختەکانی ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگاوبان**
**فەرموویان لێ کردم ئەی سروودی سروودەکان تێپەڕە**
**شکۆی خۆشەویستانت لە ئاسماندا ببینە**
**دایکە سروشت**
**دەزووی گەورەمەندیی لە پەنجە ئاڵاندم و هەڵیدام**
**بێ دڵ لەدڵدان**
**بە ئاسماندا ڕۆیشتم و گەیشتم بە شکۆی پەیام**
**هەمووومان لە سێبەریدا دەست لە دڵمان دەدەین**
**بارانێک بە هیواوە نمە دەکات**
**سڵاوی بنە گوڵێکی پێیە و لە تەنیشتمان دادەنیشێت**
**نیگای دەکاتەوە و بەسەر گیانماندا دەمێنێتەوە**
**بێ ئەوەی بدوێم هەواڵی خرۆشانێکم دەداتێ**

**باڵندەی بێدەنگی هێلکەکانی ترووکان و کەوانەی بڕی**
**خۆ درەوشانەوەیەکی لەمە مەزنترمان نییە**
**لە ئومێدی ئەو باڵندەیەدا بژین**
**هێلکەکانی لە گەرمای تیشکی خودادا ترووکان**

لەم شـیعرەدا شـاعیر چـاوەڕێی ئومێـدێکی گەورەیە و هەر بە ئومێدی ئەو ئومێدە گەورەیەشەوە چاو بە دەوروبەری خۆیدا دەگێڕێت. لەسـەر جـادەیەک وەسـتاوە، کە درەختەکـانی ئەمـبەر و ئەوبەری جـادەکەش دەزانـن ئومێـدێکی گەورەی بە دەمەوەیە، هەربـۆیە بە سـروودی سـرووودەکان فەرمـووی لـێ دەکەن بەرەو شـکۆی خۆشەویستانی لە ئاسمان بڕوانێت و لەوێدا بیانبینێت. بارینی باران بە هیواوە، سڵاوی بنەگوڵ، هەواڵی خرۆشان، تروکانی هێلکەکانی باڵندەی بێـدەنگی، واتە شـکانی بێـدەنگی، درەوشـانەوەیەکی لە هەمـوو درەوشـانەوەیەک مەزنتـر، کە هـیچ درەوشـانەوەیەک لەو مەزنتـر نـیـیە، وێڕای ژیان لە ئومێدی ئەو باڵندەیەدا کە هێلکەکانی لە گەرمای تیشکی خودادا تروکاندووە. کەسێکی لەو شێوەیە ئەگەر بەو سۆزەوە لە هەر دیـاردەیەک بڕوانێـت، هەر ئومێـدی مەزنـی تێـدا بەدی دەکـات. وێـنە جۆربەجۆرەکانی نـاو ئەم شـیعرە هەریەکەو سـۆزێکی جـودا نـین، بگـرە سـۆزی شـاعیر هەموویـانی پێکەوە گـرێ داوە و هەر وێـنەیەک لە لای خۆیەوە جوانییەکی بە شیعرەکە بەخشیوە و زمـانی شـیعرەکەی بەهێز کردووە. ڕنێ وولک(٧)، نووسـەری مێژووی ڕەخنەی نوێ دەڵێت: "ئەو شتەی کە کاریگەریی وێنە لە شیعردا دروست دەکات، زیاتر خەسڵەتی شـتەکەیە وەکـو ڕووداوێکـی زەینـی، کە بە شـێوەیەکی یەکجـار سەرسـووڕهێنەر پەیوەندیی بە سـۆزەوە هەیە." [٢٠] هەسـت و سـۆز لە وێنەسـازیی شـیعریدا دەبـنە ڕێبەری شـاعیر. خـۆ هەر هێنـانی وێـنە بە دوای وێـنەدا کـارتێکەرییە کەلامیـیەکەی شـیعر دروسـت ناکـات، بگـرە ڕادەی خزمـایەتی و پەیوەنـدیی ئەو وێنـانە لەگەڵ سـۆز و هەسـت

شیعریکی تۆکمە و کارتێکەر دەخولقێنێت. واتە لە شیعردا خزمایەتی و پەیوەندیی هەموو توخمە پێکهێنەرەکانی شیعر لەگەڵ ئامانج و بابەتی شیعرەکەدا گرینگە. واتە دەبێ هەستی زاڵی شیعر بە لای خولقاندنی وێنەی وادا بچێت، کە هێزی سۆزی شیعر زیاتر بکات. لە سەرلەبەری دیوانی **"حەز دەکەم ئەوەندە بژیم"**دا وێنە شیعرییەکان پەیوەندییەکی ئۆرگانییان بە سۆزەوە هەیە و لەم دیوانەدا شیعر وەسفی دەروون و دەوروبەر و تەنانەت بنەماڵە و ناو خێزانی شاعیرە. بۆیە سۆزی شیعرەکان لە وێنای دەروونیی شاعیرەوە دەگەڕێنەوە بۆ ژینگەی دەوروبەری شاعیر و تەنانەت دەگەڕێنەوە بۆ ناو کێشە ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی دەوروبەری شاعیر.

**٢. پەیوەندیی سۆز و زمان:**

زمان بۆ شاعیر ڕایەڵێکە بۆ گواستنەوەی خرۆشە زەینی و سۆزییەکان و هەست و واتاکان. ئەگەر لای ئەرەستۆ شیعر وێنەکردنی زمان بێت، لای ڕۆمانسییەکان دەبێتە بەکارهێنەری پێویستیی زمان. [٢١] هەربۆیە شاعیر هەموو ئیمکانیات و تواناییەکانی زمان لەپێناو گواستنەوەی سۆز و واتادا بەکار دێنێت. کۆمەڵێک هۆکار لە هەڵبژاردنی وشەکانی شیعردا کاریگەرییان هەیە، کە بەشێکیان لە دەرەوەی زمانن، وەکو کەسایەتیی کەسیی شاعیر، بەتایبەت بارە دەروونی و ڕۆحییەکانی؛ هەروەها خوێنەرانی شیعر، نەریتی ئەدەبی، پێشینەی مێژوویی، ژینگە و دۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی سەردەمی شاعیر. بەشێک لەو بابەتانە، وەکو یەکەمەکەیان خزمایەتیی لەگەڵ سۆزی شاعیر هەیە. شاعیر ئەو وشانە هەڵدەبژێرێت، کە سەبارەت بە وشەکانی دیکە تایبەتمەندییەکی تایبەتییان هەیە و پەیوەندییەکی ڕواڵەتی و ناخەکیی چەندلایەنە لەگەڵ وشەکانی دیکەدا پێکدێنن. لەوانەیە هەر پەیڤێک چەندین هاوواتای هەبێت، کە شاعیر شیاوترین و بەربڵاوترینیان هەڵدەبژێرێت. بەڵام ئەو هەڵبژاردنە دەستەبژێریکی

هۆشیارانە و بە ئانقەست نییە، بگرە هێزی ڕاکێشەری سۆزی دەروونی شاعیر شیاوترین و بەهێزترین وشە دەدۆزێتەوە.

وشەکانی ناو شیعر دەلالەتی واتایی بەرفراوان لەخۆ دەگرن و بەستینی واتایی شیعر فراوان دەکەن. وشەکان لە نهێنیی خۆیاندا وزەیەکی سەیروسەمەرەیان شاردووەتەوە. شاعیری بەتوانا ئەوکەسەیە کە دەتوانێت ئەو وزە پەنگراوە سەیرەی ناخی وشەکان بە تەکنیک و جوانکارییەکی تایبەتی بەکارهێنانی وشەکان لە شیعردا ڕەها بکات. وشەکانی شیعر لە پێکهاتەی گشتیی شیعرەکەدا پێکەوە سازگارن، سەرباری ئەوەی کە هەر وشەیەک واتای تایبەتیی خۆی هەیە، بەڵام لێکدژی و نەسازی لەگەڵ وشەکانی دیکەدا دروست ناکات، بگرە تۆکمەیی و هاوئاهەنگی لە سەرلەبەری شیعردا پەرە دەستێنێت و ئەو تۆکمەیی و هاوئاهەنگییە، یەکێک لە گرینگترین هۆکارەکانی گواستنەوەی سۆزە لە شیعردا.

بۆ دیتنی پەیوەندیی سۆز و زمان لە شیعری (سەباح ڕەنجدەر)دا، شیعری "کە مەرگ مانای نامێنێ" دەخوێنینەوە:

**گیا بە دەمودووی گیای سەرپەڵە و سروەوە**
**سەما دەکات و ئاهەنگ دەگێڕێت**
**لەناو بێستان و ڕێگای بە گیادا**
**پەیڕەوی ڕەوشتی بای سەرپەڵە و سروە دەکەم**
**وەک ئەوان هەنگاو بە نەرمی دەنێم**
**بای سەرپەڵە و سروە بە قووڵی گیایان خۆشدەوێت و بۆ ناخی هەڵدەکەن**
**خۆشەویستی دێڕێکە لە شیعرێک کە بە بوون چوێندراوە**
**لە شوێنێک کە دڵە**
**مەرگ دەبێتە میوەیەک و دەستی بۆ دەبەین**
**ئەشق ڕەنگی دەبێتە ڕەنگی**
**سەدو بیست و چوار هەزار پێغەمبەر**

**هێما و ڕاز پڕ دەبن لە شیعر و جاویدانی و لە سەرەتادا وشە هەبوو**
**لەگەڵ خۆم دەیانهێنمەوە ماڵەوە**
**دڵبەرە دڵباشەکەی من**
**شیعر و**
**جاویدانی و**
**لە سەرەتادا وشە هەبوو**
**لەگەڵ خۆتان بمبەنەوە خانەی خودا**
**هەرچی لە ئەفسوونی هەمیشەی ڕوودەدات با ڕووبدات**

لەم شیعرەدا وشەکانی "گیا، سەرپەڵە، سروە، بێستان، ڕێگای بە گیا، میوە" بەتەواوەتی پەیوەندییان پێکەوە هەیە و فەزایەکی سەوزی ژیانبەخش دەخولقێنن، کە تێیدا مەرگ مانای نامێنێت و واتای سەرناوی شیعرەکە وەڕاست دەگەڕێت. هەروەها وشەکانی "شیعر، خۆشەویستی، ئەشق، ڕاز، لە سەرەتادا وشە هەبوو" دەبنە فریادڕەسی سۆزی دەروونیی شاعیر و داوایان لێ دەکات لەگەڵ خۆیان بیبەنەوە بۆ خانەی خودا، واتە بیبەنەوە بۆ سەرەتا کە وشە هەبوو. کە گەڕانەوە بۆ خانەی خودا و بۆ سەرەتا کە وشە هەبوو، واتە دەستپێکردنەوەی ژیان و لەناوبردنی مردن.

(سەباح ڕەنجدەر) وەکو تایبەتمەندییەکی ڕێبازی شیعریی خۆی هێندێک وشە دەکاتە ناوەندی زمانی شیعرەکەی و گەردوونێک لە پەیڤی جیاوازی بەدەوردا دەچنێت. بۆ نموونە لە شیعری **"گۆرانییەک لەدڵەوە تکایە سەر زەوی پڕ"**دا لە کۆپلەی یەکەمدا وشەکانی "ئەفسوون، ئەفسانە، غەزەل و ئەزەل" دەکرێنە چەقی بەهرە و سرووش و یەکەم تەزووی گوتارێک کە لە کۆپلەی دووەمدا دەست و دڵی شاعیر پڕ دەکەن لە "شانەی هەنگوین، هەوری پڕباران، خەڵوەتی پێشهات و خوداوەندی" بۆ ئەوەی بچێتە ناو "گفتوگۆیەکی بێدەنگ"، کە خۆی گفتوگۆی بێدەنگ

پێکهاتەکی لێکدژە، بەڵام دەبێتە هۆی وەبیرهاتنەوەی خۆشەویستی بەلای دەریا و ئاسمانەوە و لە کۆپلەی سێیەمدا جارێکی دیکە "ئەفسوون، ئەفسانە، غەزەل و ئەزەل" دەبنەوە چەقی گەردوونی زمانی شیعرەکە و لە گوتارەکەیان "بەهرە و سرووش و شیعر" دەتکێت. ئەم گەمە زمانییە، کە تایبەتمەندییەکی ڕێبازی خۆی بە شیعری (ڕەنجدەر) دەبەخشێت، لە دواین کۆپلەی شیعرەکەدا دیسان "ئەفسوون، ئەفسانە، غەزەل و ئەزەل" دەکاتەوە ناوەندی گوتارەکەی بۆ ئەوەی گوتارێکی ڕەخنەیی بە واتای شەرمکردن لە مێژووی لە سەرەتادا وشە و بەهرە و سرووش و یەکەم تەزوو بخاتەڕوو. چونکە ئەو لە گەردووندا هەر شیعری بە بەش پێبڕاوە، کەچی ئێستا شیعریش ماندووی کردووە و سکاڵا لە شیعر دەکات، ئەو شیعرەی کە هەم لەم شیعرەدا و هەم لە چەند شوێنی دیکەی دیوانەکەشدا بە بەشە دڵباشەکەی خۆی وەسفی دەکات، کە ئەمەش جوانکارییەکی زمانییە و شیعر نەک هەر تاکە بەشی شاعیرە، بگرە هاودەمێکی گیانلەبەری شاعیرە و لێی زیز دەبێت و سکاڵای لێ دەکات.

جێی ئاماژەیە نووسەر و توێژەر، (حەکیم مەلا ساڵح)[٢٢]، لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر زمانی شیعری (سەباح ڕەنجدەر) بە ناوی "زمان و بیرکردنەوەی شیعری" لە لایەن بەڕێوەبەرایەتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێرەوە لە ساڵی ٢٠١٦دا بڵاوکردووەتەوە، کە شیاوی خوێندنەوەیە.

### ٣. پەیوەندیی سۆز و ئەزموون:

ئەزموون بزوێنەری سۆزەکانی شاعیرە و بە یەکەمین کۆنتێکستی پەیدابوونی شیعر لەقەڵەم دەدرێت. شیعر، خۆی لە ڕوویەکەوە تۆمارکردنی ئەزموونەکانی شاعیرە. بەرهەمە ئەدەبییە هەرە بەناوبانگەکانی دنیا، بەرهەمی ئەزموونی ژیانی نووسەرەکانیانن. ئەزموونی هونەری، خۆی ڕووداوێکە لە ژیانی هونەرمەندا ڕوودەدات

و هەست و سۆزی هونەرمەندەكە بۆ نووسین، یان بەرهەمهێنانی بەرهەمەكەی هان دەدات و لەو نێوانەشدا شاعیر لەگەڵ دەربڕینی ئەزموونەكانی خۆی، سۆزی دەروونی خۆیشی لە شیعردا تۆمار دەكات. ئەو شیعرانەی كە ئەزموون تێیاندا ڕۆڵی سەرەكی دەگێڕێت، بە شێوەیەكی تایبەت خوێنەر بەلای خۆیاندا ڕادەكێشن، ئەگەر ئەو ئەزموونە لەگەڵ ژیانی خوێنەر یەكیش نەگرێتەوە، بە بزواندنی هەستی دڵسۆزی و هاودەردیی خوێنەر، ئەویش لەگەڵ شاعیرەكەدا خۆی بە هاوسۆز دەزانێت. دیارە بەستێنی ئەزموونەكانی هەر شاعیرێك زۆر فراوانە و بەشی زۆریان ناخرێنە ناو شیعرەوە. (گۆران) گوتەنی:

**هەرچەند ئەكەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم**
**بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم** (٢٣)

بەڵام خاڵی گرینگ ئەوەیە كە شاعیر لە كاتی گواستنەوەی ئەزموونەكانیدا بۆ ناو شیعر توانایەكی شاعیرانەی بە سەریاندا هەبێت. شاعیر و نووسەر و ڕەخنەگری بەناوبانگی ئەمریكایی ڕۆبێرت پێن وارێن(vi)، وتەیەكی گرینگی هەیە، دەڵێت: "ئەوەی كە لە ئەزموونی مرۆڤدا جێی دەبێتەوە، نابێت بە هۆی ڕێسایەكەوە لە چوارچێوەی شیعر دوور بخرێتەوە. واتای ئەم قسەیە ئەوەیە كە هەموو شتێك لە شیعردا كارایی هەیە، واتە لەوانەیە بەشێكیان لە ئەوانی دیكە سەركێشتر نەبن... بگرە بەو واتایەیە كە ئەگەر نیشانەكانی لە شیعردا هەبن، هەرچەشنە بابەتێك، ڕەنگە قانوونێكی كیمیاییش بە گوێرەی كردە و پێگەی خۆی لە شیعردا جێی ببێتەوە. واتە شاعیر بە گوێرەی فراوانیی ئەزموونەكانی دەتوانێت هەیمەنەی شاعیرانەی بەسەریانەوە هەبێت." (٢٤) ئەزموون ئەگەر نەخرێتە چوارچێوەی شیعرییەوە، دەبێتە بیرەوەری نووسین. واتە دەربڕینی سەركەوتووانەی ئەزموون لە شیعردا دەگەڕێتەوە سەر ڕادەی نزیكایەتیی شاعیر لەگەڵ ماددە و دنیای دەرەوە، واتە ئەو دنیایەی كە كارتێكەری و ئەندێشەكانی ئەوی

تێدا دابین بووە. لە کاتی خوێندنەوەی شیعر، یان هەر بەرهەمێکی هونەریی دیکەدا خوێنەر بە وەبیرهێنانەوە یان هاوشێوەسازیی ئەزموونەکانی ناو ئەو بەرهەمەی دەیخوێنێتەوە، پەیوەندیی لەگەڵ بەرهەمەکەدا دروست دەکات.

لە پەیوەندیی نێوان سۆز و ئەزمووندا دەبێ سەرنج بدرێتە دوو جۆر ئەزموون: ئەزموونی تاک و ئەزموونی یەکسان. لە ئەزموونگەلی تاکدا شاعیر تەنیا باس لە ئەزموونێکی تاک دەکات. یان لە یەک ڕەهەندەوە سەیری ئەزموونەکە دەکات و بەکورتی دەریدەبڕێت. بۆ دەربڕینی ئەزموونی تاک شیعری کورتی وەکو هایکۆ بەکار دەهێنرێت. بەڵام لە ئەزموونگەلی یەکساندا باسی چەندین ئەزموون دێتە گۆڕێ، کە لێکچوویی سۆزدارانەیان لەنێواندا هەیە. ئەرەستۆ لە کتێبی هونەری شیعر، بەشی "یەکێتیی چنین"دا دەڵێت: "یەکێتیی چنین، وەکو هەندێ کەس بۆی دەچن، لەوەدا نییە، کە بابەتەکەی لەبارەی یەک کەسەوە بێت. لەوانەیە یەک تاکەکەس زۆر شت، یان بەبێ پەی و سنوور شتی لێ بقەومێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شتانە هیچ جۆرە یەکێتییەک دروست ناکەن."[٢٥] هەڵبەت لە شیعردا حاڵەتەکە جودایە و دەکرێت ئەو ئەزموونە جۆربەجۆرانەی بارێکی سۆزداریی یەکسانیان هەیە، لەپاڵ یەکدا باس بکرێن، یان بە واتای شاعیرانە بەیان بکرێن. لەوانەیە کۆمەڵێک ئەزموون هەبن، کە لە باری کات و شوێنەوە لێک دوور بن، بەڵام بە جۆرێک لە جۆرەکان لێکچووییان هەبێت و زەینی شاعیر پێی وابووبێت ئەمانە هاوشێوەن و سۆزێکی هاوشێوەی بۆیان هەبووبێت و لەپاڵ یەکەوە لە شیعردا بیانچنێت. ئەزموونێک بووەتە هۆی وەبیرهاتنەوەی ئەزموونێکی دیکە لەلای شاعیر و جۆرە یەکسانییەکی لە باری سۆز، وێنە و جۆری ڕووداوەکەوە لە نێوانیاندا دۆزیوەتەوە و پێکەوە گرێ دراون.

لە سەرلەبەری دیوانی **"حەز دەکەم ئەوەندە بژیم"** و بەتایبەت لە **شیعری "بانگەواز بۆ گۆڕهەڵکەن"**دا (سەباح ڕەنجدەر) باس لە

گواستنەوەی هەشتا ساڵ ئەزموون دەکات، ئەو هەشتا ساڵەی کە خۆی "دەرزی بە دەزوو وەکردنێکە"، کەچی لەڕاستیدا تەمەنی شاعیر، خۆی کەمێک لە نیوەی زیاتری ئەو ئەزموونەی بڕیوە، ئاخر لە (١٨ی ١١ی ١٩٦٥)ـەوە دەست پێدەکات و بڕیارە لە (١٨ی ١١ی ٢٠٤٥)دا، لەسەر داوای خۆی ببڕێتەوە، بەڵام شاعیر نیوەکەی تریشی بۆ ئێمە بەیان دەکات، کە لە کۆتایی هەشتا ساڵەکەدا لەسەر "بستە خاکێکی مرادخواز و ماندوودا" "شادییەکانی دەبیستێتەوە".

(ڕەنجدەر) لە "**حەز دەکەم ئەوەندە بژیم**"دا چەندین ئەزموونی یەکسان بۆ خوێنەری خۆی بەیان دەکات، بەڵام زۆر لێزانانە هەودای سۆز دەکاتە لیزگەی هۆنینەوەی ئەو گشتە ئەزموونە و فیلمێکی پڕ لە ئەزموونی سروشتی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەرەنجام ڕۆحانیمان بۆ دەگێڕێتەوە.

**ئەنجام :**

١) سۆز دژکردەوەیەکە مرۆڤ لە بەرانبەر ئەزموونە دەروونی و ژینگەیییەکانی خۆیدا دەینوێنێت و یەکێک لە توخمە بنچینەیییەکان و پاڵنەرە سەرەکییەکانی بەدیهاتنی بەرهەمی ئەدەبییە.

٢) سۆز لە شیعری (سەباح ڕەنجدەر)دا توخمێکی گرنگە بۆ یەکپارچەیی و هاوئاهەنگی و تۆکمەیی شیعر. لە ڕاستیدا شیعرەکانی (سەباح ڕەنجدەر) بەرهەمی جۆرە سۆزێکی تایبەتن، کە تا کۆتایی شیعرەکە بەردەوام دەبێت و هەر بە هۆی زاڵبوونی ئەو سۆزەوەیە کە شیعری (ڕەنجدەر) لە کەشێکی تۆکمە و یەکپارچەدا درێژە پەیدا دەکات و سەرلەبەری توخمە پێکهێنەرەکانی تریشی بۆنی ئەو سۆزە دەگرن.

٣) وێنە لە شیعری (ڕەنجدەر)دا نەک هەر جوانکاریی هونەری شیعر، بگرە کەرەستەیەکە بۆ بەهێزکردنی ڕەهەندی سۆزداریی شیعر. وشەکانی (سەباح ڕەنجدەر) پەیوەندییەکی سۆزداری نهێنییان پێکەوە هەیە و لە هاونشینییان پێکەوە هەستی شاعیر وەدیار کەوتووە، یان گوازراوەتەوە بۆ خوێنەر.

٤) هاوڕۆحی و خزمایەتیی خەسڵەتەکانی هەر دیاردە، یان شتێک لەگەڵ وشەکان هۆکارێکی دیکەی کاریگەرە بۆ گواستنەوەی کارتێکەری شیعری (ڕەنجدەر). هەروەها هۆکارێکی تریش لە بەردەوامی و تۆکمەیی سۆز لە شیعری (ڕەنجدەر)دا ڕۆڵی گرنگی هەیە، کە ئەویش ئەزموونی ژیانی شاعیرە لەگەڵ شیعر. لە خوێندنەوەی شیعری (ڕەنجدەر)دا خوێنەر هەست دەکات، کە شاعیر بە شێوازێکی تایبەت و بە زمانێکی هونەری ئەزموونەکانی ژیانی تۆمار کردووە. هاونشینیی ئەزموونی وەسفکراو و یەکسانیی سۆز لە شیعری (ڕەنجدەر)دا هۆکاری هەرەدیاری تۆکمەیی و جیاوازی و داهێنەریی شیعری (ڕەنجدەر)ە.

**سەرچاوە و پەراوێزەكان :**


١) سەباح رەنجدەر، حەزدەكەم ئەوەندە بژیم، دیوانی شیعری، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوكردنەوەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، چاپی یەكەم، ٢٠١٥.

2) IA Richards, principles of literary criticism, London[ u.a.];Routledge ,2001 ,p.83.

٣) تولستوی لئون، هنری چیست؟ ترجمە كاوەدهگان، انتشارات امیركبیر، تهران، چاپ هفتم،١٣٦٤، ص٥٥.

٤) سۆزان مامەند عەبدوڵلا، نۆستالژیا لە شیعری هاوچەرخی كوردیدا، بەنموونە شیعرەكانی عەبدوڵلا پەشێو، ئەنوەر قادر محەمەد، سەباح ڕەنجدەر، ناوەندی ئاوێر بۆچاپ و بلاًوكردنەوە، چاپی یەكەم، ٢٠١٦. ل١٠٨

٥) ئەنوەر قادر محەمەد، لیریكای شاعیری گەورەی كورد مەولەوی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ژمارەی سپاردن ٢٧٢ی،٢٠٠١.ل١٢٥

٦) پێشرەو عەبدوڵلا، دەروونشیكاری شیعر، بلاوكراوەی ئاكادیمیای كوردی، ژمارە ٢٠٦. ل٧٣

7) Letter to harriet ,in the complete peams and sele cted letters and prose of hart grane ,ed. Brom we ber garden city ,n.y.; doubleday [an chor book],1966,p.238.

٨) لی مۆرگان و... بنەماكانی رەخنەی ئەدەبی، وەرگێڕانی سامالٚ ئەحمەدی، دەزگای چاپ و بلاوكردنەوەی رۆژهەلاًت، چاپی یەكەم، ٢٠١٤، ل٢٩ .

٩) سەرچاوەی پێشوو، سەباح رەنجدەر، حەزدەكەم ئەوەندە بژیم، ل٥.

١٠) سەرچاوەی پێشوو، سەباح رەنجدەر، حەزدەكەم ئەوەندەبژیم، ل٧.

١١) مرشد الزبیدی، بناء القصیدة الفني في النقد العربي القدیم والمعاصر، دار الشؤون الثقافة العامة بغداد، ١٩٩٤،ص٤٩.

12) http: // 3rbseyes .com/t428624.

١٣) دیوانی مەولەوی، كۆكردنەوە و لێكۆڵینەوە و..... مەلا عەبدولكریم مودەریس، بلاًوكردنەوەی كوردستان، سنە، چاپی دووەم، ١٣٩١، ل٥٠.

١٤) ابن سینا حسین عبدالله، قانون در طب، ترجمەی عبدالرحمن شرفكندی (هەژار)، نشر سروش، چاپ دوانزدەهم، ١٣٩٠.

15) http : // elbaba.own0.com /t169-topic.

16) http : // www.ankawa.com /forum /index. php /topic, 268861. msg3657234. #msg3657234.

١٧) کروچە بندتو، کلیات زیباشناسی، ترجمەی فواد جعفری، چاپ هشتم، انتشارات علمی فرهنگی، تهران ١٣٨٨، ل ٨٣.
١٨) تادیە ژان ایو، نقد ادبی در قرن بیستم، ترجمەی مهشید نونهالی، انتشارات نیلوفر، چاپ دوم، ١٣٩٠، ص٣٠٤.
١٩) شێخ نووری، ڕۆژنامەی ژیان، ژ( ٢٠، ٢١، ٢٢)، ساڵی (١٩٢٦، ١٩٢٧).
٢٠) ولک رنە و آوستن وارن، نظریە ادبیات، ترجمە ضیاء موحد و پرویز مهاجر، انتشارات علمی فرهنگی ١٣٨٢، ص ٢٠٩.
٢١) تودوروف، نقد النقد، ترجمة د. سامی سویدان، دار الشؤون الثقافة، بدون سنة الطبع، ص٤.
٢٢) حەکیم مەلاساڵح، زمان و بیرکردنەوەی شیعر، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠١٦.
٢٣) دیوانی گۆران، سەرجەمی بەرهەمی گۆران، بەرگی یەکەم، محەمەدی مەلاکەریم کۆی کردووەتەوە و ئامادەی کردووە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا ـ ١٩٨٠. ل ١٢١.
٢٤) دیچز دیوید، شیوەهای نقد ادبی، ترجمە محمد تقی صدقیانی و غلامحسین یوسفی، چاپ سوم، انتشارت علمی، ص ٢٤٩.
٢٥) ئەرەستۆ، هونەری شیعر، وەرگێڕانی لە ئینگلیزی و پێشەکی و پەراوێزی: عەزیز گەردی، خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، چاپی دووەم، ٢٠١١، ل ٣٥.

i. Hart Crane, (July 21, 1899 – April 27, 1932), was an American poet.
ii. David Bleich, (Jaunuary 17, 1940), is known for his (Readings and feelings: an introduction to subjective criticism), Published June 1975 by National Council of Teachers of English.
iii. Benedetto Croce, (25 February 1866 – 20 November 1952), was an Italian idealist, philosopher, historian and politician.
iv. Jean Cohen, (July 23, 1919 - May 30, 1994), was a philosopher and professor at the Sorbonne, is known for his "Structure of Poetic Language".
v. René Wellek, (August 22, 1903 – November 11, 1995), was a Czech-American comparative literary critic.
vi. Robert Penn Warren, (April 24, 1905 – September 15, 1989) was an American poet, novelist, and literary critic and was one of the founders of New Criticism.

## ملخص البحث

**دراسة العاطفة فى ديوان ( حەزدەكەم ئەوەندە بژيم ) صباح رنجدر**

العاطفة حالة ذهنية كثيفة ونظرية عقلانية ونفسية ومعنوية في الشعر نبذة اساسية في الآثار الادبية. لذا كانت البحث والدراسة هذه تدور حول وجود العاطفة في الشعر بشكل عام والعاطفة في شعر رنجدر بشكل خاص .

الصدق في العاطفة هو محور البحث في دراستنا عند الشاعر (صباح رنجدر) في ديوانه الموسوم (حەز دەكەم ئەوەندە بژيم) ونظرا لاهمية العاطفة لابد ان ينظر اليها في كل الجوانب .

البحث يشمل مقدمة وفصلين مع الاستنتاجات وقائمة بالمصادر بالشكل الآتي:

**<u>الفصل الاول</u> :**

- دراسة العاطفة لغة واصطلاحا
- الاخذ والعطاء في مسألة العاطفة
- انواع العاطفة الشعرية
- مستويات العاطفة الشعرية
- استمرارية العاطفة الشعرية

**<u>الفصل الثاني</u> :**

- علاقة العاطفة بالصورة
- علاقة العاطفة باللغة
- علاقة العاطفة بالخبرة

الاستنتاجات

قائمة المصادر والمراجع

ملخص البحث بالانكليزية

## Abstract

Expression of passion in an undated “I love somewhat to live” by Sabah Ranjdar

Passion is overturning of the main psychological and moral of thought, its poetry and the main seeds of all production of arts that is why discussing and explaining passion in poetry is essential. The aim of this study is expressing development of passion by the poet Sabah Ranjdar in “I love somewhat to live’’ it’s seen in different aspects.

This study consists of two main sectors in spite of introduction, results and references.

**First part:**

-Expression of passion
-Taking and giving passion
-sorts of passion
-Levels of passion
-continuation of passion

**Second part:**

-The connection of passion and picture
-The connection of passion and language
-The connection of passion and examination
-Results
-References

# مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی
# لە کتێبی (کاروانی شیعری نوێی کوردی)ی
# (کاکەی فەللاح)دا

**م.ی. ڕێبین خەلیل قادر**
بەشی کوردی/کۆلێژی پەروەردە
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی**

ڕەخنەی مێژوویی یەکێکە لەو مێتۆدە ڕەخنەییانەی لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیدا بەکاردەهێنرێت و یەکێکە لە مێتۆدە کۆنەکان و لەگەڵ هەریەکە لە مێتۆدەکانی (کۆمەڵایەتی و دەروونی) بە مێتۆدە ڕەخنەییە تەقلیدییەکان ناسراون، کە لە ئەوروپادا لە سەدەی نۆزدەهەم سەری هەڵداوە و تا ئێستاش گرنگیی خۆی لەدەست نەداوە. ئەم مێتۆدە ڕەخنەییە لە دەرەوەی دەقی ئەدەبییەوە لە دەق دەکۆڵێتەوە و زیاتر گرنگی بە هۆکارە دەرەکییەکانی دەق دەدات، کە ڕۆڵێکی گرنگیان لە پێکهاتەی بونیادی دەقدا هەیە و ناکرێت ئەرك و ڕۆڵیان فەرامۆش بکرێت. دەقی ئەدەبی لەم مێتۆدەدا لە بونیادە هونەری و ئیستاتیکییەکە دادەماڵرێت، چونکە مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی بایەخ بە ڕوخسار و بونیادی هونەری دەق نادات و زیاتر بەلای ناوەرۆك و ئەو بنەمایانەدا دەچێت کە دوور لە لایەنە هونەری و ئیستاتیکییەکەی دەقەوە لە پێکهاتەی دەقدا بەشدارن. بەگشتی دەق لەم مێتۆدەدا وەکو بەڵگەنامەیەکی مێژوویی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و ڕەخنەگرانی سەر بەم مێتۆدە زۆرتر سوود لە زانیارییە دەرەکییەکانی دەرەوەی خودی دەقی ئەدەبی وەردەگرن، وەك (ژیانی نووسەر و بۆنە و هۆی نووسینی دەق و ڕەگەزەکانی نەژاد و سەردەم و ژینگە و بەسەرهات و ڕووداوە مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان و.... هتد). ئەمانە بنەما و هۆکاری بەسوودن لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی نووسەر و بەرهەمەکانی و هەڵسەنگاندن و لێکدانەوە و بڕیار لەسەردانی بەرهەمە ئەدەبییەکانیان. کتێبی

(کاروانی شیعری نوێی کوردی)ی (کاکەی فەللاح) یەکێکە لە سەرچاوە ڕەخنەییەکان لە ئەدەبی کوردیدا، لەم کتێبەیدا (کاکەی فەللاح) بەسوودوەرگرتن لە بنەما ڕەخنەییەکانی مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی توانیویەتی لە زۆر لایەنی ژیانی ئەو شاعیرانەی کە بۆ کتێبەکەی هەڵیبژاردوون و هەروەها دەقە شیعرییەکانیشیان بکۆڵێتەوە. ئێمە هەوڵمانداوە تیشکێك بخەینە سەر پەیڕەوکردنی بنەماکانی ئەم مێتۆدە لەم کتێبەدا.

## بەشی یەکەم: مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی:

### تەوەرەی یەکەم: چەمکی مێتۆدی رەخنەی مێژوویی:

لەنێو ڕەخنەی ئەدەبی و مێتۆدە ڕەخنەییەکاندا ژمارەیەکی زۆر تیۆر و بنەما و پێوەر و مێتۆدی ڕەخنەیی جیاواز هەن، کە لە ئەدەب دەکۆڵنەوە، هەریەکە لەم تیۆر و مێتۆدانەش سێینەی (دانەر– دەق– خوێنەر)یان کردۆتە کەرەستەی لێکۆڵینەوە. هەیانە گرنگی بە (داهێنەری دەق) دەدات، هەیانە گرنگی بە (دەقی ئەدەبی) دەدات و هەشیانە گرنگی بە (خوێنەری دەق) دەدات و هەریەکە لەم مێتۆدە ڕەخنەییانە یەکێك لەم بنچینانەی کردەی داهێنانیان کردۆتە چەقی تێڕامان و لێوردبوونەوە.

مێتۆدی رەخنەی مێژوویی یەکێکە لەو ئاراستە و مێتۆدە رەخنەییە بەناوبانگانەی کە لە دەرەوەی دەق لە دەق دەکۆڵێتەوە، بێئەوەی بۆ خودی دەقی ئەدەبی و بونیادی هونەری و هەناوی دەق و ئەودیو زمانی دەقی ئەدەبی بگەڕێتەوە. چونکە ئەم مێتۆدە پشت بە کۆمەڵێك بنەما و رەگەز و لایەنی دەق و هۆکار دەبەستێت، کە لە دەرەوەی دەقی ئەدەبییەوە کاریگەری دەخەنە سەر دەق و کۆنترۆڵی دەق دەکەن. بۆیە ئەم مێتۆدە هەرگیز لە دەق ناکۆڵێتەوە لە ڕووی زمان و ڕەگەزە ناوەکییە پێکهێنەرەکانی دەقەوە و هەموو ئەمانە فەرامۆش دەکات. دەکرێت هۆکارە دەرەکییەکان و ئەو ڕەگەزانەی لە دەرەوەی دەقەوە ڕۆڵ لە بونیاد و واتای دەقدا دەبینن، بکرێنە پێوەری هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە لەم مێتۆدەدا، بۆ نموونە دەکرێت سوود لەو پەیوەندییە فراوانەی لەنێوان مێژوو و ئەدەبدا هەیە، ببینین، ئەویش لە چەند ڕوویێکەوە:

((١- زانینی مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێویستە بۆ تێگەیشتن لە ئەدەب و لێکدانەوە و شیکردنەوەی زۆرێك لە بابەت و خەسڵەت و سیماکانی و ئەو ئاراستە گشتیانەش کە ئەدەب دەڕژێتە ناویەوە و ئەدیبەکان دەیگرنەبەر.

٢- لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەو کتێبانەمان بۆ لێکدەدەنەوە کە لە سەردەمێکدا نووسراون، لەژێر ڕۆشنایی ڕووداوە سیاسییەکان و ئایینییەکان و ئاکارییەکان یان ئابوورییەکان، ئەم کتێبانە لە بابەت و شێوازیاندا بریتین لە تێڕوانینی خاوەنەکانیان کە بەرهەمی ئەو ژینگە و دەوروبەرەیە کە دەورەی داوە.

٣- ئێمە لە تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی بۆچوونەکانی ئەدیبەکان و بیر و خەیاڵکردنیان و پەیوەستکردنیان بە سەردەمەکانیانەوە دەبێت تێبینی ئەو زانیاری و ڕێبازە سیاسی و زانستی فەلسەفی و پێوەرە ڕەخنەیی و ئاکارییانە بکەین کە لەو سەردەمانەدا باو بوون و شاعیران و نووسەران پەیڕەویان دەکرد یان دژی بوون، چونکە بەرهەمە ئەدەبییەکان بە شێوازی ئەرێنی بێت یان نەرێنی بێت ملکەچی ئەمانەن)) (الشایب، ١٩٧٣، ص٩٥-٩٦). کەواتە ئەو پەیوەندییە بەتینەی کە لەنێوان (مێژوو و ئەدەب و ڕەخنە)دا هەیە، سەرچاوەی ڕوونکردنەوەی زۆر نهێنی تایبەت بە دەق و داهێنەری دەقەکەیە، چونکە ((مێژوو لای ڕەخنەگر وەسیلەیەکە بۆ ڕەخنە، بێگومان ڕەخنەکەشی مێژووییە لە سنووری ئەم بازنەیەدا)) (حسن، ١٩٩٦، ص ٦٤). دەشێ ڕەخنەگر لە دەرەوەی دەقی ئەدەبییەوە بۆ دەقەکە بچێت، بەڵام ئەوکات لە خودی دەقەکەوە لە دەقەکە ناکۆڵێتەوە، بەڵکو بەگوێرەی ئەو زانیارییە دەرەکییانەی کە لە کات و سەردەم و ژینگە و ڕێباز و بنەمای فەلسەفی و بارودۆخی ئەوسای هاتنەکایەی دەقەکەوە لێیدەکۆڵێتەوە. ڕەخنەگری سەر بەم مێتۆدە لەکاتی لێکۆڵینەوە لە نووسەر و دەقدا ڕەچاوی هەندێك لایەن دەکات، کە ڕێگا لەبەردەم ڕەخنەگرەکە ڕۆشن دەکەنەوە ((ڕەخنەگر پەیوەندیی خۆی بەو دەقە ئەدەبییەوە دیاریدەکات کە بەشێوەیەکی تایبەت گرنگی پێدەدات و پشت بە مێژوو و کاریگەرییەکانی دەق دەبەستێت، مێژوو دەخاتە خزمەتی دەقی ئەدەبییەوە نەك بە پێچەوانەوە. ڕەخنەگر لە لێکۆڵینەوەی دەقدا دیاردەکان بەدرێژایی سەردەمە یەك بەدوای یەکەکان لە دەق دادەماڵێت و لە لێکۆڵینەوەشدا پشت بەو بەڵگەنامانە دەبەستێت

کە لەبەر دەستیدان. هەروەها لە سنووری سەردەمی دەقەکە ڕەخنـە لـە دەقەکـە دەگرێت بۆ ئاشکراکردنی ڕەهەندەکانی دەق نەك ئەوەی کـە ڕەخنەگرەکـە چـێژی سەردەمی خۆی بۆ بەکاربهێنێت، بەڵکو دەتوانێت پشت بەو شـتانە ببەسـتێت کـە دەقەکە پێمـانی دەدات بـۆ ئاشـکراکردنی ڕەهەنـدەکانی دەق و تەمومژییـەکانی)) (الطالب، ١٩٩٣، ص٨٢). ئەگەر ڕەخنەگر ڕەچاوی چێژ و لایەنەکانی تری سـەردەمی سەرهەڵدانی دەقەکە نەکات، ئەوا دەکەوێتە هەڵەوە و لەوانەیە بە هەڵەشەیی بڕیار لەسەر دەقەکە بدات و نـەتوانێت بـە ئاسـانی هەنـدێك لـە نهێنییـەکانی دەقەکـە و شـاعیرەکە ڕوون بکاتـەوە، بۆیـە پێویسـتە ((لـەلای لێکۆڵـەری ئـەدەبی ئـەو سەردەمەی خۆی کە تێیدا دەژیت لەبیر بکات و لێی بپچڕێت کاتێك لـەنێو قـوولایی سـەردەمێکدا مەلـە دەکـات، چـونکە ئـەوەی کـە داوا کـراوە لێـی سـەرلەنوێ بونیادنانەوەی ڕابردوو و سەرلەنوێ گەڕاندنەوەی وێنەی ئەوکاتەی دەقەکەیـە کـە لای خەڵك و سەردەمی خۆی بەم شێوەیە بـووە، یـەکێك لـە بانگەشـەکارانی ئەمـە بیرمەنـدە ئەڵمانییـەکانی سـەدەی نۆزدەهـەم لـە نموونـەی (شـبینگل) بـوون کـە بانگەشەکەیان لە ئینگلتەرا و ئەمریکا ڕەزامەندی هەبوو)) (الطـاهر، ١٩٧٩، ص ٤٠٠). کەوایە سەردەم و ژینگەی سەرهەڵدانی هەر دەقێکی ئـەدەبی بـۆ لێکۆڵینـەوە لـەو دەقە گرنگە و ناکرێت ئەمـە فـەرامۆش بکرێـت و بەچـاوی سـەردەم و ژینگەیـەکی جیاوازتر لە دەقە ئەدەبییەکە بڕوانین، چونکە هەر سەردەم و ژینگەیەك جۆرێك لە تایبەتمەندی بـە دەقـی ئـەدەبی دەدات و کاریگەرییـەکانی خـۆی دەخزێنێتـە نێـو دەقەکەوە و بەمەش بۆ تێگەیشتن و دروست بڕیاردان لەسەر دەقەکـە پێویسـتمان بەو زانیارییانە دەبێت کە ڕۆڵیان لە بونیادنانی دەقەکە هەبووە.

مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی گرنگییەکی زۆر بە ڕووداو و بەسەرهاتە مێـژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان دەدات و زۆرجار لەژێر ڕۆشنایی ئەم ڕووداوانـەوە لـە ئـــەدەب دەکۆڵێتـــەوە ((مێتـــۆدی مێـــژوویی ڕووداوە مێـــژوویی و سیاســـی و کۆمەڵایەتییـــەکان دەکـــات بـــە هۆکارێـــك بـــۆ ڕاڤـــەکردنی ئـــەدەب و دیـــاردە و تایبەتمەندییـەکانی)) (عتیـق، ١٩٧٢، ص ٢٨٨). ڕەخنـەگر دەقەکـە بـە بـارودۆخی سـەرهەڵدانی دەقەکـە و ئـەو ڕووداو و بەسـەرهاتانەی بوونەتـە هـۆی داهێنـانی دەقەکەوە پەیوەست دەکات. دەکرێـت بـە گەڕانـەوە بـۆ ئـەو ڕووداوە مێـژوویی و

سیاسی و کۆمەڵایەتییانە زۆر نهێنی و واتای شاراوەی دەقەکە و بۆنەی وتنی دەقەکەمان بۆ ئاشکرا بێت و زۆر نهێنی ژیانی ئەدیبەکەشمان بۆ ڕوون بێتەوە، یان بەهۆی دەقەکەوە زۆر زانیاری لەسەر ڕووداوە مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی نەتەوەیەك بزانرێت و لە هەردوو باردا دەق وەك بەڵگەنامەیەکی مێژوویی سەودای لەگەڵدا دەکرێت. لێرەوە ڕەخنەگر ئەوەندەی خەریکی دەرەوەی دەق دەبێت، ئەوەندە گرنگی بە ناوەوە و قووڵایی دەق و ئەودیوی زمان و ئەودیوی دەق نادات و ئەمانە فەرامۆش دەکات، چونکە ((لەپێناوی ئەمەدا لەسەر ڕەخنەگر پێویستە کە پێش بەهادانان بۆ ئەم بڕیارانەی لە ڕەخنەکەیدا، دەبێت لە بارودۆخ و هۆکارەکانی ئەو دەقە لە واقیعی مێژووی گشتی ئەو ماوەیەی کە دەقەکەی تێدا نووسراوە بکۆڵێتەوە، هەروەها لەو بارودۆخ و هۆکارە تایبەتییانەی دەورەی نووسەرەکەیان داوە بکۆڵێتەوە)) (عتیق، ١٩٧٢، ص ٢٩١). کەوایە ڕەخنەگری مێژوویی لەم مێتۆدەدا ئامانجی زیاتر گەڕانەوەیە بۆ ئەو هۆکارە دەرەکییانەی لە دەرەوەی دەقەوە ڕۆڵی بەرچاو دەگێڕن لە بونیادنانی دەقی ئەدەبیدا، جگە لەمەش ئەو واقیع و بارودۆخ و سەردەم و هۆکارانەی دەوری نووسەریان داوە بنەمای ڕەخنەیی گرنگن بۆ زیاتر قووڵبوونەوە و لێوردبوونەوەی ڕەخنەگر لە دەقەکە و خودیی نووسەرەکەش، چونکە هەموو ئەمانە لە کردەی داهێناندا پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە و ناکرێت لە ڕۆڵ و گرنگیی هیچیان کەم بکرێتەوە.

**تەوەرەی دووەم: بنەما ڕەخنەییەکانی مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی:**

مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبدا زۆر بڵاوە، ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەم مێتۆدە بەشێوەیەکی فراوان بەکاردەهێنرێت و لە لێکۆڵینەوەی ئەدەب و ئەدیباندا سوود لە تەکنیك و بنەما و پێوەرە ڕەخنەییەکانی وەردەگیرێت و دەکرێت ئەنجامی باش و دروستیشی لێ وەدەست بێت. دەکرێت بڵێین هەندێك لەم بنەما و پێوەرە ڕەخنەییانە لە ڕەخنەگرێکەوە بۆ ڕەخنەگرێکی تر لەڕووی گرنگی پێدانەوە دەگۆڕێت. بەواتایەکی تر هەندێك ڕەخنەگر گرنگی بە یەکێك یان کۆمەڵێك لەو بنەما ڕەخنەییانە دەدەن کە لەم مێتۆدە ڕەخنەییەدا پشتی پێدەبەسترێت و هەندێك ڕەخنەگری تر گرنگی بە بنەمای دیکە دەدەن،

هەڵبەت هەموو ئەو بنەما و پێوەرە ڕەخنەییانەش کە لە ڕەخنەی مێژووییدا پشتی پێدەبەسترێت بۆ مەسەلەی لێکۆڵینەوە جیاوازن و هەریەکەیان لایەنێکی شاراوەی ئەدەب دەردەخەن، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەم بنەمایانە پەیوەندییان بە دەرەوەی ئەدەبەوە هەیە، واتا هۆکاری دەرەکیین و ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ڕۆڵیان لە دروستبوونی ئەدەبدا هەیە. دەکرێت بنەما ڕەخنەییەکانی ڕەخنەی مێژوویی لەم چەند خاڵەدا باس بکەین:

١- **گرنگیدان بە ژیانی شاعیران:** یەکێك لەو بنەما و لایەنانەی کە ئەم مێتۆدە گرنگی پێدەدات، ژیانی شاعیرانە، گرنگیدان بە خودی نووسەر و ژیانەکەی لە لایەن (سانت بۆڤ)ەوە سەری هەڵدا و گرنگی بە لێکۆڵینەوەی کەسێتی نووسەرەکە دا و ئەمەی کردە بنەمایەك بۆ تێگەیشتن لە بەرهەمەکانی، ئەو بڕوای وابوو کە بۆ تێگەیشتن و بڕیاردان لەسەر هەر بەرهەمێکی ئەدەبی، پێویستە لە خودی نووسەرەکەیەوە دەست پێبکەین و بە وردی لە ژیانی بکۆڵینەوە، بۆیە ((بڕیارەکانی لە ڕەخنەگرتندا بریتی بوو لە بڕیاردان لەسەر کەسێتی نووسەرەکان)) (هلال، ١٩٧٧، ص ٤٨). (سانت بۆڤ) مێتۆدەکەی خۆی لە وتارێکیدا لەبارەی (شاتۆ بریان)ەوە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: ((بە بڕوای من ئەدەب — واتا بەرهەمی ئەدەبی— لە مرۆڤ جیا نابێتەوە، دەتوانم چێژ لە بەرهەمێکی ئەدەبی وەربگرم، بەڵام بۆم قورسە بڕیاری لەسەر بدەم بەبێ ئەوەی زانیاریم لەسەر نووسەرەکە خۆی نەبێت)) (مندور، ١٩٧٤، ص ٧٦). کەواتە لێکۆڵینەوە و بایەخدان بە ژیانی نووسەران زۆر نهێنی و ئاستەنگ لەبەر دەم تێگەیشتنمان بۆ بەرهەمەکانیان ناهێڵێت و بەرەو بڕیار و شیکردنەوەیەکی دروستی بەرهەمەکانمان دەبات.

٢- **لێکۆڵینەوە و گرنگیدان بە ناوەڕۆکی دەق:** یەکێك لەو ڕەگەز و لایەنانەی کە ئەم مێتۆدە ڕەخنەییە زۆرتر جەختی لەسەر دەکاتەوە، مەسەلەی ناوەڕۆك و مەبەستی دەقەکانە. مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی ئەوەندەی لە ناوەڕۆك دەکۆڵێتەوە و بایەخی پێدەدات، ئەوەندە گرنگی بە فۆرم و بونیادی هونەری دەق نادات. هەڵبەت مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی مێتۆدێکی ڕەخنەیی ناوەڕۆکییە و سوود لە چەندین سەرچاوەی جیاواز وەردەگرێت بۆ لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی

مەبەست و ناوەڕۆکی بەرهەمی ئەدەبی، دەشێ سوود لە ژیانی ئەدیبەکە وەربگرێت، یان سوود لە ڕووداو و بارودۆخە مێژوویی و سیاسی و کۆمەلایەتییەکان وەربگرێت، یان سوود لە سەردەم و ژینگەی سەرهەلدانی بەرهەمەکە و نەژادی ئەدیبەکە وەربگرێت و ناوەڕۆکی دەقەکە بەهۆی یەکێك لەمانەوە ڕوونبکاتەوە. چونکە هەریەکێك لەمانە کاریگەریان بەسەر ناوەڕۆکی دەقدا هەیە و بابەتێك بەسەر ئەدیبدا دەسەپێنن کە ڕەنگدانەوەی ئەو بارودۆخە دەروونی و کۆمەلایەتی و سیاسییە بێت کە بۆی ڕەخساوە. هەندێك میتۆد هەن بە پێچەوانەی میتۆدی ڕەخنەی مێژووییەوە بۆ دەستەبەرکردنی واتا و ناوەڕۆکی دەق پشت بەم زانیارییە دەرەکییانە نابەستن و ئەمانە فەرامۆش دەکەن، بەڵکو لە خودی دەقەوە بۆ نێو هەناوی دەق و زمان دەچن و دەگەنە ئەودیوی زمانەوە، کە واتا شاراوەکان لەودیو زمانەوە خۆیان حەشارداوە، کە ئەمە بەلای میتۆدی ڕەخنەی مێژووییەوە قبوڵ نییە.

٣- **دەق وەك بەڵگەنامەیەکی مێژوویی و سیاسی و کۆمەلایەتی:** هەڵبەت ئەدەب ڕەنگدانەوەی ئەو سەردەم و کۆمەڵگایەیە کە تیایدا سەرهەڵدەدات، ئەدەب ڕەنگدانەوەی مێژوو و هەموو ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەیە کە لەنێو کۆمەڵگادا ڕوودەدەن، بۆیە دەبینین میتۆدی ڕەخنەی مێژووییش لە هەمان ڕوانگەوە لە دەقی ئەدەبی دەڕوانێت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و وەك بەڵگەنامەیەکی مێژوویی و سیاسی و کۆمەلایەتی لە دەقی ئەدەبی دەکۆڵێتەوە. چونکە دەق ڕەنگدانەوەی ئەمانەیە و زۆر جار ڕەخنەگر بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوە و بڕیاردان لەسەر دەقێك پێویستی بە زانیاریی مێژوویی دەبێت و لەژێر ڕۆشنایی ئەم زانیارییانە دەقەکە لێکدەداتەوە، بۆیە هەموو کات دەقی ئەدەبی دەبەستێتەوە بە مێژووی نەتەوایەتی و مێژووی نەتەوەکانی تر ((میتۆدی مێژوویی ڕووداوە مێژووییە سیاسییەکان و کۆمەلایەتییەکان وەردەگرێت و وەکو هۆکارێك بۆ ڕاڤەکردنی ئەدەب و پاساودانی دیاردە و تایبەتمەندییەکانی بەکاریان دەهێنێت)) (عتيق، ١٩٧٢، ص ٢٩١)، کەوایە مادام ڕەخنەگر وەك بەڵگەنامەیەك مامەڵە لەگەڵ دەقدا بکات، ئەوا پێویستی بە زانیاریی دەرەکی (بەتایبەتیش مێژوویی و سیاسی و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری) دەبێت، تا بەهۆیانەوە بتوانێت

مەبەست و ئامانجی ئەدیب بخاتە ڕوو. کاتێکیش لە دەق دەکۆڵێتەوە، ئەوا هەمان ئەو زانیارییانە هەڵدەهێنجێت و دەیداتە خوێنەر، چونکە دەشێ بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی نەتەوەیەك پشت بە ئەدەبی ئەو نەتەوەیەش ببەستین کە پڕیەتی لە ڕووداو و بەسەرهاتی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ....هتد، هەروەها ڕەخنەگر لەم مێتۆدەدا مەبەست و واتای دەقەکە لە خودی دەقەکەوە وەرناگرێت و ئەوەندە پشت بە زمان و ئەودیو زمان (میتا زمان)ی دەقەکە نابەستێت.

٤- **کاریگەری (ڕەگەز، ژینگە، سەردەم) بەسەر دەقەوە:** مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی گرنگییەکی زۆر بەم سێ ڕەگەزە دەدات و هەوڵدەدات لە بەرهەمی ئەدەبی بکۆڵێتەوە لە ڕوانگەی ئەم سێ ڕەگەزەوە، ڕابەری ئەم تیۆرەش (هیبۆلیت تین) بوو، لە کتێبەکەیدا بەناوی (مێژووی ئەدەبی ئینگلیزیی)دا باسی ئەم سێ ڕەگەزەی کردووە و هەوڵیداوە بەسەر نووسەرەکانی ئینگلیزییدا پراکتیکیان بکات ((تین کە قوتابی (سانت بۆڤ) بوو سێ ڕەگەزی بۆ تیۆرەکەی خۆی دەستنیشان کرد، کە (نەژاد و سەردەم و ژینگە) بوون. ئەو کاریگەری ئەم سێ ڕەگەزەی بۆ ڕۆڵی چالاکانەیان لە دروستکردنی ئەدیبدا گەڕاندەوە)) (نشأت، ١٩٧٦، ص ١٦٥). ئەم سێ ڕەگەزە ڕۆڵی سەرەکییان لە پێکهێنانی ئەدیب و نووسەر و بەرهەمەکانیاندا هەیە، هەر بەهۆی کاریگەری ئەم سێ ڕەگەزەشەوەیە کە زۆربەی ئەدیب و نووسەران جیاوازییان لە شێواز و بیرکردنەوە و چۆنێتی تێڕامان و فەلسەفە و بڕیاریاندا هەیە. جگە لەمانەش ئەم سێ ڕەگەزە هۆکار و بنەمای زۆر بە نرخن لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی دەقی ئەدەبی و نووسەرەکانیان، چونکە لە ڕێگەی ئەم سێ ڕەگەزەوە زۆر نهێنی کە لە پشتی دەقەکانەوە حەشاردراون و خوێنەر لێیان بێئاگایە، ڕوون دەکاتەوە.

٥- **گرنگیدان بە هۆکارە دەرەکییەکان:** مەبەست لە هۆکارە دەرەکییەکان هەموو ئەو بنەما و هۆکارە جیاوازانە دەگرێتەوە کە لە دەرەوەی دەقی ئەدەبییەوە کار بۆ بونیادنانی دەقی ئەدەبی دەکەن و ڕۆڵی گرنگ لە بونیاد و پێکهاتەی واتای دەقدا دەگێڕن. ئەم هۆکارە دەرەکییانە پەیوەندییان بە بونیادی هونەری و ئیستاتیکیی دەقەکەوە نییە، چونکە کاتێك ڕەخنەگر لە هۆکارە دەرەکییەکان دەکۆڵێتەوە بەهیچ جۆرێك بایەخ بە لایەنی ڕوخسار و بونیادی

هونەری و ئیستاتیكیی دەقی ئەدەبی نادات. دەكرێت بڵێین هۆكارە دەرەكییەكان زیاتر ئەو زانیارییانە دەگرێتەوە كە لە ژیانی نووسەرەكانەوە وەردەگیرێن، هەروەها لایەنی مێژوویی و كۆمەڵایەتی و دەروونی و ئابووری و ڕۆشنبیری و بیرییش دەگرێتەوە، جگە لەمانەش هۆ و بۆنەی نووسین و كات و شوێنی دەقیش دەگرێتەوە، كە دەكرێت لە ژێر ڕوانگەی ئەم لایەنە جیاوازانە لە دەقی ئەدەبی بكۆڵرێتەوە و نهێنییەكانی ئاشكرا بكرێن.

## بەشی دووەم: مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی لە كتێبی( كاروانی شیعری نوێی كوردی )ی ( كاكەی فەللاح )دا:

### تەوەرەی یەكەم: دەقی شیعریی وەكو بەڵگەنامەیەكی مێژوویی:

مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی وەك بەڵگەنامەیەكی مێژوویی مامەڵە لەگەڵ ئەدەبدا دەكات و لێكۆڵینەوەی ئەو زانیارییانەی لەنێو دەقدان لای ڕەخنەگرانی ئەم مێتۆدە ڕەهەندێكی قووڵی هەیە، چونكە دواتر هەر لەڕێگەی ئەم زانیارییانەوەیە كە دەتوانرێت كون و كەلەبەرەكانی دەق ڕۆشن بكرێنەوە و دواجار ئەم زانیارییانە ببنە كلیلی كردنەوەی كۆد و ڕەمزی دەقەكە. هەڵبەت ئەدەب (بەتایبەتیش شیعر) وەك بەڵگەنامەیەكە پڕیەتی لە ڕووداو و بەسەرهات و سەرگوزەشتە و ....هتد، چونكە ((نیگاركێشان و داتاشین و مۆزیك ناتوانن وەك ئەدەب پابەند بن، نیگار و شێوە و ئاوازەكان ناكرێ وەك ئەدەب بەڵگەمەند بكرێن)) (سارتەر، ٢٠٠٩، ٤٨). لەنێو ئەدەبدا هەست بە مێژوو و گۆڕانكارییە سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی و ئایینی و ڕۆشنبیرییەكان دەكرێت و ئەدەبی هەر نەتەوەیەك بەشێكی فراوانی مێژوو و بەسەرهات و سەرگوزەشتەی نەتەوەكەی تێدایە، ئەمە لەنێو ئەدەبی كوردییشدا ڕەنگی داوەتەوە ((بەشێكی زۆری ڕووداو و بەسەرهات و دۆسیە و بابەت و دنیابینییەكانی كورد وەك نەتەوە، لەناو تێكستە شیعرییەكانی ئەدەبی میللەتەكەماندا تۆمار كراون)) (حوسێن، ٢٠١٣، ل١٧٣). دەشێ ئەم زانیارییانە وەك پێوەرێكی ڕەخنەیی بۆ لێكۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن و ڕوونكردنەوەی مانا و ناوەرۆكی دەقەكە و بارودۆخی نووسینی دەقەكە خۆی بەكار بهێنرێتەوە.

(کاکەی فـەللاح) لـەم کتێبەیـدا کاتێـك دەقـە شـیعرییەکانی شـیکردۆتەوە، هەوڵیداوە مەبەست و ناوەرۆکی دەقەکان بۆ خوێنەر ڕوونبکاتەوە. لە زۆر شـوێندا وەکو بەڵگەنامەیەکی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی مامەڵەی لەگەڵ دەقەکانـدا کردووە و هەوڵیداوە ڕووداو و بەسەرهاتە مێـژوویی و سیاسـی و کۆمەڵایەتییـەکان لەنێو دەقە شیعرییەکاندا هەڵبهێنجێت و بەهۆی ئـەم زانیارییانەشـەوە مەبەسـت و واتای دەقەکە شیبکاتەوە. بۆ نموونە لە بابەت شیعری مرۆڤایەتی لای (گۆران) ی شاعیر دەڵێت: ((گۆران، وەك شاعیرێکی خاوەن بڕوا و لایەندار و هەست بە ئەرکی سەرشان کردوو، بە قووڵی بڕوای بە یـەکێتیی خـەبات و بەرژەوەنـدیی تێکۆشـانی میللـەتان و چارەنووسـیان هەیـە)) (کاکـەی فـەللاح، ١٩٨٧، ل ٥٩). هـەر لـەم ڕوانگەیەشەوە (گۆران) شیعری (پەیامی کـورد)ی لـە دژی ڕژێمـی سـەرمایەداری و ئیمپڕیالیستی و داگیرکەری بۆ نەتەوە چەوساوەکانی جیهـان نووسـیوە و (کاکـەی فەللاح)یش کاتێك کۆپڵەیەك لە دەقەکەی شیکردۆتەوە هەر لەم ڕوانگەیەوە باسـی کردووە. هەروەها (گۆران) شیعری (لاوکی سوور)ی بۆ نەتەوەی کۆریـا نووسـیوە، کە ئەوکات هەردوو کۆریا لە جـەنگێکی دەسـتە و یەخـەدا بـوون لـە دژی یـەکتر و کۆریای باکوور لەلایـەن یـەکێتی سـۆڤیەتی جـاران و کۆریـای باشـووریش لەلایـەن ئەمریکاوە پاڵپشـتی لێـوە دەکـرا، کـە تیایـدا (گـۆران) لایـەنگری کۆریـای بـاکوور دەکات و داوای ئازادی و سەربەستی بۆ نەتەوەی کۆریا دەکـات. (کاکـەی فـەللاح) لـەبارەی ئـەم دەقـەوە دەڵێـت: ((ورد ورد بـار و مەبەسـت و کارەسـاتی شـەڕی کۆریامان بۆ دەگێڕێتەوە گەل چۆن دەژیا و ئیمپریالیزمی ئەمریکا و کۆنەپەرسـتی ئەڵقـە لـە گـوێی کۆریـای خـواروو چـییان دەویسـت و قارەمـانێتی گـەلی کۆریـا و جانەوەرێتی ئەهرەمەنی سـەردەم لـە چ پلەیەکدا بـوو)) ( کاکـەی فـەللاح، ١٩٨٧، ل ٦١). نووسـەر وەك بەڵگەیـەکی مێـژوویی دەقەکـەی شـیکردۆتەوە و لـە ڕوانگـەی شەڕی نێوان هەردوو کۆریا و چاوتێبڕینی ئەمریکا بۆ داگیرکردنی کۆریـا نـاوەرۆکی دەقەکـەی باسـکردووە. لـە بابـەت شـیعری (شۆڕشـگێڕ)ی (گـۆران)ەوە نووسـەر شـیعرەکە بـە شۆڕشـی چـواردەی تـەمووز و ڕووخـانی ڕژێمـی پاشـایەتی و سەرهەڵدانی سیستەمی کۆمـاری لـە عێراقـدا پەیوەسـتدەکات و دەڵێـت: ((پارچـە شیعری شۆڕشگێڕ کە تایبەتە بە هەڵهاتنی خۆری چواردەی تـەمووز.. دەسـتەیەك

لە ئاغا و سەرجاسوس و مەلایەکی خۆفرۆش و کۆنە حاکمێك و سەرەك پۆلیس و بازرگان و سەر پزیشك و شەپقە زلێك کنەیان لە دۆزینەوەی هۆی کەوتنی پیاوە زلەکەی ئیمپریالیزم دەکرد و هەریەکەیان بەپێی بۆچوونی خۆی پەنجەی بۆ درێژ دەکرد)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ٦٥). هەڵبەت هەموو ئەو کەسێتییانەی شاعیر بەکاریهێناون ڕەمزن و دەلالەت لە لایەنگرانی پاشا و دارودەستەکەی دەکەن و شاعیر خۆشحاڵیی خۆی لەبارەی کەوتنی ڕژێمی پاشایەتییەوە دەردەبڕێت، (کاکەی فەللاح)یش سەرجەمی شیعرەکە بۆ ئەم ڕووداوە مێژووییە دەگێڕێتەوە.

لەبارەی (هەردی) شاعیرەوە دەڵێت: ((هەر لەو سەردەمانەدا شاعیر کۆمەڵێك شیعری سیاسی بەبۆنەی چەند ڕووداوێکی سیاسییەوە دانا)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٤٢). واتە (هەردی) هەوڵیداوە ڕووداوە سیاسییەکانی سەردەمەکەی خۆی بخاتە نێو شیعرەکانییەوە. ئەمەش کارێکی ئاساییە و چونکە ئەم دەقە شیعرییانە مێژوویێك بۆ نەتەوەی کورد تۆمار دەکەن. (کاکەی فەللاح) لەبارەی شیعرێکی (هەردی)یەوە کە بە بۆنەی لەسێدارەدانی چوار ئەفسەرە کوردەکەی سوپای عێراق نووسیویەتی، دەڵێت: ((بەبۆنەی لەسێدارەدانی ئەفسەرە کوردەکانەوە: مستەفا خۆشناو، عیززەت عەبدولعەزیز، خەیروڵلا عەبدولکەریم، محەمەد قودسی، و ناشتنی تەرمی دووانیانەوە لە سلێمانی شاعیر ئەم شیعرەی خوارەوەی لە ساڵی ١٩٤٧ دا داناوە)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٤٢). (کاکەی فەللاح) باسی ئەو ڕووداوە مێژووییە دەکات کە ئەم شیعرەی لەپێناودا دانراوە، کەواتە ڕەخنەگر مەبەست و ناوەرۆکی دەقەکەش بەم ڕووداوەوە دەبەستێتەوە و لە دەرەوەی دەقەکەوە بۆ واتای دەقەکە چووە. دیسانەوە (هەردی) شاعیر بەبۆنەی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤٨)ەوە شیعرێکی داناوە و (کاکەی فەللاح)یش لەبابەت ئەم شیعرەوە دەڵێت: ((بەڵام ئەو سروودەی کە لە گەرمی و برەو و بایەخدا پلەی دووەمی دوای سروودی ئازادیخوای وەرگرت، ئەم سروودە بوو کە بەبۆنەی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ەوە دایناوە...... لە کارەساتی دوای ڕاپەڕینەکەی کانون و لێدانی بزووتنەوەی نیشتیمانی و حیزبە پێشکەوتنخواز و دیموکراتەکانەوە، شاعیر پشتی کردە سیاسەت و کونجی گۆشەگیری گرت)) ( کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٤٤). وەك نووسەر

بۆی چووە لەڕێگەی ئەم دەقەوە هەڵوێستی شاعیر و خەڵکی ئەوسامان بەرامبەر ڕژێمی پاشایەتی و داگیرکەری بەریتانیا بۆ دەردەکەوێت و واتای دەقەکەش لە دەوری ئەم ڕووداوە دەخولێتەوە.

(کاکەی فەللاح) لەبارەی نازناوی خۆی و پارچە شیعرێکی خۆی کە بۆ جووتیار و هەژار و ستەمدیدەکانی نووسیوە و داوای ڕاپەڕینیان لێدەکات و شیعرەکەش بۆنێکی حەماسی لێدێت، دەڵێت: ((سەرەتای ئەم لەقەبە بۆ ساڵی ١٩٤٧ز دەگەڕێتەوە. بۆ سەردەمی هەڵبژاردنی نوێنەرانی پارلەمان کە پارتی کۆمۆنیست و حیزبی ئازادکردنی نیشتیمانی لە سلێمانی کۆبوونەوەیەکی تەواو گەورەیان بۆ ساز کرد و لە ساحەی قوتابخانەی سانەوی (غازی))، قوتابخانەی شێخ مەحمودی سەرەتایی ئێستا، ئەو کۆڕە بەسترا و، ئەمیش بەو بۆنەیەوە پارچە قەسیدەیەکی دوور و درێژی خوێندەوە)) ( کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٩١).

نووسەر هۆی نازناوە شیعرییەکەی و ئەو پارچە شیعرەش کە ئەوکات وتوویەتی، بە هەڵبژاردنی نوێنەرانی پەرلەمانی عێراق لە ساڵی (١٩٤٧)ەوە پەیوەست کردووە، ئەوکات عێراق لەژێر ئینتیدابی بەریتانیادا بوو و سیستەمی پاشایەتی کە بەرگری لەم ئینتیدابە دەکرد ولاتی بەرێوە دەبرد، ڕەخنەگریش ناوەرۆك و مەبەستی دەقەکە و نازناوەکەشی (کە زیاتر مەبەست لێی بەرگریکردن بووە لە جووتیار و مافەکانیان) هەر لەمەوە هەڵێنجاوە و شیکردنەوەی بۆ دەقەکە لە خودی دەقەکەوە نەبووە، بەڵکو بە پشتبەستن بە هۆکاری دەرەکی (کە ئەم ڕووداوە مێژووییەیە) دەقەکەی شیکردۆتەوە.

بەشێوەیەکی گشتی (کاکەی فەللاح) لەم کتێبەیدا لە زۆر شوێنی تردا وەکو بەڵگەنامەیەکی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی شیعرەکانی ئەو کۆمەڵە شاعیرەی کە هەڵیبژاردوون، شیکردۆتەوە و هەوڵیداوە بەگوێرەی ئەم زانیارییانەوە لە شیعرەکان بکۆڵێتەوە، ئەگەرچیش لە هەندێك شوێندا نەیتوانیوە تەواو مەبەست بپێکێت و ئەوەندەی گرنگی بە ڕووداوە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانەوە بەستووە ئەوەندە گرنگی بە ناوەرۆکی شیعرەکانەوە نەداوە، بەڵام تا ڕاددەیەکی زۆریش بە جەختکردنەوە لەسەر ئەم زانیاری و ڕووداوانە توانیویەتی واتا و مەبەست و ناوەرۆکی شیعرەکان بۆ خوێنەر ڕوون بکاتەوە.

**تەوەرەی دووەم: بەستنەوەی واتا و ناوەڕۆکی دەقەکان بە ژیانی شاعیرەکانەوە:**

(کاکەی فەللاح) لەم کتێبەیدا لەکاتی شیکردنەوەی زۆرێك لە دەقە شیعرییەکان، هەوڵیداوە لە ڕێگەی پەیوەستکردنی زانیاری و ڕووداو و بەسەرهاتەکانی قۆناغە جیاوازەکانی ژیانی شاعیرەکان و دەقە شیعرییەکانیانەوە لە دەقەکان بکۆڵێتەوە. ئەمەش بۆ ئەوەی لەڕێگەی ئەو زانیارییانەی ژیانیانەوە مەبەست و واتای دەقەکان شیبکاتەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی دەقی ئەدەبی زۆر جار ڕەنگدانەوەی ژیانی ئەدیبەکانە و زۆرێك لە ئەدیبەکان بەشێکی ژیانیان لەنێو بەرهەمە ئەدەبییەکاندا تۆمار دەکەن. هەر لەم ڕوانگەیەشەوە (کاکەی فەللاح) بە سوودوەرگرتن لە ژیان و ڕووداوە جیاوازەکانەوە دەقەکانی شەنوکەو کردووە.

لەبارەی شیعری (بۆ هیوای کوڕم)ی (گۆران)دا دەڵێت: ((هەمان هەنسك و هەمان قوڵپی نائومێدی و بێ هیواییە کە لێرەدا گەیشتۆتە لووتکە و کەوتۆتە بەراوردێکی میسالیانەی سەیرەوە لەنێوان ژیانی نائومێدی خۆی و ژیانی هیوادا. لەنێوان گریانی بێ فرمێسکی خۆی و گریانی بێ مەبەستی منداڵانەی کۆرپەکەیدا.. تەنانەت بوونی ساواکەی بەتاوانی باوکێتی خۆی دادەنێ و دەڵێت: ئەگەر ژیانی تۆش نوسخەی دووەمی کاربۆنی ڕەشی ژیانی من بێت، هەقی خۆتە هەموو دەریاکان پڕکەی لە تف و بیدەی بە تەختی ناوچاوانی باوکێتی مندا..)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ٢١). نووسەر ناوەڕۆکی دەقەکەی بە ژیانی پڕ لە ناسۆری و بێ ئومێدی و ناخۆشی (گۆران)ەوە بەستۆتەوە، کە هەموو کات ژیانی خۆی و خێزان و منداڵەکانیشی دەردی سەری و مەینەتی و هەژاری بووە و ئەم لایەنانەش لە بەشێکی شیعرەکانی (گۆران)دا ڕەنگیانداوەتەوە. لە بارەی شیعری (وەڵامی پرس)ی (گۆران)دا دیسانەوە ناوەڕۆکی دەقەکە و شیکردنەوەی دەگەڕێنێتەوە بۆ دوا ساتەکانی ژیانی (گۆران) و تووشبوونی بە نەخۆشی و مانەوەی لە نەخۆشخانە و بێ هیوایی لە چارەسەرکردن و دەڵێت: ((لە ١٩٦٢/١١/١٨ دا گۆرانی شاعیر و داهێنەر و نوێکەرەوە، مرۆڤ و هەست ناسك و جوانی پەرست، نیشتیمان پەروەر و تێکۆشەر و ئاشتی خواز، بلیمەت و خاوەن بەرهەمی نەمری جیهانی بە نەخۆشی سەرەتانی گەدە بەجێی هێشتین و ڕووی کردە سەیوانی ماتەم، دوا یادگاری

شیعری ئەم پارچەی خوارەوەیە........ لەژێر زەبری ئەو نەخۆشییەدا لەو حاڵەتی دەروونی و دوور وڵاتیەدا، لەو دیمەنەدا کە چاوی مەرگی سامناکی لێ زیتە و گێژەلووکەی ئازار لوولی داوە، ئەوەتا خەم و پەژارەکەی بۆخۆی نەبوو، بۆ گەل و وڵاتەکەی بوو)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ٧٤).

لەبارەی شیعری (کوێرەوەری) کە (مەدهۆش)ی شاعیر لەبارەی ژیانی خۆی نووسیویەتی، (کاکەی فەللاح) دەڵێت: ((بەم شیعرە ساکار و ڕاستگۆیە، شاعیر کەفوکوڵی خەم و پەژارە و دەردی کوێرەوەری خۆیمان، بەو تابلۆ داخاوی و ڕاستەقینانە، بەو هەموو زووخاوەوە بۆ هەڵدەڕێژێت و سەختیی گوزەران و نان پەیداکردنی ئەو سەردەمەی خۆیمان، وەك فلیمێکی سینەما، بۆ دەگێڕێتەوە)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٢١-١٢٢). (کاکەی فەللاح) ئەم شیعرەی بە ژیانی کوێرەوەری و هەژاریی شاعیر بەستۆتەوە و پێیوایە ئەوەی شارەزای ژیانی شاعیر بێت، زیاتر مەبەستی ئەم جۆرە شیعرانە تێدەگات، چونکە شاعیر هەموو مەینەتی و ئازارەکانی ژیانی خۆی لە شیعرێکدا کورت کردۆتەوە. لەبارەی شیعرە خۆشەویستییەکانی (مەدهۆش) نووسەر پێیوایە کە ناوەرۆکی خۆشەویستی ئافرەت لەم جۆرە شیعرانەیدا بۆ پیشەکەی دەگەڕێتەوە و دەڵێت: ((ئەوەش کە زۆرتر پارێزەری مانەوەی ئەم پەیوەندییە ڕۆژانەییەی پیشەکەی شاعیرە کە بەرگ دروونە بەتایبەت بەرگ درووی ئافرەت. بێ گومان پیشەی شاعیر، وەك حەقیقەتێکی گەورەی ڕۆژانە، دەخڵی بەسەر شیعرەوە زۆرە و لە شیعرەکاندا، کەم و زۆر، دەنگ و ڕەنگ دەداتەوە)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٢٦-١٢٧). نووسەر پێیوایە کە پیشەی بەرگ دروویی ئافرەتان و ئەو ژینگە و دەوروبەرەش کە شاعیری تێدا ژیاوە و کاریشی تێدا کردووە، کاریگەرییان بەسەر ئەو شیعرانەوە هەبووە کە ناوەرۆکەکەی باسی خۆشەویستی و ئافرەتان دەکات و شیعرەکانیشی لە ڕوانگەی ئەم کاریگەرییەوە شیکردۆتەوە.

لە بارەی شیعری (ڕازی تەنیایی)ی (هەردی)یەوە، (کاکەی فەللاح) دەڵێت: ((ئەم شیعرە بەروبوومێکی تەواو ڕاستگۆیانەی تاقیکردنەوەی پڕ لە هەستی شاعیر خۆیەتی و بەم وێنە زیندووانە زمانی پـاوە و دەستی هونەرمەندانەی گەیاندۆتە قووڵترین ناخی دەروون بەوپەڕی ئەمانەتەوە چیرۆکی جوانە مەرگی

پاراوی و دڵشکاوی و گلان و بەکام نەگەیشتن و ڕەنجەڕۆیی و بێ هیوایی بەپەردەی گوێماندا دەدات)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٤٨). ئەم بڕیارەی نووسەر تەواو ڕەنگدانەوەی ژیانی شاعیرە و نووسەر پێیوایە کە (هەردی) لە دنیای سیاسەت و دڵداریدا تووشی کەوتن و دڵشکاوی و نائومێدی بووە و ئەمەش لە شیعرەکانیدا ڕەنگیداوەتەوە، کە (ڕازی تەنیایی)یش ڕەنگدانەوەی ئەم بارودۆخەی ژیانی شاعیرە. هەر لە باسی (هەردی) و لە بابەت شیعری (دڵداری کچی تازە)دا نووسەر ئەم شیعرەش بە قۆناغێکی ژیانی شاعیرەوە پەیوەست دەکات، کە مەسەلەی دڵداری و خۆشەویستییە لە ماوەی تەمەنی گەنجیی شاعیر و دەڵێت: ((هەنگاوی یەکەمی شیعرەکە هەمان چیرۆکی خۆشەویستی شاعیرە و دووبارە دەبێتەوە. بەڵام لەپاڵ سکاڵا و دەربڕینی خۆشەویستی و هەستی جوانی پەرستییەکەدا هۆیەکی کۆمەڵایەتی، کەوا دیارە تەگەرەیەکی سەرەکی نێوانە، لێرەدا سەری هەڵدا. کە ئەویش ناوهێنانی (تەلار)ە و نیشانەی دەوڵەمەندی سامانی ماددیی بەچکە دەوڵەمەندێکە کە خۆشەویستەکەی پێ تەفرە داوە و لێی زەوت کردووە و بە چەشنێك مەستی کردووە کە نە چاوی ئەو، فرمێسك و کڕنوشەکانی ئەم ئەبینێ و نە گوێشی هەنیسك و ناڵە و پڕمە یەك بینەکانی ئەبیسێت)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٥٧).

لە بابەت شیعری (شانزە ساڵ چاوەڕوانی)شدا نووسەر ئەم شیعرە بۆ قۆناغێکی ژیانی شاعیر دەگەڕێنێتەوە و دەڵێت: ((هۆی سەرەکی بەیەك نەگەیشتنیش، وەك بە شیعرەکەدا دەردەکەوێت، جیاوازیی باری کۆمەڵایەتی و هەژاری و دەوڵەمەندییە، ئەویش بە ناوهێنانی وشەی (هەژار) لە بەیتی (کە شەوقی چەندە گەنجی هەژاری تیا ڕزاوە)دا و بڕواناکەم مەبەست لە هەژار بەستەزمان بێت جگە لەوەش وادیارە شاعیرمان لەماوەی ئەو شانزە ساڵی چاوەڕوانی کردنەشدا هەر لە ئاگری سزا و ژیانی بێ هیوایی و ڕەنجی بێ دەر و خەیاڵی دووردا ژیاوە.......)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٥٩). نووسەر هەوڵیداوە بە سوودوەرگرتن لە بەشێکی ژیانی شاعیر ئەم شیعرە لێکبداتەوە و پەیوەستی بکات بەو ساتانەی کە شاعیر کچێکی خۆشویستووە و ماوەی شانزە ساڵ چاوەڕوانی کردووە، کەچی هەر پێینەگەیشتووە، ئەمەش لەبەرئەوەی شاعیر هەژار بووە و (کچە یان بنەماڵەکەیان) بە باری ئابووری و کۆمەڵایەتی شاعیر ڕازی نەبوون.

لەبارەی شیعری (لە جەرگەی تاریکییەوە) کە هی (کاکەی فەللاح) خۆیەتی و ناوەرۆك و مەبەستی شیعرەکەی بە ڕووداوێکی ژیانی خۆیەوە پەیوەست دەکات و دەڵێت: ((لەسەر بەشداربوونی ڕاپەڕینەکەی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ ساڵێك بەندی و ساڵێك دەست بەسەری حوکم دراو، بەندییەکەی لەنێوان بەغداد و کوت و دەست بەسەریەکەی لە پارێزگای (ناصریە) بەسەر برد و لە (ئەبوغرێب)دا بەناوی (لە جەرگەی تاریکییەوە)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٩٣). ئەم شیعرەی وتووە و هیوا و ئاواتی سەربەستی و ئازادی بووە لە زیندان و باسی بارودۆخی خۆی لەنێو زینداندا دەکات، هەر خۆشی بەگوێرەی ئەم ڕووداوەی ژیانییەوە باسی شیعرەکە دەکات و بەرچاوڕوونی بە خوێنەر دەدات، تا بەتەواوی لە نهێنی و واتاکانی شیعرەکە تێبگات.

**تەوەرەی سێیەم: کاریگەری سەردەم بەسەر دەقە شیعرییەکانەوە:**

ئەو سەردەم و کاتەی کە شاعیرەکانی تێدا دەژیت، کاریگەرییەکی زۆریان بەسەر شیعرەکانیانەوە هەیە. بۆیە دەبینین بەشێکی زۆری شیعرەکان ڕەنگدانەوەی بارودۆخ و قۆناغە جیاوازەکانی ئەو سەردەم و کاتانەن کە شیعرەکانیان تێدا لە دایك بوون، ئەمە یەکێکە لەو یاسایانەی کە (هیپۆلیت تین) دایناوە ((تین گرنگی بەو ساتە دەدات کە نووسەرەکە داهێنانی تێدا دەکات و پێیوایە کە شارەزایی لێی پێویستە چونکە بیرۆکەی وای تێدایە کە ئەولەویەت بۆ ئەو بیرۆکانەیە و بۆ ماوەیەکی درێژ نەتەوەکان لەژێر باری ئەو سەردەم و بیرۆکانەوە بوون، ئەمانە بەدوای بەرهەمهێنانی ئەدەبییەوەن)) (الطالب، ١٩٩٣، ص٨٨). (تین) سەردەمی نووسینی بەرهەمە ئەدەبییەکانیش دەکاتە مەرجێك بۆ لێکۆڵینەوە و دروست خوێندنەوەی ئەدەب، چونکە هەر سەردەمێك و ئەدەبێکی تایبەت بەخۆی هەیە و جیایە لەگەڵ ئەدەبی سەردەمەکانی پێش و دوای خۆی بۆ نموونە لە ئەدەبی ئەوروپیدا ((ئەدەبی سەردەمە کۆنەکان کە لەسەردەمی ئایینە دوانەییەکان (بت پەرستی) و شارستانییەتی کشتوکاڵی دەرکەوتن جیایە لەگەڵ ئەدەبی سەدەکانی ناوەڕاست کە لە سەردەمی ئایینە ئاسمانییەکان و فەرمانڕەوایی فیودالیزم و لێکجیابوونەوەی نەتەوەکانەوە پەیدابوو، هەروەها ئەمەش جیایە لەگەڵ ئەدەبی نوێ، کە بەهۆی ئازادیی بیرەوە دەرکەوت کە

ڕێنیسانسی ئەوروپی هێنایە کایەوە، هەروەها دەرکەوتنی نەتەوەکان و دۆزینـەوە و داهێنانە هاوچەرخەکان، لـە کۆتاییشـدا لەگـەڵ ئـەدەبی هاوچـەرخدا جیـاوازە)) (مندور، ١٩٧٤، ص ١٥٤) بۆیە دەبینین ئـەدەبی هـەر سـەردەمێك ڕەنگدانـەوەی ئـەو سەردەمەیە بـە هـەموو تایبەتمەنـدی و ڕووداوی مێـژوویی و سیاسـی و ئـابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئەدەبی، ئەمە لە ئەدەبی کوردیشدا هەستی پێدەکرێت و ئەدەبی کوردی بە درێژایی سەردەمە جیاوازەکـان گـۆڕاوە و ڕەنگدانـەوەی ئـەو سەردەمانە بووە کە تێیدا هاتۆتە کایەوە و هەموو تایبەتمەندییەکانی سەردەمەکە و کۆمەڵگاکەی نیشانداوە بە هەموو گۆڕانکارییە مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایـەتی و ڕۆشنبیری و کێشە و گیروگرفتەکانـەوە، هـەروەها چـۆن گۆڕانکـاری سـەردەم و کۆمەڵگاش ڕۆڵیـان لـە نوێبوونـەوە و گـۆڕانی ئـەدەبی کوردیـدا هـەبووە. (کاکـەی فەللاح)یش لەم کتێبەیدا ڕەچاوی ئەمەی کردووە و لەکاتی لێکۆڵینەوە لە بەشێکی دەقــە شــیعرییەکاندا هەوڵیــداوە لــە ڕوانگــەی کاریگــەریی ســەردەم و ســاتی هاتنەکایەی شیعرەکان، ناوەرۆك و واتا و مەبەستی شیعرەکان ڕوون بکاتەوە. بـۆ نموونە، لەبارەی هەنگاونانی (گۆران) بەرەو ڕیالیزم دەڵێـت: ((ئەگـەر سـاڵ دانـان دروسـت و ڕەوا بێـت ئـەوا لـە چـلەکان بـەدواوە لـەم چەشـنە تەقـەڵا ئەدەبییـە گەورەیەشدا سەرکەوتووانە هەورازی گرتەبەر و کارەساتی شەڕی دووەمـی جیهـان و بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی سەربەستی و مافی چارەنووسـی گـەلان و سـەرکەوتنی بــەرەی گــەلان بەســەر مۆتەکــەی شــەڕ و فاشــیزمدا و بەرزبوونــەوەی شــەپۆلی بزووتنــەوەی ڕزگــاریخوازی گــەلی عێـراق و دروســت بــوونی ژیــانی پارتایــەتی و بیروباوەڕی دیموکراسی و بزووتنەوەی ئاشـتیخوازی و مەسـەلەی چەوسـاندنەوەی نەتەوایــەتی و چــینایەتی و حاڵــەتی دەروونــی و بــیری و دیســان بلیمــەتی و ئامادەبوونی سروشتی ئەو پیت و بەهرەیـەی لـە زەمینـەی شـاعیرانەی ئـەوا بـوو، ئەمانە سەرجەم پێکەوە بوونە هەوێنی بەرەو چوونی تەواوی شاعیرمان بـۆ دنیـای ڕیالیزمی)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ٥٥). مەبەستی (کاکەی فەللاح) ئەوەیە کە ئـەو سەردەم بەم هەموو ڕووداو و پێشهاتە جیاوازانەیەوە ڕاستەوخۆ کاریانکردۆتە سەر (گــۆران) و لــە ڕۆمانســیزمەوە بــەرەو ڕیالیزمیــان بــردووە، شــیعرەکانی ئــەو سەردەمیشی زۆربەی ڕەنگدانـەوەی ئـەو ڕووداوانـە بـوون کـە ئـەوکات ڕوویانـدا و

کاریگەرییان بەسەر زۆربەی لایەنەکانی ژیاندا جێهێشت، کە ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەتی پشکێکی زۆری ئەم کاریگەرییەیان بەرکەوت. لەبارەی شیعری (بەردەنووسێك)ی (گۆران)، (کاکەی فەللاح) ناوەرۆکی شیعرەکەی بە دواکەوتوویی کۆمەڵگای کوردی ئەوکات بەستۆتەوە و دەڵێت: ((لە کۆمەڵێکی دواکەوتووی وەك کۆمەڵگای کوردەواریدا، لە تابلۆی ژیانی ڕۆژانەی گەلێکی وا نەخۆش و چەوساوە و ماف خوراودا، ئەم چەشنە کارەساتانە هەن و زۆریشن. شاعیریش وەك ڕابەرێك و ڕێ پیشاندەرێك، نەك هەر بە قووڵی هەستی پێکردووە، بەڵکو توانیویەتی هونەرمەندانە وێنەیان بگرێت و دەستنیشانی هۆیەکانی بکات و چاوی نووستوو بکاتەوە و دڵی بێهۆش بەئاگا بهێنێت)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل٦٣). نووسەر پێیوایە کە ئەو سەردەمەی شاعیری تێدا ژیاوە کۆمەڵگای کوردی دواکەوتوو بووە و کێشە و گرفتی زۆر بووە، ئەمەش کاریگەری بەسەر شاعیرەوە هەبووە، بۆیە هەوڵیداوە کێشە و گرفتەکانی سەردەمەکەی خۆی لەنێو شیعرەکانیدا باسبکات و هەوڵبدات خەڵك لەم گرفتانە ئاگادار بکاتەوە. ئەمەش پیشاندانی واقیعی ئەو سەردەمی کۆمەڵگای کوردییە کە شاعیر بەرپرسانە مامەڵەی لەگەڵدا کردووە.

لەبارەی شیعری (ئەی خودایە)ی (دڵدار)ەوە دەڵێت: ((لە شیعری (ئەی خودایە)دا وەك ناوەرۆك بەشێوەیەکی میسالیانە و خەیاڵی، لە کۆمەڵگایەکی دواکەوتووی وەکو کوردەواری و سەردەمی سی و چلەکاندا، جۆرە وردبوونەوە و سەرنجێکی ئازایانەی دەربڕیوە و تەواو هەستی بە جیاوازی چینایەتی کردووە و چەند دیمەنێکی ڕیالیزمانەی بە ناسۆرەوە نواندووە. ئەگەرچی هۆی هەموو جیاوازی و ناتەواوی ژیانی چەوساوەکانی بەرەو ڕووی ئاسمان کردۆتەوە)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٠٦). (کاکەی فەللاح) لە ڕوانگەی کاریگەریی سەردەم بەسەر شاعیرەوە، پێیوایە کە (دڵدار) ئاگاداری کێشە و گرفتەکانی سەردەمەکەی بووە و هەوڵیداوە کێشەی چینایەتی کۆمەڵگای دواکەوتووی ئەو سەردەمەی کورد باسبکات، کەوایە ئەو سەردەمەی کە (دڵدار)ی تێدا ژیاوە بە هەموو پێشهات و ڕووداو و بارودۆخەکەیەوە ڕەنگدانەوەیان بەسەر شاعیردا هەبووە و شیعرەکە ڕەنگدانەوەی ئەو سەردەمەیە کە تێیدا هاتۆتە کایەوە.

نووسەر لەبارەی شیعری (هۆشت لای خۆت بیّ)ی (مەدهۆش) کاریگەری و ڕەنگدانەوەی ئەو سەردەم و ژینگەیە دەردەخات کە (مەدهۆش)ی تێدا ژیاوە، باسی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی دەکات کە نەك هەر ئەو سەردەم بەڵکو ئێستاش ئەم جۆرە کێشانە لە کۆمەڵگای کوردیدا باوە و نووسەر دەڵێت: ((لە مەسەلەی کچ بەشوودانی زۆرەملیّ و یاخیبوونی کیژدا و وەستانی هەڵوێستێکی ڕاست و دروست، شاعیر لە پارچە شیعری (هۆشت لای خۆت بیّ)دا هونەرمەندانە ئەو نارەزایی و یاخیبوون و پیّ داگرتن و لەسەرکردنەوەیەی خۆشەویستییە دەنەخشێنێت و هەست و نەستی بەرامبەر بە فەرمانی شووکردن کە مافێکی تەواو سروشتی و ڕەوای کیژەیە و ژیان و کامەرانی و دوارۆژی پیّ بەخشیوە)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٢٩). شاعیر نەیویستووە لە ئاست ئەو ستەمەی لەو سەردەم بەرامبەر کچان دەکرا بێدەنگ بێت و دەنگی نارەزایی بەڕووی کۆمەڵگادا بەرزکردۆتەوە، دیارە لەو سەردەم مەسەلەی کچ بەشوودانی زۆرەملیّ باو بووە و ئەمەش کاری کردۆتە سەر شاعیر. لە شیکردنەوەی شیعری (خامە)شدا نووسەر هەوڵیداوە کاریگەری سەردەم و زوڵم و ستەمی کۆمەڵگای ئەوکات و ڕوانینی شاعیر بۆ پاشەڕۆژ ڕوون بکاتەوە و دەڵێت: ((ئەم شیعرە دەنگدانەوەی ڕاستەقینەی بەسەرهات و ڕووداوی سەردەمە تاریکەکانی ڕۆژگارێکە کە لە چەند سەردەمێکدا دەست و پێی شاعیر و هاوچەرخانی پیا چزاوە و لەگەڵ ئەو هەموو خەم و تەم و ناسۆرییانەشدا شاعیر ڕێگای بیرکردنەوە و بەراورد و قەناعەت و هیوای ون نەکردووە و بە چەند تابلۆیەکی ڕەنگینی هونەری ئەو هەڵچوون و بۆچوون و تێبینییانەی دەروونی خۆی تۆمار کردووە)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل١٣٣).

لەبارە ی شیعری (ئازادیخوای کوردین ئێمە)ی (هەردی)، نووسەر شیعرەکەی بە کاریگەری ئەو سەردەمە و بارودۆخەی کە شیعرەکەی تێدا سەرهەڵداوە باسکردووە و دەڵێت: ((شاعیر، هۆشیارانە دەستنیشانی دوشمنەکانی گەل کە ئیمپریالیزم و دەرەبەگ و کۆنە پەرستن، کردووە و ئامانجی سیاسیش لەناوبردنی ئەو دوشمنە خوێن خۆرانەیە لە ڕێگای شۆڕشێکی نیشتیمانیەوە)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٤١). (هەردی) لەم شیعرەیدا دژایەتی

خۆی بۆ ئاغا و دەرەبەگ و حکومەت و داگیرکەر دووپات کردۆتەوە و داوای ئازادی و چاونەترسی لە گەلەکەی دەکات، لەو سەردەمەی کە ئەم شیعرەی وتووە کۆمەڵگای کوردی و عێراقی بەگشتی لەژێر چەپۆکی زوڵم و ستەمی داگیرکەر و نۆکەرانیدا بوون و ئاغا و حکومەت و داگیرکەریش خەڵکیان دەچەوساندەوە، شاعیریش بە شیعرەکەیەوە گوزارشت لەم سەردەمە دەکات.

لە شیعری (ئەڕۆین)ی (ع. ح. ب.)ی شاعیریشدا، کاکەی فەللاح ئەم شیعرە و شیکردنەوەی ناوەرۆك و واتاکەی بۆ ئەو سەردەمە گەڕاندۆتەوە کە شاعیری تێدا ژیاوە، لەو سەردەمدا (وەك پێشتریش باسمانکرد) کێشەیەکی کۆمەڵایەتی باو بووە، ئەویش مەسەلەی کچ بەشوودانی زۆرەملێ بووە و نووسەر لەبارەی بەتەنگەوەهاتنی شاعیر بۆ کێشەی سەردەمەکەی خۆیەوە دەڵێت: ((لێرەدا پەنجەی بۆ دەردێکی گەورەی کۆمەڵایەتیمان درێژ کرد، دەردی زیندە بەچاڵ کردنی کچ لەشێوەی بەشوودانی زۆرەملێدا، کە تەنانەت جوانیش لە حاڵەتی وەهادا سەرباری کلۆڵییە و خاوەنەکەی پڕ بە دڵ تف و نەفرەتی لێ دەکات و ئەو ڕاستییەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە تەلیسمی خۆشی و کامەرانی مرۆڤ بە خشڵ و پارەی زۆر دروست نابێت و تەنها مەسەلەکە بە ویژدان و دەروون و هەستی ڕاستەقینە و بێ گەردی مرۆڤ و ویست و خواست و بایەخیەوە بەستراوە)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٧٤). شاعیر هەوڵیداوە سەردەمەکەی خۆی بە هەموو کێشە و مەینەتییەکانەوە بخاتە نێو شیعرەکانیەوە. واتە سەردەمەکە کاریگەری بەسەر شاعیرەوە هەبووە و وایکردووە ئەو بابەت و ناوەرۆکە هەڵبژێرێت کە لەو سەردەمدا باو بووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەر سەردەمێك و جۆرە کێشە و بابەتێك باوی دەبێت و لەنێو ئەدەبدا ڕەنگدەداتەوە.

لێرەوە ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە شیعر بەگوێرەی سەردەمەکان تەواو گۆڕانکاری بەسەردا دێت، چونکە شیعر ڕەنگدانەوەی ئەو سەردەمانەیە کە تێیدا سەر هەڵدەدات، شاعیرانیش ناتوانن خۆیان لە کاریگەریی سەردەم و ساتە جیاوازەکانی ژیان بەدوور بگرن، بۆیە هەموو کات هەوڵیانداوە ئەو سەردەمە جیاوازانەی کە تێیدا دەژین، لەنێو شیعرەکانیاندا گوزارشت لە هەموو بچووك و گەورە و باشە و خراپەی بکەن، چونکە هەر سەردەمێك مۆرکێکی تایبەت بە شیعر دەدات.

**تەوەرەی چوارەم: کاریگەری ژینگە بەسەر دەقە شیعرییەکانەوە:**

ژینگە وەکو ناوەندێکی جوگرافی و کۆمەلایەتی و هەروەها ئەو بارودۆخ و کەش و هەوایەش دەگرێتەوە کە لەم ژینگەیەدا هەیە و کاریگەرییەکی زۆری بەسەر شاعیر و شیعرەکانیانەوە هەیە. شاعیران پەروەردەکراو و کوڕی ئەو دەوروبەر و ژینگەیەن کە تێیدا دەژین. هەر لە ڕێگەی دەقە ئەدەبییەکانیشەوەیە دەکرێت بزانین کە شاعیران سەر بە چ ژینگە و دەوروبەرێکن بارودۆخ و ئاووهەوای ئەم ژینگەیە چ کاریگەرییەکی بەسەر ئەدیبەکانەوە هەیە، کەواتە ((دەتوانین گرنگیی ژینگە وەکو ناوەندێکی جوگرافی و کۆمەلایەتی دیاری بکەین کە کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر داهێنانی نووسەردا هەیە)) (صقر، ٢٠٠١، ص ٢٢٤) ئەمە جگە لەوەی کە کەش و هەوای ئەو ژینگەیەش بە گەرم و ساردییەوە کاریگەرییان بەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکانەوە دەبێت. ئەمەشیان یەکێکە لەو یاسایانەی کە (هیبپۆلیت تین) دایناوە، کە لەو ڕوانگەیەوە لێکۆڵینەوە لە دەقی ئەدەبی دەکرێت. (کاکەی فەللاح) لەم کتێبەیدا هەوڵیداوە کاریگەریی ژینگە بەسەر هەندێك لە شاعیرەکان و شیعرەکانیاندا دەربخات، بۆ نموونە پێیوایە ئەو ژینگە و سەردەمەی (گۆران)ی تێدا ژیاوە هۆکارن بۆ ئەوەی ئەو ببێتە سەرمەشقی نوێکردنەوەی شیعری کوردی و دەڵێت: ((ئەو بیئە و ئاووهەوا ئەدەبییە و ئەو گیانی سەردەم و تامەزرۆییە و ئەو تەقەلا و کنە و خولیایەی لە دڵ و دەروونی (گۆران)دا بوو کارێکی کاریگەری ئەوتۆیان کرد کە ئەرکی گەورەی مێژوویی ئەو گۆڕین و درێژەپێدان و چەسپاندن و سەر پێ گرتنە، وەك پێشەوایەك و داهێنەرێك بەو بسپێررێت)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ٣١-٣٢). لەبارەی کاریگەریی ژینگە و سروشتی کوردستان لەسەر (گۆران) دەڵێت: ((لەپاڵ جوانی و ڕازاوەیی سروشتی تەلیسماوی کوردستان و جوانییە پڕشنگ هاوێژەکەی نازدارانی جاف و بەگشتی شۆخەکانی کوردستاندا تێکڕا هەموو ئەم گەوهەرانە، لەگەڵ بەهرەی شاعیرانەی (گۆران) و بلیمەتی و گیانی جوانی پەرستی و چاوتیژیی وێنە و تێبینی ورددا، بوونە هەوێنی جووڵە و دانەکەوتن و داهێنان و تێپەڕبوون و قەتیس نەبوونی شەونمی بەهرە و هونەری خولیا و کەڵکەڵەی گۆڕین و سەر لێ دەرکردن و بەرەو پێشەوەچوونی سەرکەوتووانەی شیعری کوردی لەسەر شەست پەڕی

گوڵی ناسك و گەشاوەی تەمری قەریحەی (گۆران)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ٣١). (کاکەی فەللاح) پێیوایە کە ئەو ژینگە و دەوروبەرەی کە شاعیری تێدا ژیاوە لەو هەموو جوانی و ڕازاوەیی و دلڕفێنی سروشت و هەموو ئەو شتە جوانانەی لەنێو ئەو سروشتەدایە، ئەمە لەپاڵ بەهرەی شاعیری و زیرەکیی شاعیر کاریان کردۆتە سەر (گۆران) و بەرەو نوێبوونەوەیان بردووە. هەر لەبارەی (گۆران) و کاریگەربوونی بە جوانی سروشتی کوردستان جوانی ئافرەتانی کورد و ڕەنگدانەوەی ئەمە لە شیعرەکانیدا دەڵێت: ((سروشت، بەتایبەتی سروشتی کوردستان، بە هەموو تەلیسمێکی جوانی و کەم هاوتاییەوە، ئافرەت بە هەموو پرشنگە دیار و نادیارەکانی جوانی و شۆخییەوە، وای لێ کردبوو، هەر شیعرێکی وتبێت لە دنیای ڕۆمانسییانەدا وێنە و تابلۆی کەم وێنەی شیعری کوردی بێت)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ٣٩). (گۆران) ئەوەندە کاریگەر بووە بەو ژینگەیەی کە تێیدا ژیاوە تەنانەت مۆرکی ئەو ژینگەیە بە شیعرەکانیەوە دیارە و جیاوازە لەگەڵ هەر شاعیرێکی تر. بۆیە گۆران زۆر شیعری بۆ ئەو سروشت و ژینگەیە وتووە و لەم بارەیەوە (کاکەی فەللاح) دەڵێت: ((لەبابەتی جوانیی سروشتەوە (دار چواڵەی پشکووتوو، بەهاری پاش باران، پاییز، هەوری پاییز، سەوزە گیای پاییز، دیمەنێکی بەهار، تاریکە شەوێ، ئەی گەلاوێژ، بەسەرهاتی ئەستێرەیەك، بۆ گوڵی لاولاو، تازە، گەشتەکانی هەورامان و قەرەداغ) چەند گەوهەرێکی بریقەدارن لە ملوانکەی شیعرە سروشتییەکاندا)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ٤٠). ژینگە و سروشتی کوردستان و ئەو ناوچە جیاوازانەی شاعیر پێیدا گوزەری کردووە و تێیدا ژیاوە بۆتە سەرچاوەی ئەم شیعرانە، کە هەر خوێنەرێك شیعرەکان بخوێنێتەوە دەزانێت ئەو ژینگە و سروشتەی (گۆران) باسی کردووە کوردستانە. هەر ئەم ژینگە جوان و بێ وێنەیە وای لە (گۆران) کردووە تەنانەت وێنە شیعرییەکانیشی کاریگەری ئەو کەش و هەوا و ژینگەیەیان بەسەرەوە بێت، بۆ نموونە (کاکەی فەللاح) لەبارەی دێڕە شیعری (مانگی بەجێماو لە سەفەری شەو)دا دەڵێت: ((لێرەدا شاعیر شەوی بە کاروانێك چواندووە و مانگیش لەبەر دووری و سەرەو ژوورەیی و سەختی ڕێگا بەجێ ماوە و پێی خستووە و خەریکە ڕۆژی لێ دەبێتەوە، بەڵام لەم کاتی لێڵی بەرە بەیانەدا ڕێی کەوتۆتە سەر شاخە بەرزەکانی کوردستان و لەتاو چریکە و

قاسپەی کەوەکان لە ترسانا زەرد هەڵگەڕاوە و تۆقیوە و.. خەیاڵ هەستی شاعیر تامەزرۆی ئەم چەشنە وێنانەیە و بەم جۆرە تابلۆیە دەیەوێت کەفوکوڵی خۆی دامرکێنێت)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ٥٣). (کاکەی فەللاح) هەوڵیداوە دێڕە شیعرەکە لەژێر کاریگەریی ژینگە و سروشتی کوردستان لێکبداتەوە و ئەوە ڕوونبکاتەوە کە ژینگە و دەوروبەری شاعیر تەواو کاریگەرییان بەسەر وێنەی شیعری و شێواز و جۆری ناوەرۆکی شیعرەکانی شاعیردا هەیە.

لەبارەی کاریگەریی ژینگەی شاری سلێمانی بەسەر (مەدهۆش)ەوە، (کاکەی فەللاح) لەسەر زاری شاعیرەوە دەڵێت: ((کە شیعر دەنووسم زۆرتر حەزدەکەم بە تەنیا بم، ئەگەر لە دەشت و دەری کوردستان بێت باشترە.. جاران بناری گۆیژە بۆ شیعر نووسین زۆر خەیاڵی ئەدامێ، ئەوکاتە سلێمانی ئەوەندە گەورە نەبوو، بە تەنیا بەرەو ژوور ئەبوومەوە بۆ بناری گۆیژە، تا ئەگەیشتمە ئەوێ شیعر پێ دەگەیشت)) (کاکەی فەللاح، ١٩٨٧، ل ١٢٠). چ (مەدهۆش) خۆی و چ (کاکەی فەللاح) هەردووکیان پێیانوایە کە ژینگە و سروشتی سلێمانی و دەوروبەرەکەی کاریگەرییان بەسەر خەیاڵ و داهێنانی شیعریی شاعیرەوە هەبووە و ئەمانە هۆکارێك بوون بۆ چەکەرەکردنی بەهرەی شیعریی لای شاعیر، ئەوەتا (مەدهۆش) و (کاکەی فەللاح)یش پێیانوایە کە هاندان ڕۆڵی لە سەرهەڵدانی شیعردا هەیە، ئەمە لەپاڵ بەهرە و توانا و سەلیقەی هونەری و شیعری.

### تەوەرەی پێنجەم: گرنگیدان بە ژیانی شاعیران:

(کاکەی فەللاح) لەم کتێبەیدا بەشێکی لێکۆڵینەوەکەی بۆ ژیانی شاعیرەکان تەرخان کردووە، ژیانی شاعیرەکان زانیاریی ورد و بەسوودیان تێدایە و دەشێ بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی شیعرەکان سوودێکی زۆری هەبێت، یان دەشێ سوود لە زانیارییەکانی نێو شیعرەکان وەربگیرێت بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوە لە ژیانی شاعیرەکان. چونکە ئەدەب ڕەنگدانەوەی ژیان و لایەنی دەروونی نووسەرە. ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە لەنێو میتۆدی ڕەخنەی مێژووییدا زۆر باوە و کاریگەریی ئەرێنی هەیە لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبدا. ڕەخنەگری فەرەنسی (سانت بۆڤ) بە پێشەنگی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە دادەنرێت کە گرنگییەکی تایبەت

بە ژیان و زانیارییە جۆراوجۆرەکانی ژیانی شاعیران دەدەن. بە بۆچوونی (بۆڤ) هەرگیز ناتوانین بێ بوونی زانیاریی ورد و لێکۆڵینەوە لە ژیانی نووسەر، بڕیار بەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکانیاندا بدەین ((سانت بۆڤ ١٨٠٤-١٨٦٩ ڕەخنەی مێژوویی بەرەو پێشەوە برد بەتایبەت لە ئاخاوتنە ناسراوەکانی بەناوی (ئاخاوتنەکانی دووشەممە و ئاخاوتنە نوێکانی دووشەممە) بۆ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لە ئەدیبەکان کە پشت بە لێکۆڵینەوەی فراوان ببەستێت بەهۆی پەیوەندییانەوە بە ژینگە و نەتەوە و خێزان و سەردەم و پەروەردە و پێکهاتەی جەستەیی و دەروونی و عەقڵی، هەروەها پەیوەندییان بە هاوڕێ و یاریدەدەر و داب و نەریت و بیر و ئایدیۆلۆژیایان و هۆکاری سەرکەوتن و سەرنەکەوتنیان و هۆکاری بەهێزی و لاوازییان، هەروەها کێن ئەوانەی کە کاریگەر بوون پێیانەوە، هەروەها هۆکارە خودی و گشتییەکانی تایبەت بە ئەدەبەکەیانەوە، تاوەکو ڕەخنەگر لە ڕێگەی ئەمانەوە چەشنە ئەدەبییەکەیان بناسێت، بەلای (بۆڤ)ەوە ئەدیبەکان چەند چەشنێکن وەکو چەشنەکانی ڕووەك و گیانەوەر، هۆکارە دەرەکییەکان بەشدارن لە بونیادنانیان)) (الطالب، ١٩٩٣، ص٩٠). هەموو ئەم زانیارییانە پێویستییان بە هەوڵ و کۆششی زۆرە و دەبێت ڕەخنەگر ئاگاداری ئەم زانیارییانە بێت، چونکە دواتر بۆ لێکۆڵینەوەکەی سوودی زۆریان دەبێت و زۆر نهێنی دەقەکان لە ڕێگەی ئەم زانیارییانەوە ڕووندەکاتەوە. دەکرێت بڵێین هەر لەم سۆنگەیەوە (کاکەی فەللاح) گرنگی بە ژیانی ئەو شاعیرانە داوە کە لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کردوون، دەکرێت بڵێین زۆر لایەنی ژیانی شاعیرەکانی باسکردووە، ئەگەر بە کورتیش بووبێت، بەڵام نووسەر باش زانیویەتی کە ئەو زانیارییانەی لە ژیانی شاعیرەکانەوە دەستی دەکەوێت، هۆکارێکن بۆ لێوردبوونەوە و تێگەیشتن لە مانا و مەغزاکانی شیعرەکانیان و لە مەشیاندا تا ڕاددەیەکی باش سەرکەوتوو بووە، چونکە:

- لە لێکۆڵینەوەی زۆرێك لە دەقە شیعرییەکاندا پشتی بەو زانیارییانە بەستووە کە لەبارەی ژیانی شاعیرەکانەوە هەیبووە.
- ناوەڕۆکی زۆربەی شیعرەکانی بەستۆتەوە بەو بەسەرهات و ڕووداوە مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبییانەی کە لە ژیانی شاعیرەکانەوە

ڕوویانداوە و ئەمانەی کردۆتە پێوەر و بنەما بۆ شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن و ڕوونکردنەوەی مەبەست و ناوەڕۆکی شیعرەکان.

- زۆر جار باسی بارودۆخ و گوزەران و نەهامەتی و ژیانی شاعیرەکانی کردووە و بۆ ئەمەش سوودی لە شیعرەکانیان وەرگرتووە.

- نووسەر کە ژیانی ئەو شاعیرانەی باسکردووە، هەوڵیداوە خوێنەری ئەم شاعیرانە لە ڕێگەی بەدەستهێنانی زانیاری لەبارەی ژیانیانەوە ئاشنای شێواز و زمان و دەربڕین و سەردەم و ژینگەی شیعریی ئەو شاعیرانە بکات، چونکە هەریەکە لەمانە کاریگەرییان بەسەر شیعرەکانەوە هەبووە.

- لە ژیانی شاعیرەکاندا ڕەچاوی لایەنی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئایدیۆلۆژیای کردووە و هەوڵیداوە ئەمانە لەنێو شیعرەکانیاندا ڕوونبکاتەوە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بۆچوونەکەی (بۆڤ) چەندە ڕاست و کاریگەرە، کاتێك وتوویەتی دەتوانم چێژ لە دەقە ئەدەبییەکان وەرگرم، بەڵام ناتوانم بڕیاری ڕەخنەییان لەبارەوە بدەم، تا نووسەرەکانیان بە وردی و تەواوی نەناسم و شارەزای ژیانیان نەبم. (کاکەی فەللاح)یش هەر لەم ڕوانگەیەوە لەگەڵ لێکۆڵینەوە لە چەند دەقێکی شیعری ئەو شاعیرانە، ژیانی ئەوانیشی فەرامۆش نەکردووە، زانیاریی لەبارەی شاعیرەکان چەکێکی کاریگەرە و لە کاتی پێویستدا ئەنجام و ئامانجێکی زۆر دەپێکێت.

**تەوەرەی شەشەم: لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵە ئەدیبێکی دیاریکراوی سەردەمێکی دیاریکراوی قۆناغێکی دیاریکراوی شیعری کوردی:**

(د. وەلید قەساب) لە کتێبەکەیدا بەناوی (مێتۆدە نوێیەکانی ڕەخنەی ئەدەبی) پێیوایە کە ئەم مێتۆدە ڕەخنەییە لە چەندین لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی و ئەدەبییدا دەردەکەوێت، بۆ نموونە ڕەخنەگرێك لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی سەردەمێکی دیاریکراو بکات، یان لێکۆڵینەوە لە ڕێبازێکی ئەدەبی دیاریکراو بکات، یان لێکۆڵینەوە لە هونەرێکی ئەدەبی یان ئاراستەیەکی ئەدەبی لە کاتێکی مێژوویی دیاریکراودا بکات، یان لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵێك ئەدیبی دیاریکراوی سەر بە ڕێبازێك یان سەر بە سەردەمێکی دیاریکراو بکات، یان دەقە ئەدەبییەکان بەگوێرەی ڕێبازە ئەدەبییەکان پۆلێن بکات، لە هەموو ئەمانەشدا ڕەخنەگر

هەوڵبدات تایبەتمەندییەکانی بەرهەمە ئەدەبییەکان و ڕێبازە ئەدەبییەکان و ژیانی ئەدیبەکان و سەردەمەکانیان و ڕووداو و بارودۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئەدەبییەکەی سەردەمە جیاوازەکان و مێژووی نووسینی دەقەکان و هۆی نووسینی دەقەکان و ڕاستی و دروستی بەرهەمە ئەدەبییەکان لەبەرچاو بگرێت (قصاب، ٢٠٠٧، ص ٢٨-٢٩). کەواتە بواری لێکۆڵینەوەی مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی زۆر فراوانە و چەندین جۆری لێکۆڵینەوە دەچنە خانەی ئەم مێتۆدەوە. ئەگەر سەرنج لە کتێبی (کاروانی شیعری نوێی کوردی)ی (کاکەی فەللاح) بدەین، دەبینین هەست بەم جۆرە لێکۆڵینەوانە دەکەین. بۆ ئەم مەبەستەش دەتوانین ئەم بۆچوونەمان لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا ڕوونبکەینەوە:

• نووسەر لەم کتێبەیدا باسی ژیان و هەندێ لە دەقە شیعرییەکانی کۆمەڵێك شاعیری دیاریکراوی سەردەمێکی دیاریکراوی ئەدەبی کوردی دەکات، کە بریتیین لە (گۆران، بەختیار زێوەر، دڵدار، مەدهۆش، هەردی، ع. ح. ب.، کاکەی فەللاح، دیلان، کامەران موکری).

• ئەم کۆمەڵە شاعیرە کە (گۆران) ڕابەرایەتییان دەکات و دەستێکی باڵایان لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی هەبووە، بەتایبەتیش (گۆران) کە توانی گۆمی مەنگی شیعری کوردی بشڵەقێنێت و لە کۆت و بەندەکانی شیعری کۆن و کلاسیزمی کوردی ڕزگاری بکات. کە دواتر شاعیرەکانی تریش لەسەر هەمان ڕێچکەی (گۆران) ڕۆیشتن و هەمان شێوازی ئەویان گرتەبەر لە ماوەی ساڵانی (٢٠ و ٣٠ و ٤٠ و ٥٠ و ٦٠)ەکانی سەدەی بیستەم.

• ئەم کتێبە باس لە قۆناغێکی دیاریکراوی ئەدەبی کوردی دەکات، کە قۆناغی نوێبوونەوەی شیعری کوردییە، قۆناغی سەرهەڵدانی ڕێبازی ڕۆمانسیزمە، کە دواتر ڕێبازی ڕیالیزمیشی بەدوای خۆیدا هێنا، (کاکەی فەللاح) باسی هەردوو قۆناغ و ڕێباز لای شاعیرەکان دەکات. هەرچەندە لای هەندێکیان باسی ڕێبازی کلاسیزمیش دەکات، چونکە هەندێك لەم شاعیرانە سەرەتا بە شیعری کلاسیزم دەستیان پێکردووە، وەك: (گۆران و بەختیار زێوەر و دڵدار و مەدهۆش و هەردی)، بەڵام گرنگیدانەکەی زیاتر بە ڕێبازی ڕۆمانسیزم و ڕیالیزمە، بەتایبەتیش ڕێبازی ڕیالیزم و جۆرەکانی.

• لە لێکۆڵینەوەی شیعری ئەم قۆناغەی ئەدەبی کوردیدا، ڕەچاوی سەردەم و بـارودۆخ و لایـەنی مێـژوویی و سیاسـی و ئـابووری و کۆمەڵایـەتی قۆنـاغ و سەردەمەکەی کردووە، جگە لەمەش ڕەچاوی ژیانی شاعیرەکان و بەسەرهات و بارودۆخ و شێواز و تایبەتمەندیی شاعیرەکانیشی کردووە و هەوڵیداوە بە پشت بەستن بەم زانیارییە دەرەکییانەوە تایبەتمەندیی شیعری هەریەکە لەم شاعیرانە دەربخات.

• لەکاتی لێکۆڵینەوەدا هەوڵیداوە شیعرەکان و ناوەرۆکی شیعرەکان بە گوێرەی ڕێبازەکانی (کلاسیزم و ڕۆمانسیزم و ڕیالیزم و جۆرەکانی) پۆلێن بکات. لەمەشیاندا زیاتر گرنگی بە بابەتە ڕیالیزمییەکان داوە.

زۆرێك لەم هەوڵە ڕەخنەییانەی (کاکەی فەللاح) لەم کتێبەیدا دەچنە نێو خانەی مێتۆدی ڕەخنەی مێژووییەوە. هەر لە ناونیشانەوە تا ناوەرۆکی کتێبەکەی و لە باسکردنی ژیان و دەقە شیعرییەکانی شاعیرەکانەوە کەوتۆتە ژێر کاریگەریی مێتۆدی ڕەخنەی مێژووییەوە، ئەگەر ئەمەشی لە نائاگاییەوە کردبێت، یان لاسایی نووسەرانی پێش خۆی کردبێتەوە لە باسکردنی ژیان و بەرهەمی شیعری چەند شاعیرێکی کورد، گرنگ ئەوەیە کە هەست بە بوونی پێوەر و بنەما ڕەخنەییەکانی مێتـۆدی ڕەخنـەی مێـژوویی دەکرێـت و ئەمـە لـە بڕیـار و هەڵسـەنگاندن و شیکردنەوەی دەقەکان و ژیانی شاعیرەکانیشەوە دیارە.

**ئەنجام:**

لەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- مێتۆدی ڕەخنەی مێژوویی یەکێکە لەو مێتۆدە ڕەخنەییانەی کە لە دەرەوەی دەق لە دەق دەکۆڵێتەوە، بێئەوەی بۆ خودی دەقی ئەدەبی و بونیادی هونەری و هەناوی دەق و ئەودیو زمانی دەقی ئەدەبی بگەڕێتەوە. چونکە ئەم مێتۆدە پشت بە کۆمەڵێك بنەما و ڕەگەز و لایەنی دەق و هۆکار دەبەستێت، کە لە دەرەوەی دەقی ئەدەبییەوە کاریگەری دەخەنە سەر دەق و ڕۆڵیان لە پێکهێنانی دەقدا هەیە. بۆیە ئەم مێتۆدە هەرگیز لە دەق ناکۆڵێتەوە لەڕووی زمان و ڕەگەزە ناوەکییە پێکهێنەرەکانی دەقەوە. دەکرێت هۆکارە دەرەکییەکان و ئەو ڕەگەزانەی لە دەرەوەی دەقەوە ڕۆڵ لە بونیاد و واتای دەقدا دەبینن، بکرێنە پێوەری هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە لەم مێتۆدەدا. ئەم مێتۆدە وەکو بەڵگەنامەیەکی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی مامەڵە لەگەڵ دەقدا دەکات و هەر لەم ڕوانگەیەشەوە لێیدەکۆڵێتەوە.

٢- (کاکەی فەللاح) لە لێکۆڵینەوەی زۆربەی دەقە شیعرییەکاندا وەکو بەڵگەنامەیەکی مێژوویی مامەڵەی لەگەڵ دەقەکاندا کردووە و ناوەڕۆکی دەقەکانی بە ڕووداو و بەسەرهاتە مێژوویی و سیاسییەکانەوە پەیوەست کردووە و هەوڵیداوە بەهۆی ئەمانەوە خوێندنەوە بۆ دەقە شیعرییەکان بکات.

٣- (کاکەی فەللاح) لەم کتێبەیدا گرنگییەکی زۆری بە ناوەڕۆکی زۆربەی دەقە شیعرییەکان داوە و هەوڵیداوە مەبەست و مەغزای شیعرەکان ڕوونبکاتەوە. جگە لەمەش هەوڵیداوە ناوەڕۆکی ئەم شیعرانە بەهۆی ڕێبازە ئەدەبییەکانەوە پۆلێن بکات و بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ناوەڕۆکی شیعرەکانیش پەنای بردۆتە بەر ژیانی شاعیرەکان و سەردەمی نووسینی شیعرەکان و هۆ و بۆنەی نووسینی ئەم شیعرانە.

٤- هەوڵیداوە کاریگەریی ژینگە بەسەر مەسەلەی داهێنانی شیعری و شاعیراندا ڕوونبکاتەوە، چونکە شاعیر کوڕی ئەو ژینگەیەیە کە تێیدا دەژیت و پەروەردە بووە، هەڵبەت ئەمە کاریگەری لەسەر بەرهەمەکانیان دەبێت و بەرهەمی ئەم شاعیرانەش ڕەنگدانەوەی ئەو ژینگەیەیە کە تێیدا ژیاون، بۆنموونە باسی

کاریگەریی ژینگەی کوردستان و ژینگەی سلێمانی بەسەر هەریەکە لە (گۆران و مەهۆش)دا کردووە.

٥- کاریگەریی سەردەمی بەسەر شاعیرەکاندا باسکردووە، چونکە ئەو سەردەمەی کە شاعیر تێیدا دەژیت بە هەموو گۆڕانکارییەکانییەوە، کاریگەرییەکی زۆری بەسەر شاعیرەکانەوە هەبووە و شیعری ئەم شاعیرانەش ڕەنگدانەوەی ئەو سەردەمەیە کە تێیدا ژیاون.

٦- گرنگیدان بە ژیانی شاعیرەکان، چونکە لەو زانیارییانەی لە ژیانی شاعیرەکانەوە دەست دەکەون، هۆکارێکی بەهێزن بۆ لێکدانەوەی مەبەستی شیعرەکان و ئاشکراکردنی نهێنییەکانی نێو دەق، چونکە شیعر ڕەنگدانەوەی دەروون و ژیانی شاعیرەکانە.

٧- (کاکەی فەللاح) لەم کتێبەیدا کۆمەڵە شاعیرێکی هەڵبژاردووە لە قۆناغێکی دیاریکراوی ڕەوتی پەرەسەندنی شیعری کوردیدا، کە قۆناغی نوێبوونەوەی شیعری کوردییە و ئەم کۆمەڵە شاعیرەش ئەگەرچی هەندێکیان سەرەتا بە کلاسیزم دەستیان پێکردووە، بەڵام هەر زوو وازیان لە کلاسیزم هێناوە و بەرەو شیعری نوێ هەنگاویان ناوە، هەڵبەت ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە دەچنە خانەی مێتۆدی ڕەخنەی مێژووییەوە.

٨- لە لێکۆڵینەوەی دەقە شیعرییەکاندا هۆکارە دەرەکییەکانی فەرامۆش نەکردووە و ئەوەی لەبەرچاو گرتووە کە ئەم هۆکارانە ڕۆڵی گرنگ لە پێکهێنانی دەقدا دەگێڕن و لە لێکۆڵینەوە و ڕەخنەشدا ئەم هۆکارانە پێوەر و بنەمای ڕەخنەیی گرنگن بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە و نەهێشتنی نهێنی و تەمومژی دەقە شیعرییەکان، کەوایە لە بەشێکی لێکۆڵینەوەی دەقە شیعرییەکان زۆرجار لە دەرەوەی خودی دەقەکانەوە بۆ دەقەکان چووە و باسی کردوون، چونکە لە دوولایەنەوە لە دەقەکانی ڕوانیوە، لە دەرەوەی دەقەکان و ناوەوەی دەقەکان (کە ئەمەیان زیاتر خۆی لە بونیادە هونەرییەکەی دەقەکان دەبینێتەوە).

**سەرچاوەکان:**

**- بە کوردی:**

**- کتێب:**

١. سارتەر، ژان پۆل (٢٠٠٩) **ئەدەب چییە؟**، وەرگێڕانی: مستەفا غەفور، چ١، چاپخانەی خانی.

٢. کاکەی فەللاح (١٩٨٧) **کاروانی شیعری نوێی کوردی**، بەرگی یەکەم، چ٢، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.

**- گۆڤار:**

٣. حوسەین، د. هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠١٣) **ئەدەب وەك دۆکۆمێنتی مێژوویی**، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، ژ: ٤٣، بەشی B، سلێمانی.

**- بە عەرەبی:**

**- کتێب:**

٤. الشايب، احمد (١٩٧٣) **اصول النقد الادبي**، ط٨، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة.

٥. صقر، د. احمد (٢٠٠١) **تاريخ النقد و نظرياته**، ط١، مركز اسكندرية للكتاب، الاسكندرية.

٦. الحاج حسن، د. حسين (١٩٩٦) **النقد الادبي في اثار اعلامه**، ط١، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت.

٧. عتيق، د. عبدالعزيز (١٩٧٢) **في النقد الادبي**، ط٢، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت.

٨. الطاهر، د. علي جواد (١٩٧٩) **مقدمة في النقد الادبي**، ط١، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بغداد،.

٩. الطالب، د. عمر محمد (١٩٩٣) **المذاهب النقدية (دراسة وتطبيق)**، دار الكتب للطباعة والنشر، موصل.

١٠. نشأت، د. كمال (١٩٧٦) **في النقد الادبي (دراسة وتطبيق)**، ط٢، مطبعة جامعة بغداد، بغداد.

١١. هلال، د. محمد غنيمي (١٩٧٧) **النقد الادبي الحديث**، ط٣، دار نهضة مصر للطبع والنشر، القاهرة.

١٢. مندور، د. محمد (١٩٧٤) **في الادب والنقد**، دار نهضة مصر للطبع والنشر، القاهرة.

١٣. قصاب، د. وليد (٢٠٠٧) **مناهج النقد الادبي الحديث**، ط١، دار الفكر، دمشق.

## ملخص البحث

ان هذا البحث الذي هو بعنوان (منهج النقد التأريخي في كتاب "مسيرة الشعر الكوردي الجديد" ل(كاكەی فەللاح) محاولة لشرح أسس هذا المنهج النقدي للكتاب. ان منهج النقد التأريخي يوضح العديد من الجوانب السرية والضبابية الأدبية مستفيدة من كل المعلومات المتعلقة بحياة الكاتب والوضع والاحداث التاريخية والسياسية والاجتماعية وكذلك عناصر (الأصل والعصر والبيئة) في ظهور المؤلفات الأدبية والبحث الأدبي خارج المؤلفات الادبية، و دراسة محتوى المؤلفات الأدبية وسبب الكتابة وتوقيت كتابة المؤلفات الأدبية. لقد تم استخدام العديد من المبادئ النقدية لهذا المنهج وتم توضيح العديد من جوانب حياة الشعراء وبعض النصوص الشعرية الى حد ما. يتكون هذا البحث من مقدمة وفصلين وفي الختام تم عرض الاستنتاجات وملخص البحث باللغتين العربية والإنجليزية. يتكون الفصل الاول من مبحثين، يتألف المبحث الاول من مفهوم منهج النقد التأريخي بينما يستعرض المبحث الثاني الأسس النقدية لهذا المنهج. يتكون الفصل الثاني من ستة مباحث، يتطرق المبحث الاول الى النص كوثيقة تأريخية، بينما يدور المبحث الثاني حول ربط المعنى ومحتوى النصوص بحياة الشعراء. يدرس المبحث الثالث تأثير العصور على النصوص، و يشير المبحث الرابع الى تأثير البيئة على النصوص. يعالج المبحث الخامس اهتمام الناقد بحياة الشعراء بينما يتناول المبحث السادس دراسة الناقد لمجموعة محددة من الشعراء في فترة محددة من مرحلة محددة من الأدب الكوردي و يَصب هذا النوع من التحقيقات في خانة منهج النقد التأريخي.

## Abstract

This paper, which is entitled "The Historical Method of criticism in (The Caravan of Modern Kurdish Poetry) for Kakai Fallah" is an effort to explain the principles of this critical method for the book. Making use of all the information related to the author's life, the condition as well as the historical, political, and social situations besides the elements of the origin, age, the environment of literary writing outside the literary writings as well as the content of literary writings, reasons of writing and the timing of literary writing, this historical and critical method explains many potential and foggy literary aspects. Many critical principles of this method have been used and many aspects of poets' life besides some poetic texts have been illustrated to an extent too .This paper is composed of an introduction and two chapters in addition to the conclusion and the abstract in Arabic and English languages at the end .The first chapter includes two sections. The first section tackles the concept of historical method of criticism while the second section presents the critical principles of this method. The second chapter contains six sections as follows :Section one deals with text as historical evidence whereas section two revolves around the connection of meaning and the content of texts to poets' life. Section three explores the impact of ages on texts. Section four refers to the impact of setting on the texts. Section five examines the interest of critics at poets' life while section six deals with the critics who study a limited group of poets in a limited period of a limited stage of Kurdish literature and this sort of investigations belongs to the unit/ cell of historical method of criticism.

# کاکەیی- ئەهلی هەق
# لە سەرهەڵدانەوە تا سوڵتان سەهاك

**پ. د. زرار صدیق تۆفیق**
کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان/ زانکۆی دهۆك

## پێشەکی

کاکەیی– ئەهلی هەق، کۆمەڵە خەڵکێکی خاوەند بیروباوەڕێکی ئایینیی تایبەت و تەواو جیاوازن و دۆناودۆنی– کراس گهۆڕین[1] (الحلول–التناسخ) بنەمایەکی جەوهەریی ئایینەکەیانە و زۆربەی هەرە زۆربەیان کوردی رەسەنن و زیاتر لە گوند و شارۆچکە و شەهرستانەکانی هەردوو پارێزگای کرماشان و لوڕستان نیشتەجێن وەك: کەرند، صەحنە و دینەوەر، سەرپوڵی زەهاب، قەصری شیرین، شاهئاباد، پاوە، جوانرۆ، هەرسین، ناوەندی کرماشان، کوهدەشت، نورئاباد، دولفان... و چەند گوند و شوێنێکی ئوستانەکانی هەمەدان، زنجان، ئازەربیجانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و تەهران[2]، سەرەڕای ئەوانەی کوردستانی باشوور کە بە کاکەیی دەناسرێن و دانیشتووی ژمارەیەك گوندی سەر بە داقوق – کەرکوك و چەند گوندێکی دیکەی سەر زێی مەزن و گوندی هاواری رۆژهەڵاتی هەڵەبجە و دەیان گوند و شوێنی دیکەی پارێزگاکانی کوردستانی باشوورن.

لە سەرەتای سەدەی بیستەوە، بەردەوام تێکستە پیرۆزەکانی ئەهلی هەق بڵاودەکرێنەوە، هاوکات چ لەلایەن نووسەران و رۆشنبیرانی ئەهلی حەقەوە[3] و چ لەلایەن توێژەرانی کورد و فارس و رۆژهەڵاتناسانەوە[4] دەیان کتێب و لێکۆڵینەوە و گوتار سەبارەت بە ئەهلی هەق نووسراون و بایەخ بە کلتوور و رێوڕەسمی ئایینی و مۆزیك و دابونەریت و دەقە پیرۆزەکانیان دراوە[5]، وەلێ لایەنی مێژوویی پشکی شایەنی خۆی پێنەدراوە و کەمتر سۆراخی کراوە و کاری زانستی و جدی بۆ ساخکردنەوەی ژیاننامەی کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەنجام نەدراوە[6].

ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا، تەنها لە رووی مێژوویی بابەتەکە دەکۆڵینەوە و زیاتر هەوڵدەدەین لە سەرچاوەکان سەرەداوێکی سەرهەڵدان و ناسنامەی

کەسایەتییە بنەڕەتییەکانی کاکەیی بدۆزینەوە و پابەندییەکی وامان نابێت بە دەقەکانەوە و خۆمانیش نادەین لە پرسەکانی میتافیزیکا و بیروباوەڕ و بنیادی کۆمەڵایەتی ئەم گرووپە و کاریگەربوونی بە مەسیحییەت[7] و بە زەردەشتی و شارستانییەت و کلتووری دێرینی ئێران[8]، یان بەمەزهەبە توندڕەوەکانی شیعەگەری کە لە مێژەوە وروژێنراون.

## بەشی یەکەم
## هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان و دەرکەوتنی کاکەیی- ئەهلی هەق

### ١– هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان و دەقەکانی ئەهلی هەق:

گرفت و ئاستەنگی سەرەکیی توێژەر لە مێژوو و سەربوردەی ئەهلی حەق لەوەدایە کە نە لە سەرچاوە تۆمارکراوەکاندا دەنگوباسی بوونیان هەیە تا بیکاتە کەرەستەی تۆژینەوە و نەدەقە پیرۆزەکانی خۆیانیش کەڵك و بەهایێکی مێژوویی وەهایان بۆ هەیە لە سۆنگەی ئەوەی کە زیاتر دەقی ئایینین و زۆر درەنگ تۆمارکراون و کۆنترینیان کتێبی سەرئەنجامە کە لە ساڵی ١٨٤٣ز. نووسراوەتەوە[9] و ناکرێت وەك دەقێکی رەسەن و ئۆرگیناڵ سەرەدەرییان لەگەڵ بکرێت[10].

خەوش و کەلێنێکی گەورە و هاوبەشی سەرلەبەری ئەم دەقانەش: (سەرئەنجام–کلام خزانە) و (شاهنامە حقیقت) و (سرودها دینی یارسان) و (تذکرە اعلی) و(آثار الحق) و (دفتر رموز یارسان) و (گنجینە سلطان صهاك)...هتد ئەوەیە، نووسەرەکانیان کەسیان ئاگایان لەوانەیی دی نەبووە و هەریەکەو بە شێوازی خۆی و بە گوێرەی ئەو سەرچاوە زارەکییانەی بەدەستی گەیشتوون، شیعر و دەقەکانیان یاداشتکردووە و لە رێبەر و پێشەواکانیان دواون و هیچ گۆیان بەساڵ و سەردەم نەداوە، وەك بڵێی زەمەن بۆ ئەوان گرنگی و بایەخێکی ئەوتۆی نییە، لە سۆنگەی ئەمەوە ناکۆکی و بێسەرەوبەرییەکی قووڵ هاتووەتە کایەوە و ئەستەمە زانیاریی مێژوویی جێگەی متمانەی تیا دەستبخرێت، لە راستیدا ئەهلی حەق کتێبێکی پیرۆزی یەکگرتوویان نییە و هەر دەستەیەکیان تایبەتیی خۆی هەیە و جیاوازە لەوانەی دی[11]، تەنانەت لەنێو نووسەرانی دەقەکاندا کەسانی وا

هەبووە دەگمەن قەڵەمی لەسەر کاغەز گێڕاوە و خۆیشی لە بەیتە شیعرەکان تێنەگەیشتووە[١٢]، هەر بۆیەش حیکایەت و دەقەکانی ئەهلی حەق دەبنە مایەی قووڵکردنەوەی سەرلێشێواوی[١٣]، لەمبارەیەوە نیعمەتوڵای جەیحونئابادی (١٨٧١–١٩٢٠) یەکێك لە رێبەرە هەرە ناسراوەکانی ئەهلی حەق و نووسەری کتێبی (فرقان الاخبار) لەوە نیگەرانە کە چۆن ناکۆکی و دژبەیەکی دزەی کردووەتە ناو دەفتەر و یاساکانی ئەهلی حەقەوە[١٤].

ئەوەی مایەی سەرنجە لەم دەقانەدا، ناوی هۆز و شوێنی وا لە ناساندنی کارەکتەرە پێکهێنەرەکان – دۆنەکان بەرچاو دەکەوێت، زۆر نوێن و زادەی سەردەمی عوسمانین و لە رۆژگاری خەملێنراوی ئەواندا، ئەم شوێن و هۆزانە هەر بوونیان نەبووە، وەك: قەرەداغ، کەرکوك، عەربەت، هۆزی جاف... [١٥].

هەروەها لە کتێبی سەرئەنجام و لە ریزی پیرانی یاوەری سولتان سەهاك دا، ناوی زۆر نامۆ و سەیر وسەمەرەی تێدایە کە لە هەموو مێژووی ئیسلامیدا ناوی لەو چەشنانە بەدی ناکرێن، وەك: عینوانی کەعبەیی، قانونی شامی، قابیلی سەمەرقەندی، راستگۆی قەرەداغی، قەمەر سوار قماشی، تەیاری خوراسانی، نادری قەرەپاپاقی، رەحمەتی بۆمبایی، تەهماسپی کرمانی، سەفەری قەڵاجی، نالی مۆردێنی، ئیبراهیمی جاف... و هەیانە خەڵکی وڵاتی وان کە ئەو دەمانە و چەند سەدەیەکیش پاشتر نەکەوتبوونە چوارچێوەی ئیسلام و حوکمی ئیسلامی، وەك ئەستانبول: حوسێنی ئەستەمبولی یان بولغار: سیراجەدینی بولغاری[١٦].

کەموکوڕیی هاوبەشی زۆربەی ئەو نووسەر و توێژەرانەی وا لەبارەی مێژووی ئەهلی حەقەوە کاریان کردووە و شتێکیان نووسیوە، ئەوەیە کە هیچ گومانیان لە راستی و دروستیی ئەم دەقانە نەبووە و نەیانخستۆتە ژێر رەخنە و هەڵسەنگاندنەوە و بێ سێودوو وەك دەقێکی بێخەوش و بێگەرد سەرەدەرییان لەگەڵ کردووە و هەرچی زانیاریی لەخۆ دەگرێت دوور لە مشتومالکردن و لە سەرەند و بێژەنگدان کوتومت وەریانگرتووە، لە کاتێکدا توێژەر دەتوانێت بەئاسانی و بێ ماندووبوون پەی بەو راستییە ببات کە زمان و فۆرمی ئەم دەقانە زۆر نوێن و بەرهەمی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستن و هەرگیز رەوا

نییە دەقەکان بگەڕێنرێنەوە بۆ سەدەکانی ٧– ٨ك/١٣–١٤ز، ئەو سەردەمەی کە وا باوە سوڵتان سەهاك و پیرە پیاوانی دیی ئەهلی حەقی تێیدا ژیاون .

**٢– دەرکەوتنی کاکەیی– ئەهلی حەق:**

کاکەهی– کاهـ کاهی بۆ یەکەمجار لە سەدەی هەشتەمی کۆچی/ چواردەهەمی زایینی و بەر لەوەی وەك گرووپێکی ئایینی بناسرێت و سەرهەڵبدات هۆزێکی کوردی دانیشتووی لۆرستانی بچووك بووە [17].

لە سەدەی شازدەهەمەوە بەشێکیان ئاودیوی شارەزوور بوون و ئەوەش دەزانین کە عەلی بەگی کاکەیی ماوەیەك قەڵای سروچکی بەدەستەوە بووە [18]، هاوکات هۆزی صارەلی کە ئەوانیش ئەهلی حەقن لە هۆزەکانی لیوای قەرەداغ بوون و لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا – وەك نەریتێك دەرهەق هۆزە کوردەکان– بە دز و ڕێگر و تێکدەر وەصفکراون [19].

کاکەییەکان پاشتر چەند دێهاتێکیان لە دەوروبەری داقووق لە خوارووی کەرکووك ئاوەدانکردووە و هەرچەند لەمێژەوە لەسەر ئایینی ئەهلی حەقن، بەڵام تا سەرەتای سەدەی بیست ناوی هۆزەکەیان بەسەردا زاڵە و پتر وەك هۆزێك دەناسرێن و ئەهلی حەقەکانی شوێنەکانی دی بە کاکەیی ناناسرێن، وەك لە شیعرەکەی شێخ ڕەزای تاڵەبانی(١٨٣١–١٩١٠) ڕووندەبێتەوە:

**چوار عەشیرەت: کاکەیی و وەند و جەباری و داوودە**
**ئیتیفاقیان کردو هاتن چوار سەد و پەنجا سوار [20] .**

سەبارەت بە ناوی کاکەیی، دەماودەم وا هاتووە کە کاتێك هەردوو برا موسا و عیسای کوڕانی بابە عەلی هەمەدانی(؟) هاتوونەتە بەرزنجە، ئەوەندەی نەبردووە هەڵساون مزگەوتێکیان بنیادناوە، لە کاتی دارەڕاکردنی کاریتەکانی سەر مزگەوتەکە، یەکێکیان کورتی هێناوە و نەگەیشتووەتە دیوارەکەی دی، شێخ عیسای برا بچووك لەم ساتەدا هاتووەتە دەست و موعجیزەی نواندووە و بە موسای برا گەورەی گوتووە: کاکە دارەکە ڕاکێشە، ئەمیش دارەکەی ڕاکێشاوە و بەڕادەی پێویست درێژ بووەتەوە، محەمەدی کوڕی بابارەسولی بەرزنجی (١٦٣٠–١٦٩١ز) لە شیعرێکدا گوزارشتی لەم حاڵەتە کردووە، وەلێ نەیویستووە ئەو ڕاستییە بدرکێنێت کە موسا و عیسا بە کوردی ئاخافتوون، بۆیە دەڵێت کاتێك

دیتیان کاریتەیەك کورتە، هەریەکەو سەرێکیان گرت و نـاوی خودایـان لـیّ هێنـا و گوتیان"بسم الله بسم الله" و دارەکەش لەهەر لایەکەوە دوو بـاڵ درێـژ بـووەوە[٢١]، شێخ مەعروف نۆدێیش (١٧٥٣–١٨٣٧) لـە شـیعرێکدا پشتڕاسـتی ئـەم رووداوەی کردووەتەوە:

**وطرفاه خرجا من جُذرِمن کل جانب زُهاء شبرِ**

**فحق ان نفخر بالجذعین هذا وجذع سید الکونین**[٢٢].

کەچـی لـەلای بـەرەبابی شـێخانی کاکەییـەکانی داقـووق کـە نـەوەی شـێخ عیسای بەرزنجین، ئەوەی ئەو موعجیزەیەی ئەنجامـداوە سـوڵتان سـەهاکی کـوڕی شـێخ عیسـایە و گوایـە کـاتیّ تەکیەکـەی بەرزنجـە کـۆن بـووە و پێویسـتی بـە نۆژەنکردنەوە بووە، دارێکیان هێناوە تا ببێتە راگری دیرەکەکە، کە بڵندیان کردە سەر دیوارەکە بینییان کورتە و ناگاتە ئەوسـەر، کاتێـك ئیسـحاق بـینی بـاوکی لـە خەمی کورتیی دارەکەیە، چووە سەر دیوارەکە و سەرێکی دارەکەی گرت و بـانگی باوکی یان برا گەورەکەی کرد، گوتی کاکە بیکێشە، دارەکەش درێـژ بـووەوە و لـە شوێنی خۆیان دانا، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە براکانی حەسوودی پـیّ ببـەن و گومانی لیّ بکەن و ئەوەیان بڵاوکردەوە کە بـاوکی پیرەمێردیـان بـە پێشـبینیی دەروێشەکان ژنی دیکەی هێنـاوە و بـاوکی دروسـتی ئیسـحاق نییـە، ئەمـەش وای لێکرد بەرزنجە جێبهێڵێـت رووبکاتـە نیازخانەیـەك لـە پـەڕدیوەر لـە سـەر کـەناری دەستەڕاستی رووباری سیروان لە نزیك گوندی شێخان لە هەورامانی لهۆن[٢٣].

ئەم دوو لێکدانەوەیە کامیان راستبن یان هیچیان راست نەبن، ئـەو راسـتییە ناگۆڕن کە ناوی کاکەیی لە وشەی کاکەوە وەرگیراوە بە واتـای بـرا گـەورە و هـەر کەسێکیش بە برا گەورە دابنرێت و گوزارشـت لـە رێزلێنـانی بکرێـت بـە کاکـە گـاز دەکرێت، دیارە کاك– کەك پـەیڤێکی کۆنی کوردییـە و لـە مێـژەوە بـۆ ناونـانیش بەکارهاتووە وەك: کـەکی بـاپیرە گـەورەی میرانـی دۆسـتەکی– مـەروانی و کـەکی مازنجـانیی حەمیـدی مـیری دەڤـەری ئـاکریّ – سـەدەی ٧ك/١٣ز– کـە لەلایـەن خەلیفەی عەباسییەوە نازناوی (مبارز الدین)ی پیّ بەخشرا و بە (مبارز الدین کەك) ناوی دەرکرد، پیر شـەهریاری هـەورامانیش (م: ٥٠١ك/١١٠٧ز) لەلایـەن موریـدان و شوێنکەوتووانیەوە لەبەر خۆشەویستی بە کاکیس ناو دەبرا .

عەباس عەززاوی لە کتێبەکەیدا دەربارەی کاکەیی، کەوتووەتە هەڵەی گەورەوە دەرهەق ناو و سەرهەڵدانیان و راستییەکانی شێواندووە و ناکۆکی و ناڕێکی لە ئاخافتنەکانی بەڕوونی بەدی دەکرێت و خۆیشی نەیزانیوە دەیەوێت چی بڵێت و ئەوانی گرێداوە بە بەگتاشی و حرووفی و عەلی ئیلاهی و تەریقەتی سەهرەوەردی و گەڕاندنەوەی ناویشیان بۆ کاکە رەتدەکاتەوە و وای لێکداوەتەوە کە هەمان کۆمەڵەی (الاخیة – برایەتی)ن، ئەو کۆمەڵەی وا ئەندامانی بە یەکدییان دەگوت برام– أخي، بەوپێیەی خۆیان بە برای یەکدی دەزانی بە پشتبەستن و لێکدانەوەی ئایەتی ((إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ))[٢٤]، ئەمانە پاشان لە سەدەکانی دواییدا بەکاکەیی ناسران و لە بنەڕەتدا پەیوەندییان بە بزاڤی(الفتوة) هەیە کە لە سەردەمی خەلیفە الناصر (٥٧٥–٦٢٢ك/١١٧٩–١٢٢٥ز) دەرکەوتن[٢٥].

ئەوەندی من بزانم، بەر لە سەدەی حەڤدەهەم، شتێکی وا لەبارەی کاکەییەوە نەنووسراوە و نە شەرەفخانی بەدلیسی و نە هیچ مێژوونووس و گەڕۆکێکی دی بەڕاشکاوی باسی هەبوونیانی نەکردووە، صۆڤی نجم الدین مەحمودی ئەصپەهانی لەسەرەتای سەدەی هەشتەمی کۆچیدا و بۆ دەیان ساڵ و تا مردنی لە دەوروبەری ساڵی ٧٤٠ك/١٣٤٠ز، لە دەڤەری پاوەی کوردستانی رۆژهەڵات ماوەتەوە و هەر لەوێ نێژراوە و تا ئێستاش گۆڕ و گڵکۆکەی ماوە، درێغیی نەکردووە لە سەرزەنشتی کورد و رەخنەی زبری لە هەڵسوکەوتی ناپەسند و بێدینیی خەڵکی چیاکانی ئەو دەڤەرەی کوردستان گرتووە و گازندە لە پابەند نەبوونیان دەکات بە فەرز و روکنەکانی ئیسلامەوە، وەك زەکات نەدان و ریبا خواردن و نوێژکردنی ساختە و سەرپێیی و سەرڕووتی و بێپەچەیی ژنانیان[٢٦]، دوور نییە و وا پێدەچێت ئەم کۆمەڵە خەڵکە نامۆ و بەدەر لەئیسلامە هەمان ئەهلی هەق– کاکەیی بن.

هەروەها کەیخەسرەو ئەسفندیار (سەدەی ١٠ك/١٦ز) لە خەڵکانێکی عەلی ئیلاهی دەدوێت لە کوێستانەکانی رۆژهەڵاتی ئێران لە نزیك وڵاتی خُتا[٢٧]، بێگومان ئەمانە پەیوەندییان بە کوردستانەوە نییە، بەڵام شاە تەهماسبی صەفەوی (١٥٢٤–١٥٧٦ز) لە یاداشتەکانیدا هۆزی سارلو بە ئیلحاد و زەندەقە تاوانبار دەکات [٢٨]، ئەگەر وا دابنێین سارلو هەمان صارەلین کە لقێکن لە کاکەیی،

عبـدالمؤمنی مـەردۆخیش لـە کەشـکۆڵەکەیدا (سـاڵانی١٧٨١–١٧٨٣ز )، پارچـە شیعری چەند شاعیرێکی هەورامی نووسیوەتەوە و هیچیان لـە ئەوانـە نـین کـە لـە کەلام و دەفتەرەکانی ئـەهلی هەقـدا نـاو و شـیعریان هەیـە، تـەنها شـیعری شـاکە ناوێك بۆنی ئەوەی لێدێت کە شاعیر لە گرووپی (الحروفیة) بێت[٢٩].

زۆر ئاسـتەمە بـەوردی بزانرێـت کـەنگی یەکـەم دەسـتەی ئـەو گرووپـە شیعەگەریانەیەی کەوا لە ئێستادا ناوی کاکەیی– ئەهلی هەق کۆی دەکەنـەوە لـە لوڕسـتان و هـەورامان چـەکەرەی کـرد و چـۆن رەگـی خـۆی داکوتـا، چـونکە وەك ئیڤـانۆڤ دەڵێـت:" مسـۆگەر لـە حـاڵی گرووهێکـی نەخوێنـدەواری دەوارنشـین و لادێییدا کـە بـە دەگمـەن هاتوچـۆی ناوەنـد و مەڵبەنـدەکانی ژیـان شارسـتانیەتی ولآتانیـان دەکـرد، ناشـێت مەزەنـدەی مێژوویـەکی واقیعـی بکرێـت، هاتنـەگۆڕی کۆمەڵەیەکی تازە بە رواڵەت ئاکامی پرۆسەیەکی دوورودرێژە، ئەم هاتنـە ئارایـەوە هـەرگیز هاوشـان و هاوکـاتی رووداوێکـی نائاسـایی نـەبووە کـە سـەرنجی دونیـای دەرەوەی راکێشابێت، سەیر ئەوەیە مێژووش شتێکی ئەوتۆی پیّ نییـە سـەبارەت بەم دەڤەرە تا قسەیەکی لـیّ بکـات"[٣٠]، مینۆرسـکیش پێیوایـە کۆمەڵـەی ئـەهلی حەق لقوپۆپی زۆری هەیە و ئەمانـە گرووپێکـی ئـاینی وا نـین یـەکێتی بیروبـاوەڕ کۆیان بکاتـەوە، بـەڵکو لـەوە نـزیکن کـە بزاڤگـەلێکی هاوپەیوەنـدبن و لـە جـۆرە یەکێتییەکەدا رێکخرابێتن[٣١].

رەنگە سەرەتا وەك چەند گرووپێکی بچووکی خامۆش و تەریك بووبێتن و لە گوندگەلێکی لاڕێی ناوجەرگەی چیاکان گیرسابێتنەوە و هیچ چالاکیەکی فکری یان جموجووڵێکی بانگەشەیانیش نەنواندبێت بووبێتـە مایـەی سـەرنج و هاوڕدانـەوەی خەڵکانی دەوروبەریان، بـە سـەواد و خوێنـدەواریش نەبوونـە تـا شـتێك بنووسـن، دیارە تا هەنوکەش لە یازدە گرووپ و بنەماڵە پێکدێن و هەر یەکـەیان بیروبـاوەڕی تایبەتی خۆی هەیە[٣٢].

ئەوەی تا ئێستا سـاخبۆتەوە، یەکـەم بەڵگـەی هـەبوونی کۆمـەڵێکی ئـاینی جیاواز یان لادەر لە ئیسلامی سوننی بەناوی کاکەیی (الکاکائیـة) دەگەڕێتـەوە بـۆ سەدەی حەڤدەهەم[٣٣] و لەو بڕوایەدام پێشتر باسی هەبوونیان لە ئـارادا نـەبێت و ناویشیان نەبرابێت، لەراستیدا تا سەدەی نۆزدەهەم هەندە نەناسرابوون و شتێکی

وایان لەبارەوە نەنووسراوە، تا ئەو دەمەی دەنگوباسیان کەوتە ناو یاداشت و سەرنجی دیبلۆمات و گەڕۆکە ئەوروپییەکانەوە، بەڵام سەیر لەوەدایە لەم یەکەم دەقەی دەرهەق کاکەیی، هیچ باس و خواسێکی سوڵتان سەهاك لە گۆڕێدا نییە، بەڵکو شیعەیەکی هەرە توندڕەون و ئیمامی (عەلی) یان لەلا چونیەکی خودایە، محەمەدی کوڕی بابا رەسوڵی بەرزنجی لەبارەیانەوە دەڵێت: ئەمانە بە سیامەنصوری و شاە بابایی و صارولیش دەناسرێن، بەلای ئەمانەوە خودا چووەتە ناو جەستەی عەلییەوە، پاشان چووەتە ناو جەستەی یەك لەدووی یەکی کوڕ و نەوەکانیەوە، ئەوجا چووەتە ناو شێخەکەی سەردەمی خۆیانەوە[٣٤]، ئەوەش بڵێین کە لەوانەیە شاە بابا یەکێك بووبێت لە ڕێبەرەکانیان.

لە شوێنێکی دی هۆزەکانی لەك و زەند و کاکەیی و کرانی و کولیائی و ئەفشاری و موقەدەمی (المقدمیة) و جرادورەوی(؟) (الجارودیة)، جەلیلوەندی و خواجەوەندی و کەسانی دی کە لەژمارە ناهێن، بەوە تاوانبار دەکات کە ئەمانیش شیعەن و حەزرەتی (عەلی) وەك خودا دەپەرستن و دەڵێت رۆژێکیان لە کابرایەکی زەندم پرسی و پێمگوت بیستوومە زەندەکان (عەلی) یان خۆش ناوێت، ئەویش گوتی: (استغفرالله)، ئێمە عەلیمان خۆش ناوێت؟ عەلی خودا و ڕێبەرمانە، تەنانەت پیرەمێردێکیان شەهدیمان (الشهادتین)ی نەدەزانی و لەبریدا دەیگوت: "عەلی وەلیی پێغەمبەری خودایە"[٣٥].

ئەمانە لە نێوخۆی کورددا بە کاکەیی دەناسران و ئەوانەی ئەودیو لە یاداشتەکانی (المنشي البغدادي – ساڵی ١٨٢٠)[٣٦] و گەڕۆکە ئەوروپییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست بە عەلی ئیلاهی ناودەبرێن کە عەلی دەکەنە هاوشانی خودا[٣٧]، ك. ج. ریچ (١٨٨٧–١٨٢١) باس لە تورکمانی عەلی ئیلاهی و ئیسماعیلی و چراغ سوندیرەن[٣٨] دەکات لە دوزخورماتوو و قەرەتەپە و گوندێکی نزیك دیالا[٣٩]، کەچی خورشید پاشا لە گەشتنامەکەیدا ئەهلی هەقی بە نوصەیری داناوە[٤٠] و محەمەد حەسەن خان اعتماد السلطنة (١٨٤٣–١٨٩٦) لە نووسینێکیدا بە عەلی ئیلاهی ناویان دەبات کە بە نوصەیری و غالی– توندڕەو و ئەهلی حەقیش دەناسرێن[٤١].

وەلێ ئـەوان خۆیـان بـە ئـەهلی حـەق و یارەسـان ناودەبـەن و ئـەم دوو ناسنامەیە لەژێر چەترێکدا کۆیاندەکاتەوە، کە وا دیارە ناوێکی تا رادەیەك نوێن و ناو و ناسنامەی گشتی و کۆکەرەوەی هەموو ئەو دەسـتە و گرووپانـەن کـە شـیعە بوون کۆیدەکردنەوە و رەنگە لە سەدەی نۆزدە یان کەمێك پێشترەوە پێی ناوزەد کرابن و لـە سـەرەتادا و لـە کـۆنترین دوو دەقـی خۆماڵیـدا، بـە ئـەهلی هـەق و بـە یارەسان ناونەبراون و نەناسراون، بەڵکو سەرباری ناوی کاکەیی وەك باسکرا، هـەر دەستەو بەناوی بنەڕەتی و دروسـتی خۆیـەوە دەناسـرا: ناووسـی[٤٢]، مقەدەمیـە، یـان بـە نـاوی هۆزەکانیانـەوە: صـارەلی، سیامەنصـوری، لـەکی، زەنـد، کرانـی، کولیائی، ئەفشاری، جەلیلوەندی، خواجەوەندی[٤٣].

ئیڤانۆڤ لەمبارەیەوە دەڵێت: "بە دوور دەزانرێت ئـەم کۆمەڵەیـە دەزگـا یـان رێکخراوێکی ئایینی مەرکەزییان هەبێت، ئەم کۆمەڵەیە نە سەرۆکێکی ددانپێدانراو، نە ئۆرگانێکی رێبـەدێیی، نـە بنکـە و ناوەنـدێکی سـەرکردایەتی، نـە دەسـتەیەکی روحی بەمانای وشە نە دۆگمایەکی رێکوپێك، نە کتێبێکی پیرۆزیان هەیە، تەنانەت هیچ کتێبێکی ئایینیشیان نییە کە شایەنی ئـەو نـاوە بێـت و لەلایـەن هەمووانـەوە وەك هـەر کـۆڕ و کۆمەڵەیـەکی بـێ سـەوادی نەخوێنـدەوار جێگـای بـڕوا و بـەقا بێت"[٤٤].

وەلێ ئـەوەی لێـرە بـۆ ئێمـە پڕبایەخـە و گرنگیـی خـۆی هەیـە بـۆ زانینـی سـەرەداوی سـەرهەڵدانی ئـەهلی حـەق و سـەلماندنی دێرینـی و رەگـداکوتاوییان ئەوەیە کە لـە سـەردەمی بـەرایی ئیسـلام و بەرەبـەیانی سـەرهەڵدانی پـەرتبوونی شیعەگەرییەوە، چیاکانی شارەزوور و هەورامان بوونە مەکۆیەکی لـەبار و مەیـدانی کار و چالاکیی تەبلیغی ئەندامانی حیزب و دەستە شـیعییە جۆربـەجۆرەکان، هـەر ئەمانە بوون دانیشـتوانی شارۆچـکەیەك بـەناوی بـیر– بیارەیـان کـردە موسـڵمان لەسەر مەزهەبـی شیعەی صـالحی زەیـدی[٤٥]، وادیـارە بـانگخوازە زەیدییـەکان لـە دەسـتەی گـەورە بـانگخواز حەسـەنی کـوڕی صـالح (م: ١٦٨ك/٧٨٤ن) کـە بە(الصالحیة) دەناسران لە غیابی دەسەڵاتێکی ناوەنـدیی بـەهێزدا، دزەیانکردۆتـە ناوچـە شـاخاوییە پـەڕگیر و دوورە دەسـتەکانی شـارەزوور و کەوتوونەتـە بڵاوکردنەوەی بیر و بەرنامەی خۆیان، ئـەم بـانگخوازە زەیدییانـە لـە هەرێمـەکانی

دەیلەم و تەبرستان و چیاکاندا کارا و چالاك بوون و پاشماوەی هـزری شیعەی زەیدی تا رۆژگاری شەهرستانی (م: ٥٤٨ك/١١٥٣ز) لـەو هەرێمانـە هـەر مـابوو[٤٦].
جاروودی لقێکی میانڕەوی شیعەی زەیدییە و بەناوی (ابو الجارود)ی رێبەریانەوە ناوزەد کراون و ئەمانە بڕوایان وابوو پێغەمبەر بە وەصف و بێ ناوهێنان عەلیی بە ئیمام و جێگرەوەی خۆی دیاریکردووە و تەکفیر و سەرکۆنەی ئەبوبەکر و عومەر و سەرجەم ئەو هەڤاڵانەی پێغەمبەریان دەکرد کە نکۆڵییان لەم هەقە رەوایەی عـەلی کردووە[٤٧].

جگە لە جاروودی، پاشماوەی ناووسی (الناووسیة) و ئیسماعیلی موبارەکی (المبارکیة) کە لە کۆنترین حیزبە شیعییە پێشەنگەکانن و چ بە ئایدیا چ بە ناویش لەناو دەستە و گرووپەکانی ئەهلی حەق بەدیدەکرێن کە دواتر دێینەوە سەریان .

هاوکات ئەوەی هیچ گومانێك لەخۆ ناگرێت و یەکلایی بووەتەوە ئەوەیە کە بانگەشەکارانی ئیسماعیلی هـەر زوو و بەماوەیەکی کـەم پاش سەرهەڵدانیان، توانییان دزە بکەن و خۆیان بخزێننە ناو چەند ناوچەیەکی کوردستان و پەیوەندیی بـە ژمارەیەك کوردەوە بکەن و بە هـزر و دروشم و ئامانجەکانی بانگەشەی ئیسماعیلی ئاشنایان بکەن و لەمبارەیەوە زیاتر لـە دەقێك هەیە[٤٨]، بگرە بەپێی ئاخافتنی بەغدادی (م: ٤٢٩ك/١٠٣٧ز) کوردەکانی هەرێمی چیاکان– واتا شارەزوور و لوڕستانی بچووك و کرماشان و هەورامان – و دانیشتوانی چیایەك بە ناوی بدین (؟) لە هەرێمی ئازەربیجان لە پێشەنگی ئەو میللەت و لایەنانە بوون کـە لەسـەر دەستی بانگەشەکارە پێشەنگەکان بڕوایان بـە هـزر و بەرنامەی ئیسماعیلی هێنا[٤٩].

سەرباری ئەوەی کە کورد لە بزاڤی قەرامیتەش بەشداریکردووە، کە بزاڤێکی چەکداری و باڵی سەربازیی ئیسماعیلییە و دەیانویست بەزەبروزەنگ خۆیان بسەپێنن، بۆ یەکەمجار لە ساڵی ٢٧٨ك/٨٩١ز لە دەڤەری کوفە دەرکەوتن و بە ناوی یەکەم رابەریانەوە: حەمدانی کوڕی قرمت ناوزەدکران و یەکێك لـە فەرماندە مەیدانییەکانی قەرامیتە کوردێکە بە ناوی جەعفەری کوڕی حەمیدی کورد (جعفر بن حمید الكُردي) کـە فەرماندەیەکی گەورەی لەشکری قرمتی بووە لـە وڵاتی شام[٥٠].

شیعەی نوصەیریش کە لە گرووپە هەرە توندڕەوەکانە و بەناوی محەمەدی کوڕی نوصەیری نومەیری (م:٢٧٠ك/٨٨٤ز)ی دامەزرێنەرەوە ناونراوە، لە ساتی دامەزراندنیەوە لای کورد نامۆ نەبووە و فازۆ یان فادۆی کورد (فازویە الکُردي) یەکێك بوو لە کەسە نزیك و هاوبیرەکانی محەمەدی کوڕی نوصەیر[٥١]، دواتر جەماوەری لە کوردستان پەیداکردووە و میر شەرەفەدینی رۆژەکی میری بەدلیس لەنیوەی یەکەمی سەدەی ٨ك/١٤ز گومانی ئەوەی لێدەکرا کە نوصەیریە[٥٢]، خورشید پاشاش خەڵکی گوندی زەردەی لای سەرپول زەهاو و هۆزی هەلیلانی کوردی فەیلی و زۆربەی هۆزی گۆران کە ئەمانە سەرجەم ئەهلی هەق بوون بە نوصەیری داناون[٥٣] و لە راستیدا نوصەیر بەلای ئەهلی هەقەوە یەکێکە لە یارانی ئیمامی عەلی، سالم (١٨٠٥–١٨٦٩)یش ناوی نوصەیریی بردووە:

**فەرەنگ و داسنیی و گەبری بەدخوو**

**نوصەیری و ئەرووس و دەیلەم و جوو**

**بە حاڵی من نەبن هەرگیز ئەمانە**

**هەزار جار ئۆف، برایم ئاغا لەدەست توو**[٥٤].

لە سەدەکانی دواتردا، کوردستان بەتایبەت ناوچە شاخاوییەکانی هەردوو ئوستانی لوڕستانی بچووك و کرماشان، بوونە دوو مەڵبەندی ئاوەدانی بزاڤە شیعە توندڕەوەکان، ئیسماعیلییە نزارییەکانی ئێران کە بە(الباطنیة) و(الحشیشیة) دەناسران و پتر لە سەدە و نیوێك (١٠٩٠–١٢٥٦ز) حوکمیانکرد و قەڵای ئەلەمۆت ناوەندی دەسەڵاتیان بوو و هۆلاکۆ لەساڵی ٦٥٤ك/١٢٥٦ز لەناویبردن و قەڵا و بارەگەکانی داگیرکردن، ئەمانە دەستیان بە کوردستانیش راگەیشتووە و بەنهێنی بانگخواز و چالاکوانی خۆیان بۆ ناردووە، بە قسەی مارکۆ پۆڵۆ (١٢٥٤–١٣٢٤ز) شێخ عەلائەدین دوا میری ئیسماعیلییەکانی قەڵای ئەلەمۆت، نوێنەری خۆی رەوانەی کوردستان و دیمەشق کردبوو[٥٥]، رەنگە ئەهلی حەق بە شێوەیەك لە شێوەکان جۆرە پەیوەندییەکیان بەمانەوە هەبێت و دوور نییە لقێك یان پاشماوەی ئەوان بن، گریمانەی بێ بەڵگەی واش هەیە کە سەرهەڵدانی ئەهلی حەقەکانی کوردستان پەیوەستە بە رووداو و گۆڕانکارییەکانی سەدەی ٦ کۆچی/١٢

زایینییەوە و گوایە دامەزرێنەرانی لە ئیسماعیلیە ئاوارەکانی هیندن کە بەرەو کوردستان هەڵاتن و گیرسانەوە[٥٦].

پاش دوو سەدە، محەممەدی کوڕی فەلاح (–٨٦٦ک/١٤٦٢ز) کە بە(المُشعشع) دەناسرا، لە ئەهواری حەوێزە دەرکەوت و خۆی بە سەید دادەنا و بانگەوازی مەهدێتی کرد و دەستی گرت بەسەر شوشتەر و دیزەفول و دەوڵەتی (المشعشعین) لە خوزستان و خوارووی رۆژهەڵاتی عێراق دامەزراند[٥٧]، عەلیی کوڕی موشعشەع ناسراو بە مەولا عەلی لە رەمەزانی ساڵی ٨٦٠ک/ هاوینی ١٤٥٦ز دەستی گرت بەسەر کوردستان و بەهبەهاندا[٥٨]، ساڵی دواتر لە دەمی مەلەکردندا لەیەکێك لە رووبارەکانی کوردستان– لوڕستان خنکا یان کوژرا و ئاو بردی [٥٩]، شایەنی باسە ئەم عەلییە دەیگوت روحی ئیمام عەلی لە ناخیدا گیرساوەتەوە و خودا هەر عەلی خۆیەتی و ئەو گۆڕەی کەربەلا هی ئەو نییە و خودا چۆن دەمرێت تا گۆڕی هەبێت و هەڵستا بەکاولکردنی گۆڕەکەی و شوێنە پیرۆزەکانی کەربەلا[٦٠].

لە ئاست گەشەکردن و جموجووڵی ئەم دەستە و کۆمەڵە توندڕەوانە لەلایەك و یەزیدییەکان لەلایەکی دییەوە و زیادبوونی ژمارەیان و بگرە ئەنجامدانی هەندێك هەڵسوکەوتی ناپەسند و هێرشبردنە سەر رموزەکانی ئەهلی سوننە و جەماعەت[٦١]، کە نەك هەر لەگەڵ جەوهەری ئیسلامی سوننەدا یەکیان ناگرتەوە، بەڵکو هەر کفرێك بوون بۆ خۆی، نەدەکرا مەلا و زانایانی کورد نەورووژێن و بەبێدەنگی بمێننەوە و هەڵوێستی خۆیان دەرنەبڕن، بۆیە بەیناوبەین دەهاتنە دەنگ و بە فەتوا و بە نووسینی کتێب و نامیلکە، بەرپەرچی ئەم تەرزە لادەر و لەڕێدەرچووانەیان دەدایەوە، لەوێنەی مەلا ئەبوبەکری مەریوانی ناسراو بە (أبوبکر المصنف ) (م:١٠١٤ک/١٦٠٥ز) و عبدالکریمی کوڕی مەلا ئەبوبەکری مەریوانی (م:١٠٥٠ک/١٦٤٠ز) و مەلا زین العابدینی گۆرانی (م: پاش ١٠٦٦ک/١٦٥٧ز)[٦٢] و مەلا محەممەدی بەرقەلایی (البرقلعلي) و محەممەدی کوڕی بابا رەسوڵی بەرزنجی[٦٣] و حەیدەری کوڕی ئەحمەدی حوسێنئابادی (م: ١٧١٧ز) و مەلا حوسێنی شێڤەکی و مەلا عەبدوڵای ربتکی(م: ١٧٤٦ز) و کەسانی دی[٦٤]، کە ئەمانەیان بە هەڵگەڕاوە (مُرتد) دەژمارد، لەمەش زیاتر مەلایەکی وەك عبدالکریمی

کوڕی ئەبوبەکری مەریوانی بە جلی کەسکەوە و بەیاوەریی میر هەڵۆخانی ئەردەڵان (١٥٩٠–١٦١٦ز) دەچووە غەزایان و گوایە بەدەستی خۆی ژمارەیەکی لێ کوشتوون [٦٥]، فەقێ و قوتابیانی قوتابخانە ئایینییەکانی شارەزووریش لەم چەشنە جیهادە بەشدار دەبوون [٦٦]، محەممەدی کوڕی بابا رەسوڵ و شێخ رەزای تاڵەبانیش بەزمانێکی زبر و بەشێوەیەکی ناڕەوا بوختان و کار و کردەوەی هەڵبەستراو و نادروستیان دەخەنە پاڵ [٦٧].

### ٣– لەنێوان ئەهلی حەق و شیعەی ئیسماعیلیدا:

ناکرێت و راست نییە ئەهلی حەق بە پاشکۆ یان لق یان درێژەپێدەری هیچ دەستە و گرووپ و تاقمێکی شیعی دابنرێن، بەڵکو کۆمەڵەیەکی سەربەخۆن هەرچەند لە زۆربەیان سوودمەندبوونە و کۆکەرەوەیانن، وێڕای کاریگەربوون و بگرە کۆپیکردن و داڕشتنەوەی تەواوی ئایدیا و بەرنامە و دنیابینیی ئیسماعیلی.

بە مردنی هەر کەڵە ئیمامێکی شیعە یان خامۆشکردنی شۆڕشێکیان، یەکسەر تەبایی و هاوکۆکیی ناو جەماوەری شیعە لەبەین دەچوو و بەسەر چەند دەستە و تاقمدا دابەش دەبوون، ئەوەی مایەی تێبینییە ئەم دیاردەیە بە زەقی لە مێژووی شیعەگەریدا رەنگی داوەتەوە [٦٨].

لە ئاکامی مردنی جەعفەری صادق (جعفر الصادق) (م: ١٤٨ك/٧٦٥ز)، گەورەترین و کاریگەرترین لێکترازان و لەتبوون لە جەستەی شیعەگەری هاتە کایەوە و جەماوەری بڕواداران و شوێنکەوتووانی هزری ئیمامەت کەوتنە قەیرانەوە و لەبەریەك هەڵوەشانەوە و چەندین لق و گرووپی جیاجیا و دژبەیەك پەیدابوون [٦٩]، بەپێی نەریتی ئیمامەت و راسپاردەی ئیمام، دەبوو دوای خۆی ئیسماعیلی کوڕە گەورەی شوێنی بگرێتەوە، کەچی ئیسماعیل پێشوەخت و هێشتا باوکی لە ژیاندا بوو و لە دەوروبەری ١٤٥ك/٧٦٢ز مرد، ئەمەش گرفتێکی سەختی هێنایە کایەوە و بووە گرێکوێرەیەك لە پرسی شوێنگرەوەی ئیمام، ئەوەبوو هەوادارانی ئیسماعیل قەناعەتیان نەهێنا کە مردووە و پێیان وابوو زیندووە و جەعفەری صادقی باوکی بەمەبەست و لە ترسی نەیارانی و دەسەڵاتدارانی عەباسی مردنی راگەیاندووە و گوایە لە بازاڕی بەصرا بینیویانە،

ئەمانە بە (الاسماعيلية الواقفة) ناسران و پاش ئیسماعیل دانیان نەنا بە هیچ ئیمامێکی دی.

کەچی بەپێچەوانەی ویستی ئەمان، زۆربەی شیعە دانیان نا بە ئیمامەتی موسای کوڕی جەعفەر (موسى الكاظم) و کردیانە ئیمام و دواتر بە دوازدە ئیمامی (الأثنا عشرية) ناسران. محەممەدی کوڕی ئیسماعیل کە هەم بە تەمەن لە موسای مامی گەورەتر بوو و هەم خۆشی بە میراتگری موستەحەق و شایەنی شوێنگرەوەی ئیمامەت دەزانی، ئامادە نەبوو ئەم ناهەقییە قبوڵ بکات و ئیمامەتی موسای رەتکردەوە، ئەوەبوو دەستەیەك دەرکەوتن کە نکۆڵییان کرد لە گواستنەوەی ئیمامەت لە براوە بۆ برا، واتا لە ئیسماعیلەوە بۆ موسا و کوڕانی دیکەی جەعفەری صادق، هەرچەند دانیان نا کە ئیسماعیل مردووە، بەڵام بڕوایان وابوو ئیمامەت لەوەوە گوازراوەتەوە بۆ محەممەدی کوڕی و ئەمیان بە ئیمامی خۆیان ناساند، لە ئاکامدا دەستەیەکی دیی ئیسماعیلی سەری هەڵدا و بە (الاسماعيلية المباركية) ناسران.

لە ژمارەیەك سەرچاوەدا وا لێکدراوەتەوە کە ئەم دەستەیە بە ناوی موبارەکی مەولای محەممەدی کوڕی ئیسماعیلەوە ناونراوە[٧٠]، بەڵام ئیڤانۆف ئەمە رەتدەکاتەوە و فەرهاد دەفتەرییش پشتگیری دەکات و دەڵێن (الامام المبارك) نازناوی خودی محەممەدی کوڕی ئیسماعیلە[٧١] و ئەم دەستە نوێیە هەر بە نازناوی ئەوەوە بە (المباركية) ناوزەدکرا[٧٢].

محەممەدی کوڕی ئیسماعیل دوای تەنگاوکردن و تەنگپێهەڵچنینی لەلایەن دەسەڵاتدارانی عەباسی لەلایەك و ناکۆکیی لەگەڵ شیعەی موسەوی لەلایەکی دیەوە، وێڕای دڵشکانی لەوەی کە زۆربەی جەماوەری شیعە داویانەتە پاڵ موسای برازای، مەدینە و عێراقی بەجێهێشت و رووی کردە هەرێمی خۆزستانی هاوسنووری کوردستان و لەوێوە رابوو بە بەرێکردن و بڵاوکردنەوەی بانگخوازانی بۆ هەرێمی چیاکان و ناوچەکانی دەوروبەری لەپێناو بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی، تا بەمەزندە لە دەوروبەری ساڵی ١٧٩ك/٧٩٥م مرد و لە کن لایەنگرانی بووە دوا ئیمام و هەر خۆیەتی خاوەندی زەمان (صاحب الزمان) و مەهدیی چاوەڕوانکراوە[٧٣].

لـە کاتێکـدا دەسـتە و لقـەکانی دیکـەی ئیسـماعیلی دوایـان بڕایـەوە، ئیسماعیلیەی موبارەکی گەشەیکرد و لقوپۆپی لێبووەوە و تـا ئێسـتاش مانـەوەی بەهێز و کاریگەری خۆی لەدەست نەداوە[٧٤].

کرۆکـی بـیر و بـاوەڕی ئیسـماعیلی لەسـەر دەرکـەوتنی حـەوت جـاری خوداوەندە لە شێوەی مرۆڤ بنیادنراوە و ئەمە پوختەکەیەتی:

خوداوەند حەوت جار دەردەکەوێت و ژمـارە حـەوت پیرۆزیـی خـۆی هەیـە و ئەوەتا حەوت ئاسمان و حەوت زەوی و حەوت هەسارەی گەڕۆك هەیە و ڕۆژەکانی حەفتەش هەر حەوتن، بۆیە خوداوەندیش لە ئەزەلەوە تا ڕۆژی دوایی حـەوت جـار دەردەکـەوێت، هـەر جـارێکیش لـە شـێوەی پێغەمبـەرێك و ئـەم پێغەمبەرانـە لـە قورئاندا بە (أولو العزم) دانراون ((فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ"))[٧٥] کە بریتین لە ئادەم و نوح و ئیبراهیم و عیسا و موسا و محەممەد، ئیمـام محەممـەدی کوڕی ئیسماعیلیش دەبێتە حەوتەم و کۆتایی، بـەلای ئەوانـەوە ئـەم پێغەمبەرانـە تـەنها (نـاطق–ئاخافتنکـەر)ن و کاریـان تـەنها ئـاخڤین و بلاوکردنـەوەی فرمـان و گوتەکانی خودایە و دەبێت هاوتەریب لەگەڵیان کەسی (صامت– بێدەنگ) هـەبێت و کـاری ئـەویش لێکدانـەوە و شـرۆڤەکردنی ئایـەت و ئاخافتنـەکان و جێبەجێکردنیانە، صامتی ئادەم هابیلە و صامتی نـوح سـامە و صـامتی ئیـبراهیم ئیسماعیلە و صامتی موسا (شمعون الصفا)یە و صامتی عیسـا خوزەیمەیـە، بـەلاَم زەکەریا بووە سەرپەرشتیار و وەصیی، صامتی پێغەمبەر محەممەدیش حـەزرەتی عەلییە، پێویسـتە ئـەم صـامتانەیش ئاگـاداری غـەیب و نهێنییـەکان بـن و توانـا و شیانی لێکدانەوەیان هەبێت، لەدوای هەر یەك لەم پێغەمبەرانە، واتـا لـەنێوان هـەر دوو دەور – دەرکەوتنـدا شـەش ئیمـام هـەن و تـا دەرکـەوتنی داهـاتوو کارەکـان ڕادەپـەڕێنن و حەوتـەمیان دەبێتـە پێغەمبـەری دەورەی داهـاتوو، هەریـەك لـەم پێغەمبەرانـە نوێنـەری دەورەیـەکن یـا خـولێکن و خولەکـە بـە نـاوی ئەوانـەوە دەناسـرێت و صـامتی کۆتـایی– حەوتـەمیش محەممـەدی کـوڕی ئیسـماعیلە کـە کۆکەرەوە و ڕێکخەرەوەی سەرجەم ئەم بیروباوەڕانەیە و کۆتاییان پـێ دێنێـت و هەر خۆیشیەتی خاوەندی کەشف و سەرهەڵدانە[٧٦].

کـەلامخوانان و دەفتـەردارانی ئـەهلی حـەق، بـۆ پڕکردنـەوەی شـوێنی کارەکتـەرە بنـەڕەتی و پێکهێنـەرەکانی ئایینەکـەیان و تـەواوکردنی پەیکـەر و سـیناریۆی لێکدانـەوەی ئایینەکـەیان لەسـەر بنـەمای دیـد و ئایـدیای شـیعەی ئیسماعیلی، پێویستیان بەداتاشین یان خواستنی کەسایەتی هـەبووە، ئـەوجا یـان خەیاڵیان بەگەڕخستووە و کەسایەتیی رەمزییان داهێناوە وەك بنیامین و پـیرداود و کاکـەرەدا و بابـا فـەقێ و دەیـانی دی، یـان دامەزرێنـەران و رێبـەرانی گرووپـە شـیعییەکانیان هێنـاوە و بـەکوردیان کـردوون و پایـەی (شـاە) و (بابـا) یـان پێبەخشـیون وەك: الامـام المبـارك – موبارەکشـاە و نـاووس– بابـا نـاووس، یـان هەڵساون لە کلتووری کوردی کەسایەتییان خواستووە و بە ئەنـدامی ئـەهلی حـەق داینـاون و شـوێنیان پـێ پـڕ کردوونەتـەوە وەك شـاعیر بابـا تـاهیری هەمـەدانی (سەدەی ٥ك/١١ز) کە نە لە شیعرەکانی و نە لە پەیڤەکانی (الکلمات القصار) هـیچ ئاماژە و بەڵگەیەك نییە کە هاوبیری ئەهلی حەق بووبێـت، یـان وەك پـیر شـالیاری هەورامان کە کەڵە صۆفییەکی سوننەی ناسراوە[٧٧]، یـان پـیر میکـائیلی دەودانـی بـاپیرە هـەرە گـەورەی مـەولانا خالیـدی نەقشـبەندی، کـە ئـەمیش صـۆفییەکی خەرقەپۆش بووە لـە ناوچـەکانی پـاوە و دەرەتـەنگ و پاڵنگـان و خـۆی و بـاب و باپیرانی خۆیان بە نەوەی عوسمانی کوڕی عەففان دادەنا[٧٨].

جگـە لـەوەی لـە کلتـووری جیهـانی ئیسـلامیش، مەنصـوری حـەلاج (م: ٣٠٩ك/٩٢٢ز)یان هێناوە و بە یەکێك لە پیرانی خۆیان دایانناوە یـان یـەکێکی وەك بەهلول– بەهلولـە شـێت (م: ١٩٧ك/٨١٣ز) یـان هێنـاوە و کردوویانـە بـە خـەڵکی دینەوەر و گۆڕێکیشـیان بـۆ چـێکردووە لـە گونـدی تەنگـەگۆل، ئەمـە لـە کاتێکـدا بەخۆی عەرەبە و هاودەمی خەلیفە (هارون الرشید) بووە و لە کوفە و بەغدا ژیاوە و یەکێك بوو لەوانەی کە بە(عقلاء المجانین) دەناسران و هیچ نزیکـی و تێکـەڵییێکی بە کوردستان و ئەهلی حەقەوە نییە و هەر لە بەغداش مردووە و تا ئێسـتاش گـۆڕ و گڵکۆکەی هەر ماوە[٧٩].

نور عەلی ئیلاهی لە کتێبی (آثار الحق)، کـە بریتییـە لـە گوتـە و بۆچـوون و یاداشتەکانی، دەڵێت خەڵکـە رەشـۆکێکەی ئـەهلی حـەق دەڵـێن: مـەولا – ئیمـام عەلی نـوور بـووە و نـووریش نابێـت خـواردن بخـوات و ژن بهێنێـت، وەلـێ ئەگـەر

پرسیار بکرێت ئەی منداڵەکانی لـە کوێـوە هـاتوون؟ ئـەوا دەڵـێن پێویسـتییەکانی جەسـتە و پێویسـتییەکانی نـەفس و زات و گیـان لـە یەکـدی جـودا کراونەتـەوە، جەستە کاری خۆی دەکات و زاتیش کـاری خـۆی رادەپـەڕێنێت، کاتێـك دەڵـێم یـا عەلی ئەوە واتای ئەوە نییە من جەستەی ئەو دەبینم کە هەزار سـاڵە رۆیشـتووە و نەماوە، بەڵام کاری ئێمە بە زاتـی ئـەوە و هـەر جارێـك و لـە کـاتی پێویسـتدا، لـە قاڵبێکدا خۆی دەنوێنێت، عـەلی رۆیشـت شاخۆشـین هـات و ئـەویش رۆیشـت بابـا ناووس هات، ئەویش رۆیشت سوڵتان ئیسحاق هات، ئەمە لە حاڵەتێکدا کە روخسار و جەستەیان یـەك نـەبووە، ئەگـەر ئێمـە خوازیـاری جەسـتە بـین ئـەوە دەتـوانین هەزاران خودا پەیدا بکەین و لەم حاڵەتەدا ئەوا لە بتپەرستان بەدتر دەبین(٨٠).

محەممەدی کوڕی ئیسماعیل حەوتەم و دوا بەرجەسـتەبوونی خواوەنـدە لای ئیسماعیلییەکان، کەچی لای ئەهلی هەق سێهەم بەرجەسـتەبوونە و یەکەمیانـە لـە کوردسـتان و بـە موبارەکشـا شاخۆشـین نـاوزەد کـراوە و بابانـاووس و سـوڵتان ئیسحاقیش چوارەم و پێنجـەمن و هـەر یـەك لـەم دۆنانـە وەك ئیسـاعیلییە، پێـنج یاوەریـان هەیـە و چـواریان رۆڵـی ئیسـرافیل و میکائیـل و جوبرائیـل و عـەزرائیل دەگێڕن پێنجەمیشیان ژنە و دایکی دۆنەکەیە یان رۆڵـی فاتیمـەی کچـی پێغەمبـەر دەگێڕێت و نوێنەرایەتی ئەو دەکات وەك لەم خشتەیە هاتووە (٨١).

| | | I | II | III | IV | V |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | خاوندگار | جبرئیل | میکائیل | اسرافیل | عزرائیل | ؟ |
| ٢ | علی | محمد مصطفی | سلمان | قنبر | ناصر | فاطمە |
| ٣ | خوشین | بابابزرگ | ب ـ رفکی (فقیە) | ب ـ حسن | ب ـ طاهر | ؟ |
| ٤ | سهاک | بنیامین | داود | پیرموسی | ؟ | رزبار |
| ٥ | کرمیزی | کاکامیر | ک ـ حرب | ک ـ رحمان | ؟ | زرباتو |
| ٦ | محمدبگ | کا ـ مریجان | ک ـ ملک جان | کرپوست | شاە ـ سوار | ؟ |
| ٧ | شاە ـ آتش | ش ـ جمشید | ش ـ الماس | ش ـ عبدال | ؟ | پری ـ خانم |

هەر ئەندامێك لەمانە بەرجەستەکەر و نیشـاندەری ئیمـامێکی شـیعەیە، داود نیشاندەر و بەرجەستەکەری حەزرەتی ئیمام عەلی رەزای کـوڕی موسـای کازمـە و

ئەوە فریادڕەس و لەکاتی تەنگانەدا بەهاناوە دێت و فریـا دەکـەوێت و خوداوەنـد ئەوی بۆ ئەو کارە راسپاردووە، بەتایبەت کاتێك مرۆڤ لە زینـدان بێـت یـان لـە نێـو دەریا یان لە ناو کێو و دەشتودەر و چۆڵەوانی گیریخواردبێت، ئەگەر لـەو دۆخـە و لە کاتی رۆژئاوابووندا هـاواری بـۆ ببـات بـە دەنگێـوە دێـت، سـوڵتان ئیسـحاقیش دەرخــەر و نیشـاندەری ئیمـام عەلییـە و بابـا یادگـاریش دەرخـەر و نیشـاندەری حوسێنە هەرچـی بنیامینـە ئـەویش دەرخـەر و بەرجەسـتەکەری ئیمـام جەعفـەری صادقە[٨٢].

## بەشی دووەم:
## هەوڵدانێك بۆ ناسینەوەی پێشەواکانی کاکەیی- ئەهلی هەق:

### ١– شاخۆشین موبارەکشاه:

شاخۆشین موبارەکشا سێهەم بەرجەستەکەری خوداوەنـدە و یەکەمیانـە لـە کوردستان، بەواتایەکی دی خوداوەند بۆ جاری سێهەم دەرکەوتووە و ئەمجارەیان کوردستانی هەڵبژاردووە و لەشێوەی شاخۆشین خـۆی نوانـدووە و بـە موبارەکشـا ناوبراوە[٨٣]، ئەم دەورەیە بە دەورەی شاخۆشین دەناسرێت کـە لـەخۆی و پێـنج یاوەری پێکدێت: باباتاهیر، بابابزورگ، بابا فەقێ، کاکە رەزا، فاتمە لوڕە یان مامە جەلالـە، هــەر ئــەم بــوو بیروبـاوەڕی یارەسـان – ئــەهلی حــەقی لــە کوردسـتان بڵاوکـردەوە بــە تایبــەت لــە ناوچــەی لوڕسـتان، بەمــەش قۆنـاغی یەکــەمی ئــەم بیروبـاوەڕە لـە دەڤـەری لۆرسـتانەوە سـەر هەڵـدەدات و بـە کوردسـتاندا تەشـەنە دەکا.

لەبارەی زیندەگیی شاخۆشینەوە، ئاستەنگ لەوەدایە، ئەمیش وەك زۆربـەی دۆنـەکان لـە کتێبـەکانی (سـەرئەنجام) و (شـاهنامە حقیقـت) و (سـرودها دینــی یارسان) و دەقەکانی دیدا، کەسێکی نامۆیـە و ژیـانی تەمومژاوییـە و بەسـەرهاتی ئـــاڵۆزە و ناکۆکییـــەکی فـــرە لەســـەر ناســـنامەی لـــە ئاراداپـــە و زیـــاتر وەك کەسایەتییەکی نائاسایی بگرە ئەفسانەیی وێنا کراوە، ئەوەتا ئەمیش بە موعجیزە و بەبێ باوك لە دایك بووە و دایکی مامە جەلالەیە کە کچی تاقانەی مـیرزا ئـەمانای سەرداری دەستڕۆیشتووی کورد بووە لە لوڕستان یان کچی سەرداری هـۆزی جـاف (؟) بووە لە شێروانەی شارەزوور[٨٤]، مامـە جەلالـە کیژۆڵەیـەکی پـاکیزەی نـازدار

بووە و لە دەمێكدا بەیانیانێك لە تیشكی هەتاو رادەمێنێت، گەردێك لە نووری خۆر شۆڕبۆتەوە و لەلای چەپیەوە چووەتە ناو زگییەوە و ئاووس بووە، هەر شەش براكەشی گومانیان لەم زگپڕییە لەناكاوەیی كردووە و بە نیازبوونە بیكوژن، سەرئەنجام شاخۆشینی بووە كە وەك پەلكەزێڕینە وا بووە و دوازدە موهری ئیمامەتی لە پاین بووە[٨٥].

لە هەردوو كتێبی (تذكرة أعلی) و سەرئەنجام بە وردی باسی ژیان و سەرگوزشتەی باباخۆشین كراوە، لە كتێبی یەكەمدا بەدرێژی و بە گوێرەی لێكدانەوە و تێگەیشتنی ئەهلی حەق، باسی چۆنیەتی دروستبوونی بوونەوەر كراوە و چۆن پاش دیارنەمانی عەلی لە مزگەوتی كوفە، خوداوەند بە شەست و شەش ساڵ [٨٦] بۆ جاری سێهەم لە ولاتی فەیلی دەركەوتۆتەوە لەناو شاخۆشین بەرجەستە بووە[٨٧].

نور عەلیشای ئیلاهی (١٨٩٥– ١٩٧٤) دەڵێت دەمێك شاخۆشین رۆژی ئاوا بوو و لە چاوان ون بوو، یارانی لێیان پرسی ئەرێ لە كوێ بتبینینەوە، ئەویش فەرمووی هەر دەمێك كۆبوونەوە و ئەم تەمبوورە بە جوانی كەوتە گەڕ، ئەوە بزانن منم، پاشان تەمبوورەكانی دیكەش دەكەونە گەڕ تا بابا ناووس دەردەكەوێت لەو دەمە هەموو تەمبوورەكان خۆبەخۆ دەكەونە گەڕ[٨٨].

لە بەیتەكانی شێخ ئەمیریش ستایشی شاخۆشین كراوە و بە پایە بڵندیدا هەڵدراوە و بە خۆشینی خۆشناو و (صاحب سلسله) وەصف كراوە:

**پشت پردەگرد پشت پردەگرد مورتەزا و ئەوزو پشت پردەگرد**
**صاحب تلسمات قصر لاجورد گژر و پارگە شاخۆشین ئاوەرد**
**میردان كردشان میردان كردشان بیا نەجامە خۆشین كردشان**

.............................. ..............................

**پنای شاهنشای خۆشین خۆشنام صاحب سلسله نهصد سرأنجام**
**رەحلت ردابی رحلت ردابی خۆشین نە جامە رحلت ردابی**
**پشت پردەگرد نەروی دنیای شی تا و دون سلطان یاری ئاگابی**[٨٩].

شاخۆشین لە هیچ شوێنێك ئۆقرەی نەگرت و هەردەم لە گەشتوگوزاری بانگخوازی بوو تا گەیشتە هەمەدان و چووە خانەی بابا تاهیر كە بەسەر گردێكەوە

بوو[٩٠]، لەو دەمەدا نزیکەی نۆسەد یان زیاتر هەڤاڵی هەبووە، ئەمجا لەمیانەی گەڕان و سووڕانیدا سەردانی کاکە ئەحمەد و حەسەن گاوان و بابا بزورگ و بابا فەقێی لە تەنگەبەری ڕێژاو کردووە، پاشان چووەتەوە هەمەدان و سەری لە بابا تاهیری هەمەدانی داوە، ئەم کەسایەتیانە پێدەچن زادەی خەیاڵ بن و تەنها بابا تاهیر حەقیقەتێکی هەیە و لە سەدەی ٥ك/١١ز ژیاوە، وەلێ وەك مینۆرسکی دەڵێت پەیوەندیی باباخۆشین بە بابا تاهیرەوە لەسەر بنەمایەکی پتەو دانەڕێژراوە و جێگای باوەڕ نییە، راوەندی (م: ٦٠٢ك/١٢٠٥ز) لە کتێبی (راحة الصدور) باسی چوونی توغرلبەگ دەکات بۆ شاری هەمەدان و دیدار و چاوپێکەوتنی لەگەڵ بابا تاهیر و دوو صۆفی دیدا، مینۆرسکی پێیوایە چوونی سوڵتانی سەلجووقی بۆ لای بابا تاهیر لای ئەهلی حەقەکان وا لێکدراوەتەوە کە ئەمە شاخۆشین بووە[٩١].

لێکۆڵەرێك بەبێ ئەوەی سەرچاوەیەکی هێنابێتەوە یان خوێندنەوەیەکی واقعیی بۆ دەقەکان بکات، زیاتر لە بیست لاپەڕەی لەمەڕ شاخۆشین رەشکردۆتەوە و بەئارەزووی خۆی و چۆنی ویستووە و چۆنی مەبەست بووە ڕووداوەکانی لێکداوەتەوە[٩٢]، لە شوێنێکدا پێیوایە شاخوشین هەمان ئەو گەنجەیە کە لە ساڵی ٣٤١ك/٩٥٢ز لە بەغدا لەنێو گرووپێکی دۆناودۆنی (التناسخية) دەرکەوت و دەیگوت روحی عەلی هاتووەتە ناومەوە و ژنەکەشی دەیگوت روحی فاتمە هاتووەتە ناومەوە و یەکێکی دیشیان خۆی بە جبریل دادەنا[٩٣].

بۆچوونێکی دی هەیە، وای بۆدەچێت کە شاخۆشین هەمان میر خۆشینی کوڕی مەسعودە ئەوەی لە سەردەمی بوەیهی دا خاوەندی قەڵای کۆسجەد بووە لە هەورامان، بەڵگەش تەنها لێکچوونی ناویانە کە هەرگیز نابێتە بەڵگە و بەس نییە بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنین کە یەك کەس بن، لەکاتێکدا جگە لە ناویان هیچ پەیوەندییەك و نزیکایەتییەك کۆیان ناکاتەوە.

خۆشینی[٩٤] کوڕی مەسعود، میرێکی پایەدار و خاوەند قەڵا و هێزی چەکدار بووە و لە ساڵی ٤٠٥ك/١٠١٤ز لەگەڵ میر بەدری کوڕی حەسنۆی بەرزەکانی میری شارەزوور و چیاکان ناکۆك بوو و شەڕ و ئاڵۆزی کەوتە نێوانیانەوە، دوای کوژرانی میر بەدریش، خۆشینی لاشەکەی برد بۆ کوفە و بەخاکی سپارد.

سیاوشی دولفانی لە کتێبە ناوازە و نایابەکەیدا (پیدایش سلسل أهـل حـق)، رەنجێکـی زۆری کێشـاوە و لـە ئامادەکردنیـدا، پشـتی بـە دەیـان سەرچـاوە و دۆکیۆمێنـت و دەسـتنووس بەسـتووە، بەتونـدی رەتیدەکاتـەوە کـە شاخۆشـین هەمان خۆشینی کوڕی مەسعود بێت، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە پرسـەکەی زیـاتر ئاڵۆز کردووە و پێیوایە شاخۆشین هەمان محەممـەدی کـوڕی فەلاحـە (المُشعشـع) (م: ٨٦٦ك/١٤٦٢ز) ئـەوەی لـە سـاڵی ٨٤٠ك/١٤٣٦ز لـە حـەوێزە دەرکـەوت و بانگـەوازی مەهــدێتی کــرد و دەوڵــەتی (المشعشــعین) لــە خــوارووی عێــراق دامەزراند[٩٥].

بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونەی، چەند بەڵگەیەکی هێناوەتەوە، لەوانە محەممـەد کـوڕی فـەلاح بـەر لـەوەی لـە حـەوێزە و زەنگاوەکـان دەربکـەوێت، لـە لوڕسـتان چـالاکیی ئەنجامـداوە و سـاداتی ئاتەشـبەگی کـە بنەماڵەیـەکی ئـەهلی حەقن، نەوەی ئەون و باباخۆشینیش بە باو و باپیری خۆیان دەزانن، هەروەها ئەو دراوانەی کاتی خۆی مینۆڕسکی لە کوردستان لەکن ئەهلی حەقەکان بینیویـەتی و بـەدراوی شاخۆشـین ناویـانبردووە، هـەمان ئـەو دراوە بـووە کـە محەممـەدی موشەعشـەع لێیـداوە[٩٦]، ئەمـەو وێـڕای بەڵگـەی دی[٩٧]، لـە دوو شـوێنی دیکـەی کتێبەکەیدا ئەم بۆچوونەی دووپاتدەکاتەوە و تەواو لێی دڵنیابووە[٩٨].

بـەڵام ئەگـەر بێـت و لـە دەقـەکانی ئـەهلی حـەق ورد بینـەوە، بۆمـان ڕووندەبێتەوە کە وێڕای ئەوەی لە زۆر شتدا ناکۆکن، بـەڵام هاوکۆکییـەکیان لـەوە هەیە کە شاخۆشین یەکەم دۆنە و پێش دۆنی سوڵتان سـەهاك و دۆنـی بابانـاووس کەوتووە، کەچی محەممەد کـوڕی فـەلاح لـە سـەدەی ٩ك/١٥ز ژیـاوە و بزاڤەکـەی راگەیاندووە، بەڵام ئەوەندە هەیە چۆنیەتی مردنی شاخۆشین نزیکـە لـە چـۆنیەتی مردنی سولتان– مەولا عەلی کوڕی محەمەدی فەلاح کە لە سـاڵی ٨٦١ك/١٤٥٧ز لـە دەمی مەلەکردندا لە یەکێك لە رووبارەکانی کوردستان– لوڕستان خنکا یان کـوژرا و ئاو بردی یان گوایە تیرێکی وێڵ لە لایەن کەسێکی نەناسراوەوە هات و کوشتی و ئاو بردی[٩٩].

سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوون و مردنی شاخۆشین بە جەسـتە، گوایـە ٣٦٦ یـان ٣٦٠ سـاڵ پـاش مـردن و لـەدونیا دەرچـوونی ئیمـام عـەلی بـووە، واتـا ٤٠٦ك/١٠١٥ز و لـە تەمـەنی شەسـت و یـەك سـاڵیدا –سـاڵی ٤٦٧ك/١٠٧٤ز– لـە

دەمێکدا لەگەڵ هەڤاڵانی خەریکی مەلەکردن بووە لە رووباری گاماسپ یان سیروان خنکاوە.

من وای بۆ دەچم کە ٣٦٦ساڵ نەبێت، بەڵکو ٣٦٦ رۆژ بێت کە دەبێتە ساڵێك و دوور نییە مەبەست لە مردنی ئیمام عەلیش، مردنی چوارەم و دوا وەکیلی دوا ئیمامی شیعەی دوازدە ئیمامی (محمد المهدي) بێت کە لەساڵی ٣٢٩ك/٩٤١ز مرد و لەو دەمەوە غەیبەی مەزن (الغیبة الکبری) دەست پێدەکات، ئەوەتا لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە خوداوەند لە ساڵی ٣٣٠ك/ ٩١٨ز سەر لەنوێ لەناو کەسایەتی شاخۆشین گیرساوەتەوە[١٠٠].

من پێموایە شاخۆشین موبارەکشا هەمان (الامام المبارك) محەممەدی کوڕی ئیسماعیلە و پێدەچێت موبارەکشا بەکوردیکردنی (الامام المبارك) بێت، ئەوەتا هەردووکیان بەرجەستەکەری خوداوەند و بنیاتنەر و دامەزرێنەری ئایینی نوێن، (الامام المبارك) شیعەی ئیسماعیلی دامەزراند و شاخۆشین موبارەکشاش ئەهلی حەق و دوور نییە ئەم ساڵەی دوایش پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە دەستپێکردنی بە غەیبەی گەورەوە هەبێت وەك روونە لە ساڵی ٣٢٩ك/ ٩١٧ز چوارەم وەکیلی محەممەد مەهدی ئیمامی زەمانی شیعە دوازدە ئیمامی مرد و قۆناغی غەیبەی بچووك تەواو بوو کە لە ساڵی ٢٦٥ك/٨٧٩ز ەوە دەستی پێکردبوو، لێرە بەدواوە غەیبەی مەزنە (الغیبة الکبری)، هەروەها سەرگوزشتەی شاخۆشین لە زۆر رووەوە هاوشێوەی محەممەدی کوڕی ئیسماعیلە، ئەویش هاتووەتە خۆزستان و لوڕستان وەك باسکرا بانگخوازانی خۆی رەوانەی ناوچەکە کردووە، بە گوێرەی دەستنووسێکی کۆنی ئیسماعیلی محەممەدی کوڕی ئیسماعیل پێشەوا و دامەزرێنەری شیعەی ئیسماعیلیی موبارەکی بەنهێنی هاتووەتە هەرێمی چیاکان و ماوەیەك لە شاری نەهاوەند ماوەتەوە[١٠١].

ئەویش چارەنووسی نادیارە و بەڕوونی نازانرێت مردنی چۆن بووە لە چ شوێنێك بووە، سەرچاوەکان لەم رووەوە ناکۆکن و هەریەکە بە شێوەیەك باسی دەکات، دوور نییە هەمان چارەنووسی هەبێت ئەوەی وای لای ئەهلی حەقەکان دەگێڕدرێتەوە گوایە لە رووباری گاماسب لە دەمی مەلەکردن خنکاوە.

### ٢- بابا ناووس - الناووسية:

ناووسی- (الناووسية) دەستەیێکی دییە کە راستەوخۆ پاش مردنی جەعفەری صادق دەرکەوت و هەڵسووڕاوە دڵسۆز و دەمارگیرەکانی ئیمامی مردووی لەخۆ دەگرت، کە بەلای هەواڵزانان و مەرجەعەکانی شیعەی دوازدە ئیمامیەوە، کەسانی گومڕا و سەرلێشێواون و فەرموودەی ساختە و ئاخافتنی درۆ لە زاری ئیمام جەعفەرەوە دەگێڕنەوە.

رێبەر و سەرکێشی ئەم دەستەیە کابرایەکی بەصرایی بوو بە ناوی (ناووس) یان (عەجلانی کوڕی ناووس) بوو، لە هەواڵێکی دیدا هاتووە خەڵکی گوندێك بووە بە ناوی ناووس، ئەمانە بیرۆکەی درێژەدان بە ئیمامەت و شوێنگرتنەوەی ئیمامی مردوویان رەتکردەوە و رایان وابوو کە جەعفەری صادق هەرگیز نەمردووە و نامرێت و بەزیندوویی و نەمری دەمێنێتەوە و هەر ئەو مەهدیی چاوەڕوانکراوە و لەلایەن محەمەد باقری باوکیەوە وەك مەهدی دەستنیشان کراوە[١٠٢]، دواتر دەستەیەکی سەبەئیش(السبأية) چوونە ریزیانەوە[١٠٣].

ئەم دەستەیە لە رووی سەربازی و جەماوەرییەوە، گەشەیەکی ئەوتۆی نەکرد و بە سستی و خامۆشی مایەوە و بەرەبەرە پووکایەوە، ابوحاتم الرازي (م: ٣٢٢ك/ ٩٣٥ز) دەڵێت: "ئەم گرووپە دوای بڕایەوە و لەم رۆژگارەدا کەسێك نییە ئەم بۆچوونەی هەبێت"، هەرچۆنێك بێت ژمارەیەك لە ئەندامانی لە شارەکانی بەصرا و کوفە و واست بڵاو بوونەوە و درێژەیان بە بزاڤ و چالاکی دا، لە نموونەی (سعيد الاسكاف) و(عنبسة بن مصعب) و (أبان بن عثمان بن يحيى) ناسراو بە(الأحمر البجلي) مەولای هۆزی بجيلە، وەلێ وا پێدەچێت بیرمەندانیان زیاتر بایەخیان بە تێکۆشانی هزری و رۆشنبیری دابێت، (أبوطالب عبدالله بن احمد الانباري) ناووسیەکی تەواو چالاك و نووسەرێکی بەبڕشتیان بوو، دەگێڕنەوە (١٤٠) کتێبی داناوە، لەوانەش کتێبی (الامامة)[١٠٤].

ئەوەی لە ناووسیە بۆ ئێمە جێگەی بایەخە و شایەنی هەڵوەستە و لێکۆڵینەوەیە، ئەوەیە کە بیروباوەڕیان دزەی کردووەتە دەڤەرەکانی لوڕستان و هەورامان و شارەزوور و جێگەی خۆی کردووەتەوە و خەڵکانێکیش قەناعەتیان پێهێناون و جەماوەرێکیان بۆ خۆیان پەیدا کردووە، هەرچەند زانیارییەکی

وەهامان لەبەردەست نییە دەربارەی چۆنیەتی و سەردەمی ئەم دزەکردنە و ناسنامەی ئەو بانگخوازانەی ئەم کارەیان راپەڕاندووە و ئالیەتی بلاوکرنەوەی ئایدیا و بەرنامەیان، ئایا لە رێگەی بانگخوازێکی ناووسیەوە بووە، یان لەبەر ئەوە بووە کە ناووسیەکان لە ترسی فشاری دەسەڵاتی ناوەندی کشاونەتەوە ناوچە پەڕگیر و دوورەدەستەکان و درێژەیان بە بلاوکردنەوەی بیروباوەڕیان داوە، دیارە چیاکانی هەورامانیش باشترین شوێن بوونە کە هەموو مەرج و پێداویستییەکانی ئەم چەشنە ئایینەی تێدا فەراهەم بووە.

ئەوەندە هەیە دەزانین کە (ناووس) رێزی لێگیراوە و لە کەسایەتییەکی کورددا وێنا کراوە بەناوی سەید ئیبراهیمی کوڕی ئەحمەد (بلە) و نازناوی بابای پیَ بەخشراوە، کە هێمایە بۆ پایەبەرزی و شکۆداری و بە بابا ناووس ناسراوە.

لە ئەدەبیاتی ئەهلی حەقدا، بابا ناووس لە ریزی پێشەوا و رێبەرە هەرە مەزنەکانە و یەکێکە لە دۆنەکان و تەجەلای دووەم یان سێهەمی خوداوەندە لە کوردستان و دەکەوێتە نێوان شاخۆشین و سوڵتان سەهاکەوە، نیشانەی دەرکەوتنیشی کەوتنەگەڕی تەمبوورە خامۆش و لەکارکەوتووەکانی یارانی شاخۆشین بووە، کەچی لە کتێبی (تذکرة اعلی) بە پێچەوانەی سەرئەنجام، بابا ناووس بوونی نییە و دوای نەمانی شاخۆشین یەکسەر دۆنی سوڵتان ئیسحاق دەستپێدەکات، ئەمەش یەکێکی دییە لە ناکۆکییە زەقەکانی نێوان دەقەکانی ئەهلی حەق .

هەروەها شیعرێکی زۆریش دراونەتە پاڵ باباناووس و دەورەکەی و لە دووتۆی دیوانێکی قەبەدا چاپکراون[١٠٥]، هەرچەند بەزەقی دەردەکەوێت کە تەواو نوێن و زادەی سەردەمێکی ئەوەندە دوور نین و هیچ سەرچاوەیەکی کۆن پشتڕاستی هەبوونیان ناکاتەوە، لەو کتێبانەی وا دەربارەی ئەهلی حەقیش دانراون، زانیارییەکی وایان تێدا نییە مۆرکی مێژوویان پێوە بەدی بکرێت و جێگەی قەناعەت بێت و هەمووی گواستنەوە و دووبارەکردنەوەی چەند ئاخافتنێکی گشتین، کە هەرگیز هاریکار نابن بۆ ناسینەوەی راست و دروستی باباناووس[١٠٦].

هەر بە گوێرەی دەقەکان، باباناووس ناوی سەید ئیبراهیمی کوڕی ئەحمەدە و بە بلە یان بلە شێت –کورتکراوەی ئیبراهیم– ناسراوە و گوایە خۆی لە شیعرێکدا ئەم راستییەی درکاندووە و لە سەدەی ٥ك/ ١١ز بە موعجیزە و بەبێ باوك و لە دایکێك بە ناوی (دایە خەزان) لە گوندی سەرگەتی هەورامان هاتووەتە دونیاوە و ژیاوە و سەر بە هۆزی جاف و بە باباناووسی جاف ناسراوە، لەگەڵ ئەوەی لەو دەمانە و تا سەردەمی عوسمانیش هۆزێکی کورد بوونی نییە بەناوی جاف، وێڕای ئەمە هێنانەناوەوەی مۆزیك، نەخاسمە بەکارهێنانی ئامێری تەمبوور تەواو پەیوەستە بەمەوە و یەکێك لە ئاوازە سەرەکیەکانیان و مەقامێکیش هەر بە بابا ناووس دەناسرێن[١٠٧].

ئیڤانۆف لەمیانەی هەوڵدانی بۆ تۆخکردنەوەی کاریگەریی مەسیحیەتی ئەرمەنی بەسەر ئەهلی حەق دا، ناسنامەی هەندێك کاراکتەری بنەڕەتیی ئەوانی شێواندووە و بۆ بنەچەی ئەرمەنی گەڕاندوونیەتەوە و بەمەش کەوتووەتە هەڵەیەکی زەقەوە، لەم چوارچێوەیەدا ناووسی بە باهوس خوێندووەتەوە و بەلای ئەوەوە هەر پاوڵ – بوهوز– بوگوزی ئەرمەنییە[١٠٨].

کەچی بەگوێرەی دیڤچوونی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ئەم سەید ئیبراهیمە، هەمان ئەو کەسەیە کە بە کابلە –کاکە بلە دەناسرا و نەوەی سەید عیسای بەرزنجی بووە[١٠٩]، لە کاتێکدا سەید عیسا لە سەدەی ٨ك/ ١٤ز ژیاوە، لێرە بە راشکاوی دەردەکەوێت کە چ ئاڵۆزی و ناکۆکییەك لەئارادایە دەربارەی ژیاننامەی سەید ئیبراهیم – باباناووس.

ئێمە پێمانوایە باباناووس هیچ کەس لەمانە نییە و تەنها کەسێکی رەمزییە و هێمایە بۆ ئیمام جەعفەری صادق و کۆپیکردن و کوردانەنی ئەوە، مەلا زین العابدینی گۆرانی هیچ گومانی نەهێشتووەتەوە لەوەی کە کۆمەڵێکی ئەهلی حەق پاشماوەی شیعە ناووسیەکانن، ئەوەتا لە نامیلکەی (الیمانیات المسلولة علی الرافضة المخذولة) کە تەرخانی کردووە بۆ رەتکردنەوە و بەرپەرچدانەوەی هەموو گرووپ و مەزهەبە شیعییەکان، کە دێتە سەر باسی ناووسیە، دەڵێت ئەمانە پاشماوەیان ماوە لە نزیك ولاتی گۆرانی خۆمان[١١٠].

ئەم کۆمەڵەیە بەوەندەوە نەوەستاون، بەڵکو کرۆکی ئاخفتنی جەعفەری صادق یان وەرگرتووە و بەرگێکی کوردەوارییان بەبەردا کردووە و لەگەڵ کەشوهەوا و کات و شوێنی خۆیان گونجاندوویانە و داویانەتە پاڵ بابا ناووس، ناووسیەکان ئیدعای ئەوەیان دەکرد کە گوایە جەعفەری صادق لە دەمی مردنیدا فەرموویەتی:" ئەگەر سەری منتان دیت لە چیاکەوە خلۆر دەبێتەوە، ئەوا بڕوا مەکەن سەری من بێت، ئەگەر هەر کەسێك هات و پێی ڕاگەیاندن کە منی چارەسەر کردووە و منی شوشتووە و کفن و دفنی کردووم، ئەوە بڕوای پێ مەکەن درۆ دەکات، ئەوە منم خاوەندی شیر"[١١١].

شاخۆشینیش، کە زانی دەمی دیارنەمانی نزیك بۆتەوە، بە لایەنگرانی ڕاگەیاند کە دوای خۆی، هەر دەمێك گوێبیستی دەنگی تەمبوور بوون، ئەوە بزانن جێگرەکەم باباناووس دەرکەوتووە و بەدووی بکەون و بڕوای پێبهێنن، ئەوانیش هەر لە چاوەڕوانی بوون تا گوێیان لە دەنگی تەمبوور بوو لە گوندی سەرگەتەوە دەهات، دیارە ئەم ئاخافتنە، هەمان ئاخافتنی ناووسییەکانە دەرهەق بە جەعفەری صادق، واتا لێرە جەعفەری صادق کراوە بە بابا ناووس و نیشانەی دەرکەوتنیشی بە ئامێری تەمبوور لێکدراوەتەوە.

## ٣– سوڵتان سەهاك – ئیسحاق:

وەك روونە سوڵتان سەهاك – ئیسحاق(؟) دامەزرێنەر و بناغەدارێژ و کەسی یەکەمی ئاینی کاکەیی– ئەهلی حەق و ستوونی سەرەکی و کارەکتەری بنەڕەتی و تەجەلای خوداوەندە لە کوردستان و لای هەموو دەستە و لقەکانی ئەهلی حەق شکۆدار و پایەرز و دانپێنراوە، کەچی ئەوەی مایەی سەرنجە نە لە یاداشتی ئەوروپییەکان و نە لە سەرچاوە ناوخۆییەکانی وەك نووسینەکانی مەلا زین الدینی گۆرانی و محەمەدی کوڕی بابا رەسوڵی بەرزنجی و نە لە شیعرەکەی شێخ رەزای تاڵەبانی کە ناوی سێ چوار کەسایەتی پیرۆزی کاکەیی هێناوە، بگرە تاکۆتایی سەدەی نۆزدەش ئامادەیی و ناو و دەنگێکی وەهای نییە[١١٢].

سەرەتا دەبێت ئەوە بڵێین کە ئیسحاق لە کوردیدا سووك دەکرێتەوە بۆ ئیساك نەك سەهاك–سوهاك، سوهاك نزیکە لەوەی سووککراوەی زوحاك ( ضُحاك) بێت، ئەم بابەتەش کێشەیەکی دیە و پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە، مەلا جەمیلی

رۆژبەیانی هەقی بووە بڵێت سوڵتان سوهاك ناوی (ضُحاك) بووە، لەوانەشە سوهاك تەنها شێوەیەکی ئەرمەنییانەی ناوە ئیسلامییەکەی ئیسحاق–ئیساك بێت[113].

بەو پێیەی زۆربەی رێبەران و مەزنانی ئەهلی حەق بەبێ باوك یان بەبێ باوك و دایك پەیدابوونە، سوڵتان سەهاکیش هەرچەند بەرواڵەت کوڕی عیسای بەرزنجیی بەساڵاچووە، هەر بەم رێسایە هاتووەتە دنیاوە و لە شێوەی باڵندەیەکی سپی بەدامێنی دایراك خاتوون –خاتوو رەزبارەوە نیشتۆتەوە، ئەم تەرزە لەدایکبوونە بەلای نوور عەلی ئیلاهیەوە، هاوشێوەی تەمەنی نەبڕاوەی خدری زیندە و ئەنگوستیلەکەی حەزرەتی سولەیمانە و بەدیتنی بنیادەمی خاکی ناسروشتییە، کەچی بە نەزەری ئەو زۆر ئاساییە و گوایە لەوەش زۆر نائاساییتری دیتووە[114].

گشت بەڵگەکان وەك مینۆرسکی دەڵێت ئەوە دەسەلمێنن کە سوڵتان سەهاك کەسایەتییەکی راستەقینەیە و هەقیقەتێکی هەیە[115] و بە کوڕی عیسای بەرزنجی دانراوە و گوایە لە تەمەنی دووسەدساڵیدا (؟) ئیسحاقی بووە، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا ژیانی هەتا بڵێی ئاڵۆز و تەمومژاوییە و لەدایکبوونی بە ئەفسانە و خەون و موعجیزە تەنراوە و بەدروستی نازاندرێت لە چ سەردەمێك ژیاوە و چ ساڵێك لەدایك بووە و چ ساڵێك مردووە، لەمەش زیاتر ئەو حەفتا و دوو پیرەی کەوا باوە لە دەوروبەر و خزمەتی بوونە، زۆربەیان ناناسرێنەوە و تەنها بەناو هەن و لەوە نزیکن کە داهێنراوی خەیاڵ بن و وەك رەمزێك بەگەڕخرابن.

سەرانی ئەهلی حەق، دەبوو تەواو لە ناسنامە و سەرگوزشتەی رێبەر و پێشەواکەیان شارەزا و ئاگاداربن و ئاشنای وردەکاریی ژیانی بن، کەچی لە دەقە بنەڕەتییەکانی ئەهلی حەق و لەلایەن گەورە رێبەران و پیاوماقووڵانی ئەهلی حەقەوە وەك حاجی نیعمەتوڵای جەیحوونئابادی و نور عەلی ئیلاهیی کوڕی و سەید قاسمی ئەفزەلی...هتد، هەروەها لە دەقە بنەڕەتییەکانی ئەهلی حەقدا وەك (حق الحقائق) یان شاهنامەی حەقیقەت و (سرودهای دین یارسان) و (برهان الحق)و (کەلام خەزانە )و (یاداشتی کاکەرەدائی) و (گەنجینە یاری)، ناکۆکییەکی زۆر بەدی دەکرێت و هەریەکە دەیگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمێك و ساڵێکی داناوە بۆ لەدایکبوون یان مردنی تا ئەو رادەیەی جیاوازی لە نێوان هەندێکیاندا سێسەد تا چوارسەد ساڵە، ئەو ساڵانەی بۆ مێژووی لەدایکبوونی دانراون بریتیین لە:

– ٥٢٨ك/١١٣٣ز، ٥٨٠ك/١١٨٤ز، ٦٠٥ك/١٢٠٨ز،٦١٢ك/١٢١٥ز، ٦٤٧ ك/١٢٤٩ز، ٦٥٠ك/١٢٥٢ز، ٦٧١ك/١٢٧٣ز، ٦٧٥ك/ ١٢٧٦–١٢٧٧ز، ٧٠٠ك/١٢٩٩ز، ٧١٦ك/ ١٣١٦ز، هەروەها هاتووە:

– لە نێوان ساڵانی ( ٤٤٥ك–٥٨٨ك/١٠٥٣–١١٩٢ز) ژیاوە.

– لە نێوان ساڵانی (٦٧٥ك–٧٩٨ك/١٢٧٦–١٣٩٦ز) ژیاوە.

– هاودەمی ڕۆژگاری شاڵاوەكانی تەیموری لەنگ بووە.

– هاودەمی شێخ زاهیدی كوردی گەیلانی (م: ٧٠٠ك/١٣٠٠ز)و شێخ صەفیەدینی ئەردەبیلی (م: ٧٣٥ك/١٣٣٤ز) بووە.

– هاودەمی سوڵتان سەلیمی عوسمانی (١٥١٢–١٥٢٠ز) بووە.

– لە شانامەی حەقیقەت یان (حق الحقائق ) هاتووە لە ساڵی ٦١٢ك/١٢١٥ز لەدایك بووە و لە ساڵی ٩١٢ك/١٥١٨ز مردووە[١١٦].

ئەم ناكۆكی و جیاوازییە زەقانە و ئەم فرە بۆچوون و لێكدانەوانەیەی دەربارەی زیندەگی و ساڵی بوون و مردنی سوڵتان سەهاك لە ئارادان، سەرباری ئەو موعجیزە و ئەفسانەیەی وا تێكهەڵكێشی كەسایەتیی كراوە، ئەو قەناعەتە زیاتر دەچەسپێنن كە دوور نییە بوونێكی راستەقینەی نەبێت و لە واقیعدا وجودی نەبێت و تەنها وەك هێما و بۆ پڕكردنەوەی قۆناغێكی بەرجەستەبوونی خوداوەند وێنا كرابێت، یان ئەگەر سوڵتان سەهاك حەقیقەتێكی هەبێت ئەوا هیچ گومان لەوە نامێنێتەوە كە ئەم دەقانە لە سەردەمی ئەودا و بگرە لە زۆر دواتریش یاداشت نەكراون و ئەو راستییە ئاشكرا دەكەن كە تا درەنگانێك پرۆسەی تۆماركردن و نووسینەوە لای ئەهلی حەق لە ئارادا نەبووە، دەنا باوەڕ ناكرێت رێبەری بیروباوەڕێكی ئایینی و كەسێكی پایەبەرزی وەك سوڵتان سەهاك ئەوەندە ژیانی لێڵ و تەمومژاوی بێت .

ئەوەی تا ئێستا زانراوە، یەكەم ناوهێنانی ئاشكرا و رەوانی سوڵتان ئیسحاق لە دەقێكی مێژوویی باوەڕپێكراو و جێگەی متمانە، دەگەڕێتەوە بۆ كۆتایی سەدەی حەڤدەهەم، سەید عبدالصمدی تودار لە كتێبی (نور الانوار) كە لە ساڵی ١٠٩٩ ك/١٦٨٨ز داینـاوە، زانیاریی وردی دەربارەی ساداتی بەرزنجە و بنەماڵە ساداتەكانی دیكەی هەورامان و شارەزوور و سنە یاداشتكردووە، لە ناساندنی

کوڕەکانی جەعفەری صادقدا دێتە سەر (ابومحمد إسحاق مؤتمن) و دەڵێت ڕۆیشتووە بۆ ولایەتی هەورامانی کوردان و بە سوڵتان ئیسحاق بەناوبانگە و لە دامێنی ئاوایی نەوسود و لەوێ نێژراوە و وەچەی لێکەوتۆتەوە[117].

لەگەڵ ئەوەی بەدووری دەزانین سوڵتان ئیسحاقی لەمەڕ هەورامان، هەمان ئیسحاقی کوڕی جەعفەری صادق بێت، بەڵام لێرە ئەو ڕاستییە ڕووندەبێتەوە کە سوڵتان ئیسحاق کێ بێت و کەنگی ژیابێت، تا ئەودەمانە هێشتا نە بە کوڕی شێخ عیسای بەرزنجی هەژمارکراوە و نە بە ڕێبەر و پێشەوایەکی ئەهلی حەقیش دانراوە.

شایەنی باسە پاش مردنی جەعفەری صادق، دەستەیەکی بچووکی شیعە دایانە پاڵ ئیسحاقی کوڕیی و ئەویان بە ئیمام دانا و بە (الإسحاقية) ناسران، ئەم دەستەیە شوێنەوار و کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبوو و هەر زوو توایەوە[118].

سیاوش دلفانی بەپشتبەستن بە دەیان شەجەرە و دۆکیۆمێنت، ڕەنجێکی زۆری کێشاوە و دیڤچوونێکی قووڵی کردووە تا سەرەداوێکی چنگ بکەوێت و سەردەمی زیندەگیی سوڵتان ئیسحاقی بۆ ساغ ببێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە لێکۆڵینەوەی لەسەر شەجەرەی چواردە بنەماڵە ئەنجامداوە کە هەندێکیان هەر هی نەوەکانی خودی سوڵتان ئیسحاقن و ژمارەیەکی دی شەجەرەی نەوەکانی سەید عەبدولکەریمی بەرزنجەی برای سوڵتان سەهاك و باپیرە گەورەی ساداتی بەرزنجە، وێڕای شەجەرەی چەند بنەماڵەیەك کە دەگەڕێنەوە بۆ کەسانێکی هاودەمی سوڵتان سەهاك و بۆ هەر نەوەیەك سی و سێ ساڵ و چوار مانگی داناوە واتا هەر سێ وەچەیەك لە یەك سەدە ژیاون، بەم حیسابە گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە سوڵتان سەهاك لە دەوروبەری ئەم ساڵانە لە دایك بووە:

– ٧٥٠ك/١٣٤٩ز. ٧٢٩ك/١٣٢٩ز، ٦٨٦ك/١٢٨٧ز، ٦٨٤ك/١٢٨٥ز، ٥٨٤ك/١١٨٨ز، ٩٧٤ك/١٥٦٩ز،٧٩٣ك/١٣٩١ز، ٦٧٩ك/١٢٨٠ز، ٨٤٨ك/ ١٤٤٤ز، ئەم ساڵەی دوایی مێژووی لەدایکبوونی میرخەسرەوی گۆرانە کە گوایە هاودەمی سوڵتان سەهاك بووە.

– ٨٧٢ك/١٤٦٨ز ساڵی لەدایکبوونی کەسێکی دیکەی هاودەمی سوڵتان .

– ٨٢٩ك/١٤٢٦ز ساڵی لەدایکبوونی شا رۆستەم، سەردەستەی حەفتاو دوو پیرەکەی دەوری سوڵتان سەهاك.

– ســـالانی: ٧٣١ك/١٣٣١ز، ٧٤٠ك/١٣٤٠ز، ٧٥١ك/١٣٥٠ز، ٧٥٨ك/١٣٥٧ز، ٧٩٨ك/١٣٩٦ز، کــە بــە مەزنــدە و بــەپێی شــەجەرەی بنەماڵــەکان، مێــژووی لەدایکبوونی سەید عەبدولکەریمی برای سوڵتان سەهاکە.

دوای کۆکردنـــەوە و دابەشـــکردنی هـــەموو ئـــەم ســـاڵ و ســـەردەمانە گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە سوڵتان سەهاك لە ساڵی ٧٥٣ك/١٣٥٢ز لەدایك بووە[119]، بەڵام خۆی بەمەبەست دوایخستووە بۆ ساڵی ٧٧١ك/١٣٧٠ز تا لەگەڵ ژیان و سەردەمی بابا عەلی هەمەدانی و محەمەدی نوربەخش بیگونجێنێت و دەڵێت عیسای بەرزنجی لە ساڵی ٧٤٥ك/١٣٤٤ز لەدایك بووە و لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیدا ژنی هێناوە و سوڵتان سەهاکی بووە[120].

بۆ دەستنیشانی سەردەمی سوڵتان سەهاك، راستتر وایە لە زاندراوەکانەوە بچین بۆ نەزاندراوەکان واتا کەسە ناسراو و پەیوەندیدارەکان بکەینە کلیلی دۆزینەوەی سەردەمی سوڵتان سەهاك، ئەوانیش موسا و عیسای بەرزنجین کە وا هاتووە مام و باوکی سوڵتانن.

زانیاریمان دەربارەی ئەم دوو برایە بایی ئەوەندە هەیە بڵێین کە لە نیوەی دووەمی سەدەی ٧ك/١٣ز و نیوەی یەکەمی سەدەی ٨ك/١٤ز ژیاون و وا دیارە ئەو کاتەی گەیشتوونەتە شارەزوور و لە بەرزنجە گیرساونەتەوە، گەنج و سەڵت بوونە، محەمەدی کوڕی بابارەسوڵی بەرزنجی هەرچەند شتێکی نووسراوی لەمبارەیەوە چنگ نەکەوتووە، پێیوایە هاتن و نیشتەجێبوونیان لە کۆتایی سەردەمی عەباسی–ناوەراستی سەدەی ٧ك/١٣ز– بووە[121]، هەواڵە زارەکییەکان ئەم مێژووە دوا دەخەن بۆ ساڵی ٦٨٦ك/١٢٨٧ز .

بێگومـان موسـای بـەرزنجی هـەمان ئـەو موسـایەیە کـە لـە چـیاکانی کوردستانەوە دەرکەوت و بانگەوازی مەهدێتی کرد و لە دژی داگیرکەرانی مەغۆل جیهادی راگەیاند و سەرئەنجام لەگەڵ خێڵێکی مەغولّ کەوتە شەڕەوە و لە ساڵی ٧٠٧ك/١٣٠٧ز لە نزیك ئاغجەلەر کوژرا[122].

عیسای برایشی وا هاتووە لە ساڵی ٧٥٤ك/١٣٥٣ز مردووە و رەنگە ئەم ساڵەش راست بێت و لەگەڵ ساڵی کوژرانی موسای برای یەك دەگرێتەوە، بابا رەسول (١٥٧٥–١٦٤٦)ی نەوەی شێخ عیساش یەکێك لە کوڕەکانی ناوی ئیسحاق بووە، بەرزنجی هەرچەند بە درێژی باسی ئەو برایانەی خۆی کردووە کە ژنیان هێناوە و کوڕ و کچ و نەوەیان لێکەوتۆتەوە، وەلێ لە ئیسحاق نادوێت(١٢٣).

کەچی سیاوشی دولفانی سەردەمی عیسای بەرزنجی بە نێوان ساڵانی ٧٤٥–٨٢٩ك/١٣٤٥–١٤٢٦ز داناوە، تەنها بۆ ئەوەی بیکاتە کوڕی بابا عەلی هەمەدانی و برای محەمەدی نوربەخش. هەروەها محي الدين عەلیی کوڕی عیسا ناودار بە سەید صادق، پیاوچاکێکی ناودارە و بەناوەکەی وا پێدەچێت کوڕی عیسای بەرزنجی بێت و هەواڵە زارەکییەکانیش هەر وا دەڵێن، ئەمیش لە نیوەی دووەمی سەدەی ٧ك/١٣ز ژیاوە و لە ساڵی ٧٠٩ك/١٣٠٩ز مردووە(١٢٤).

پیر میکائیلی داودانی دانیشتووی گوندی داودانیی نێوان جوانرۆ و پاوە، ئەمیش شتێکمان لەبارەیەوە دەستکەوتووە و دەزانین لەساڵی ٧١٠ك/١٣١٠ز لە ژیاندا بووە و سەردانی بەغدای کردووە(١٢٥)، وا باوە پیر میکائیل سەرەتا نەیار و بەرهەڵستی سوڵتان سەهاك بووە و نەیهێشتووە بێتە ناوچەکە و بارەگا دابنێت.

لەبەر رۆشنایی ئەم بەڵگانە، دەکرێت بڵێین ئەگەر وا دابنێین سوڵتان سەهاك حەقیقەتێکی هەیە و کوڕی عیسای بەرزنجییە، ئەوە نابێ ئەو ئەنجامانەی سیاوشی دلفانی پێیگەیشتووە بە هیچ شێوەیەك دروست بن، راستییەکەی ئەوەیە عیسای بەرزنجی لە ناوەڕاستی سەدەی ٨ك/١٤ز مردووە و سوڵتان سەهاکیش لە هەمان سەدەدا لەدایك بووە و مردووە.

### ٤– پەیوەندیی سوڵتان سەهاك بە بابا عەلی هەمەدانییەوە:

باباعەلی هەمەدانی یان میر سەید عەلی هەمەدانی (م: ٧٨٦ك/١٣٨٤ز)، لە خانەوادەیەکی سادات و دەسترۆیشتووی هەمەدانە و بە میری مەزن (أمیر کبیر) و (شاهی هەمەدان) و (عەلیی دووەم) دەناسرا، هەرچەند بە منداڵی و بەیاوەریی دایك و باوکی هاتووەتە کوردستان، بەڵام باوەڕ ناکرێت هیچ پەیوەندییەکی بانگخوازیی بە شارەزوور و بەرزنجەوە هەبێت، ئەو پتر سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی ئیسلام و تەریقەتە صۆفیگەریەکەی خۆی –هەمەدانی– بوو لە وڵاتی کشمیر و

نیمچە کیشوەری هیند و تورکستان و ساخ نەبۆتەوە شیعە بووە یان سوننە و نزیکەی چل کتێب و نامیلکەی بە هەردوو زمانی عەرەبی و فارسی داناوە و گرنگترینیان کتێبی (ذخیرة الملوك)[١٢٦].

پاش مردنی بابا عەلی، خەلیفەکەی خواجە ئیسحاقی خوتەلانی، کەوتە چالاکی و بەردەوامبوو لە بلاوکردنەوەی بیروباوەڕی تەریقەتی هەمەدانی و لە ساڵی ٨٢٦ك/١٤٢٣ز شۆڕشێکی دژی دەسەلاتی تەیمووری راگەیاند و محەممەدی نوربەخش (٧٩٥–٨٦٩ك/١٣٩٣–١٨٦٥ز)ی بە مەهدی راگەیاند، بەلام هەر زوو شۆڕشەکەی خامۆش کرا و بەخۆی کوژرا و محەممەدی نوربەخشیش زیندانی کرا.

محەممەدی نوربەخش دوای ئازادکردنی لە زیندان، کەوتە گەڕان و سووڕانەوە و رووی کردە کوردستان و لە ساڵی٨٢٧ ك/١٤٢٣ز هاتووەتە هەولێر[١٢٧]، ئەمجا رووی کردە "کوردستانی فەیلی و بەختیاری"، خەڵکەکەیش چوون بەپیرییەوەی و بەگەرمی پێشوازییان لێکرد و بەیعەتیان پێدا، میران و گەورە پیاوانی کوردی ناوچەکەش ملکەچی و گوێڕایەڵیی خۆیان بۆ راگەیاند و دراویان بەناویەوە لێدا، پاش ماوەیەك مانەوە چوو بۆ هەرێمی گەیلان و ئەمجا گەڕایەوە کوردستان، دواتر لە ژێر گوشار و هەڕەشەی شاهرخی کوڕی تەیموری لەنگ ناچار کوردستانی جێهێشت[١٢٨].

هەواڵە زارەکییەکان کە دەماودەم هاتوون، موسا و عیسای بەرزنجییان بە برای محەممەدی نوربەخش داناوە و هەرسێکیشیان کردوون بە کوڕی سەید عەلیی هەمەدانی[١٢٩]، بێگومان ئەمە هەڵەیەکی مەزنە و عیسا و موسا هیچ خزمایەتییەك و نزیکایەتییەکیان بەو دوو کەسایەتییە ناودارەوە نییە و زیاتر لە سەدەیەك بەر لە محەممەدی نوربەخش ژیاون و بابا عەلیش تەنیا یەك کوڕی هەبووە بەناوی سەید محەممەد (م: ٨٥٤ك/١٤٥١ز)، بەلگەی واش بەدەستەوە نییە هاتبێتە کوردستان و لەنێو دەستەی هەڤالان و یاوەران و موریدانیشیدا ناو و دەنگوباسی عیسا و موسای بەرزنجی بەرچاو ناکەوێت.

نووسەرێك بۆ دەربازبوون لەم ناکۆکییە، پێیوایە ئەو بابا عەلیەی کە دەبێتە باوکی موسا و عیسای بەرزنجی، بابە عەلیی هەمەدانی نییە و یەکێکی دیی هاوناوە و گوایە بەهەڵە کراون بە یەك کەس[١٣٠]، نووسەرێکی دی بۆ پینەکردنی

ئەم ناكۆكییە هەڵساوە بە دواخستنی ژیانی عیسای بەرزنجی و ئەو پێیوایە عیسای بەرزنجی ساڵی ٧٥٤ك/١٣٥٣ز نەمردووە و ئەو ساڵەی بە ٧٤٥ك خوێندووەتەوە و بە ساڵی لەدایكبوونی داناوە، گوایە دوای كوژرانی ئیسحاقی خوتەلانی لە ساڵی ٨٢٦ك/١٤٢٣ز، عیسای بەرزنجی بووەتە موریدی محەممەدی نوربەخش، بۆیە بە عیسای نوربەخشیش ناوی هاتووە.

لەلایەكی دیەوە محەممەد نوربەخش لە كتێبەكانیدا ناوی چەندین ئەولیا و پیاوچاكی هێناوە كە ژمارەیەكیان كوردن و هیچ باس و خواسێكی ئیسحاق–سەهاك ناوێكی تێدا نییە، وەك ئەبوبەكری كوردستانی، یوسفی گۆرانی كە صۆفییەكی ناودارە، خالیدی لوڕستانی، جوبرائیلی كورد، كاكە گۆرانی، دۆست گۆرانی، شەهابەدینی گۆرانی، شەمسەدینی كۆكۆیی، حوسێنی كۆكۆیی[١٣١]، دەوڵەتشاە قەواسی گۆرانی، عەبدولای كوردی شیرازی[١٣٢].

### ٥– بابا یادگار:

دیارە بابا یادگاریش ژیانی تەمومژاوییە و هەواڵە میللییەكان زانیارییەكی وایان تێدا نییە جێگەی قەناعەت و متمانە بێت و سەرچاوەكان پشتڕاستی بكەنەوە، خورشید پاشا لە ساڵی ١٨٣٢ بە خۆی سەردانی گڵكۆی بابا یادگاری كرد لەسەر چیای بانی زەرد لە گوندی سەیدانی نزیك سەرپوڵی زەهاو و دەڵێت شوێنێكی یەكجار پیرۆزە و لە خەڵكەكەم بیستووە كە بابا یادگار ناوی سەید محەممەدی كوڕی سەید عەلیی كوڕی شێخ موسای بەرزنجییە[١٣٣]، ئەمە لە كاتێكدا موسای بەرزنجی بەگەنجی كوژراوە و شێخ عیسای برای ژنەكەی خواستووەتەوە.

كەچی بەپێی دەقەكانی ئەهلی حەق، دایكی بابا یادگار كچێكی پاكیزە و بێگەرد بووە و هیچ پیاوێك توخنی نەكەوتووە و لە كاتی پاككردنەوەی جەمخانەكەی پەردیوەردا، دەنكە هەنارێكی بینیوە و یەكسەر زگی پڕ بووە و سەرئەنجام لە ساڵی ٨٦١ك/١٤٥٧ز لە گوندی شێخان بابا یادگاری بووە، ئەم زگپڕبوونە هاوچەشنی زگپڕبوونی حەزرەتی مریم وا بووە و لەلایەن جۆرە خەڵكانێكەوە بە زینا تاوانبار كرا، ئەوانەی تەنیا رووكەشی دیاردەكان دەبینن و لە ناوەڕۆكی راستەقینە ورد نابنەوە، سوڵتان سەهاك بەمەبەستی رەواندنەوەی

گومان و دڵنیاکردنی خەڵکەکە لە خاوێنی و بێ تاوانیی دایکی بابا یادگار، بڕیار دەدات تەنوورێك ساز بدرێت و بابا یادگاری کۆرپەی فڕێبدرێتە ناوێوە و دەرگای لەسەر کلۆم بدرێت، پاش ماوەیەك سوڵتان و هەڤالآن و یاوەرانی دەچنە لای تەنوورەکە و دەبینن بابا یادگار ساغ و سەلامەتە و هاوار دەکات یا عەلی یا عەلی، دواتر بەفرمانی سوڵتان ڕەوانەی هیند و پاکستان کراوە بۆ ڕێنوێنی و ڕێبدێیی خەڵکی، پاشان گەڕاوەتەوە کوردستان و لە گوندی سەیدان لەلایەن دوژمنانەوە کوژراوە[١٣٤]، نورعەلی ئیلاهی دەڵێت، بە سێ کەس یا سێ تەن لە حەوت تەن پەیوەندیدارم ئەوانیش داود و یادگار و ڕەزبارە و حەوت جاران سەردانی مەزاری بابا یادگارم کردووە[١٣٥]، کوردانی گۆران پێیان وایە ئەم گۆڕە هی حوسێنی کوڕی عەلییە، بەو پێیەی وەك دەگێڕنەوە یەکێك لە فەرمانڕەوایانی هیند هەڵدەستێت صندوقێك بۆ گڵکۆی حوسێن دروستدەکات و جوان دەینەخشێنێت و دەیخاتە سەر پشتی حوشترێك و بەپیاوانی دەڵێت بکەونە دوای ئەم حوشترە بۆ کوێ دەڕوات دوای کەون و لێگەڕێن بە ئازادی ڕێ بکات، ئەوانیش ئاوها دەکەن تا شوێنی مەبەست، حوشترەکەش پاش شەو و ڕۆژێك ڕێگا بڕین کاتێك دەگاتە سەرمیل(؟) یەکسەر ڕووەو چیای بانی زەردە مل دەنێت تا لە پاوانەکانی بڵەوەڕێت، ئەمجا یەکسەر ڕوو دەکاتە گۆڕەکەی و لەسەری رادەوەستێت و یەخدەدات ئەوانیش صندوقە دارینەکە لەسەر گۆڕەکەی دادەنێن و وا دەزانن گڵکۆی حوسێنە[١٣٦]، ئەوەتا بابا یادگاری بەخۆی دەرخەر و بەرجەستەکەری ئیمام حوسێنە[١٣٧].

بەدەر لەم ئاخافتنە ئەفسانە ئامێزانە، بابا یادگار حەقیقەتێکی هەیە و لە سەدەی ١٠ك/١٦ز ژیاوە و پەیوەندیی بە سوڵتان سەهاکەوە ناڕوونە، لە ساڵی ١٠٠٥ك/ ١٥٩٧ز قوباد بەگ حاکمی دەرنە– دەرتەنگ لەلایەن والیی بەغداوە دەستگیر و زیندانی کرا [١٣٨]، دایکیشی بۆ ئازادکردنی کوڕەکەی بە هەڵەداوان پەنا دەباتە بەر بابا یادگار و داوای لێدەکات دوعا بکات تا کوڕەکەی دەرباز ببێت گوایە هەر بە دوعای بابا یادگار بوو قوباد بەگ ئازاد کرا و هەتا گەیشتەوە دەرتەنگ، بابا یادگار مردبوو، ئەویش گومبەتێکی لەسەر گۆڕەکەی بنیادنا[١٣٩].

**ئەنجام:**

کاکـەیی– ئـەهلی هــەق کۆمەڵـە خـەڵکێکی خاوەنـد ئـایینێکی تایبــەتن و دۆناودۆنی بنەمایەکی جەوهەریی ئایینەکەیانـە و زۆربـەی هـەرە زۆربـەیان کـوردی رەسـەنن و یەکـەم ئامـاژە بـۆ کاکـەیی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەدەی حەڤدەهـەم و ناویشیان لە وشەی کاکەوە وەرگیراوە بە واتای برا گەورە و ئەوانەی ئـەودیویش– ئوستانی کرماشان لە یاداشـتی گەڕۆکـە ئەوروپییـەکانی سـەدەی نـۆزدە بـە عـەلی ئیلاهی ناودەبرێن.

گرفت و ئاستەنگی سەرەکیی توێژەر لە مێـژوو و سـەربوردەی ئـەهلی حـەق لەوەدایە کە نە لە سەرچاوە تۆمارکراوەکاندا دەنگوباسی بوونیان هەیە تـا بیکاتـە کەرەستەی تۆژینەوە و نە دەقە پیرۆزەکانی خۆیانیش کەڵك و بەهایێکی مێـژوویی وەهایان بۆ هەیە.

رەنگە سەرەتا وەك چەند گرووپێکی بچووکی خامۆش و تەریك بوو‌بێتن و لە گوندگەلێکی لاڕێی ناوجەرگەی چیاکان گیرسابێتنەوە و ناکرێت بە پاشکۆ یـان لـق یـان درێژەپێـدەری هـیچ دەسـتە و گـرووپ و تـاقمێکی شـیعی دابنـرێن، بـەڵکو کۆمەڵەیەکی سەربەخۆن بەڵام کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی تەواوی ئایدیا و بەرنامـە و دنیابینیی شیعەی ئیسـماعیلیەوە کـە لەسـەر بنـەمای حـەوت جـار دەرکـەوتنی خوداوەندە لە شێوەی مرۆڤ – پێغەمبەر، سـەرەڕای کاریگـەربوون بـە ئایینـەکانی دی.

کــەلامخوانان و دەفتــەردارانی ئــەهلی حــەق، بــۆ پڕکردنــەوەی شــوێنی کارەکتەرە بنەڕەتی و پێکهێنەرەکانی ئایینەکـەیان، پێویسـتییان بەداتاشـین یـان خواستنی کەسایەتی هەبووە، ئەوجا یان خـەیاڵیان بەگەڕخسـتووە و کەسـایەتیی وەهمیان داهێناوە یان دامەزرێنـەران و رێبـەرانی گرووپـە شـیعیەکانیان هێنـاوە و بەکوردیان کردوون و پایەی (شاە) و (بابا) یان پێبەخشیون وەك شاخۆشین و بابا ناووس...

شاخۆشین سێهەم بەرجەستەبوونی خوداوەندە و یەکەمیانە لە کوردسـتان و باباناووس و سوڵتان ئیسحاقیش چوارەم و پێنجەمن و هـەر یـەك لـەم دۆنانـە وەك ئیسـماعیلیە، پێـنج یاوەریـان هەیـە و چـواریان رۆڵـی فریشـتەکان دەگێـڕن و

پێنجەمیشیان ژنە و دایکی دۆنەکەیە یان رۆڵی فاتیمەی کچی پێغەمبەر دەگێڕێت و ئەم کەسایەتییانە بە موعجیزە و بەبێ باوك لەدایك بوونە.

سوڵتان سەهاك – ئیسحاق کەسی یەکەمی ئایینی کاکەیی– ئەهلی حەقە و تەجەلای خوداوەندە لە کوردستان و لای هەموو دەستە و لقەکانی ئەهلی حەق شکۆدار و پایەرز و دانپێنراوە، کەچی ژیانی هەتا بڵێی ئاڵۆز و تەمومژاوییە و بەدروستی نازاندرێت لە چ سەردەمێك ژیاوە تا ئەو رادەیەی گومان لە هەبوونی بکرێت و لەنێو دەقەکاندا جیاوازییەکی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی لە چ سەردەمێکدا ژیاوە و لێرە بۆمان ساخ بووەوە کە لە سەدەی ٨ك/١٤ز ژیاوە .

**پەراوێزەکان:**

(١) کوردە یەزیدییەکان بەم حاڵەتە دەڵێن کراس گهۆڕین.

(٢) دەربارەی ژمارە و ڕێوڕەسم ودابونەریتی ئەهلی هەق، بڕوانە: دایرة المعارف تشیع (تهران: ١٣٦٨ش)،٢/ ٦١٠–٦١٤، عبدالله خدابنده، شناخت فرقه أهل حق، ص٥٥–٦١.

(٣) قووڵترین و فراوانترینیان کتێبەکەی سیاوش دلفانی یە: پیدایش سلسله أهل حق، منشور أمید (تهران:١٣٩٢)، ٧٧٤ل.

(٤) زانستیترینیان تۆژینەوەیەکی مینۆرسکی یە لە کتێبی: سه گفتار تحقیقی در آیین أهل حق، ویراسته و حواشی و توضیح وترجمه محمد علی سلطانی و مریم بانو رزازیان، مؤسسه نشر فرهنکی سُها (تهران: ١٣٧٨) ص٣٨–٥٩ و کتێبەکەی ئیڤانۆف: پەیڕەوانی ڕاستی، یارانی کوردستان"ئەهلی هەق"، وەرگێڕانی ئاسۆ کەریم (هەولێر: ٢٠٠٣)،٢١٨ل.

(٥) ڕێز و سوپاسم بۆ هاوڕێی هێژا و ڕێزدارم د. ئیسماعیل شەمس کە بەدەنگمەوە هات و بە سوپاسەوە، چیی هەبوو لەمەڕ ئەهلی هەق لە دەق و سەرچاوە بۆی ناردم .

(٦) بڕوانە: بیبلۆگرافیای هەڵبژاردە لە بارەی ئەهلی حەق (سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان) لە کتێبی: چەند باسێك دەربارەی ئەهلی حەق، وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵا، دەزگای موکریان (هەولێر: ٢٠٠٥)، ل١٤٦–١٥٣.

(٧) مینۆرسکی و پێشتریش گەڕۆکە ئەوروپییەکان بە ڕوونی باسی کاریگەریی یەهودی و مەسیحییان لەسەر عەلی ئیلاهییەکانی ئەودیو کردووە، بگەڕێوە بۆ:

GEORGE KEPPEL,A JOURNEY FROM INDIA TO ENGLAND (LONDON:1853), 2/57-58, H.RAWLINSON, NOTES ON A MARCH FROM ZOHAB(1839), P 36-39.

ویبرت بلوشر، سفرنامه بلوشر، ترجمه کیکاووس جهانداری (تهران: ١٣٦٩ش)، ص٨٧.

(٨) دەربارەی دەستە و بنەماڵەکانی ئەهلی حەق و کاریگەریی زەردەشتی و ئایینە ئاسمانییەکان و مەزهەبە شیعییەکان لەسەر بیروباوەڕیان بگەڕێوە بۆ: سه گفتار تحقیقی در آیین أهل حق، از اعتماد السلطنة – دکتر سعید کردستانی– مینورسکی، ویراسته وحواشی و توضیح وترجمه محمد علی سلطانی و مریم بانو رزازیان، مؤسسه نشر فرهنکی سُها (تهران: ١٣٧٨)، دائرة المعارف بزرگ اسلامی (تهران:١٣٦٧ش)، أهل الحق،١٠/٢٧٣–٢٧٤.

(٩) مینورسکي، دائرة المعارف الاسلامیة، أهل الحق، ٩٤/٣، و بڕوانە: پەیڕەوانی ڕاستی، ل ٤١– ٤٢.

(١٠) ك. ج. ریچ کە بەمەبەستی بەدەستهێنانی دانەیەك لە شەرەفنامە و کاری دی، لە ساڵی ١٨٢٠ لە سلێمانییەوە ڕووی کردە سنە و بەنزیك ناوچەکانی ئەهلی حەقدا گوزەری کرد و لە یاداشتنامەکەیدا بە وردی لە هەر شتێك دواوە سەرنجی ڕاکێشابێت، تەنانەت باسی

کەشوهەوا و تۆپۆگرافیای ناوچەکەشی کردووە، ئەگەر بیزانیبا یان شکی کردبا کە ئەهلی حەقەکان گەنجینەیەك لە دەستنووسی دینی و ئەدەبییان هەیە، ئەوا رەنگبوو هەر بەرگوێی بکەوتایە و هیچ نەبوایە بە چەند وشەیەکیش بووایە لێی بدوایە و دووریش نەبوو کاری بۆ دەستخستنی دەستنووسەکانیان بکردایە.

(١١) دائرة المعارف الاسلامية، أهل الحق، ٣/٩٥.

(١٢) ئیڤانۆف، پەیڕەوانی راستی، ل ٤١.

(١٣) محەمەد عەلی سوڵتانی، بزووتنەوە و سەرهەڵدانی عەلەوییەکانی زاگرۆس، ١/٣١.

(١٤) دائرة المعارف الاسلامية، أهل الحق، ٣/١٠٢.

(١٥) گوایە عیسای بەرزنجی کچی سەرداری هۆزی جاف خواستووە لە کاتێکدا دەرکەوتنی هۆزێکی کورد بەو ناوە گەلێك درەنگە و یەکەم ناوهێنانی دەگەڕێتەوە بۆ رێککەوتنامەی زەهاوساڵی ١٦٣٩ز.

(١٦) نامه سرنجام یا کلام خزانه، تحقیق وتفسیر صدیق صفی زاده، انتشارات هیرمند (تهران: ١٣٧٥هـ.ش)، ص١٢٦–١٢٨.

(١٧) حمدالله مستوفی، تاریخ گزیده، ص٥٥٠. چوار سەدە لەوە پێشتر ناوی هۆزی کوردی کیکانی– کیکی هاتووە کە هۆزێکی دییە و زیاتر ناسراوە و ئێستاش بە هەمان ناوەوە هەر ماوە و لە چەند گوندێکی نێوان موصڵ و دهۆك نیشتەجێیە و هیچ پەیوەندییەك و نزیکایەتییەکی بە کاکەیییەوە نییە و بە هەڵە و تەنها بە پاساوی نزیکیی ناویان لەلایەن مەلا جەمیلی رۆژبەیانی و نووسەرانی دییەوە بە کاکەیی دانراون.

(١٨) البرزنجي، الفصول في مناقب عبدالرسول، نشره د. عماد عبدالسلام رؤوف في كتابه: دراسات وثائقية عن تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم ص٣٤٦، هامش (٦).

(١٩) د. عماد عبدالسلام رؤوف، عشائر كردية في وثائق عثمانية، نشره في كتابه: دراسات وثائقية عن تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، ص٢٨٤–٢٨٥.

(٢٠) دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، ل ١٧٥،٨٩.

(٢١) الفصول في مناقب عبدالرسول، ص ٣٦٧.

(٢٢) بروانە: الأعمال الكاملة للشيخ معروف النودهي (بغداد: ١٩٨٤)، ٣/ ٣٢٧ –٣٢٨.

(٢٣) ادمونز، کرد و ترك و عرب، ص ٢٦٥، کەچی مەلا یەحیای بالیسانی (م: ١٧٩١) لە یاداشتەکانی دەگێڕێتەوە کە لە دەوروبەری ساڵی ١٧٤٣ چاوی بەو سەیدە کەوتووە کە ئەم موعجیزەیەی نواندووە و ئەو دەمانە لە شارەزوورەوە کۆچی کردووە بۆ ئاکرێ و لەوێ نیشتەجێ بووە.

(٢٤) الكاكائية في التأريخ، ط٢، مكتبة النهضة العربية (بغداد: ٢٠١٦)، ص ٤–٧.

(٢٥) سورة الحجرات/١٠.

(٢٦) منهاج الطالبين ومسالك الصادقين، ص١٩١–١٩٥.

(٢٧) "در بين عقايد على اللهيان در كوهستان مشرق نزديك بەختا" كتاب دبستان مذاهب، كتابخانه طهورى (تهران: ١٣٦٢ش)، ص٢٦٥–٢٦٧.
(٢٨) تذكره شاه طهماسب، أنتشارات شرق (تهران: ١٣٦٣ هـ.ش)، ص١٦.
(٢٩) کەشکۆڵە شیعرێکی کوردیی گۆرانی، ساغکردنەوەی ئەنوەری سوڵتانی، چاپی دووەم، بنکەی ژین (سلێمانی: ٢٠١٠)، ل٤١٢.
(٣٠) پەیڕەوانی راستی، ل٢٠.
(٣١) دائرة المعارف الاسلامية، مادة أهل الحق، ٣/٩٥.
(٣٢) نامه سرنجام يا كلام خزانه، تحقيق وتفسير صديق صفى زاده، انتشارات هيرمن (تهران: ١٣٧٥ش)،ص ٢٣.
(٣٣) البرزنجي، النوافض للروافض، ص١٠٧.
(٣٤) النوافض للروافض، ص١٠٦.
(٣٥) النوافض للروافض، ص١٠٨–١٠٩.
(٣٦) رحلة المنشي البغدادي عام ١٨٢٠، ص٦٤–٦٧.
(٣٧) FROM INDIA TO ENGLAND, 2/57-5 , GEORGE KEPPEL, A JOURNEY
H.RAWLINSON ,P36 ,39 ,109..... راولينسون، سفرنامه راولينسون (تهران: ١٣٦٢ش)، ص١٤، ويبرت بلوشر، سفرنامه بلوشر، ترجمه كيكاووس جهاندارى (تهران: ١٣٦٩ش)، ص٨٧.
(٣٨) واتا ئەوانەی شەوێك چراكانیان دەكوژێننەوە و گوایە ژن و پیاویان تا بەیانی بەتاریكی رادەبوێرن(؟).
(٣٩) رحلة ريج عام ١٨٢٠، ص٣٩٦،٣٩٤،٤٤، رحلة المنشي البغدادي، ص٧٧،٧٤.
(٤٠) رحلة الحدود بين الدولة العثمانية وايران، ١٩٩–٢٠٢.
(٤١) سه كفتار تحقيقى در ايين أهل حق، ص٤–١٦
(٤٢) رسائل في الرد على الرافضة، ص٤١.
(٣) النوافض للروافض، ص١٠٨.
(٤٤) پەیڕەوانی راستی، ل ١١– ١٢.
(٤٥) مسعر بن المهلهل، الرسالة الثانية، ص١١.
(٤٦) الملل والنحل، ص١٢٨، بگەڕێوە بۆ: د. زرار صدیق، کوردو کوردستان لە رۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا، چاپی سێهەم، (هەولێر: ٢٠١٣)، ل٧٧.
(٤٧) الفرق بين الفرق، ص٣٩–٤١.
(٤٨) بگەڕێوە بۆ: البغدادي، الفرق بين الفرق، ص٢٨٥، ابن الجوزي، المنتظم، ١٢/٢٩٧–٢٩٨.
(٤٩) الفرق بين الفرق، ص٢٦٦.

(٥٠) بگەڕێوە بۆ کتێبەکەم: کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا، چاپی سێهەم (هەولێر: ٢٠١٣)، ل ١٠٤–١٠٥.
(٥١) الخصيبي، الهداية الكبرى،ص٣٣٨.
(٥٢) العمري، التعريف بالمصطلح الشريف،ص٥٤.
(٥٣) رحلة خورشيد باشا، ص ١٥٢،١٩٩
(٥٤) دیوانی سالم، بنکەی ژین (سلێمانی: ٢٠١٥)، ل ٦٥٩.
(٥٥) فرهاد دفتري، الاسماعيليون تأريخهم وعقائدهم، ص٥٠.
(٥٦) ئیڤانۆف، پەیڕەوانی ڕاستی، ل٣٤–٣٥.
(٥٧) نورالله الشوشتري، مجالس المؤمنين، ٣/٤٩٩– ٥٠٤.
(٥٨) التأريخ الغياثي، ص٣١٢.
(٥٩) مجالس المؤمنين، ٣/٥٠٦–٥٠٧.
(٦٠) مجالس المؤمنين، ٣/٥٠٧.
(٦١) اليمانيات المسلولة، في رسائل في الرد على الرافضة، ص٨٦.
(٦٢) وەك خۆی دەڵێت کچەزای مەلا ئەبوبەکری موصەنیفی مەریوانییە (م: ١٠١٤ك/١٦٠٥ز).
(٣) محەممەدی کوڕی بابا ڕەسوڵی بەرزنجی لەمبارەیەوە دوو کتێبی هەیە: الناشرة الناجرة بالرد على الفرقة الفاجرة، بروكلمان، تاريخ الأدب العربي، ٩/٦٢، النوافض للروافض، ابوعبدالرحمن النعيمي بڵاوی کردۆتەوە لە سایتی www.archief.org
(٦٤) بڕوانە: رسائل في الرد على الرافضة، جمع وتحقيق حمدي عبدالمجيد السلفي، مطبعة خبات (دهوك:١٩٩٧).
(٦٥) اليمانيات المسلولة، ص٨٦.
(٦٦) البدليسي، شرفنامە، ص٤٧٨.
(٦٧) النوافض للروافض، ص١٠٧–١٠٩، دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ل٩٧–١١١.
(٦٨) بۆ ئاشنابوون بە شیعە و شیعەگەری بڕوانە: السيد عبدالرسول الموسوي، الشيعة في التاريخ، مكتبة المدبولي (القاهرة: ٢٠٠٢)، سعد رستم، الشيعة والتشيع، النشئة، التاريخ، العقيدة، التوزيع الجغرافي، دار الاوائل (دمشق: ٢٠٠٨).
(٦٩) بڕوانە: النوبختي، فرق الشيعة، ص٥٧–٥٨، ئێمە لێرە تەنها لەوانە دەدوێین کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە ئەهلی حەقەوە هەیە.
(٧٠) النوبختي، فرق الشيعة، ص ٥٨، الاشعري، مقالات الاسلاميين، ص ٢٥–٢٦، البغدادي، الفرق بين الفرق، ص ٦٧، الشهرستاني، الملل والنحل، ص ١٣٦.
(٧١) ابويعقوب اسحاق السجستاني، اثبات النبوات، ص ١٩٠.
(٧٢) الاسماعيليون تأريخهم و عقائدهم، ص ١٧٣– ١٧٤ .
(٧٣) الاسماعيليون، تاريخهم و عقائدهم، ص ١٨٢.

(٧٤) بڕوانە كتێبی: فرهاد دفتري، الاسماعيليون، تاريخهم و عقائدهم، ترجمة سيف الدين القصير، دار الساقي (بيروت: ٢٠١٢).

(٧٥) سورة الأحقاف/٣٥.

(٧٦) السجستاني، اثبات النبوءات، ص١٨٥–١٩٣ و بڕوانە: الغزالي، أبوحامد محمد بن محمد الطوسي (ت: ٥٠٥هـ/١١١١م)، فضائح الباطنية، تحقيق: عبدالرحمن بدوي، دار الكتب الثقافية (الكويت د.ت)، ص٤١،١٦–٤٤.

(٧٧) بگەڕێوە بۆ لێكۆڵینەوەكەم: ناسینەوەی پیر شەهریاری هەورامان، گۆڤاری ئەكادیمی، ژمارە (٣٥) (هەولێر: ٢٠١٦)، ل٩–٣٨.

(٧٨) ابن الفوطي، مجمع الاداب في معجم الالقاب (طهران: ١٤١٦هـ)،، ٢/٥٢٣–٥٢٤، ٣/٤٤٨.

(٧٩) بگەڕێوە بۆ: صديق صفيزاده (بورەكەئی)، مشاهير اهل حق، كتابخانه طهوری (تهران: ١٩٨١).

(٨٠) آثار الحق، به اهتمام دكتر بهرام الهي، انتشارات جيحون (تهران ١٣٧٠هـ)، ٢/٣٧٩ .

(٨١) مینورسكی، سه كفتار تحقيقى در آيين أهل حق، ص٤٠.

(٨٢) آثار الحق، ٢/٥٠ .

(٨٣) نامه سرنجام يا كلام خزانه، ص ١٣٤.

(٨٤) جەلیلە ئێستا گوندێكە لە شارەزوور، ڕەنگە پەیوەندییەكی بە مامە جەلالەوە هەبێت.

(٨٥) مجموعه رسائل و اشعار اهل حق – تذكره أعلى (تهران: ١٩٦٠)، ص٢٧، پەیڕەوانی ڕاستی، ل٨٤، ١٥٩، ئەیوب ڕۆستەم، یارسان، ل٩٧–١٠٠، محەمەد عەلی سوڵتانی، بزووتنەوە و سەرهەڵدانی عەلەوییەكانی زاگرۆس، ١/٣٦.

(٨٦) هەڵەی چاپە، لە دەقەكانی دیدا سێسەدو شەست و شەش ساڵە.

(٨٧) مجموعة رسائل و اشعار اهل حق، ص٢٣–٢٨ .

(٨٨) اثار الحق، ٢/٥٠٩.

(٨٩) چەند باسێك دەربارەی ئەهلی حەق، ل١٢٥.

(٩٠) اثار الحق، ٢/١٢٨–١٢٩ .

(٩١) دائرة المعارف الاسلامية، ٣/١٠٣، ياداشتها در مورد اهل حق، ترجمه سياوشى منصورى (تهران: ١٣٨٧ش).

(٩٢) محەمەد عەلی سوڵتانی، بزووتنەوە و سەرهەڵدانی عەلەوییەكانی زاگرۆس، ١/٣١ –٥٥.

(٩٣) بزووتنەوە و سەرهەڵدانی عەلەوییەكانی زاگرۆس، ١/٣٥. و بڕوانە: جلال الدين السيوطي (ت ٩١١هـ)، تاريخ الخلفاء، تحقيق: حمدي الدمرداش، ط١ (القاهرة: ٢٠٠٤م)، ص ٢٧٨.

(٩٤) خوشین –خُشین لە سەرچاوە عەرەبییەكاندا بووە بە حُسين .

(٩٥) دەربارەی ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ: جاسم محمد شبر، تاريخ المشعشعين وتراجم رجالهم، مطبعة الآداب (النجف الأشرف: ١٩٦٥).

(٩٦) لە راستیدا لە کوردستان دراو بە ناوی محەمەدی نوربەخشەوە لێدرا نەك بە ناوی محەمەدی المشعشع.

(٩٧) پیدایش سلسله أهل حق، ص١٢٢–١٣٣.

(٩٨) پیدایش سلسله أهل حق، ص ١٦٧– ١٦٩، ٢٠٦ .

(٩٩) نورالله الشوشتري، مجالس المؤمنين، ٣/٥٠٦–٥٠٧.

(١٠٠) چەند باسێك دەربارەی ئەهلی حەق، ل١٣٥ .

(١٠١) عارف تامر، تاريخ الاسماعيلية (لندن: ١٩٩١)، ص١٠٨.

(١٠٢) النوبختي، فرق الشيعة، ص ٥٧، الاشعري، مقالات الاسلاميين، ص ٢٥، البغدادي، الفرق بين الفرق، ص ٦٧، الشهرستاني، الملل والنحل، ص ١٣٦.

(١٠٣) الفرق بين الفرق، ص ٦٧.

(١٠٤) ابن شهراشوب، معالم العلماء، ص ٧٠.

(١٠٥) ديوان حضرت بابا ناووس، ترجمة وشرح سيد فضل الله دكه اى، سازمان چاپ أحمدى (تهران: ١٣٩٤ش)، لاپەڕە ٥٧٠

(١٠٦) بڕوانە، سوڵتانی، بزووتنەوە و سەرهەڵدانی عەلەوییەکانی زاگروس، ١/٥٦–٦٠، ئەیوب روستەم، یاراسان، چاپی ئۆفیسی قانع (سلێمانی: ٢٠٠٦)، ل ١٠٠– ١٠٤.

(١٠٧) محەمەد موکری، موسیقای پیرۆز لای کوردەکانی ئەهلی حەق لە کتێبی چەند باسێك دەربارەی ئەهلی حەق، وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵا، ل ٨٤–٩٣ .

(١٠٨) پەیڕەوانی راستی، ل ٢١ .

(١٠٩) مەلا عبدالکەریمی مدرس، بنەماڵەی زانیاران، ل٢٨٠.

(١١٠) رسائل في الرد على الرافضة، ص٤١.

(١١١) النوبختي، فرق الشيعة، ص ٥٧، الاشعري، مقالات الاسلاميين، ص ٢٥، البغدادي، الفرق بين الفرق، ص ٦٧، الشهرستاني، الملل والنحل، ص ١٣٦.

(١١٢) بڕوانە: علي أكبر كُردستاني، الحديقة الناصرية، ص٥٧.

(١١٣) پێڕەوانی راستی، ل٢١.

(١١٤) اثار الحق، ٢/٩١ .

(١١٥) دائرة المعارف الاسلامية، مادة سلطان اسحاق، ١٢/٩١.

(١١٦) مشاهير أهل حق، ص٥٤–٥٥، سياوش دلفانى، پيدايش سلسله أهل حق، ص ٢٥–٢٧، هەروەها بڕوانە: ئەیوب رۆستەم، یارسان، ل ١٠٥–١٠٧، هاشم کاکەیی، ئەستێرە گەشەکەی ئاسمانی شارەزوور "سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی"، گۆڤاری کاروان، بەشی یەکەم، ژ(٦١)، (کانوونی یەکەم:١٩٨٧)، ل١٠٢–١٠٣.

(١١٧) نورالانوار در سلسلة آل أطهار، انتشارات حسينى نسب (سنندج: ١٣٦٩)، ص٢٨.

(١١٨) بڕوانە: ابن حجر الهيثمي، الصواعق المحرقة،مؤسسة الرسالة (بيروت:١٩٩٧)،٢/٤٨٥.

(١١٩) بیدایش سلسله أهل حق، ص ٢٨– ٣٧.
(١٢٠) پیدایش سلسله أهل حق، ص ٤١٠.
(١٢١) الفصول في مناقب عبدالرسول، ص ٣٧٥.
(١٢٢) القاشاني، تاريخ اولجاتيو، ص٧٦–٧٧.
(١٢٣) الفصول في مناقب عبدالرسول، ص ٣٧٠.
(١٢٤) إبن الفوطي، مجمع الاداب في معجم الالقاب، ٧٨/٥.
(١٢٥) مجمع الاداب في معجم الالقاب، ٥٢٣/٢–٥٢٤، ٤٤٨/٣.
(١٢٦) پرويز ازكايى، سرگوزشت نامايى مير سيد على همدانى، فرهنگى ايران زمين، زبستان سال ١٣٦٨ شماره ٢٨، ص ٩–٦٩، رسالة الهدى، من مهدى هستيم، ترجمه به فارسى، بكوشش رسولى جعفريان، پيام بهارستان، د ٣، سال ٥، شماره ١٧، پاييز ١٣٩١، ص ٦٩٧–٧١٦ .
(١٢٧) سيد محمود انوارى، مير سيد على همدانى و تحليلى آثارى أو، دانشكده علوم و ادبيات انسانى، شماره (٢٣) (تبريز: بايز ) ١٣٥٦، ص ٢٩٧–٣٦٣.
(١٢٨) نورالله الشوشتري، مجالس المؤمنين، ٦٥/٣.
(١٢٩) الشيخ معروف النودهي، الأعمال الكاملة للشيخ معروف النودهي (بغداد: ١٩٨٤)،٣/ ٣٢٨، عبد الكريمى مدرس، بنەماڵەی زانیاران، ل ٢٧٠– ٢٧١.
(١٣٠) محەمەد عەلی سوڵتانی، بزووتنەوە و سەرهەڵدانی عەلەوییەکانی زاگرۆس، ٦٨/١.
(١٣١) کۆکۆیی گوندێکی سەر بە هەڵەبجەیە و تا ئێستاش ئاوەدانە کەچی سیاوش دلفانی دەڵێت ناوچەیەکە لە مراکش یان مصر، ل٥٤٢–٥٤٣.
(١٣٢) پیدایش أهل حق، ص ٥٣٧–٥٦٢، ٥٥٠.
(١٣٣) رحلة الحدود، ص٢٠١–٢٠٢.
(١٣٤) بورەکەیی، مشاهير اهل حق، ص ٥٥–٥٦، ٦٨–٧٠، يارمورادی تيموريان، نم از يمی حقيقت، ص ٣٠ .
(١٣٥) آثار الحق، ١٤٢/٢،١٣٦.
(١٣٦) خورشيد باشا، رحلة الحدود، ص ٢٠٢.
(١٣٧) آثار الحق، ٥٠/٢ .
(١٣٨) البدليسي، شرفنامه، ص ٥٥٠.
(١٣٩) رحلة الحدود، ص٢٠١–٢٠٢.

## سەرچاوەکان:

### أ– بەعەرەبی:


– ادمونز، سي، جي، كورد وتُرك وعَرب، ترجمة: جرجيس فتح الله، دار آراس (أربيل: ٢٠١٢).
– الاشعري، ابو الحسن بن علي بن اسماعيل (م: ٣٣٠هـ/٩٥٢م).
– مقالات الاسلاميين واختلاف المصليين، دار الحديث، (القاهرة: ٢٠٠٨).
– البدليسي، الأمير شرفخان بن شمس الدين، (ت١٠١٠هـ/١٦٠١م).
– شرفنامه، ترجمة محمد جميل الملا أحمد الروزبياني، ط٢، (أربيل:٢٠٠١).
– البرزنجي، محمد بن عبدالرسول (بابا رسول) الحسيني، (ت: ١١٠٣/١٦٩١م).
– الفصول في مناقب السيد عبدالرسول، نشره د. عماد عبدالسلام في كتابه: دراسات وثائقية عن تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، دار الزمان، (دمشق: ٢٠١١)، ص٣٥٣–٣٧٦.
– النوافض للروافض، نشره ابو عبدالرحمن النعيمي في موقع www.archief.org.
– البغدادي، عبدالقهار بن طاهر البغدادى (ت ٤٢٩هـ/ ١٠٣٨م ).
– الفرق بين الفرق، دار الافاق الجديدة، (بيروت: ١٩٧٧).
– خورشيد باشا، رحلة الحدود بين الدولة العثمانية وايران، المركز القومي للترجمة (القاهرة: ٢٠٠٩).
– ريج، كلوديوس جيمس، رحلة ريج سنة ١٨٢٠، الترجمة العربية، (بيروت: ٢٠٠٨).
– السجستاني، ابو يعقوب اسحاق (ت بعد ٣٦٠هـ/٩٧١م).
– كتاب اثبات النبوات، تحقيق عارف تامر، دار المشرق، (بيروت: ١٩٨٦).
– أبن شهراشوب، رشيد الدين محمد بن علي الطبسي (ت ٥٨٨هـ/١١٩٢م).
– معالم العلماء، عني بنشره عباس أقبال، مطبعة فردين، (طهران ١٣٥٣هـ).
– الشهرستاني، ابوالفتح محمد بن عبدالكريم (ت ٥٤٨هـ/١١٥٣م).
– الملل والنحل، مطبعة حجازي، (القاهرة: (د.ت)).
– عارف تامر، تاريخ الاسماعيلية، (لندن: ١٩٩١).
– عباس العزاوي، الكاكائية في التأريخ، ط٢، مكتبة النهضة العربية، (بغداد: ٢٠١٦).
– العمري، شهاب الدين أحمد بن يحيى بن فضل الله (ت: ٧٤٩هـ/١٣٤٧م).
– التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق: محمد حسين، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٨٨).

– الغياثي، عبدالله بن فتح الله البغدادي، (ت بعد ٨٩١هـ/١٤٨٦م).
– التاريخ الغياثي، تحقيق طارق الحمداني، مطبعة أسعد، (بغداد ١٩٧٥).
– فرهاد دفتري، الاسماعيليون تأريخهم وعقائدهم، ترجمة سيف الدين القصير، دار الساقي، (بيروت: ٢٠١٢).
– ابن الفوطي، كمال الدين عبدالرزاق بن احمد الشيباني (ت: ٧٢٣هـ/١٣٢٣م).
– مجمع الآداب في معجم الألقاب، تحقيق: محمد الكاظم، (طهران: ١٤١٦هـ).
– الكوراني، زين العابدين بن يوسف بن محمد الكردي (ت: بعد ١٠٦٦هـ/١٦٥٦م).
– اليمانيات المسلولة على الرافضة المخذولة، في كتاب (رسائل في الرد على الرافضة)، جمع وتحقيق حمدي عبدالمجيد السلفي، مطبعة خبات، (دهوك: ١٩٩٧).
– مسعر بن المهلهل الخزرجي (ت ٣٩٠هـ/١٠٠٠م).
– الرسالة الثانية، نشرها مينورسكي، مطبعة جامعة القاهرة، (القاهرة: ١٩٥٥).
– معروف النودهي، الأعمال الكاملة للشيخ معروف النودهي، مطبعة العاني (بغداد: ١٩٨٤).
– المنشي البغدادي، رحلة المنشي البغدادي عام ١٨٢٠، ترجمة عباس العزاوي، دار الوراق، (لندن: ٢٠٠٨).
– مينورسكى، ف. ف، دائرة المعارف الاسلامية، مادة السلطان اسحاق، مادة أهل الحق.
– نورالله الشوشتري (ت: ١٠١٩هـ/١٦١٠م).
– مجالس المؤمنين، ترجمة محمد شعاع فاخر، دار هشام (د.ت).
– النوبختي، ابو محمد الحسن بن موسى (ت: ٣١٠ هـ /٩٢٣م).
– فرق الشيعة، مطبعة الدولة (أستانبول:١٩٣١).

**ب– بە کوردی و فارسی:**

– أصفهانى، نجم الدين محمود بن سعدالله (ت بعد ٧٤٠ هـ/١٣٣٩م).
– مناهج الطالبين ومسالك الصادقين، انتشارات مولى، (تهران: ١٣٩٣ش).
– أهل حق: نامه سرنجام يا كلام خزانه، تحقيق وتفسير صديق صفيزاده بورەكەیی، انتشارات هيرمند (تهران: ١٣٧٥هـ.ش).
– أهل حق: مجموعه رسائل و اشعار اهل حق – تذكره أعلى، باصلاح و. ايوانف، (تهران: ١٩٦٠).

– ئیڤانۆف، پەیڕەوانی راستی، یارانی کوردستان "ئەهلی هەق"، وەرگێڕانی ئاسۆ کەریم، (هەولێر: ٢٠٠٣).
– پرویز ازکایی، سرگوزشت نامایی میر سید علی همدانی، فرهنگی ایران زمین، زبستان سال ١٣٦٨ شمار ٢٨. –تودار،عبدالصمد(١٠٩٩ك/١٦٨٨ز)،نورالانوار در سلسله ئ‌ل أگهار، انتشارات حسینی نسب، (سنندج:١٣٦٩).
– حمدالله مستوفی (ت ٧٥٠هـ/١٣٤٩م). تارخ گزیده، انتشارات امیر کبیر، (تهران ١٣٨١ هـ.ش).
– سیاوش دلفانی، پیدایش سلسله أهل حق، منشور أمید، (تهران: ١٣٩٢).
– سید محمود انواری، میر سید علی همدانی و تحلیلی آثاری أو، دانشکده علوم و ادبیات انسانی، شماره (٢٣)، (تبریز: بایز ١٣٥٦).
– صدیق صفیزاده بورەکەیی، مشاهیر اهل حق، کتابخانه طهوری، (تهران: ١٩٨١).
– شاه طهماسب صفوی، تذکرة شاه طهماسب، أنتشارات شرق، (تهران: ١٣٦٣ هـ.ش).
– شێخ رەزای تاڵەبانی، دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، پرۆژەی هاوسەر (سلێمانی: ٢٠٠٥).
– القاشانی، ابو القاسم عبدالله بن محمد (ت: ٧٣٨هـ/١٣٣٧م ).
– تاریخ أولجایتو، به اهتمام مهین همبلی، شرکت إنتشارات علمی وفرهنگی (تهران: ١٣٨٤ش).
– مەلا عبدالکریمی مدرس، بنەماڵەی زانیاران، چاپخانەی شەفیق، (بەغدا: ١٩٨٤).
– محەمەد عەلی سوڵتانی، بزووتنەوە و سەرهەڵدانی عەلەوییەکانی زاگرۆس، وەرگێڕانی عەدنان بەرزنجی، دەزگای ئاراس، (هەولێر: ٢٠١١).
– محەمەد موکری و چەند نووسەرێك، چەند باسێك دەربارەی ئەهلی حەق، وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵا، دەزگای موکریانی، (هەولێر: ٢٠٠٥).
– محمد نوربخش، رساله الهدی، من مهدی هستیم، ترجمه به فارسی، بکوشیش رسولی جعفریان، پیام بهارستان، د ٣، سال (٥)، شماره ١٧، (پایز: ١٣٩١).
– نورعلی الاهی، آثار حق، به اهتمام دکتر بهرام الهی، انتشارات جیحون، (تهران: ١٣٧٣ش).
– یار موڕادی تیموریان زند، نمی از یم حقیقت، چابخانه بهرام، (تهران: ١٣٨٢ش).

## ملخص البحث

يتناول هذا البحث تاريخ فرقة الكاكايي أو اهل الحق منذ ظهورها بكُردستان مرورا بمراحل تطورها وتأثرها بالديانات السماوية الكبرى والتراث الإيراني القديم وبالفرق الشيعية المختلفة التي انتشرت بين الكُرد منذ عهد مبكر لا سيما الاسماعيلية المباركية، والتعرف على سيرة أهم شخصياتها الرمزية الرئيسة ممن حل الذات الالوهية المتمثلة بروح الامام علي بن أبي طالب فيهم حسب اعتقادهم كبابا خوشين و بابا ناووس و سلطان اسحاق و بابا يادكار ومقارنة حياتهم بسيرة الدعاة الأسماعيلية الأوائل، مع ان النصوص والروايات عنهم شحيحة للغاية ولاتفي بالغرض، دون الخوض في الجوانب الدينية والعقائدية والشعائرية لهم والتي اشبعت بحثا ودراسة وكتب حولها منذ مطلع القرن العشرين العديد من الأبحاث والدراسات من قبل المستشرقين والكُتاب الكُرد وغيرهم.

ووقف الباحث موقف الناقد من النصوص الشعرية الكثيرة المنسوبة الى الشيوخ والزعماء الروحيين لأهل الحق التي حررت في وقت متأخر لا يتعدى القرن التاسع عشر ولا يمكن الأعتماد عليه من الناحية التأريخية لما تحويها من أخطاء ومغالطات تاريخية، لا بل اختلاف شديد وتناقضات مثيرة حول عصر و شخصية السلطان اسحاق أو سان سهاك وغيره من رموز الفرقة.

وتوصل البحث الى ان هذه الفرقة كانت موجودة بولاية شهرزور والمناطق الجبلية النائية من هورامان وكرمانشاه على الأقل منذ القرن السابع عشر على شكل فرق وطوائف دينية شيعية صغيرة ومغمورة، دون أن تعرف باسمها الحالي أهل الحق وانما عرف كل فرع منه بأسمها الخاص به أو باسم القبيلة التي تنتمي اليها أفرادها قبل ان تجمعها هذه التسمية خلال القرن التاسع عشر.

## Research Summary

This research deals with the history of the Kakayi or Ahl al-Haq sect since its emergence in Kurdistan through its stages of development and its impact on the great heavenly religions and the various Shiie groups that spread among the Kurds from an early age, especially the Ismaili Al-Mubarikia and the biography of the main symbolic characters of the self-deity of the Imam Ali bin Abi Talib, He is with them according to their belief, as Kababa Khoshin, Baba Naous, Sultan Ishaq and Baba Yadgar and comparing their lives to the early Ismaili preachers, although the texts and narratives are very trivial and inadequate, without going into the religious and ideological aspects of them. And that is exhaustively researched and studied and wrote around since the beginning of the twentieth century, many researches and studies by orientalists and writers of the Kurds and others.

The researcher stopped the critic from the many poetic texts attributed to the sheikhs and spiritual leaders of the people of truth, which were liberated in the late nineteenth century and can not be relied on from the historical point of view of the historical mistakes and inaccuracies, and there is a doubt and different opnion about the character of commander Isaac or San Sahak and other band characters.

The research found that this group was present in the state of Shahrzur and the remote mountainous areas of Hawraman and Kermanshah at least since the seventeenth century in the form of small and submerged Shiie sects, without knowing the current name of the people of truth, but knew each branch by its own name or the name of the tribe that To the members before the gathering of this name during the nineteenth century.

# کۆڕی زانیاری کورد

## لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە

**پ. ی. د. ئازاد عوبێد ساڵح**
بەشی مێژوو – کۆلێژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی**

یەکێك لە داخوازییە سەرەکی و هەرە گرنگەکانی بزووتنەوەی نیشتمانی کورد، بایەخدان و بڵاوکردنەوە و خزمەتکردنی زمانی کوردی بووە، لەبەرئەوەی هەمیشە داگیرکەرانی کوردستان بۆ تواندنەوەی کورد، رێگرییان لە هەرجۆرە بڵاوبوونەوە و بەکارهێنانێکی زمانی کوردی کردووە، بە ئامانجی پووکاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی و سەرەنجام سەرکوتکردنی. لەم رووەوە دامەزراندنی کۆڕی زمانەوانی و زانستی ئامانج و ئەرکی پیرۆزی رۆڵەکانی بووە.

بۆ دەرخستنی ئەو هەوڵ و کۆششانەی کراون ئەم توێژینەوەمان ئامادەکردووە، بێگومان هەموو کارێك و بەتایبەتیش کاری زانستی، بەشی خۆی ئاستەنگ و کۆسپی دێتە پێش، بەتایبەتیتریش بۆ توێژەری کورد، لەبەرئەوەی کتێبخانە و ئەرشیفخانەی پێویستی لەبەر دەستدا نییە بە ئاسانی سەرچاوەی کارت دەست بکەوێت، بۆیە دەبێ ماندووبوونێکی بێ ئەندازە بچێژێ تا بتوانی زانیارییەکان لێرەولەوێ کۆبکەیتەوە.

ئەم توێژینەوەیە باس لە سەرەتا و دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد دەکات کە دوای ١١ی ئاداری ١٩٧٠، هاتووەتە دامەزراندن و دەستی بە چالاکییەکانی خۆی کردووە. دوای خستنەڕووی هەوڵە سەرەتاییەکان و دامەزراندنی کۆڕی زانیاری عیراق، دواتر هاتووینە سەر کۆڕی زانیاری کورد لەڕووی چۆنیەتی دامەزراندن و پێکهاتە و ئامانج و بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی کۆڕ.

ئەو سەرچاوانەی بەکارهاتوون بۆ سەرەتا و دامەزراندن گۆڤار و رۆژنامە کۆنەکانن، هەروەها گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد.

**ناوی کۆڕ لە چییەوە هاتووە:**

ڕۆژئاواییەکان بەکۆڕی زانیاری دەڵێن (Academia)، کە بێژەیەکی یۆنانییە لەناوی ئەکادیمیوسی ئەسینایی قارەمان وەرگیراوە، ئەوە باخچەیەکی دامەزراند فەیلەسوفەکان تێیدا کۆدەبوونەوە، سوقراتی فەیلەسوف لەوێ قسەی بۆ قوتابی و لایەنگرەکانی دەکرد، هەروەها ئەفلاتوونیش. بۆیە بە هەر کۆمەڵێك کە بۆ فێربوون و گفتوگۆ و وتاردان بوایە پێیان دەگوت (ئەکادیمیا). یەکەمین کۆڕی لەو جۆرە ئەکادیمیای ئەرستۆ بوو کە لەسەر شێوەی قوتابخانە و کۆڕ بوو، جا لەوەوە ناوی لاتینی (Academia) و (Academie)ی فەرەنسی و (Academy) ئینگلیزی و عەرەبیش بە (مجمع علمی)یان وەرگێڕا[1].

ئەو کۆڕانەش زۆر جۆرن بەپێی بابەتەکانیان، وەك ئەوەی زمانەوانی و زانستی و هونەری و مێژوویی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و ئاوەدانی و ئەو شێوانەن، بە زۆرییش کۆڕی گەورەن کە یەك یان زۆریان یان گرنگەکانیان لەخۆدەگرێت[2].

دیارە لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا هەندێ فێرگە بە ئەکادیمی ناونراون، لە ڕۆژهەڵات، سەدەی نۆیەم (خانەی حیکمەت – دارالحکمة) لە بەغدا، ئەکادیمی مەئمون لە خوارەزم لە سەدەی یازدەیەم و چەندانی دیکە. لە سەدەکانی پازدەیەم و شازدەیەم لە ئیتالیا بەو کۆڕ و کۆمەڵانەی خەریکی زمان و ئەدەبیات بوون ئەکادیمییان پێ گوتراوە. لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەیەم لە زۆر وڵاتی جیاجیا ئەکادیمی دامەزراون. لە ساڵی ١٧٢٤دا ئەکادیمیای پێتەربورگ لە رووسیا دامەزراوە و لە زۆر وڵاتانی جیهاندا ئەکادیمیای بەناوبانگ هەن و زۆر پشتگیری دەکرێن. هەر بۆ نموونە لە فەرەنسا شەش ئەکادیمیا هەن[3].

لە میسر لە ساڵی ١٨٩٢ کۆڕی زمان (المجمع اللغوي) دامەزراوە[4]. کۆڕی زانستی عەرەبیش لە سوریا لە سەرەتای ساڵی ١٩١٩ بە سەرۆکایەتی محەمەد کوردعەلی دامەزراوە[5].

کۆڕی زانیاری عێراق (المجمع العلمي العراقي)یش بەپێی یاسای ژمارە (٦٢)ی ساڵی ١٩٤٧ دامەزراوە کە لە ٢٦ی تشرینی دووەمی ١٩٤٧ لە بەغدا دەرچووە و ئەوکاتە تۆفیق وەهبی (١٨٩١ – ١٩٨٤) وەزیری مەعاریف بووە و یاساکەش بەپاڵپشتی برگەی شەشەمی مادەی یەکەمی یاسای مەعارفی گشتی ژمارە (٥٧)ی ساڵی ١٩٤٠، دامەزراوە[6].

**سەرەتا:**

کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییەکان و ئۆرگانەکانیان بایەخی زۆریان بە زمانی کوردی داوە، چ بە بەکارهێنانی چ بە خستنەنێو پێڕەو و پرۆگرام و بەرنامەکانیانەوە.

جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی کورد کە لە "١٩ی ئەیلوولی ١٣٢٤ رۆمی {١٩٠٨}" لە ئەستەنبۆڵ دامەزراوە، لە مادەی (١١)یدا دەڵێت: کۆمەڵە بۆ خوێندنی سەرەتایی بە زمانی کوردی هەوڵی نووسین و چاپکردنی ڕێزمانی کوردی و سەرف و نەحوی کوردی، فەرهەنگی کوردی، کتێبی دینی کوردی دەدات، لەبارەیەوە و نووسەرانیش هان دەدات و هاوکارییان دەکا[٧]. ئەمە وێڕای بڵاوکردنەوەی بابەتی نووسەرانی لەبارەی زمانی کوردییەوە لە ڕۆژنامەکەی خۆی (کورد تەعاون تەرەقی غەزەتەسی)، بۆ نموونە: بەدیعو زەمان مەلا سەعیدی کوردی، (زمانی کوردیمان)، نامەی تایبەت، محەمەد تاهیر جزیری لە ئامەد، زمانی کوردیمان، وەطەن و ئیتیفاقا کورمانجان، خەلیل خەیاڵی[٨]. هەر لەو ڕۆژنامەیەدا نووسەرێك لە وتارێکیدا داوا دەکات: "کۆمسیۆنێك لە شارەزایانی زمانی کوردی بۆ داڕشتنی فەرهەنگ و ڕێزمانی کوردی پێکبهێنرێ"[٩].

بایەخدانی ڕووناکبیرانی کورد بە بابەتی زمان یەکێکە لە نووسین و بابەتە دیارەکانی گۆڤار و ڕۆژنامەکان. ئیسماعیل حەقی بابانیش (١٨٧٦ – ١٩١٣) زۆر بە بایەخەوە باسی زمانی نەتەوە دەکات[١٠].

ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی)یش (١٩١٨ – ١٩١٩) ئاماژە بەوە دەکات کە کورد بایەخ بە مێژوو و ئەدەبیاتی خۆیان ئەدەن بۆ ئەم مەبەستە "لە هەموو جێ جەمعیات علمیە تأسیس و تاریخ ئەدەبیات خۆیان تەدوین ئەکەن"[١١].

کۆمەڵەی تەعالی کوردستانیش لە (١٩١٨/٢/١٧ دامەزراوە) لە ڕێی "جەمعییەتی تەعمیمی مەعاریف و نەشرییاتی کوردی"یەوەی سەر بەو کۆمەڵەیە، لە بەرنامەی کاری خۆیدا، بایەخدان بە زمانی کوردی لە ئامانجە سەرەکییەکانی بووە بۆ چارەسەرکردنی کێشە و کەموکوڕییەکانی، ئەمە وێڕای لەبەرچاوگرتنی ئامادەکردنی فەرهەنگێکی کوردی، تەنانەت یەکێکیشی بەناوی "کوردی بتلیسی"یەوە بۆ ئەو کارە ڕاسپاردووە[١٢].

سەرباری ئەوە، هەر ئەو کوردەی بەتلیسی، وتاری سەبارەت بە زمانی کوردی و زاراوەکانی نووسیوە و پێشنیازی کردووە، کە لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر بکرێت، تا زمانێکی یەکگرتوو دروست بکرێت، تەنانەت پێشنیازی کردووە ((ئەنجوومەنێکی زمانەوانی)) پێکبێت کە سەر بە جەمعیەتی تەعمیمی مەعاریف و نەشرییاتی کورد بێت[١٣]. هەر ئەو جەمعیەتی تەعمیمی مەعاریف و نەشرییاتی کوردە، کتێبێکی رێزمانی کوردی بەناوی (مقدمة العرفان) ئامادەکردووە کە نووسەرەکەی دیار نییە[١٤]. دواتر دەرکەوتووە نووسەرەکەی محەمەد میهرییە (١٨٨٩ – ١٩٥٧) و لە ساڵی ١٩١٩ لە ئەستەنبۆڵ چاپ کراوە و بە وتاریش بڵاوبووەتەوە[١٥].

هەر لەو بارەیەوە مەمدوح سەلیم (١٨٩٠ – ١٩٧٧)یش دەڵێت: یەکێك لەو ئەرکانەی کە جەمعیەتی تەعمیمی مەعاریف و نەشرییاتی کورد بە ئەرکی خۆی زانیوە، کێشەی زمان و ئەدەبیاتی کوردی بووە[١٦].

گۆڤاری (کوردستان)ی ئەستەنبۆڵ – یش لەبارەی زمانی کوردییەوە، وتاری زمانەوانی، لەبارەی رێنووس و فەرهەنگ و زمانی یەکگرتووی کوردی نووسیوە کە لەمەدا محەمەد میهری دەوری دیاری هەبووە[١٧].

لە رۆژنامەی (پێشکەوتنی سلێمانی)یشدا بایەخدان بە زمان زۆر بە زەقی دیارە، بەتایبەتی ئەو پێشبڕکێیەی کە بۆ کوردی پەتی نووسین کراوە و تێیدا بابەتێك بەناوی (جووت و گا شتێکی چاکە) لە نووسینی شێخ نوری شێخ ساڵح (١٨٩٦ – ١٩٥٨) گرەوەکەی بردووەتەوە[١٨].

چەند نووسەرێك لە (دیاری کوردستان) لەبارەی زمان و رێنووسی کوردی دواون وەك: پیرۆت، تۆفیق وەهبی، ئیسماعیل حەقی شاوەیس (١٨٩٦ – ١٩٧٦) و حەسەن کوردستانی[١٩].

گۆڤاری (زاری کرمانجی)یش بە دەوری خۆی بایەخی تەواوی بە زمانی کوردی داوە و هەر ناونانەکەی بە (زاری کرمانجی) ئاماژەیەکی روونی بایەخدانە بە زمانی کوردی، هەوڵی بووژانەوە و یەکگرتنی زمانی کوردی داوە و تەنانەت تاڕادەیەك زمانێکی پاراوی کوردانەی بەکارهێناوە، لەمەشدا جێی پەنجەی حوزنی موکریانی (١٨٨٦ – ١٩٤٧) دیارە[٢٠].

(کۆمەڵـەی زانسـتی کـوردان) لـە سـلێمانی لـە سـاڵی ١٩٢٦ دامـەزراوە بـۆ بژارکردنی زمانی کوردی لە وشەی بێگانـە، کۆمەڵەیـەکی بـەناوی "کۆمـەڵی بـژاری زمانی کـوردی" پێکهێنـاوە، ئامـانجی بڵاوکردنـەوەی زانسـت و زانیـاری بـووە لـە کوردستان، ئەم هەوڵە لە بیستەکان چەندی کردبی دیار نییە، بەڵام چەندین دەیـە ساڵ بەر لە کۆڕی زانیاری کوردی حەفتاکان بووە[٢١].

رووناکبیرێکیش بەناوی ع. عەزیز هەولێری (١٩٠٤ — ١٩٦٢) وتارێکی بەناوی (زمـــانی کـــوردی) نووســـیوە، تێیـــدا بایـــەخی زمـــانی بـــۆ کـــورد بـــە وردی روونکردووەتەوە[٢٢].

ژمارەیەك نووسەر لەبارەی زمانی کوردییەوە لـە هـاوار وتاریـان نووسـیوە و داوایان کردووە کۆمیتەیەك پێکبێت بۆ خزمەتکردنی زمانی کوردی....[٢٣].

گۆڤـاری (نیشـتمان)یش بایـەخی بـە زمـانی کـوردی داوە وێـڕای هـەوڵی بـۆ نووسینی کوردی پەتی، "بەشداری کردووە لە رێکوپێکخسـتن و بـژارکردنی زمـانی کوردیدا"[٢٤].

هەر لە بابـەت بایەخـدانی گۆڤـار و رۆژنامـەکان بـە زمـانی کـوردی "دەنگـی گـێتی تـازە" ئامـانجی خـۆی لـە خزمـەتی زمـان و ئـەدەبیاتی کـوردی، دیـاری کـردووە[٢٥]. لـە رۆژگـاری کۆمـاری کوردسـتانیش لـە مـەهاباد نووسـەرێك لـەرووی چۆنیەتی نووسین و وەرگێڕان و پاککردنـەوەی زمـانی کـوردی لـە وشـەی بێگانـە، باسی لیژنەیەکی (٢٠ — ٣٠) کەسی دەکات کە هەموویان پسپۆڕ بن لە دەستووری نووسـین و خوێنـدنی زمانـانی زینـدووی بیـانی و دەوروبـەر و شـارەزای هـەموو زارەکانی زمانی کوردیش بن[٢٦].

**دامەزراندنی کۆڕی زانیاری عیراق:**

لەڕووی مێژووییەوە، بیرۆکەی سەرەتای دامەزراندنی کۆڕێکی زمانەوانی لە عیراق لە ساڵی ١٩٢٠ـەوە، ئەوکاتەی یەکەمین وەزارەت لە عیراق بە سەرۆکایەتی عەبدوڕەحمان گەیلانی لە ١٩٢٠/١٠/٢٥ پێکهات، بەرلەوە کاربەدەستانی سەربازی بەریتانیا دەستەیەکیان بەناوی (ئەنجومەنی مەعارف) پێکهێنابوو(٢٧).

لە هەردوو سەردەمی داگیرکاری و ئینتدابی بەریتانیادا لە عیراق، ژمارەیەك گۆڤار و ڕۆژنامە دەرچوونە، لەبارەی زمان و کێشەکانی و پاراستنی زمانی عەرەبی و دانانی زاراوەی زانستی بۆ وشە بیانییەکان کە لە خوێندن و نووسین بەکاردەهاتن، دابنێن، بۆ ئەوەش یەکەمین داواکاریی دامەزراندنی کۆڕی زانستی یان کۆڕی زمانەوانی بووە(٢٨).

لە تشرینی یەکەمی ١٩٢١ "لیژنەی وەرگێڕان و بەعەرەبیکردن" لە وەزارەتی مەعارف پێکهێنراوە — لە ٢٣ کانوونی دووەمی ١٩٢٥ ، پەیمانگای زانستی کە لە ١٩٢١/١٢/٣٠ لە عیراق دامەزرابوو — لەبارەی دامەزراندنی (کۆڕێکی زمانەوانی) کۆبوونەتەوە و گفتوگۆیان کردووە و بەڵام سەری نەگرتووە. لە ساڵی ١٩٢٦ وەزارەتی مەعارف کۆڕێکی زمانەوانی دامەزراندووە(٢٩).

لە ساڵی ١٩٣٤ یانەی قەڵەمی عیراقی لە بەغدا دامەزراوە کە یەکەمین سەرۆکی جەمیل سدقی زەهاوی (١٨٦٣– ١٩٣٦) بووە، کە تا ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ چالاکی بەردەوام بووە(٣٠).

وەزارەتی مەعارف لە ساڵی ١٩٤٥ لیژنەی وەرگێڕان و دانان و بڵاوکردنەوەی پێکهێناوە تا ساڵی ١٩٤٧، یاسای کۆڕی زانیاری عیراق ژمارە (٦٢)ی ساڵی ١٩٤٧ دەرچووە، بەردەوام بووە(٣١).

دوای ئەو هەوڵ و کۆششانە لە ساڵی ١٩٤٧ بە هەوڵی وەزارەتی مەعارف، ئەنجوومەنی وەزیرانی عیراق بەپێی یاسای ژمارە (٦٢)ی ساڵی ١٩٤٧، کۆڕی زانیاری عیراقی، دەرکردووە(٣٢).

بەپێی مادەی یەکەمی ئەو یاسایە کۆڕێکی زانستی عیراقی دادەمەزرێت کە سەر بە وەزارەتی مەعارف دەبێت و بەپێی بودجە کەسایەتی حەکەمی و سەربەخۆیی دارایی دەبێت، لە مادەی دووەمی یاساکەدا کار و ئامانجەکانی بەو شێوەیە دیاریکردووە:

أ- سەروکار و چاودێریکردنی سەلامەتی زمانی عەرەبی و کارکردن بۆ ئەوەی داخوازی زانست و هونەر و کاروبارەکانی ژیانی هاوچەرخ دەستەبەر بکات.

ب- توێژینەوە و دانان لە ئەدەبیاتی زمانی عەرەبی و لە مێژووی عەرەب و عێراقی و زمان و زانست و شارستانیەکانیاندا.

ج- کۆڵینەوە لە پەیوەندییەکانی گەلانی موسڵمان بە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریی عەرەبی.

د- پاراستنی دەستنووس و بەڵگەنامە عەرەبییە دەگمەنەکان و بووژاندنەوەیان بە چاپکردن و بڵاوکردنەوەیان بە نوێترین رێگای زانستی.

هـ- توێژینەوە لە زانست و هونەرە نوێیەکان و هاندانی وەرگێڕان و دانان لەو بوارانە و بڵاوکردنەوەی گیانی زانستی لە وڵاتدا(٣٣).

دامەزراندنی ئەو کۆڕە وای لە رووناکبیرانی کورد کردووە، داوای دامەزراندنی کۆڕێکی هاوشێوە بکرێت بۆ کورد، بەتایبەتی کە بەپێی خاڵی (ب) لە مادەی دووەم کارەکە هەموو عێراقییەکان دەگرێتەوە، ئەوەبوو گۆڤاری (نزار) راشکاوانە بەدواداچوونی بۆ کردووە.

نووسەرێك بەناوی ئیبن خەلەکان لە گۆڤاری (نزار)دا باس لە دامەزراندنی کۆڕی زانیاری عێراق و ئەو هیوایەی لەسەری هەڵچنراوە دەکات، تێیدا داوا دەکات لە تەك دامەزراندنی ئەو کۆڕە بایەخی رەوای خۆی بە زمانی کوردیش بدات. دوای ئاماژەکردن بە دامەزراندنی کۆڕی ناوبراو و خستنەرووی ئامانجەکانی لە خزمەتکردنی زمان و ئەدەب و مێژووی عەرەب و عێراقییەکان و شارستانیەتیان، نووسەر رەخنەی لە پەیڕەوی ئەو کۆڕە گرتووە - کە بۆچی بە دەستەواژەیەکی روون و ئاشکرا باس لە بایەخدان بە زمانی کوردی نەکراوە، کە زمانی خەڵکی "باکوورە" [مەبەست باشووری کوردستان]، بۆیە خۆزگەی ئەوەی خواستووە، ئەوانەی کە فەرمانی دامەزراندنی ئەو کۆڕەیان بەدەستە، مافی رەوای خۆی بدەنێ(٣٤).

(نزار) جارێکی دیکەش دێتەوە سەر کۆڕی زانیاری عێراق و زمانی کوردی، وێڕای ئاماژەکردن بە داواکەی (ابن خلكان)، دەڵێت: "خاوەنی ئەو گۆڤارەش [عەلائەدین سەجادی] داوای لە سەرۆکی کۆڕ و هەندێ لە ئەندامانی ئەو کۆڕە

کردووە، کەوا رای خۆیان سەبارەت بەو نووسینەی خاوەن وتار بدەن. کە بە گەرمی داوای بڵاوکردنەوەی برایەتی و دۆستایەتی لە رێگای ئەو کۆڕە بکەن بۆ ئەوی ببێتە بەردەسیلەی (حجر الزاوية) برایەتی عەرەب و کورد، بەڵام وادیارە ئەوانە رازی نەبوونە، هەر ئەوەش دەربڕی دروستی زمانحاڵی کوردەکانە، لە بەرامبەر ئەو داخوازییەدا، پاشان دێتە سەر ئەوەی کەوا یان دەبێ لەبیر خۆیان بردبێتەوە و فەرامۆشیان کردبێ یان لەبەرئەوەی پڕکارن نەیانپرژاوەتە سەر ئەو داخوازییە، بۆیە وا ئێمە داوایان لێ دەکەینەوە کەوا بەرامبەر بە برا کوردەکانیان ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن و ئەو کۆڕە لە ئافاتی سیاسەت دوور بخەنەوە، زانایانی کوردیش بخەنە ناو ئەو کۆڕەوە.... دواتر دەڵێت: ئێمە ئەوە لە کۆڕ بە رەخنە دەگرین کە بایەخ بە زمانی کوردی نادات و ئاوڕی لێ ناداتەوە. پاشان داوا لە وەزارەتی مەعاریف دەکات وەك ئەرکی خۆیان بایەخ بە زمانی کوردیش بدەن و ئەندامانی کورد بخەنە ناو ئەو کۆڕەوە، بەشێك لە کۆڕ دابمەزرێنن بایەخ بە ئەدەبی کوردی بدات بەهاوکاری بەشی عەرەبی و هەڵبژاردنی ئەندامان لە زانایانی کورد بۆ بەشی کوردی، بەپێی رێنماییەکانی پەیڕەوی ئەندامانی کۆڕ (کارا و هاوکار و شانازی)، بایەخدان بە دانانی فەرهەنگێك بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی، بۆ ئەوەی ئاسانکاری بێت، بۆ ئەوانەی لە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی دەکۆڵنەوە، وێڕای بەخشینی یارمەتی و دیاری و خەڵاتی دارایی بۆ توێژەران و نووسەران لە زمانی کوردیدا، هەروەها ئەو گۆڤارەی کۆڕ کە دەرئەچێت دوو بەش بێت عەرەبی و کوردی. لە کۆتاییدا دەڵێت: ئەوە ئەرکێکی ئەدەبییە لەسەر ئەندامانی کۆڕ خۆیان و پاشان وەزارەتی مەعاریف واتە حکومەت خۆی، کە یەکێك لە ئەرکەکانی راگرتنی دادپەروەرییە لە نێوان رۆڵەکانی نیشتمان"[٣٥].

جارێکی دیکە هەر لەو بارەیەوە لە ساڵی ١٩٥٢ — ١٩٥٣، جەمال نەبەز لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی خوێندکاربوونە لە زانستگەی بەغدا، کۆمەڵەیەکیان پێکهێناوە بۆ دانانی زاراوەی زانستی زمانی کوردی، بەڵام ئەو کۆمەڵەیە زۆر نەژیاوە. دواتر لە ساڵی ١٩٥٦ خۆی بەتەنیا هەندێ کاری کردووە و بە رۆنیۆ لە کەرکووك چاپی کردوون. هەر جەمال نەبەز لە هاوینی ١٩٥٦ سەردانی شام

دەكات، هەندێ لە ڕۆشنبیرانی دیاری ئەو سەردەمەی ئەوێ دەبینێ و ئەم باسەیان لەگەڵ دەكاتەوە بۆ دامەزراندنی ئەكادیمییەكی زمانەوانی[٣٦].

گۆڤاری (هەتاو)یش لەبن ناوی (یەكیەتی زمانی كوردی) زنجیرە وتارێكی بە پێنووسی جیاجیا بڵاوكردۆتەوە، یەكێك لەو نووسەرانە داوای "كۆمەڵی زمان – المعجم اللغوي" دەكات، هەرچەندە ئەو نووسەرە داوا لە دەوڵەت ناكات ئەو دەزگایە دروست بكات، بەڵكو "چەند مامۆستایەكی شارەزای زمانی كوردی لە جێگایەك كۆببنەوە بەناوی (كۆمەڵی زمان)"[٣٧].

نووسەرێكی دیكەش هەر لەو گۆڤارە بەناوی (ج) لە وتارێكیدا ئاماژە بە نەبوونی "گروهێكی زانستی تر مجمع علمی" دەكات[٣٨].

هەر د. جەمال نەبەز لەساڵی ١٩٥٧ نامیلكەیەك بۆ بڵاوكردنەوەی نووسینی كوردی لاتینی دەنووسێت، تێیدا بیروڕای خۆی و عوسمان سەبری ڕووناكبیری دیاری ڕۆژئاوای كوردستان لەمەڕ "كۆڕی زانستی كورد" نووسیوە، هەر لەو ساڵەدا (١٩٥٧)[٣٩]، نامیلكەی (خوێندەواری بەزمانی كوردی) چاپ كردووە و تێیدا باسی "كۆڕی زانستی زمانەوانی" بەشێوەیەكی فراوانتر خستووەتە ڕوو[٤٠].

داخوازی دامەزراندنی كۆڕی زانیاری كوردی داوایەكی لەمێژینەی زانا و ڕۆشنبیرانی كورد بووە و لەم ڕووەوە گۆڤار و ڕۆژنامەكان دەوری دیاریان هەبووە لە خستنەڕووی ئەم داوایە هەروەك لە سەرەوەش ئاماژەی پێكرا.

(محرم محمد امین) لە وتارێكی سەرەكیدا داوای (كۆكراوەیەكی زمانی – مجمع لغوي) دەكات و تێیدا ئاماژە بەوە دەكات كە دەستەیەك لە نووسەرانی كورد لە هەوڵ و كۆششدان بۆ خزمەتكردنی زمانی كوردی و بۆ نەهێشتنی گیروگرفتەكانی، بەڵام وەك دەڵێت: "لەبەرئەوەی هەركەسە خەریكی هەوڵی تاكەكەسی ڕای خۆی دەردەخات و ڕای جیاوازیان هەیە، بۆیە ئەمە پێویستی بە ڕێكخستنی كۆششی زاناكان هەیە كە لەو پەرش و بڵاوییە ڕزگاری بێت بۆیە پێیوایە بۆ ئەمە "كۆكراوەیەكی زمانی (مجمع لغوي) پێویستە بۆ یەكخستنی تواناكان"، پاشان دەڵێت: ئەم كارە لەگەڵ دەستوور و یاسای عێراق دەگونجێ و پەیوەندی بە سیاسەتەوە نییە"[٤١].

هەروەها نووسەرێکی دیکەش لە (بەدرە)وە لەژێر ناوی (پوختەکردنی زمانی کوردی)دا لە وەڵامی نووسەرێکی دیکەدا سەرباری باسکردنی هەندێ لایەنی گیروگرفتەکانی زمانی کوردی، داوای پێکهێنانی "کۆکراوەیەکی زمانی (مجمع لغوي)" دەکات(٤٢).

نووسەرێك لە ساڵی ١٩٥٨ لە ئینگلتەرە لەگەڵ باسکردنی بایەخی زمان بەگشتی و زمانی کوردیدا، داوای پێکهێنانی "کۆمەڵەیەکی پوختەکردن و بووژاندنەوە"ی لە زمانزانان و وێژەوانان و نووسەرانی کورد کردووە(٤٣).

لەدوای بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لە عیراق جەمال نەبەز لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی بیرخەرەوەیەکیان داوەتە وەزیری زانیاری کە یەکێك لە داواکانی دامەزراندنی (کۆڕێکی زمانەوانی) بووە(٤٤).

رێکخراوی یەکێتی قوتابیانیش کوردستان لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٥٨ یادداشتێکی داوەتە سەرۆکی وەزیران و وەزیری پەروەردە و فێرکردن، یەکێك لە خاڵە گرنگەکانی داوای فراوانکردنی کۆڕی زانیاری عێراق کردووە، تا بتوانێت شارەزایانی بواری رۆشنبیری کوردیش وەربگرن و بووژاندنەوەی کەلەپووری نەتەوەی کوردی و دەرکردنی گۆڤاری کۆڕ بە زمانی کوردی(٤٥).

نووسەرێکی زمانەوانیش دەڵێت: "هەتا کۆمەڵێکی زمانشوناس ( مجمع لغوي) لە کوردستانا دائەمەزرێ هەمووی ئەکا بەکوردی"(٤٦).

جارێکی دیکە (ژین) باس لە (مجمعێکی علمی بۆ زمانی کوردی) دەکات، لەسەر زاری د. جەمال حاجی شەفیق وەکیلی بەڕێوەبەری گشتی زانیاری خوێندنی کوردی بڵاوی کردۆتەوە، کە نیاز وایە مجمعێکی علمی بۆ زمانی کوردی لە سلێمانی دابمەزرێنن وەکو چۆن لە بەغدا مجمعێکی علمی بۆ زمانی عەرەبی هەیە، لەدواییدا (ژین) دەڵێت: "ئەمە بناغەیە بۆ چەسپکردنی خوێندنی زمان و ئەدەبی کوردی"(٤٧).

کۆنگرەی یەکەمی مامۆستایانی کورد لە شەقڵاوە لە رۆژانی ١١ – ١٣ی ئەیلوولی ١٩٥٩ بەسترا، لەو کۆنگرەیەدا یەکێك لە بڕیارەکانی لیژنەی زمان و ئەدەبی کورد دانانی کۆمەڵێکی زوبان (مجمع لغوي) بوو(٤٨).

لەلایەکی دیکەوە لە شێوەی پرسیاردا (ژین) دەپرسێت: "تەدوینی قانونی ئەڵێ (مجمعی) زمانی کوردی پێویست نییە.... بۆچی؟، ئەم پرسیارە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە بەپێی هەواڵی رۆژنامەکانی ئەو رۆژە دیوانی تەدوینی قانونی (رەفزی) ئەو نیزامەی کردووە کە نیاز بوو بەپێی ئەو نیزامە مجمعێك بۆ زمانی کوردی دابمەزرابایە"، کە وەك دەڵێت: "دەمێکە هەمووان بەتەمان. بەقسەی دیوانی ناوبراو مجمعێك بۆ (کورد) بەتەنیا پێویست نییە، چونکە مجمعێکی عێراقی هەیە کە دەکرێ بۆ کورد و زمانی کوردیش کاربکات، گوایە ئەمە بۆ پتەوکردنی یەکێتی نیشتمانی باشترە...!. لە بەدواداچوونیدا رۆژنامەی (ژین) رەخنە لەو دوانەی دیوانی ناوبراو دەگرێت و دەڵێت: ئەوانەی لەو دیوانە دانیشتون ئەگەر دیموکراسی بونایە ئەو بۆچوونەیان نەدەبوو، وەك مافێکی گەلی کورد هەقی خۆیەتی مجمعێکی هەبێت بۆ زمانەکەی، هەروەك چۆن بۆ زمانی عەرەبی هەیە، پاشان داوا دەکات ئەو مجمعە دابمەزرێت "چونکە زۆر پێویست و گرنگترین شتە بۆ کورد و زمانی کوردی"[٤٩].

هەروەها رۆژنامەی (ئازادی)یش پشتگیری خۆی بۆ رۆژنامەی (ژین) سەبارەت بە کۆڕی زانیاری عیراق و گەلی کورد دەربڕیوە[٥٠].

هەر لەو رووەوە رۆژنامەی (دەنگی کورد) لەو بارەیەوە دواوە، بەسەردێڕ نووسیویە: "کۆڕی زانیاری عیراق — کۆڕی عەرەبی و کوردییە؟؟!!"، تێیدا ئاماژە بەوە دەکات کە پێڕەوی ناوخۆی کۆڕی زانیاری عیراق بۆ زمانی کوردی دانراوە، بۆ خزمەتی زمان و ئەدەبی کوردی، کەچی دیوانی تەدوینی قانونی رای گشتی دووچاری سەرسامی کرد وەك دەڵێت، کاتێ رای خۆی دەربڕیوە و گوتوویەتی، لە عیراق کۆڕێکی زانستی عیراقی هەیە، هەردوو گەلی عەرەب و کورد بەشداری تێدا دەکەن، هەبوونی کۆڕی زانیاری کوردی پێچەوانەی یەکێتی عیراقە!!!! پێویست ناکات. کەچی کۆڕی زانیاری عیراق بەتەنیا لە خەمی زمان و ئەدەبی عەرەبیدایە و یەك دێڕیشی بە کوردی نەنووسیوە، وێڕای ئەوەش کە خەڵاتی بۆ نووسەرانی عەرەب تەرخان کردووە" بەڵام بۆ زمانی کوردی هیچی نەکردووە، ئەم دیوانە لایەنگیری و دەمارگیری پەیڕەو کردووە، کە رازی نەبوو کۆڕ بۆ کورد دابمەزرێت"[٥١].

هەروەها گۆڤاری (ڕۆژی نویٚ)ش سەروسۆراخی بڕیارەکەی (دیوانی تەدوینی قانونی) کردووە و لەژێر ناوی ئەم (پرسیارانە)دا نووسیویەتی: لە مانگی شوباتی ١٩٦٠ یاسایەك بۆ پێك هێنانی (مجمعی زمانی کوردی) دانراوە، بەڵام (تدوینی قانونی) لە بڕیارێکی دا گوتوویەتی: لە عێراقدا یەك مجمعی عیلمی هەیە کە بۆ کورد و عەرەبە، بۆیە پێویست ناکات مەجمعێکی تایبەتی بە زمانی کوردی دابنرێت، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە وەك (ڕۆژی نویٚ) نووسیویە مجمعی علمی عێراقی (خەڵاتی) بۆ نووسەرە عەرەبەکان داناوە بۆ زمان و ئەدەبی عەرەبی، کە دیارە پێشتر ڕۆژنامەی (ژین)یش چەوتی ئەو بڕیارەی دەرخستووە و لەو بارەیەوە نووسیویە.

هەر لەم بارەیەوە (ڕۆژی نویٚ) بە شێوەی پرسیار دەنووسێت: ئەگەر ئەو (مجمع)ـە بۆ کورد و عەرەبە بۆ تەنیا بۆ نووسەرە عەرەبەکان و زمانی ئەدەبی عەرەبی (خەڵاتی) داناوە، چۆن لەگەڵ بڕیاری (تدوینی قانونی) دەگونجیٚ، ئەو بڕیارە لەگەڵ مادەی (٣)ی دەستوری عێراق ڕاست و دروستە، ئاخۆ کورد نووسەر و زمان و ئەدەبی نییە؟[٥٢].

لە یادداشتێکی مامۆستایانی کورد وەك بەڵگەنامەی کۆنگرەی دووەمی مامۆستایانی کورد لە شەقڵاوە لە ساڵی ١٩٦٠، یەکێك لە داخوازییەکانیان لە برگەی (٧)دا، داوای دامەزراندنی (مجمع علمي لغوي) کراوە بۆ ئەوەی سەرپەرشتی ڕۆشنبیری کوردی بکات[٥٣]. هەروەها لە بڕیارەکانی لیژنەی زمانیش داوای پێکهێنانی کۆزمانێك دەکات بۆ دانانی ڕێنووسی زمانی کوردی و زاراوەی زانستی و دانانی فەرهەنگی زمانی کوردی و دەرکردنی گۆڤارێکی زانستی و وێژەیی و کۆمەڵایەتی[٥٤].

یەکێك لە بڕیارەکانی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردیش لە ئەوروپا کە لە ٢٢ تا ٢٦ی ئابی ١٩٦٠ لە بەرلین بەسترابوو، "دامەزراندنی کۆزمانێك بۆ لێکۆڵینەوەی گیروگرفتی زمان و خوێندەواری کوردی بە شێوەیەکی باش یەکلا بکرێتەوە"[٥٥].

نووسەرێك لە ڕۆژنامەی (صوت الاکراد – دەنگی کورد) لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٦٠/٩/١٨ داوای دامەزراندنی کۆڕی زانیاری دەکات، وەك نووسیویە: "گەلی کورد پێویستی بە کۆڕی زانیاری کوردییەوە هەیە"، کە وەك وتارێکی ناوازە لە گۆشەی (تحفة الیوم)دا لە لاپەڕەی یەکەمیدا بڵاوکراوەتەوە[٥٦].

رۆژنامەی (خەبات)یش بابەتی دامەزراندنی مجمعی علمی کوردی زۆر بە گرنگ زانیوە، بۆیە لە مانشێتێکی سەرووی تەرویسەی رۆژنامەکەدا نووسیویە: پێویستە دەستپێشخەری بۆ دامەزراندنی مجمعی عیلمی کوردی بکرێت، پاشان لە سەروتاردا بە سەردێڕی "چی لە راسپاردەکانی کۆنگرەی مامۆستایانی کورد کرا مەجمعی علمی کوردی"دا نووسیویە: سەرەتا باس لە بایەخدانی گەلی کورد بە بەستنی هەردوو کۆنگرەی مامۆستایانی کورد بەئاشکرا دەکات لە ئەیلولی ١٩٥٩ و ١٩٦٠، وەك رووداوێکی گرنگ لە مێژووی گەلی کورد، کە پێشتر نموونەی لە مێژووی گەلی کورددا نەبووە، لەوەتەی دەوڵەتی عێراق دامەزراوە، لەڕووی بایەخدان بە لایەنێکی مافەکانی گەلی کورد بەپێی دەستووری کۆماری عێراق بۆ گەشەکردنی رۆشنبیری کوردی، بەڵام وادیارە ئەو راسپاردانەی لەو کۆنگرانەدا کراون جێبەجێ نەکراون و هەروەك مەرەکەبی سەر کاغەز ماونەتەوە، وەك ئەوەی کە کۆنگرەش نەبەسترابێت، لەو رووەوە (خەبات) وەك دەڵێت بە ئەرکی خۆی دەزانێت ئەو راسپاردانە بەبیر لایەنی پەیوەندیدار بهێنێتەوە: سەبارەت بە خوێندنی کوردی، دواتر دەنووسێت. بەڵام ئەوەی کە شایەنی دواخستن و فەرامۆش کردن نییە، دامەزراندنی (مجمعی علمی کوردی)یە ئەو دەزگایەی کە کۆنگرە چەندین ئەرك و داخوازی خستۆتە سەر شانی، بەبێ ئەو دەزگایە خوێندن، رۆشنبیری کوردی گەشەکردن و پەرەسەندن بەخۆیەوە نابینێت، بۆیە دامەزراندنی کارێکی زۆر پێویستە، تەنانەت ئاماژەی بەوەش کردووە، ئەگەر بارودۆخ تواناکان فەراهەم نابن بۆ دامەزراندنی بەسەربەخۆیی، ئەوا با لە ناو مجمعی علمی عراقی دابێت کە ئێستا هەیە(٥٧).

ئەو بایەخدانەی (خەبات) نیشانەی گرنگی ئەو دەزگایەیە بۆ خزمەتکردنی زمان و ئەدەب و مێژووی کوردی.

لە بەدواداچوونی زیاتردا (ژین) لە رۆژی ١٩٦١/١/٣٠ بەسەرناوی "مجمعیکی عیلمی بۆ زمانی کوردی بۆچی پێویستە؟" دەنووسێت: لەبەر باری نالەباری گەلی کورد هەتا ئێستا هیچ بایەخێك بە زمانی کوردی نەدراوە، لەرووی دانانی رێزمان و زاراوە، بۆیە داوا دەکات لەبەر ئەو هۆیانە و زۆر هۆی دیکە، مجمعێکی عیلمی دابمەزرێت، ئەمە وەك مافێکی ئاسایی زانیاری خزمەت بە کۆمار دەکات و دەبێتە

هـۆی پتـەوکردنی برایـەتی کـورد و عـەرەب و بـەهێزکردنی یـەکێتی نیشـتمانی. سـەرباری ئـەوە، وەك دەڵێـت: مجمـع عیلمـی عیراقـی بـۆی نـاکرێ ئـەو ئەرکـە رابپەڕێنێت، چونکە تا ئێستا هیچی بۆ زمـان و ئـەدەبی کـوردی نـەکردووە. بۆیـە دامەزراندنی ئەو مجمعە بۆ زمانی کوردی زۆر بە پێویست دەزانێت[٥٨].

رۆژنامەی (پێشکەوتن) زۆر بـە پـەرۆش و بـە درشـتی لـە لاپـەڕەی یەکـەمی رۆژی ١٩٦١/٤/٣ دەنووسێت: "میللەتی کورد چی ئەوێ؟ بـوونی مجمعـی لغـوی و علمـی بـۆ کـورد شـتێکی زۆر زۆر پێویسـتە". لـە بەشـێکی وتارەکـەدا نووسـیویە: "....ئەگەر بێتوو مجمعێکی لغوی (بۆ زبان)ی تایبەتی نەبێت کە هەموو شـارەزا و بوێژ و زمانزانەکانی کورد کۆبکاتەوە بـۆ ئـەوەی بەیارمـەتی یـەکتر بتـوانن هـەموو گیروگرفتێکی زبانی کوردی لەناوببەن و ڕێگایەکی راسـت دابنـێن بـۆ پێشخسـتن و بووژاندنەوەی زبان و وێژەی میللەتی کورد"[٥٩].

نووسـەرانی کـوردیش بەپەرۆشـەوە داوای دامەزرانـدنی کـۆڕی زانیارییـان کردووە، لەوانە (باوکی تەنیا) داوای دامەزراندنی "کۆزمانێکی کـوردی" کـردووە و پێی وایە تا ئـەو کۆزمانـە پێـك نـەهێنرێ شـێوەکانی زمـانی کـوردی یـەك نـاگرن. هەروەها دوای ئـەوەی گلـەیی جێبـەجێ نـەکردنی بڕیارەکـانی هـەردوو کـۆنگرەی مامۆستایانی کورد لە شەقڵاوە لە ساڵانی ١٩٥٩ و ١٩٦٠ دەکات، کە "هـەر لەسـەر کاغەز مانەوە" پاشان دێتە سەر هۆکانی دامەزراندنی دواتـریش هەنـدێ مـەرج بـۆ ئەم کۆزمانییە دیاری دەکات، کە وەك دەزگایەکی رەسمی بێـت و بودجـەی خـۆی هەبێت و دەسەڵاتی تەواوی بڕیاردانی هەبێت، جێبەجێ بکرێ و هەر کتێب و گۆڤار و رۆژنامەیەك چاپ بکرێت، دەبێ لە بن تیشکی بڕیارەکانی ئـەو کۆزمانییـە بێـت و بتوانێت رێنووس و چۆنیەتی یەکگرتنەوەی شێوەزارەکانی چارەسەر بکات[٦٠].

لـەبارەی داخـوازی رۆڵـەکانی نەتـەوەی کـورد بـۆ دامەزرانـدنی کـۆڕ وەك داوایـەکی جـەماوەری، ئـەوەتا قوتابییـەك لـە هـەولێرەوە لـە رۆژگـاری دوای ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لەگەڵ "ئاواتی قوتابیانی کوردستان" کە بە خاڵ دیاری کـردووە، لە خاڵی (٣)یەمیدا داوای کردووە "مجمەعێکی علمی کوردی بکرێتەوە"[٦١].

رۆژنامـەی "ژیـن" جـارێکی دیکـەش دێتـەوە سـەر بۆچـوونەکەی "دیـوانی تەدوینی قانونی" و لەژێر ناوی "دیـوانی تـەدوینی قـانونی شـتێك ئـەڵێ و مجمعـی

علمی عراقی شتێکی تر....!"، تێیدا ئاماژە بەوە دەکات کە "دوای ئەوەی هەموو بە پەرۆشەوە لە چاوەڕوانی بڕیاری دامەزراندنی (مجمعێکی علمی بۆ زمانی کوردی)دا بووین بۆ ئەوەی هاوشانی مجمع علمی عیراقی بڕوات بۆ خزمەتکردنی زمانی کوردی و پێشخستنی، کەچی لەپڕ دیوانی تەدوینی قانونی بڕیارێکی دەرکردووە کەوا نابێت مجمعێکی علمی بۆ زمانی کوردی دابمەزرێت چونکە مجمعی علمی عیراق هەیە بۆ زمانی کوردی و عەرەبی کار دەکات، دامەزراندنی زیان لە یەکێتی نیشتمانی دەدات". بۆیە (ژین) ڕەخنە لە بڕیارەکەی دیوانی ناوبراو دەگرێ و دەڵێت: "ئەو بڕیارە دەبێتە مایەی دووبەرەکی و زیان گەیاندن بە یەکێتی نیشتمانی، لەبەرئەوەی ماف کورد فەرامۆش دەکات". پاشان پرسیاری ئەوە دەکات کە "مجمع علمی عیراقی هەتا ئێستا چی بۆ زمانی کوردی و خزمەتکردنی کردووە، ئینجا ئەپرسێ ئێمە نازانین ئەو – مجمعي علمي عيراق –ە گوێ بە خزمەتکردنی زمان و ئەدەبی کوردی ناکات، واتە پەیڕەوی لە بڕیارەکانی دیوانی تەدوینی قانونی ناکات، یان ئیشی ئەو مجمعە ئەوە نییە کە خزمەتی زمانی کوردی بکات!، بۆیە دەپرسێ ئێمە نازانین کامیان ڕاست دەکات؟ نەك هەریەکەو قسەیەك بکات!، دیارە ئەمە زیان بە یەکێتی نیشتمانی دەگەیەنێ، نەك دامەزراندنی مجمعێکی علمی بۆ زمانی کوردی"[٦٢].

هەر (ژین) لە بەدواداچوونێکی دیکەدا جارێکی دیکەش هاتووەتەوە سەر ئەو بابەتە و بە سەرناوی (مجمعی عیلمی عیراقی پێویستە گوێ بداتە زمان و ئەدەبی کوردیش)، تێیدا وێڕای ئاماژەکردن بەو خزمەتەی بە زمان و ئەدەبی عەرەبی کردووە، داوا دەکات ئاوڕێکیش لە زمان و ئەدەبی کوردی بداتەوە، هەروەك پارەکەش دیوانی تەدوینی قانونی بڕیارێکی لەو بارەیەوە دەرکردبوو. بایەخ بە زمان و ئەدەب بدات و خزمەتیان بکات بۆ بووژاندنەوەیان، بۆیە داوا لەو مجمعە دەکات کە وەك ئەرکی سەرشانیان خزمەت بە زمان و ئەدەبی کوردیش بکەن و بەرپرسیاریەتی مێژووییشیان دەخاتە ئەستۆ[٦٣].

یەکێك لە بڕیارەکانی کۆنگرەی چوارەمی نەقابەی مامۆستایان لە کۆماری عیراق کە لە ٩-١٣ی شوباتی ١٩٦٢ بەستراوە، – واتە دوای ئەوەی بارودۆخ گۆڕا و بەهۆی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ – ئەوا لە لیژنەی دیراساتی کوردیدا (١٤) بڕیار

نووسـراوە، لـە خـاڵی (١٠)دا دەڵـێ: "رادەسـپێرێ کـە کـۆڕی زانیـاری کـورد دانەمـەزرێت چـونکە کـۆڕی زانیـاری عـێراق هەیـە و هـەمووانی لـەخۆ گرتـووە و بڕیارەکانی لیژنـەی دیراسـاتی کـوردی کۆنگرەی سـێیەمی مامۆسـتایان مـەحکوم دەکەین لەو بارەیەوە..."[٦٤].

رۆژنامەیەکی دیکەی ئەو سەردەمە لە سەروتاری خۆیدا بـەناوی "پێویسـتە بەخێرای[ی] کۆڕی زانیاری کورد دابمەزرێت" خوازیاری دامەزراندنی کۆڕە[٦٥].

ئەمـە ئـەوە دەردەخـات تـا چـەند دەسـەڵات ترسـی لـە وشـەی کـورد و کوردسـتان هـەبووە، تەنانـەت لـە بـواری رووناکبیریشـدا و هـەر لـە رۆژگـاری پاشایەتیشەوە دان بە زمانی کوردی نرابوو، چ جای رۆژگاری کۆماری..!

**دامەزراندن:**

د. جەمال نەبەز لەو نامیلکەیە سەرەتا لـە باسـکردنی هەوڵـەکانی خـۆی لـە پەنجاکاندا، هەوڵی دامەزراندنی "کۆڕێکی زانستانەی زمانەوانی" داوە، کە کۆڕیش وەك خۆی دەڵێت لە ساڵی ١٩٦٩ دامـەزرا، ئـەوا ئاواتەکـەی هاتووەتـە دی، بـەڵام وەك پێویسـتە وا دانەمـەزراوە، چـونکە بـەهۆی بـاری سیاسـی سـاڵانی ١٩٧٠ – ١٩٧٤، ئەوانـەی سـەروکاری ئـەو دەزگایـەیان خرایـە بەردەسـت لەوانـەبوون "بەدرێژایی ساڵان لە تەڕ خواردیان و لە وشك نووسـتن"[٦٦]، واتـە کەسـانی شـیاو نەخراونەتە ئەو شوێنە گرنگە.

دامەزرانـدنی کـۆڕی زانیـاری کـورد یەکـەمجار وەك جێبـەجێکردنی مـادەی شەشـەمی بەیاننامـەی ٢٩ی حـوزەیرانی ١٩٦٦ بـوو، کـە بڕیـاری ژمـارە (٣٥)ی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش (عێراق) بوو لـە رۆژی ١٩٦٨/٨/٣ دەریکـردووە و بـەپێی بـەیانی ژمـارە (٣٧)، ١٩٦٨/٨/٤، بڕیـاری ژمـارە (٥٨)ی ئەنجوومـەنی سەرکردایەتی شۆڕشی (عێراق) لە ١٩٦٨/٨/٤ بڵاوی کردووەتەوە[٦٧].

سـەبارەت بـە دامەزرانـدنی کـۆڕی زانیـاری کـورد، د. ئەحمـەد عوسمـان ئەبوبەکر (١٩٣٠ – ٢٠١٤) (ئاماژە بەوە دەکـات کـە بیرۆکـەی دامەزرانـدنی کـۆڕی زانیاری هەر لە سەرەتای شەستەکانەوە لە هزریدا خولاوەتەوە، بـەڵام لـە کۆتـایی سـاڵی ١٩٦٩ پێشـنیاری بـۆ د. ئیحسـان فوئـاد (١٩٣٥ – ٢٠١٠) کـردووە، کـەوا

پەیوەندی بە شێخ محەمەدی خاڵ (۱۹۰۰ – ۱۹۸۸)ەوە بکات و خۆشی پەیوەندی بە د. ئەوڕەحمانی قاسملوو (۱۹۳۰ – ۱۹۸۸) و د. بەدرخان سندییەوە بکات کە یەکەمین دانیشتنی هەر پێنجیان لە هۆڵی ئیبن هەیسەم بووە لە کۆلێژی پەروەردەی پێشوو لە بەغدا، سەبارەت بە دامەزراندنی کۆڕ گفتوگۆیان کردووە و وێنەیەکی فۆتۆگرافیشیان بەو بۆنەیەوە گرتووە. دوای ۱۱ی ئاداری ۱۹۷۰ کۆبوونەوەیەکی فراوانتریان هەر لەو شوێنە کردووە و ئەمانە بەشداربوونە: عەلائەدین سەجادی، د. پاکیزە رەفیق حیلمی، عەبدوڕەحمان هەژار. لێرەش گفتوگۆ و پێشنیازی پێویست کراوە، د. ئەحمەد و د. ئیحسان کارەکەیان داوەتە ئەوانی دیکە لە ئامادەبووان، تا ئەوەی کۆڕ دامەزراوە، "خەڵکانی دیکە تێیدا بوونەتە ئەندام کە پێشتر لە دوو کۆبوونەوەکە ئامادە نەبوونە، بەڵام دەڵێت: هەرپێمان خۆش و باش بوو، دەستپێشخەرییەکی باش بوو بۆ خزمەتکردنی هەموو چالاکییە رۆشنبیرییەکان کە بۆ ماوەیەکی درێژی خایاند و هەردووکیان [واتە د. ئەحمەد و د. ئیحسان] بوونەتە ئەندامی هاریکار"(٦٨).

لە ۳ی نیسانی ۱۹۷۰ ژمارەیەك نووسەر و رووناکبیری کورد لە هەموو شار و ناوچەکانی کوردستان لە یانەی کۆلێژی زانکۆی بەغدا کۆبوونەتەوە، بەمەبەستی دانانی بەردی بناغەی ((ئەکادیمیەی زانستی کورد))، دوای گفتوگۆ و گۆڕینەوەی بیروڕا، بڕیاریان داوە بە دەنگدانی نهێنی لیژنەیەك هەڵبژێرن بۆ دانانی ((دەستووری ئەکادیمیەی زانستی کوردی)) و ئەنجامی هەڵبژاردنەکەش بەم شێوەیە بووە:

| ناوی ئەندام | ژمارەی دەنگ |
|---|---|
| ١– د. پاکیزە رەفیق حیلمی | ٢٥ |
| ٢– عەبدولڕەحمان هەژار | ٢٣ |
| ٣– د. مارف خەزنەدار | ٢٣ |
| ٤– شێخ محەمەدی خاڵ | ٢١ |
| ٥– د. ناجی عەباس | ٢١ |
| ٦– کامیل بەسیر | ٢١ |
| ٧– سادق بەهائەدین | ٢١ |

٨- د. ئیحسان فوئاد ٢٠
٩- حوسین ڕەشوانی ٢٠

ئەم لیژنەیە چەند کۆبوونەوەیەکی تایبەتییان کردووە و دەستووری ئەکادیمیەی زانستی کوردییان ئامادەکردووە و داویانەتە وەزارەتی کاروباری ژووروو [باکوور] بۆ پەسەندکردنی لەلایەن حکومەتەوە[٦٩].

د. مارف خەزنەدار (١٩٣٠ - ٢٠١٠) نووسیویە: کاربەدەستانی دەوڵەتی عیراق دەمێك پێش بەیانی ١١ی مارت بەڵێنی دامەزراندنی ئەم دەزگایەیان دابوو، بڕیارەکە دەستاودەست دەکرا، لەپاش ١١ی مارت بڕیارەکە پێشکەش بە سەرۆکایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان کرا. دوای هەڵبژاردن چەند کۆبوونەوەیەکیان کردووە و "دەستووری کۆڕی زانیاری کورد"یان بە بژارکراوی و پوختی داوەتە وەزارەتی کاروباری باکوور کە محەمەد مەحمود عەبدولڕەحمان (سامی) (١٩٣٣ - ٢٠٠٤) وەزیر بوو، بەبێ دەسکاری پڕۆژەکە بڕیاری لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق وەك قانون لە ڕۆژنامەی فەرمی (الوقائع العراقية) بڵاوکراوەتەوە[٧٠].

ئیدی لە ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠دا ئاماژە بە دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد (مجمع علمی کردی) کراوە[٧١]. وەك بایەخی دانانی ئەم کۆڕە، هاوکاری لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکە ئاماژە بە هەواڵی دامەزراندنی دەکات و دەنووسێت: "وەزیری کاروباری سەرەوە [باکوور] باسی گرنگیی بڕیاری دانانی کۆڕی زانیاری کورد ئەکا"[٧٢].

ئەوەبوو ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی - عیراق، بڕیاری ژمارە (١٨٣)ی ساڵی ١٩٧٠ی دەرکرد، کە تایبەتە بە قانونی کۆڕی زانیاری کورد (المجمع العلمي الكردي)، ئەو قانونە لە (٢٥) مادە پێکهاتووە، تێیدا ئامانج و پێکهاتەی کۆڕی دیاری کردووە. لە هۆی دەرکردنی ئەم بڕیارەدا هاتووە هەروەك چۆن دەستووری کاتی دانی بە مافە نەتەوەییەکانی کورد لە ناو چوارچێوەی عیراقدا ناوە، بۆیە بە مەبەستی بایەخدان بە زمان و ئەدەب و کەلەپووری هزری و شارستانی کورد، بەپێویست زانرا کۆڕی زانیاری کوردی دابمەزرێت و ئەو ئەرکە لە

ئەستۆ بگرێت و پەیوەندی لەگەڵ کۆڕی زانیاری عیراق و دام و دەزگا زانستی و زمانەوانی و رۆشنبیرییەکانی وڵاتانی عەرەبی و هی دیکە پتەو دەکات[٧٣].

لە مادەی یەکەمدا دەڵێت: لە کۆماری عیراق کۆڕێك پێکدێت بەناوی (کۆڕی زانیاری کورد) دەبێتە لکی کوردی کۆڕی زانیاری عیراق و دەستەیەکی سەربەخۆی خاوەن کەسایەتی حەکەمی و سەربەخۆیی دارایی دەبێت و دیوانی سەرۆکایەتییەك بەڕێوەی دەبات و وەزیری پەروەردە و فێرکردن لە بەرامبەر لایەنە پەیوەندیدارەکان نوێنەرایەتی دەکات"[٧٤].

لە مادەی سێیەمی یاساکەدا ئامانجەکانی کۆڕ بەم جۆرە خراونەتە روو:

أ- پەرەدان بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستی لە عیراق بۆ ئەوە لەگەڵ ڕێڕەوی پێشکەوتنی زانستی بڕوات.

ب- پارێزگاریکردن لە سەلامەتی زمانی کوردی و کارکردن بۆ گەشەپێدانی.

ج- زیندووکردنەوەی کەلەپووری کوردی و ئیسلامی لە زانستەکان و ئەدەب و هونەر.

د- بایەخدان بە لێکۆڵینەوەی مێژووی عیراق و شارستانیەتی بەشێوەیەکی گشتی و ناوچە کوردییەکان بەشێوەیەکی تایبەتی.

هـ- بڵاوکردنەوەی توێژینەوەی رەسەن و هاندانی وەرگێڕان و دانان لە زانست و ئەدەب و هونەردا.

لە مادەی چوارەمدا دەڵێت: کۆڕ بەو ئامرازانەی خوارەوە ئامانجەکانی جێبەجێ دەکات:

أ- دانانی فەرهەنگی زمانەوانی و زانستی.

ب- دەرکردنی گۆڤار و بڵاوکراوە.

ج- بڵاوکردنەوەی کتێب و بەڵگەنامە و دەقی کۆن.

د- پتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵ کۆڕی زانیاری عیراق و کۆڕ و دەزگا زانستی و زمانەوانی و رۆشنبیرییەکان لە وڵاتانی عەرەبی و هی دیکە.

هـ- بەخشینی خەڵات بە توێژەر و زانا و ئەدیبە دیارەکان.

و- یارمەتیدانی دارایی بۆ توێژەران و دانەران و وەرگێڕان.

ز- داواکردن بۆ دانان و وەرگێڕان لەو بابەتانەی کۆڕ دیارییان دەکات.

ط- دامەزراندنی کتێبخانەی کۆڕ و گەشەپێدانی.

ح- گرتنی کۆڕ بۆ لێکۆڵینەوە[٧٥].

مادەی پێنجەم دەڵێت: کۆڕ دەتوانێت کۆنگرەی زانستی و ئەدەبی ببەستێ و بەپێی ئەو یاسایە ئاهەنگ بگێڕێت و بەشداری لە کۆنگرە زانستی و ئەدەبییەکاندا بکات و ئەندامەکانی بۆ ئەو کۆنگرانە دیاری دەکات تا نوێنەرایەتیان بکات، هەروا دەتوانێ شاندی زانستی و توێژینەوەش بنێرێت[٧٦].

لەبارەی پێکهاتەی کۆڕەوە لە مادەی شەشەمدا دەڵێت کۆڕ لەمانە پێکدێت:

أ- پێنج ئەندامی کارا.

ب- دە ئەندامی تەرخانکراو.

ج- ئەندامانی شەرەف.

د- ئەندامانی یارمەتیدەر (هاریکار)[٧٧].

لەبارەی مەرجەکانی ئەندامی کارای کۆڕ، دەبێ ئەندامی کۆڕ عیراقی بێت و تەمەنی لە ٣٠ساڵ کەمتر نەبێت، شارەزاییەکی باشی لە رێزمانی زمانی کوردیدا هەبێت و دەبێ لانی کەم یەکێك لەو سیفەتانەی لێ بێتە دی:

١- شارەزاییەکی فراوانی لە یەك لك یان پتری لە لکەکانی زانست و بەرهەمهێنانی رەسەندا هەبێت.

٢- زانینی زمانی کوردی و شارەزایی لە زمانێکی زیندوو یان کۆنیشدا هەبێت و توانای دیاریکردن و هەڵبژاردنی زاراوەی هەبێت.

بۆ ئەندامانی هاریکاریش دەبێ شارەزایی باشی لە رێزمانی زمانی کوردیدا هەبێت و شارەزایی زۆری لە یەکێك لە لکەکانی زانستدا هەبێت.

بۆ ئەندامی شەرەفیش، دەبێ لەوانە بێت خزمەتی گەورەی بە زانست کردبێت و لە لایەن یەکێك لە ئەندامانی کارای کۆڕ دەپاڵێورێت بە رەزامەندی زۆرینە لە دانیشتنێکی دروستدا، لە سێیەکی ئەندامانی کارا ئامادەبن[٧٨].

بەپێی یاسای ناوبراو ئامانجەکانی کۆڕ خۆی لە پەرەپێدانی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستی لە عیراق لەگەڵ رەوتی پێشکەوتنی زانستی بڕوات و پاراستنی سەلامەتی زمانی کوردی و گەشەپێدانی بۆ ئەوەی لەگەڵ داخوازی زانست و ئەدەب و هونەرەکاندا بێت و بووژاندنەوەی کەلەپووری کورد و ئیسلام لە

زانستەکان و ئەدەبیات و هونەر و بایەخدان بە لێکۆڵینەوە لە مێژووی عیراق و شارستانییەتەکەی بەگشتی و ناوچە کوردییەکان بەتایبەتی، هەروەها بڵاوکردنەوەی توێژینەوەی رەسەن و هاندانی وەرگێڕان و دانان لە زانستەکان و ئەدەبیات و هونەر. بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەش کۆڕ ئەو رێگایانە دەگرێتە بەر، دانانی قامووسی زمانەوانی و زانستی و دەرکردنی گۆڤار و بڵاوکراوە و بڵاوکردنەوەی کتێب و بەڵگەنامە و دەقی کۆن و پتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵ کۆڕی زانستی عیراق و کۆڕ و دامودەزگا زانستی و زمانەوانی و روناکبیرییەکان لە وڵاتانی عەرەبی و شوێنانی دیکە و بەخشینی خەڵات بە زانا و توێژەر و ئەدیبانی دیار و گێڕانی کۆڕ و دامەزراندنی کتێبخانەی کۆڕ و گەشەپێدان و بایەخدان بە کاروباری چاپ.

بەپێی مادەی پێنجەمیش کۆڕ دەتوانێ کۆنگرەی زانستی و ئەدەبی ساز بدات و لە سنووری یاسای کۆڕیشدا ئاهەنگ بگێڕێت و بەشداری کۆنگرە زانستی و ئەدەبییەکان بکات و ئەندامانی خۆی بە نوێنەرایەتی کۆڕ بنێرێت بۆ مەبەستی زانستی یا توێژینەوە[٧٩].

سەبارەت بە پێکهاتەی کۆڕ لە مادەی شەشەمدا بەم شێوەیە دیاری کراوە، پێنج ئەندامی کارای تەرخان و دە ئەندامی ناکارا و ئەندامانی شەرەف و یاریدەدەر، بەپێی مادەی حەوتەمیش مەرجی ئەندامی کارا لە کۆڕ دەبێ عیراقی بێت و تەمەنی لە سی ساڵ کەمتر نەبێت و شارەزاییەکی باشی لە رێزمانی زمانی کوردیدا هەبێت و لای کەم یەك لەو سیفەتانەی تێدا بێت: شارەزاییەکی فراوان لە لکێك یان پتر لە لکەکانی زانستی و زانینی زمانی کوردی و شارەزابوون لە زمانێکی بیانی یان کۆن و توانای هەڵبژاردن و دیاریکردنی زاراوەشی هەبێت. لە مادەی هەشتەمیشدا باس لە چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەندامی کارای کۆڕ دەکات وێڕای سیفاتی تایبەتی دوای هەڵبژاردنی فەرمانی کۆماری پێ دەردەچێت[٨٠].

بەپێی مادەی هەشتەمیش کۆڕ دەتوانێت دە گەورە زانا و هزرڤانی کورد بکاتە ئەندامی کارا، مادەی نۆیەمیش بۆ چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەندامی یاریدەدەر تەرخان کراوە، مادەی یازدەیەم لە پڕکردنەوەی شوێنی ئەندامی کارا و مادەی دوازدەیەمیش باس لە ئەرکی ئەندامی کارا دەکات[٨١].

مادەی سێزدەیەم تایبەتە بە دەستەی دیوانی ئەنجومەنی كۆڕ كە لە سەرۆك و دوو جێگر و دوو ئەندامی كارا پێكدێت، هەروەها چۆنیەتی هەڵبژاردنی دەستەی سەرۆكایەتی كۆڕی زانیاری عێراق و كۆڕی زانیاری كورد لە نێو ئەندامانی كۆڕ بە دەنگدانی نهێنی و بۆ ماوەی سێ ساڵ دەكرێ دووبارە ببێتەوە. ئەو دەستەیەش دەسەڵاتی بڕیاری پێویست و گونجاوی هەیە بۆ پێشخستنی كۆڕ[٨٢].

مادەی چواردەیەمیش باس لە دەسەڵاتی سەرۆك دەكات لە دامەزراندن و خەرجكردنی پارە و پوول بەپێی یاسای كارپێكراو. لەكاتێ كە سەرۆك ئامادە نەبێت، جێگری یەكەم شوێنی دەگرێتەوە، ئەگەر ئەویش ئامادە نەبوو ئەوا جێگری دووەم شوێنی دەگرێتەوە، ئەگەر ئەویش ئامادە نەبوو بەتەمەنترین ئەندام شوێنی دەگرێتەوە[٨٣].

بەپێی مادەی پازدەیەمیش كۆڕ ئەمینداری گشتی دەبێت، لەگەڵ دیاریكردنی ئەركەكانی، لە مادەی شازدەیەمیشدا ئەركەكانی دیوانی سەرۆكایەتی دیاری دەكات لەڕووی بودجە و لایەنی داراییەوە. مادەی حەڤدەیەمیش باس لە لیژنەكانی كۆڕ دەكات بۆ هەر لكێك لە لكەكانی زانست، ئەو لیژنانەش هەمیشەیی و كاتی دەبن. لە مادەی هەژدەیەمیشدا باس لە دانیشتنەكانی كۆڕ دەكات كە دەبێ یەكەمین دانیشتنی لە نیوەی یەكەمی مانگی تشرینی یەكەمدا بێت و مانگانە دووجار كۆدەبێتەوە و پشووی كۆڕ لە تەمموز و ئەیلولدا دەبێت[٨٤].

مادەی نۆزدەیەم لە (نصاب)ی ئەنجومەنی كۆڕ دەدوێت كە دەبێ نیوە زیاتر بن. مادەی بیستەمیش باسی یادداشتی دارایی سەرۆك و ئەندامانی كۆڕ و هاوكارانی دەكات و مادەی بیست و یەكەمیش باسی بودجەی كۆڕ دەكات كە سالانە لە دەوڵەت وەریدەگرێت، لەگەڵ داهات و كۆمەك و باربوكردنی.

مادەی بیست و دووەمیش لە چۆنیەتی دیاریكردنی ئەندامانی كۆڕ دەدوێت، لە بڕگەی (١) دەبێ لە ماوەی شەش مانگ كۆڕ سێیەكی ئەندامەكانی دیاری بكات و لە بڕگەی دووەمیشدا دەسەڵات دراوەتە وەزیری پەروەردە و فێركردن و وەزیری كاروباری باكوور بۆ دیاریكردنی پێنج ئەندامی كارا كە مەرجەكانی ئەندامی كارایان تێدابێت، ئەو پێنجەش پێنجی دیكە هەڵدەبژێرن و دەدرێتە وەزیری پەروەردە و فێركردن بۆ ئەوەی فەرمانی كۆماری پێ دەربچێت، دوای دوو

هەفتە لە دەرچوونی فەرمانی كۆماری، وەزیری پەروەردە و فێركردن داوایان لێ دەكات كۆببنەوە بۆ هەڵبژاردنی دیوانی سەرۆكایەتی[(٨٥)].

سەبارەت بە هۆكاری دەرچوونی ئەو یاسایە دەڵێت كەوا بەپێی دەستووری كاتی داننراوە، بەمافە نەتەوایەتییەكانی هاونیشتمانیانی كورد لەناو چوارچێوەی عێراقدا، بەمەبەستی بایەخدان بە زمان و ئەدەب و كەلەپووری هزری و ژیاری كوردی، بەپێویست زانرا كۆڕێكی زانستی كوردی دابمەزرێت[(٨٦)].

دوای ئەو یاسایە، یاسای هەمواری یەكەمی یاسای كۆڕی زانیاری كورد بە ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٧٢ بۆ یاسای ژمارە (١٨٣)ی ساڵی ١٩٧٠ دەرچوو، تێیدا هەندێ لە مادە و بڕگەكانی هەمواركرا و لە هۆی هەمواركردنیشی نووسراوە بەمەبەستی رەخساندنی بوار بۆ كۆڕی زانیاری كورد بۆ ئەوەی لەگەڵ پەرەسەندنە هزری و زانستییە نوێیەكاندا بێت و رووناكبیران و زانایان بەشداری هاوبەشیان لە كارەكانی كۆڕ و فراوانكردنی لیژنەكانی و رەخساندنی بارودۆخی گونجاو بۆ ئەوەی كارەكانی بە ئاسانی و ئەركە زانستی و ئەدەبییەكانی سەرشانی جێبەجێ بكات ئەم بڕیارە دەرچووە[(٨٧)].

لە مادەی یەكەمی یاسا هەمواركراوەكەدا خاڵێكی بۆ دامەزراندنی كتێبخانە و چاپخانەی كۆڕ دیاریكردووە و لە مادەی دووەمدا دەستكاری مادەی شەشەم كراوە و ژمارەی ئەندامانی كۆڕی كارا و ناكارا و تەرخان كراوەتە پازدە ئەندام[(٨٨)].

– بە مەبەستی كارئاسانی بۆ ئەركەكانی كۆڕ، بە یاسای ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٧٢، یەكەم دەستكاری یاسای كۆڕی زانیاری كورد هەندێك دەستكاری یاساكەی كراوە. ئەنجومەن و لیژنەی یاسا و پێڕەوی ناوخۆی كۆڕیان داناوە كە لە پەنجا بەند پێكهاتووە و كاروباری زانستی و كارگێڕی كۆڕی زانیاری كوردی تێدا دیاری كردووە[(٨٩)].

كۆڕی زانیاری كورد دوای دەرچوونی هەمواری یەكەم ئەنجومەنی كۆڕ لە دانیشتنی رۆژی ١٩٧٢/٨/٩ پێڕەوی ناوخۆی كۆڕی زانیاری كوردی دەركردووە كە لە (١١٠) بەش و (٥٠) مادە پێكهاتووە. لەو پێڕەوەدا لە بەشی یەكەم لە ئەندامەتی لە كۆڕ دەدوێت و تێیدا ژمارەی ئەندامانی كۆڕ بە (١٥) ئەندام كە

(٥)یان كارا بن لەگەڵ ئەندامانی شەرەف و هاریكار دیاریكردووە. هەروەها كار و ئەرك و مەرجەكانی و چۆنیەتی هەڵبژاردنی دیاری كراوە. لە بەشی دووەمدا دەستەكانی كۆڕ و دەسەڵاتەكانیان دیاریكراون كە پێكهاتووە لە دەستەی گشتی و ئەنجوومەنی كۆڕ و دیوانی سەرۆكایەتی لەگەڵ وردەكاری پێكهاتە و ئەرك و كارەكەیان دیاری كراوە. لە بەشی سێیەمدا ئەركەكانی سەرۆك و ئەمینداری گشتی و دەسەڵاتەكانیان دیاری كراوە. بەشی چوارەمیش لە لیژنەكانی كۆڕ دەدوێت و ژمارەی ئەندامانی لیژنە و ژمارەی لیژنەكان كە نۆ لیژنەی پسپۆڕ و هەمیشەیین. لە بەشی پێنجەمدا بۆ بودجە و ژمێریاری كۆڕ تەرخان كراوە. بەشی شەشەمیش تایبەتە بە كتێبخانە و چاپخانە و بەشی حەوتەمیش بۆ گۆڤار و چاپكراوەكان و زیندووكردنەوەی كەلەپوور تەرخان كراوە. بەشی هەشتەمیش خواستن (الاعارة)ی فەرمانبەر لە فەرمانگەكانی دەوڵەت و بەشی دەیەم (راستییەكەی نۆیەم) ئەحكامی گشتین[٩٠].

بۆ دامەزراندنی كۆڕی زانیاری كورد بەپێی یاسای كۆڕی زانیاری كورد، بڕگەی (ب) لە مادەی سێزدەیەم بۆ هەڵبژاردنی دیوانی سەرۆكایەتی كۆڕی زانیاری كورد لەنێو ئەندامە كارا عێراقییەكانی، لە كۆبوونەوەیەكی دروست كە دەستەی گشتی تێدا ئامادە دەبن، كە لە ئەندامانی كارای كۆڕی زانیاری عێراق و كۆڕی زانیاری كورد، ئەمەش لەسەر داوای وەزیری پەروەردە بووە كە بە نووسراوی ژمارە (٩٥٣٦) لە ١٩٧١/٣/٧، بۆ ئەو مەبەستەش لە هۆڵی كۆبوونەوەكانی تەلاری كۆڕی زانیاری عێراق دەستەی گشتی هەردوو كۆڕ بە سەرۆكایەتی عەبدوڕەزاق محیەددین سەرۆكی كۆڕی زانیاری عێراق لە ئێوارەی رۆژی ١٩٧١/٣/١٧ بە ئامادەبوونی وەزیری پەروەردە بەڕێوەچوو، دوای ئەوەی رێوڕەسمی پێویست بەڕێوەچوو، سەرەتا سەرۆكی كۆڕی زانیاری عێراق وتەیەكی پێشكەش كردووە، وێڕای پیرۆزبایی دامەزراندنی كۆڕی زانیاری كورد باسی لە كاری كۆڕ كردووە كە كاری ورد و ئارامی و پشوودرێژی و دڵسۆزی و پەرۆشی راستەقینەی دەوێت، دوور لە ژاوەژاو و هەرا و پەشتە پەشت دەبێ بەرەكەی پێی بگات، بەتایبەتی بۆ كۆڕێكی وەك ئەو كۆڕە كە رێگاكەی دژوار و پڕ هەڵەتە و كاری لەسەر نەكراوە، وەك گوتوویە ئێمە هاوكارتان دەبین و هەرچی شارەزاییمان

هەیە لە خزمەتتاندا دەبێت، پاشان باسی هاوکاری نێوان هەردوو کۆڕی کردووە و لە کار و ئەرکەکانی کۆڕیش دواوە[91].

دواتریش ئیحسان شێرزاد سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد، لە وتەیەکدا پەسنی دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد دەکات لەلایەن ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی (عیراق)، وەك داننان بە مافە رۆشنبیرییەکانی گەلی کورد لە عیراق، دوابەدوای ١١ی ئاداری ١٩٧٠، بەدەرکردنی یاسای کۆڕ، هەروەها بەڵێنی نیازپاکی خۆی بۆ وەئەستۆگرتنی ئەم بەرپرسیاریەتییە زانستییە بۆ گەلی کورد دەربڕیوە، بەتایبەت خزمەتکردنی زمان و رۆشنبیری و کەلەپووری کورد[92]، پاشان بەپێی بڕگەی (ب)ی مادەی سێزدەیەم ئەندامانی دیوانی سەرۆکایەتی کۆڕی زانیاری کورد هەڵبژێردراون و ئەمانەی خوارەوە بە ئەندام دەرچوون:

١- ئیحسان شێرزاد - سەرۆك

٢- عەزیز ئاکرەیی - جێگری یەکەمی سەرۆك.

٣- شێخ محەمەدی خاڵ - جێگری دووەمی سەرۆك.

٤- عەلائەدین سەجادی - ئەندام.

٥- د. ناجی عەباس - ئەندام[93].

رۆژی ٢٧/مارت/١٩٧١ ئەنجومەنی کۆڕ بۆ یەکەمین جار کۆبووەتەوە کە تا ساڵی ١٩٧٢ پەنجا و سێ جار کۆبووەتەوە، بەپێی یاسای کۆڕ (١١) ئەندامی کارا بوونە، کە ئەمانەن:

د. ئیحسان شێرزاد سەرۆك

شێخ محەمەدی خاڵ

عەبدوڵڵا نەقشبەندی[94]

مەسعوود محەمەد

عەلائەددین سەجادی

پاکیزە رەفیق حیلمی

عەزیز ئاکرەیی

عەبدورەحمان هەژار

ناجی عەباس

ئەحمەد عەلی عوسمان

کەمال مەزهەر ئەحمەد

دوو ئەندامی شەرەف

تۆفیق وەهبی

عەبدوڵڵا نەقشبەندی

ئەندامانی کارا لە دەرەوە: قەناتی کوردۆ (یەکێتی سۆڤیەت)، کامەران بەدرخان (فەرەنسا)، لەگەڵ ژمارەیەك ئەندامی یاریدەدەر[٩٥].

خولی یەکەم زیاتر خولی خۆدامەزراندن و خەریکی رێکخستنی کاروباری کارگێڕی بوونە، وێڕای ئەو کارانەی کردوونی، هەرچی خولی دووەمە جارێکی دیکە لیژنەکانی کۆڕ دامەزراونەتەوە و بەپێی پێویست گۆڕانکارییان تێدا کراوە، لیژنەکانیش: زمان و زانستەکانی، لێکۆڵینەوەی زمان، وێژە و کەلەپوور، زانستە کۆمەڵایەتییەکان، فەرهەنگ، وەرگێڕان و دانان و بڵاوکردنەوە، زانستی ئابووری و یاسا، ژیاری ئیسلام، کتێبخانە و گۆڤار، ئەم لیژنانە چالاکانە کاریان کردووە و گەلێك کار و بەرهەمی بەنرخیان بەدەست هێناوە، بۆ نموونە لیژنەی زمان تاوتووی زاراوەکانی کردووە، لیژنەی وێژە و کەلەپوور، چەندین بەیت و باوی کوردی لەسەر شریت تۆمارکردووە، کتێبەکەی ئۆسکارمان لەلایەن هێمن موکریانییەوە و هێنراوەتە سەر رێنووسی کوردی کە بە ناوی (توحفة مظفریە)یە و لە (١٨) بەیتی کوردی پێکهاتووە[٩٦].

خولی دووەمی دیوانی سەرۆکایەتی کۆڕ لە دوای مارتی ١٩٧٤ دەست پێدەکات، کە دیارە کۆڕ لە کارەکانی بەردەوام بووە.

کۆڕ (١٠) لیژنەی جۆراوجۆری پێکهێناوە کە ئەمانەن: زمان و زانستەکانی، وێژە و کەلەپوور، زانستە کۆمەڵایەتییەکان، زانست، فەرهەنگ، وەرگێڕان و دانان و بڵاوکردنەوە، ژیاری ئیسلام، زانستی ئابووری و یاسا، کتێبخانە و گۆڤار، لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی[٩٧].

لەبارەی دامەزراندنی کۆڕەوە د. کەمال مەزهەر وەك سکرتێری کۆڕ دەست بەکاردەبێت ئاماژە بەوە دەکات کە (٤ — ٥) ساڵ خەریکی کاروباری کۆڕ بووە لە قۆناغی دامەزراندن، کۆڕ شتێکی زۆر گەورە و دەستکەوتێکی ئێجگار بەنرخ بوو،

هەمووکاتی خۆی بۆ تەرخان کردووە، شەو و ڕۆژ کاری کردووە، جاری وابووە سەعات (١٢)ی شەو گەڕاوەتەوە ماڵ، ئەمە سەرباری ئەوەی کە ئەوانەی کاری لەگەڵ کردوون دەستەیەکی هەڵبژاردە بوونە و ڕێکوپێك و ڕووناکبیر بوونە وەك یەك خێزان کاریان کردووە. یەکەم کەسیشیان سەرۆکی کۆڕ ئیحسان شێرزاد زۆر پەسنی دەدات، کۆڕی زۆر خۆشویستووە، وەك وەزیر بەر لەوەی بچێتە وەزارەت سەری کۆڕی داوە[٩٨].

لەکاتێکدا کە ڕەخنەی زۆر لە شێوازی پێکهاتەی کۆڕ گیراوە، بەڵام د. کەمال مەزهەر زۆر پەسنی ئەندامانی کۆڕ دەکات بەناو ئاماژەیان پێدەکات کە چییان کردووە و چۆن کاریان کردووە، لەوان وێڕای ئیحسان شێرزاد، مەسعوود محەمەد لە شارەزایی و دانانی زاراوە بۆ زمانی کوردی، لێکدانەوەی شیعری نالی. هەروەها باسی هەژار و ئەوانی دیکەش[٩٩].

**ئە نجام:**

خزمەتكردنی زمان و رۆشنبیریی كوردی، ئاوات و داخوازییەكی لەمێژینەی بزووتنەوەی نیشتمانی كورد بووە، لەم رووەوە لەگەڵ دەستكردن بە كوردی نووسین و دامەزراندنی كۆڕ و كۆمەڵە كوردییەكان ئەو داوایە لە گۆڤار و رۆژنامەكاندا زۆر بە روونی دیار و بەرچاوە و هەروەها رووناكبیرانیش دریغییان نەكردووە.

– دامەزراندنی كۆڕی زانیاری عیراق هەنگاوێكی بەرجەستە بوو، وای كرد كە كوردیش زۆر بە راشكاوانە ئەو داوایە بكات، جا چ بە دامەزراندنی كۆڕێكی هاوشێوە یان هەر لە ناو ئەو كۆڕەدا بەشی كوردیش دابمەزرێت و خزمەت بە زمان و رۆشنبیریی كوردی بكات. بەڵام كە ئەوە نەكراوە، گۆڤاری (نزار) لە سەر لاپەڕەكانی داوای دامەزراندنی كۆڕی زانیاری كوردی كردووە، بەڵام هیچی لێ نەهاتووەتە دی.

جارێكی دیكە گۆڤار و رۆژنامە و نووسەرانی كورد دوای ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ ئەو داوایەیان دووپات كردووەتەوە، وێڕای ئەوە رەخنەشیان لە بڕیارێكی (دیوانی تەدوینی قانونی) عیراقی گرتووە لە سالانی شەستەكان ئەو داوایەی كوردیان رەت كردووەتەوە بۆ دامەزراندنی كۆڕی زانیاری كورد لە عیراقدا.

ئەوەی جێی ئاماژەیە رۆژنامەی (ژین)، سلێمانی لە هەمووان زیاتر بەدواداچوونی بۆ ئەم بابەتە كردووە. بە ئاڵۆزبوونی دۆخی كوردستان كارەكە هەروا ماوەتەوە تا لە ساڵی ١٩٦٨ بڕیاری دامەزراندن كۆڕی زانیاری كورد درا، بەڵام نەچووە بواری جێبەجێكردنەوە تاكو دوای رێككەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠، كە خاڵێكی ئەو رێككەوتنە، دامەزراندنی كۆڕی زانیاری كورد بوو تا دواتر لە هەمان ساڵدا بە بڕیاری ژمارە ١٨٣ لە ساڵی ١٩٧٠ بڕیاری دامەزراندنی دەرچوو و ناوی ئەندامە دامەزرێنەرەكانی بە رەسمی دیاری كران، كە هەر لە سەرەتاوە رووبەڕووی رەخنەی (یەكێتی نووسەرانی كورد) وەك رێكخراو و رووناكبیرانی كورد بووەوە و داوای هەڵوەشاندنەوەیان كردووە، هەروەها رەخنە لە چۆنیەتی دامەزراندن و ناو و پێكهاتەكەشی گیراوە.

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**

(١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مجلة المجمع العلمي العربي، الجزء (٤)، المجلد الاول، نيسان ١٩٢١، ص ٩٨.

(٢) نفس المصدر، ص ٩٩؛ بەپێی زانیاریی ئێمە د. مارف خەزنەدار بۆ یەکەمجار وتارێکی تێروتەسەلی لەبارەی (ئەکادیمییە)وە نووسیوە. بۆ وردەکاری و زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. مارف خەزنەدار، ئەکادیمیە — AKADEMIA، رۆژی کوردستان "گۆڤار"، بەغدا، ژمارە (٧)، ئاداری ١٩٧٢، ل ٣٨ — ٤٣.

(٣) بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: شوکر مستەفا، ئەکادیمیا، فەرهەنگستان، زاراوە رۆنان، کۆڕی زانیاری کورد — کۆڕی زانیاری کوردستان، "ئەکادیمی"، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردستان، ژمارە (١)، ل ١١٣ — ١١٥؛ هەروەها بۆ زانیاریی وردتر و زیاتر بڕوانە: عيسى اسكندر المعلوف، المجامع العلمية في العالم، "مجلة المجمع العلمي العربي"، (دمشق)، الجزء (٤)، نيسان ١٩٢١، المجلد الاول، ص ٩٧ — ١٠٥. لە (ارشيف المجلات الادبية والثقافية العربية — صخر) وەرگیراوە. رۆژی سەردان ٢٠١٧/٥/٢٦.

(٤) بڕوانە: عيسى اسكندر المعلوف، مجلة المجمع العلمي العربي، الجزء (٤)، المجلد الاول، نيسان ١٩٢١، ص ١٠٤.

(٥) مجلة المجمع العلمي العربي، العدد (١)، ١ كانون الثاني ١٩٢١، ص ٣.

(٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: نظام المجمع العلمي العراقي (رقم ٦٢ لسنة ١٩٤٧)، "الوقائع العراقية" (الجريدة الرسمية)، بغداد، العدد (٢٥٦٠)، ١٩٤٧/١٢/١١، مجلة المجمع العلمي العراقي، بغداد، العدد (١)، أيلول ١٩٥٠، ص ٣ — ٧.

(٧) مالمیسانژ، جەمعییەتی تەعاون و تەرەقی ی کورد و رۆژنامەکەی، لە تورکییەوە وەرگێڕانی: رۆژهەڵاتی، پێداچوونەوەی: سدیق ساڵح، بنکەی ژین، چ. دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ١٥٤ — ١٥٨.

(٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ١٦٤.

(٩) حەمید سولەیمان ئەرزنجانی، رێگەی زیندووکردنەوە و سیستماتیزەکردنی پەروەردە لە کوردستاندا، — کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی، ژمارە (٨)، ٢٣ی کانوونی دووەمی ١٩٠٩، بە وەرگرتن لە: مالمیسانژ، جەمعییەتی تەعاون و تەرەقی کورد......، ل ٢٣٥ — ٢٣٩.

(١٠) بڕوانە: بابان زادە اسماعیل حقی، کردجەیە دائر، کُرد تعاون ترقی غزتەسی (رۆژنامە، ئەستەنبۆڵ، نومرو (٣)، ٦ کانون اول ١٣٢٤ (١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٠٨)، ص ١٨ — ١٩؛ د. جەبار قادر، (کورد) و چەند زانیارییەکی نوێ، رۆژنامەڤانی (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٩)، هاوینی ٢٠٠٢، ل ٦٧ — ٦٨؛ بابان زادە ئیسماعیل حەقی، ئیسلامچیەتی، کوردایەتی، رۆژی کورد، ژمارە (٢)، ٦ی تەمموزی ١٣٢٩ (١٩١٣)، ل ٦؛ رۆژی کورد، گۆڤاری جڤاتی فەقێی قوتابیانی کورد

١٩١٣ – ئەستەموول، ئامادەكردن و لێكۆڵینەوەی عەبدوڵڵا زەنگەنە، بنكەی ژین، چ. شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.

(١١) بڕوانە: تێگەیشتنی راستی، بەغدا، ژمارە (١١)، ٥ی شوباتی ١٩١٨، ل ١؛ رۆژنامەی تێگەیشتنی راستی ١٩١٨ – ١٩١٩ یەكەمین رۆژنامەی كوردی لە عێراق، ئامادەكردنی: رەفیق سالح – سدیق سالح، پرۆژەی هاوبەشی دەزگای (ئاراس و بنكەی ژین ٧٧)، سلێمانی، ئاراس، ٢٠٠٧، ل ٢١.

(١٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ژین (ئەستەنبۆڵ)، ژمارە (١٠)، شوباتی ١٣٣٥، ل ١٣، بە وەرگرتن لە: ئیسماعیل گوێڵداش، جەمعییەتی تەعالیی كوردستان، وەرگێڕانی: زریان رۆژهەڵاتی، بنكەی ژین، چ. شڤان، سلێمانی، ٢٠١١، ل ١٠، ١٣٠ – ١٣١، ٤٣٠.

(١٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ژین، ژمارە (١٤)، ل ١٣، بە وەرگرتن لە: گوێڵداش، ل ١٣١ – ١٣٢.

(١٤) گوێڵداش، ل ١٣٣.

(١٥) بڕوانە: م. م. {محمد میهری}، عرفان كوردجە تركجە عربجە فارسجە و فرانسز لغت، "كوردستان" (گۆڤار)، ئەستەنبۆڵ، عدد (٢)، شباگ ١٣٣٥ {٢٢ شوبات ١٩١٩}، ل ٢٢ – ٢٤ ؛ د. عومەر عەبدولعەزیز، پوختەیەكی ژیاننامەی "محەمەد میهری دشەیی" ناسراو بە (بُرهان الاسلام) (١٨٨٩ – ١٩٥٧)، "ژین" (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە (٧)، ساڵی حەوتەم، دیسەمبەری ٢٠١٥، ل ٢٤٧.

(١٦) (ژین، ژمارە (١٦)، ١٠ی نیسانی ١٣٣٥، ل ٨)، بە وەرگرتن لە: گوێڵداش، ل ١٢٧؛ ژین، ژمارە (١٠)، ل ١٣، بە وەرگرتنی لە گوێڵداش، ل ١٣٠.

(١٧) بڕوانە: گۆڤاری كوردستان ١٩١٩ – ١٩٢٠، ئەستەمبۆڵ، كۆكردنەوە و لەسەرنووسینی: د. فەرهاد پیربال، كتێبی گوڵان، ژمارە (٣)، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٧.

(١٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: رۆژنامەی (پێشكەوتن) یەكەمین رۆژنامەی سلێمانی ١ – ١١٨ (١٩٢٠ – ١٩٢٢)، ئامادەكردنی: رەفیق سالح و سدیق سالح، بنكەی ژین، چ. شڤان، سلێمانی، ٢٠١٢، ل ١٥٤.

(١٩) بڕوانە: دیاری كوردستان، ژمارەكانی (٥، ٦، ٨، ٩، ١٠، ١١، ١٢، ١٣، ١٤). لە دیاری كوردستان ١٩٢٥ – ١٩٣٦، ئامادەكردنی: رەفیق سالح، لێكۆڵینەوەی: نەوشیروان مستەفا و سدیق سالح، ل ٢٧، ٥٢ – ٥٣، ٦٣.

(٢٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: زاری كرمانجی "گۆڤار"، ئامادەكردن و پێشەكی: د. كوردستان موكریانی، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكریان، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٢٠ – ٢٤.

(٢١) نەوشیروان مستەفا، ژیان بەتەمەنترین رۆژنامەی كوردی ١٩٢٦ – ١٩٣٨، چ. رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٢٤٢، ٢٥٠، ٢٥١.

(٢٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ژیان، سلێمانی، ژمارە (٢٩)، ١٩ی ئاغستۆسی ١٩٢٦، بە وەرگرتن لە: نەوشیروان مستەفا، ژیان بەتەمەنترین رۆژنامەی كوردی، ل ٢٥٧ – ٢٦٠.

(٢٣) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. حوسێن حەبەش، هاوار و پرسی یەکێتیا زمانی کوردی، ڕۆژنامەڤانی (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٥)، ٢٠٠١، ل ٢٨٣ – ٢٨٧.

(٢٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: برای ڕاست – ٦٧، کوردی دەبێ چۆن بنوسرێ، نیشتمان (گۆڤار)، تەورێز، ژمارە (٣ و ٤)، سەرماوەز و ڕێبەندانی ١٣٢٢ (١٩٤٣)، ل ٥ – ٨ بە وەرگرتن لە (جەمال نەبەز، گۆڤاری نیشتمان تەموزی ١٩٤٣ – مایسی ١٩٤٤، چ ٢، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٦٢ – ٦٥، ١٣٣).

(٢٥) فایق تۆفیق ئامانجی دەنگی گێتی تازە، دەنگی گێتی تازە (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (١)، س ٣، ١٢ تشرینی دووەم ١٩٤٥، ل ٣ – ٤.

(٢٦) بڕوانە: م. م. منگوری، بریک لە دەستووری نووسین، کوردستان (ڕۆژنامە)، مەهاباد، ژمارە (٤٢)، س ١، ١ مە (مایس) ١٩٤٦، ل ١ – ٢.

(٢٧) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. عبدالله الجبوري، المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٦٥، ص٣١. بە وەرگرتن لە : سالم الالوسي، المجمع العلمي في خمسين عاماً، ١٩٤٧ – ١٩٩٧، منشورات المجمع العلمي، مط. المجمع العلمي، ج١، ط٢، بغداد، ٢٠١٥، ص ١٣.

(٢٨) سالم الالوسي، المجمع العلمي في خمسين عاماً، ١٩٤٧ – ١٩٩٧، ج١، ط٢، ١٣.

(٢٩) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: سالم الالوسی، المصدر السابق، ص ١٥ – ٣٢.

(٣٠) عبدالله الجبوری، المصدر السابق، ص ٣٣ – ٣٥. بە وەرگرتن لە سالم الالوسی، ص ٣٢ – ٣٣.

(٣١) بڕوانە: سالم الالوسي، نفس المصدر، ص ٣٤ – ٤٤.

(٣٢) الوقائع العراقية (الجريدة الرسمية)، العدد (٢٥٦٠)، ١٩٤٧/١٢/١١.

(٣٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە. سالم الالوسي، المجمع العلمي في خمسين عاماً....، ج١، ط٢، ص ٤٧ – ٤٨

(٣٤) ابن خلكان، المجمع العلمي العراقي والامال المعلقة عليه، نزار "مجلة"، بغداد، العدد (٤)، ١٥ مايس ١٩٤٨، ص ٦. بە وەرگرتن لە: نزار گۆڤارێکی سیاسی کوردی – عەرەبییە، ١٩٤٨/٣/٣٠ – ١٩٤٩/٢/١٥، ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح، لێکۆڵینەوە و پێڕستکاری: سدیق ساڵح، زنجیرە کتێبی دەزگای سەردەم (٢٩)، ئۆفسێتی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.

(٣٥) نزار، العدد (١٧)، ٣٠ تشرين الثاني ١٩٤٨، ص ٧ – ٨.

(٣٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، زنجیرەی کوردەوانی (١) لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا، بامبێرگ – ئەڵمانیا، ١٩٧٦، ل ١٥ – ١٦؛ جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاریی کورد، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، زانستگای بەغدا، ژمارە (٢٢)، ١٩٧٨، ل ٨٢ – ٨٣.

(٣٧) بۆ زانیاری پتر بڕوانە: ع. قرگەیی، یەکیەتی زمانی کوردی، هەتاو، ژمارە (١٧ – ١٨)، ٣١ کانونی یەکەمی ١٩٥٤، ل ٤.

(٣٨) بڕوانە: (ج ......)، نووسینی کوردی، هەتاو، ژمارە (٣٠)، ١٠ی مایسی ١٩٥٥، ل ٢.

(٣٩) جەمال نەبەز، نووسینی کوردی بەلاتینی، بەغدا، ل گ. ك؛ جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ئەڵمانیا، ١٩٧٦، ل ١٦.

(٤٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: جەمال نەبەز، خوێندەواری بە زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٥٧، ل ٣١ — ٣٤؛ جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ل ١٦.

(٤١) محرم محمدامین، کۆکراوەیەکی زمانی (مجمع لغوي)مان ئەوێ تەنها هەست کردن بە ناتەواوی بەس نیە بۆ لابردنی ناتەواوی، ژین "رۆژنامە"، سلێمانی، ژمارە (١٣٤٢)، ٩٥٧/٤/٢٥، ل ١—٢).

(٤٢) صالح ئەحمەد، پوختەکردنی زمانی کوردی، ژین، ژمارە (١٣٤٣)، ١٩٥٧/٥/٩، ل ١، ٨).

(٤٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: طاهر حسین، زوبانی کوردی، کوردستان (گۆڤار) (ئۆرگانی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا)، ژمارە (١)، مارتی ١٩٥٨، ل ١٠. کوردستان، نەوزاد عەلی ئەحمەد ئامادەی کردووە و پێشەکی بۆ نووسیوە، پرۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، چ. حەمدی، سلێمانی، ٢٠١١.

(٤٤) جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ل ١٦ — ١٧.

(٤٥) بڕوانە: شازین هێرش، رێکخراوە دیموکراسی و پیشەییەکان لە چەندین بەڵگەنامەی مێژووییدا ١٩٥٨ — ١٩٦٨، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ١٩— ٢١.

(٤٦) نوری عەلی ئەمین، زاراوەی زانیاری لە زمانی کوردیدا، نەورۆز (گۆڤار)، ژمارە (٣)، جۆزەردانی ١٩٥٩، ل ٦١.

(٤٧) بڕوانە: ژین، ژمارە (١٤٩٥)، ١٩٥٩/١٢/١٧، ل ١.

(٤٨) بڕوانە: هیوا (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٢ و ٣)، کانوونی یەکەمی ١٩٥٩ و کانوونی دووەمی ١٩٦٠، ل ٩٩.

(٤٩) ژین، ژمارە (١٥١٢)، ١٩٦٠/٢/٢٢، ل ١ ، ٥.

(٥٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مجمعی علمی و عراقی گەلی کورد، (ئازادی)، ژمارە (٢٩)، س ٢، ١٢/ تەمموزی ١٩٦٠، ل ٢.

(٥١) (صوت الاكراد) (جريدة)، بغداد، العدد السابع، ١٩٦٠/٧/٢٥.

(٥٢) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: رۆژی نوێ، ژمارە (٥)، ئابی ١٩٦٠، ل ٦٨.

(٥٣) بڕوانە: هەتاو، ژمارە (١٨٥)، ١٥ی ئەیلولی ١٩٦٠، ل ٢٦.

(٥٤) هەتاو، ژمارە (١٨٥)، ١٥ی ئەیلولی ١٩٦٠، ل ٢٨.

(٥٥) هەتاو، ژمارە (١٨٧)، ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٠، ل ٣٣.

(٥٦) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: هەڵگورد، الشعب الكردي بحاجة الى مجمع علمي كردي، صوت الاكراد، العدد (٣٠)، ١٩٦٠/٩/١٨، ل ١.

(٥٧) بڕوانە: خەبات (جريدة)، بغداد، العدد (٣٦٥)، ١٩٦٠/١١/٢٠، ص ١.

(٥٨) بڕوانە: ژین، ژمارە (١٥٨٨)، ١٩٦١/١/٣٠.

(٥٩) پێشکەوتن — التقدم، ژمارە (٦٥)، ١٩٦١/٤/٣، ل ١.

(٦٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: باوكی تەنیا، شێوەكانی زمانی كوردی یەك ناگرێ بێ ئەوەی كۆزمانێكی كوردی پێك نەهێنرێ، رۆژی نوێ، ژمارە (٢)، مایسی ١٩٦١، ل ٧٥ — ٧٦.

(٦١) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: محمد حسن مەنگوری، ئاواتی قوتابیانی كوردستان، پێشكەوتن، ژمارە (٦٧)، ١٩٦١/٤/١٩، لاپەڕەی دوایی.

(٦٢) ژین، ژمارە (١٦٢٨)، ١٩٦١/٧/٢٧، ل ١ — ٤.

(٦٣) بڕوانە: ژین، ژمارە (١٦٦٠)، ١٩٦٢/١/١٨، ل ١.

(٦٤) منشورات نقابة المعلمين، مقررات المؤتمر الرابع لنقابة المعلمين في الجمهورية العراقية المنعقد في ٩–١٣ شباط ١٩٦٢، لجنة التوحيد والنشر. بە وەرگرتن لە: د. عبدالفتاح البوتاني، منطقة بادينان ١٩٢٥ — ١٩٧٠، تقديم: د. عدنان عودة عباس، منشورات الاكاديمية الكردية، مطبعة زانكوي سەلاحەددين، اربيل، ٢٠١٧، ص ٤٨٢.

(٦٥) بڕوانە: "النور" (جريدة)، بغداد، العدد (٨٣)، ٢٠ كانون الثاني ١٩٦٩، ص ١؛ ئەمەش لە سەروبەندی دەرچوونی بڕیاری ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕشی (عیراق) لە ١٩٦٨/٨/٤.

(٦٦) بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: د. جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەكی تازە بەكارهاتوو و كۆڕی زانیاری كورد، گۆڤاری كۆلێجی ئەدەبیات — زانستگای بەغدا، ژمارە (٢٢)، ١٩٧٨، ل ٨٠ — ٨٤.

(٦٧) بڕوانە: الجمهورية العراقية — القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة ١٩٦٨ — ١٩٧٠، المجلد الاول، ص٥٩٣؛ "التآخي" (جريدة)، بغداد، العدد (٣٣١)، ١٩٦٨/٨/٥؛ ئیحسان شێرزاد، گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی یەكەم، بەشی یەكەم، ١٩٧٣، ل ٤ پەراوێز؛ مذكرات: للأستاذ احسان شيرزاد، مهندساً، أكاديمياً ووزيراً، ص ٢٣٥.

(٦٨) الاثار الكاملة للدكتور احمد عثمان ابوبكر، اعداد: د. ازاد عبيد صالح، مؤسسة ژين، السليمانية، ٢٠١٠، ص ٢٨٣ — ٢٨٤.

(٦٩) بڕوانە: دەفتەری كوردەواری (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٢)، مارت و نیسانی ١٩٧٠، ل ١٥٥ — ١٥٦؛ هەروەها بڕوانە: د. مارف خەزنەدار، رۆژگاری من، بەرگی پێنجەم، چ. رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٧٠– ٧١.

(٧٠) د. مارف خەزنەدار، رۆژگاری من كەمێك ئاشتی و بڕێك هێمنی ١٩٦٨ — ١٩٧٥)، بەرگی پێنجەم، چ. رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٧٠ — ٧١.

(٧١) بڕوانە دەقی بەیاننامەی ناوبراو لە: "الوقائع العراقية"، العدد (١٩١٧)، ٨ أيلول ١٩٧٠، ص ١ — ٣.

(٧٢) هاوكاری، ژمارە (٣٥)، ١٩٧٠/٥/٢، ل ١.

(٧٣) بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: الوقائع العراقية ، العدد (١٩١٧)، ٨ ايلول ١٩٧٠، ص ١–٣.

(٧٤) بڕوانە: "الوقائع العراقية"، الجريدة الرسمية للجمهورية العراقية، العدد (١٩١٧)، ٨ أيلول ١٩٧٠.

(٧٥) مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، القسم الاول، قانون المجمع العلمي الكردي، ص ٧٤٢ — ٧٤٣.

(٧٦) نفس المصدر، ص ٧٤٣.

(٧٧) نفس المصدر ، ص ٧٤٣.

(٧٨) نفس المصدر، ص ٧٤٣.

(٧٩)نفس المصدر، ص ٧٤٣.

(٨٠) نفس المصدر، ص ٧٤٣ — ٧٤٤.

(٨١) نفس المصدر، ص ٧٤٤.

(٨٢) نفس المصدر، ص ٧٤٤.

(٨٣) نفس المصدر، ص ٧٤٥.

(٨٤) نفس المصدر، ص ٧٤٥ — ٧٤٦.

(٨٥) نفس المصدر، ص ٧٤٦ — ٧٤٧.

(٨٦) **نفس المصدر**، ص ٧٤٧.

(٨٧) نفس المصدر، ص ٧٥٢.

(٨٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: قانون التعديل الاول لقانون المجمع العلمي الكردي، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، العدد الاول، ١٩٧٣، ص ٧٤٨ — ٧٥٢.

(٨٩) بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، پوختەی کارەکانی کۆڕ لە خولی یەکەم و دووهەمیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل ٣٢٤ — ٣٢٥؛ الوقائع العراقية، العددان (٢١٢٣ — ٢١٨١)، ١٥ نيسان ١٩٧٢، ص ٦ — ٧، ١١، أيلول ١٩٧٢، ص ١٥ — ١٨.

(٩٠) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: النظام الداخلي للمجمع العلمي الكردي، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، العدد الاول، ١٩٧٣، ص ٧٥٣ — ٧٦٤.

(٩١) بۆ وردەکاریی زیاتر بڕوانە: كلمة رئيس المجمع العلمي العراقي في حفلة تأسيس المجمع العلمي الكردي العراقي، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، العدد الاول، ١٩٧٢، ص ٧٦٧ — ٧٧٠.

(٩٢) كلمة السيد احسان شيرزاد رئيس المجمع العلمي الكردي في الاجتماع الاول، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، العدد الاول، ١٩٧٣، ص ٧٧٠ — ٧٧١.

(٩٣) بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: الاحتفال التأسيسي للمجمع العلمي الكردي، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، العدد الاول، ١٩٧٣، ص ٧٦٥؛ مذكرت الاستاذ احسان شيرزاد، ص٣٦٢؛ جێی ئاماژەیە ئیحسان شێرزاد ڕۆژی کۆبوونەوەکەی بە ١٩٧١/٣/١٨ دیاری کردووە.

(٩٤) عەبدوڵڵا نەقشبەندی سەرۆکی ئەنجومەنی چاودێری دارایی بووە، بەپێی یاسای ژمارە (٤٠) نابێت ببێتە ئەندام لە فەرمانگەیەکی سامیری (شبه رسمي)، بۆیە لە ١٩٧٢/٤/١٥ نامەی دەست لە کارکێشانەوەی وەك ئەندامی کارا پێشکەش کردووە و بووەتە ئەندامی شەرەف. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ل ٥٢٦ — ٥٢٩.

(٩٥) بۆ زانیاریی پتر و ناوی تەواوی ئەندامانی کۆڕ بە کارا و شەرەف و یاریدەدەر بڕوانە: د. کەمال مەزهەر، پوختەی کارەکانی کۆڕ لە خولی یەکەم و دووهەمیدا؛ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل ٣٢٢ — ٣٢٤.

(٩٦) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، پوختەی کارەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕ، بەشی سێیەم، بەشی یەکەم، ل ٥٤٥ — ٥٥٢.

(٩٧) بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەو لیژنانە و ناوی ئەندامەکانی بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ، ل ٣٢٨ — ٣٢٩.

(٩٨) ئازاد هیدایەت دەلۆ، دیداری رۆشنبیری، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٤٨ — ٥٢.

(٩٩) هەمان سەرچاوە، ل ٤٨ — ٦٥.

**لیستی سەرچاوەکان:**

**١— کتێب:**

**أ— کوردی:**


١— ئازاد هیدایەت دەلۆ، دیداری رۆشنبیری، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧.

٢— ئیسماعیل گوێڵداش، جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی: زریان رۆژهەڵاتی، بنکەی ژین، چ. شڤان، سلێمانی، ٢٠١١.

٣— جەمال نەبەز، گۆڤاری نیشتمان تەموزی ١٩٤٣ — مایسی ١٩٤٤، چ ٢، هەولێر، ٢٠١٠.

٤— ـــــــــــــ، زمانی یەکگرتووی کوردی، زنجیرەی کوردەوانی (١) لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا، بامبێرگ — ئەڵمانیا، ١٩٧٦

٥— ـــــــــــــ، نووسینی کوردی بەلاتینی، بەغدا، ل گ. ك؛ جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ئەڵمانیا، ١٩٧٦.

٦— ـــــــــــــ، خوێندەواری بە زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٥٧، ل ٣١ — ٣٤؛ جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی.

٧— دیاری کوردستان، ژمارەکانی (٥، ٦، ٨، ٩، ١٠، ١١، ١٢، ١٣، ١٤). لە دیاری کوردستان ١٩٢٥ — ١٩٣٦، ئامادەکردنی: رەفیق ساڵح، لێکۆڵینەوەی: نەوشیروان مستەفا و سدیق ساڵح.

٨— رۆژی کورد، گۆڤاری جڤاتی فەقێی قوتابیانی کورد ١٩١٣ — ئەستەموول، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی عەبدوڵڵا زەنگەنە، بنکەی ژین، چ. شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٩— رۆژنامەی تێگەیشتنی راستی ١٩١٨ — ١٩١٩ یەکەمین رۆژنامەی کوردی لە عێراق، ئامادەکردنی: رەفیق ساڵح — سدیق ساڵح، پرۆژەی هاوبەشی (ئاراس و بنکەی ژین ٧٧)، سلێمانی، ئاراس، ٢٠٠٧.

١٠— رۆژنامەی (پێشکەوتن) یەکەمین رۆژنامەی سلێمانی ١ — ١١٨ (١٩٢٠ — ١٩٢٢)، ئامادەکردنی: رەفیق ساڵح و سدیق ساڵح، بنکەی ژین، چ. شڤان، سلێمانی، ٢٠١٢.

١١- زاری کرمانجی "گۆڤار"، ئامادەکردن و پێشەکی: د. کوردستان موکریانی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.
١٢- شازین هێرش، ڕێکخراوە دیموکراسی و پیشەییەکان لە چەندین بەڵگەنامەی مێژوویيدا ١٩٥٨ - ١٩٦٨، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠١.
١٣- کوردستان، نەوزاد عەلی ئەحمەد ئامادەی کردووە و پێشەکی بۆ نووسیوە، پرۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، چ. حەمدی، سلێمانی، ٢٠١١.
١٤- گۆڤاری کوردستان ١٩١٩ - ١٩٢٠، ئەستەمبوڵ، کۆکردنەوە و لەسەرنووسینی: د. فەرهاد پیربال، کتێبی گوڵان، ژمارە (٣)، هەولێر، ١٩٩٨.
١٥- مارف خەزنەدار (د.)، ڕۆژگاری من کەمێك ئاشتی و برێك هێمنی ١٩٦٨ - ١٩٧٥)، بەرگی پێنجەم، چ. ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٠.
١٦- مالمیسانژ، جەمعییەتی تەعاون و تەرەقی ی کورد و ڕۆژنامەکەی، لە تورکییەوە وەرگێڕانی: زریان ڕۆژهەڵاتی، پێداچوونەوەی: سدیق ساڵح، بنکەی ژین، چ. دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧.
١٧- نزار گۆڤارێکی سیاسی کوردی - عەرەبییە، ١٩٤٨/٣/٣٠ - ١٩٤٩/٢/١٥، ئامادەکردنی: رەفیق ساڵح، لێکۆڵینەوە و پێرستکاری: سدیق ساڵح، زنجیرە کتێبی دەزگای سەردەم (٢٩)، ئۆفسێتی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
١٨- نەوشیروان مستەفا، ژیان بەتەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی ١٩٢٦ - ١٩٣٨، چ. ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٢.

**ب- عەرەبی:**

١- الاثار الكاملة للدكتور احمد عثمان ابوبكر، اعداد: د. ازاد عبيد صالح، مؤسسة ذين، السليمانية، ٢٠١٠.
٢- الجمهورية العراقية - القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة ١٩٦٨ - ١٩٧٠، المجلد الاول.
٣- مذكرات: للأستاذ احسان شيرزاد، مهندساً، أكاديمياً ووزيراً.
٤- سالم الالوسي، المجمع العلمي في خمسين عاماً، ١٩٤٧ - ١٩٩٧، منشورات المجمع العلمي، مط. المجمع العلمي، ج١، ط٢، بغداد، ٢٠١٥.
٥- عبدالله الجبوري (د.)، المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٦٥.
٦- عبدالفتاح البوتاني (د.)، منطقة بادينان ١٩٢٥ - ١٩٧٠، تقديم: د. عدنان عودة عباس، منشورات الاكاديمية الكردية، مطبعة زانكوي سةلاحةددين، اربيل، ٢٠١٧.
٧- منشورات نقابة المعلمين، مقررات المؤتمر الرابع النقابة المعلمين في الجمهورية العراقية المنعقد في ٩- ١٣ شباط ١٩٦٢، لجنة التوحيد والنشر.

**٢- ڕۆژنامە و گۆڤار:**

**أ- کوردی:**

١- ئەورەحمانی حاجی مارف(د.)، پوختەی کارەکانی کۆڕ، گۆڤاری کۆڕ، بەشی سێیەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٥.
٢- ئیحسان شێرزاد، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣.
٣- بابان زادە اسماعیل حقی، کردجەیە دائر، کُرد تعاون ترقی غزتەسی (رۆژنامە، ئەستەنبۆڵ، نومرو (٣)، ٦ کانون اول ١٣٢٤ (١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٠٨).
٤- ________________، ئیسلامچیەتی، کوردایەتی، رۆژی کورد، ژمارە (٢)، ٦ی تەمموزی ١٣٢٩ (١٩١٣).
٥- برای راست — ٦٧، کوردی دەبێ چۆن بنوسرێ، نیشتمان (گۆڤار)، تەورێز، ژمارە (٣ و ٤)، سەرماوەز و رێبەندانی ١٣٢٢ (١٩٤٣).
٦- باوکی تەنیا، شێوەکانی زمانی کوردی یەك ناگرێ بێ ئەوەی کۆزمانێکی کوردی پێك نەهێنرێ، رۆژی نوێ، ژمارە (٢)، مایسی ١٩٦١.
٧- تێگەیشتنی راستی، بەغدا، ژمارە (١١)، ٥ی شوباتی ١٩١٨.
٨- پێشکەوتن — التقدم، ژمارە (٦٥)، ١٩٦١/٤/٣.
٩- (ج ......)، نووسینی کوردی، هەتاو، ژمارە (٣٠)، ١٠ی مایسی ١٩٥٥.
١٠- جەبار قادر(د.)، (کورد) و چەند زانیارییەکی نوێ، رۆژنامەڤانی (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٩)، هاوینی ٢٠٠٢.
١١- جەمال نەبەز، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، زانستگای بەغدا، ژمارە (٢٢)، ١٩٧٨.
١٢- حوسێن حەبەش(د.)، هاوار و پرسی یەکێتیا زمانی کوردی، رۆژنامەڤانی (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٥)، ٢٠٠١.
١٣- حەمید سولەیمان ئەرزنجانی، رێگەی زیندووکردنەوە و سیستماتیزەکردنی پەروەردە لە کوردستاندا، — کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی، ژمارە (٨)، ٢٣ی کانوونی دووەمی ١٩٠٩.
١٤- دەفتەری کوردەواری (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٢)، مارت و نیسانی ١٩٧٠.
١٥- رۆژی نوێ، ژمارە (٥)، ئابی ١٩٦٠.
١٦- ژین (ئەستەنبۆڵ)، ژمارە (١٠)، شوباتی ١٣٣٥، ژمارە (١٤)، ژمارە (١٦)، ١٠ی نیسانی ١٣٣٥.
١٧- ژین، ژمارە (١٤٩٥)، ١٩٥٩/١٢/١٧، ژمارە (١٥١٢)، ١٩٦٠/٢/٢٢، ژمارە (١٥٨٨)، ١٩٦١/١/٣٠، ژمارە (١٦٢٨)، ١٩٦١/٧/٢٧، ژمارە (١٦٦٠)، ١٩٦٢/١/١٨.
١٨- ژیان، سلێمانی، ژمارە (٢٩)، ١٩ی ئاغستۆسی ١٩٢٦.
١٩- شوکر مستەفا، ئەکادیمیا، فەرهەنگستان، زاراوە رۆنان، کۆڕی زانیاری کورد — کۆڕی زانیاری کوردستان، "ئەکادیمی"، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردستان، ژمارە (١).
٢٠- صالح ئەحمەد، پوختەکردنی زمانی کوردی، ژین، ژمارە (١٣٤٣)، ١٩٥٧/٥/٩.

٢١- طاهر حسین، زوبانی کوردی، کوردستان (گۆڤار) (ئۆرگانی کۆمەڵەی خوێندنکارانی کورد لە ئەوروپا)، ژمارە (١)، مارتی ١٩٥٨.
٢٢- فایق تۆفیق ئامانجی دەنگی گێتی تازە، دەنگی گێتی تازە (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (١)، س ٣، ١٢ تشرینی دووەم ١٩٤٥.
٢٣- ع. قرگەیی، یەکیەتی زمانی کوردی، هەتاو، ژمارە (١٧ - ١٨)، ٣١ کانونی یەکەمی ١٩٥٤.
٢٤- عومەر عەبدولعەزیز (د.)، پوختەیەکی ژیاننامەی "محەمەد میهری دشەیی" ناسراو بە (بُرهان الاسلام) (١٨٨٩ - ١٩٥٧)، "ژین" (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە (٧)، ساڵی حەوتەم، دیسەمبەری ٢٠١٥.
٢٥- کەمال مەزهەر ئەحمەد(د.)، پوختەی کارەکانی کۆڕ لە خولی یەکەم و دووهەمیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣.
٢٦- گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣.
٢٧- مارف خەزنەدار(د.)، ئەکادیمیە - AKADEMIA، رۆژی کوردستان "گۆڤار"، بەغدا، ژمارە (٧)، ئاداری ١٩٧٢.
٢٨- م. م. {محمد میهری}، عرفان کوردجە ترکجە عربجە فارسجە و فرانسز لغت، "کوردستان" (گۆڤار)، ئەستەنبۆڵ، عدد (٢)، شباگ ١٣٣٥ {٢٢ شوبات ١٩١٩}.
٢٩- م. م. منگوری، بریك لە دەستووری نووسین، کوردستان (رۆژنامە)، مەهاباد، ژمارە (٤٢)، س ١، ١ مە (مایس) ١٩٤٦.
٣٠- مجمعی علمی وعراقی گەلی کورد، (ئازادی)، ژمارە (٢٩)، س ٢، ١٢/ تەمموزی ١٩٦٠.
٣١- محرم محمدامین، کۆکراوەیەکی زمانی (مجمع لغوي)مان ئەوێ تەنها هەست کردن بە ناتەواوی بەس نیە بۆ لابردنی ناتەواوی، ژین "رۆژنامە"، سلێمانی، ژمارە (١٣٤٢)، ٩٥٧/٤/٢٥).
٣٢- محمد حسن مەنگوری، ئاواتی قوتابیانی کوردستان، پێشکەوتن، ژمارە (٦٧)، ١٩٦١/٤/١٩.
٣٣- نوری عەلی ئەمین، زاراوەی زانیاری لە زمانی کوردی دا، نەورۆز (گۆڤار)، ژمارە (٣)، جۆزەردانی ١٩٥٩.
٣٤- هاوکاری، ژمارە (٣٥)، ١٩٧٠/٥/٢.
٣٥- هیوا (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٢ و ٣)، کانوونی یەکەمی ١٩٥٩ و کانوونی دووەمی ١٩٦٠.
٣٦- هەتاو، ژمارە (١٨٥)، ١٥ی ئەیلولی ١٩٦٠، ژمارە (١٨٥)، ١٥ی ئەیلولی ١٩٦٠، ژمارە (١٨٧)، ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٠.

**ب- عەرەبی**

١- ابن خلکان، المجمع العلمي العراقي والامال المعلقة علية، نزار "مجلة"، بغداد، العدد (٤)، ١٥ مایس ١٩٤٨.
٢- الاحتفال التأسیسي للمجمع العلمي الکردي، مجلة المجمع العلمي الکردي، المجلد الاول، العدد الاول، ١٩٧٣.

٣- "التآخي" (جريدة)، بغداد، العدد (٣٣١)، ١٩٦٨/٨/٥.
٤- خەبات (جريدة)، بغداد، العدد (٣٦٥)، ١٩٦٠/١١/٢٠.
٥- عيسى اسكندر المعلوف، المجامع العلمية في العالم، "مجلة المجمع العلمي العربي"، (دمشق)، الجزء (٤)، نيسان ١٩٢١، المجلد الاول، له (ارشيف المجلال الادبية والثقافية العربية — صخر).
٦- (صوت الاكراد) (جريدة)، بغداد، العدد السابع، ١٩٦٠/٧/٢٥.
٧- كلمة رئيس المجمع العلمي العراقي في حفلة تأسيس المجمع العلمي الكردي العراقي، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، العدد الاول، ١٩٧٢.
٨- كلمة السيد احسان شيرزاد رئيس المجمع العلمي الكردي في الاجتماع الاول، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، العدد الاول، ١٩٧٣.
٩- قانون التعديل الاول القاون المجمع العلمي الكردي، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، العدد الاول، ١٩٧٣.
١٠- نظام المجمع العلمي العراقي (رقم ٦٢ لسنة ١٩٤٧)، "الوقائع العراقية" (الجريدة الرسمية)، بغداد، العدد (٢٥٦٠)، ١٩٤٧/١٢/١١.
١١- النظام الداخلي للمجمع العلمي الكردي، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، العدد الاول، ١٩٧٣.
١٢- مجلة المجمع العلمي العربي، الجزء (٤)، المجلد الاول، نيسان ١٩٢١، العدد (١)، ١ كانون الثاني ١٩٢١.
١٣- مجلة المجمع العلمي العراقي، بغداد، العدد (١)، أيلول ١٩٥٠.
١٤- مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الاول، القسم الاول، قانون المجمع العلمي الكردي، ١٩٧٣.
١٥- نزار، العدد (١٧)، ٣٠ تشرين الثاني ١٩٤٨.
١٦- "النور" (جريدة)، بغداد، العدد (٨٣)، ٢٠ كانون الثاني ١٩٦٩.
١٧- هەڵگورد، الشعب الكردي بحاجة الى مجمع علمي كردي، صوت الاكراد، العدد (٣٠)، ١٩٦٠/٩/١٨.
١٨- الوقائع العراقية (جريدة الرسمية)، العدد (٢٥٦٠)، ١٩٤٧/١٢/١١.
١٩- "الوقائع العراقية"، الجريدة الرسمية للجمهورية العراقية، العدد (١٩١٧)، ٨ أيلول ١٩٧٠، العددان (٢١٢٣ — ٢١٨١)، ١٥ نيسان ١٩٧٢، ص ٦ — ٧، ١١، أيلول ١٩٧٢.

## ملخص البحث

هذه الدراسة تبحث عن البواكير الاولى لمحاولات تأسيس المجمع العلمي الكوردي من قبل الجمعيات والأحزاب والمنظمات والصحافة والكتاب والمثقفين الكورد، حيث كان أحد مطالب الكورد بهدف خدمة لغتهم.

يتكون البحث من المقدمة والمحاولات لتأسيس المجمع العلمي الكوردي ومن ثم يتطرق إلى تأسيس المجمع العلمي العراقي عام ١٩٤٧ ومن ثم دعوات تأسيسه بعده لتأسيس المجمع العلمي الكوردي لغاية تاسيسه كثمرة اتفاقية ١١ ادار ١٩٧٠ التي تم بموجبها تمتع الكورد بالحكم الذاتي.



## Abstract

This research examines the first attempts to establish the (Kurdish academy, ( كۆڕی زانیاری كورد ) by few Kurdish organizations, political parties, Media, writers and intellectuals, as one of the demands of the Kurds in order to serve their own language .

The research contains an introduction and first attempts to set up Kurdish academy and then discussing the establishment of Iraqi academy in 1947. After that, there were dozen attempts to set up Kurdish academy.

Finally, the Kurdish academy was established on 11th March 1970, after declaration of Kurdish autonomy in Iraq.

# ڕۆڵی هۆزی جاف
# لە چالاکییە سیاسییەکانی باشووری
# کوردستان لە (١٩١٨-١٩٤٥ز)[*]

**سەیران ساڵح ئیسماعیل** **پ.ی.د. محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسوور**
کۆلێژی ئەدەبیات – زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

**پێشەکی**

هۆز بە پێکهاتەیەکی گرنگی کۆمەڵگەی کوردی نیوەی یەکەمی سەدەی بیست دادەنرا. هەرچەندە هۆز لایەنی ئەرێنی و نەرێنی هەبووە، بەڵام ڕاستییەکی روونی مێژووی کورد بووە ناکرێت بە بێ تێگەیشتن لە رۆڵی هۆز لە کوردستان لە مێژووی کورد بگەین. جاف لە گەورەترین هۆزە کوردەکانی کوردستانی عێراق بووە لەم ماوەیەدا و کاریگەری لەسەر بارودۆخی کوردستانی عێراق هەبووە. بۆیە (ڕۆڵی هۆزی جاف لە چالاکییە سیاسییەکانی باشووری کوردستان لە ١٩١٨ – ١٩٤٥ز) وەکو ناوونیشانی ئەم توێژینەوەیە دیاری کرا.

توێژینەوەکە بەسەر شەش ناوونیشانی لاوەکی دابەش کراوە ئەوانیش ئەمانەن: رۆڵی هۆزی جاف لە حکومەتی یەکەمی شێخ مەحموود، ڕۆڵی هۆزی جاف لە شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆدا، ڕۆڵی هۆزی جاف لە حکومەتی دووەم و سێیەمی شێخ مەحمووددا، هەڵوێستی بەگزادەکانی جاف دەربارەی کێشەی ویلایەتی موسڵ، ڕۆڵی هۆزی جاف لە ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرا ١٩٣٠، و رۆڵی هۆزی جاف لە شەڕی ئاوباریک دا.

شتێکی ئاساییە هۆزێکی وا گەورە یەک هەڵوێستی بەرامبەر بەم ڕووداوانە نەبێت، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بەشدارییەکی کارای لە هەموو ئەو ڕووداوانەدا هەبووە، هەڵوێستیشیان بە گشتی بەلایەنی

پشتگیری کردنی مافە نەتەوەییەکانی کورد بووە. تەنانەت هۆزی جاف بەشێکی گرنگی لە هێزی شێخ مەحموود پێکدەهێنا بە تایبەتی کە شێخ مەحموود خۆی هۆزێکی گەورەی نەبوو بە بەراورد بە هۆزی جاف.

هەروەها ئەوەی جێگای سەرنجە هۆزی جاف لە بنەڕەتدا لە کوردستانی رۆژهەڵات بۆ عێراق هاتبوون و لە کوردستانی باشووریش لە هەردوو لیوای سلێمانی و کەرکووک بوون. واتە بە گشتی هۆکارێکی بەیەکبەستنەوەی کورد بوون لەسەر ئاستی دوو بەشی کوردستان و دوو شاری کوردستان.

ئەوەی جێگای خۆشبەختییە سەرچاوەکان زانیاریی باشیان دەربارەی ئەو هۆزە بۆ تۆمارکردووین بە بەراورد بە هەندێک هۆزی کوردی تر کە سەرچاوەکان زۆر کەم زانیارییان لەسەر تۆمار کردوون، ئێمەش هەوڵمانداوە بەپێی توانا زیاترین سەرچاوەی تایبەت بەم ماوە مێژووییە بەکاربهێنین وەکو لە پەراوێز بەرچاو دەکەوێت.

لە کۆتاییدا هیچ کارێک بێ کەم و کوڕی نابێت، هیوادارین توێژەرانی تر سوودی لێ ببینن و لەو خاڵانە دەست پێبکەن ئێمە لێی وەستاوین.

**یەکەم/ ڕۆڵی هۆزی جاف لە حکومەتی یەکەمی شێخ مەحمووددا:**

شکستهێنانی عوسمانییەکان و سەرکەوتنی هاوپەیمانەکان لە جەنگی یەکەمی جیهاندا، بووە هۆی خۆشحاڵی مەحموود پاشای جاف، چونکە عوسمانییەکان لە کاتی جەنگدا ئەم پاشایەیان لە سەرۆکایەتی هۆزەکەدا لادا بە تۆمەتی پەیوەندیکردن لەگەڵ بەریتانیا، بەڵام (تاهیر بەگی جاف)[1] و کەسوکارەکەی پێچەوانەی مەحموود پاشا بوون[2]، کە جەنگ کۆتایی هات (مێجەرنۆئیل ١٨٨٦-١٩٧٤ ئەفسەری هەواڵگری ئینگلیز بوو لەلایەن تورکەکان بە لۆرەنسی کورد ناسرابوو) سەردانی مەحموود پاشای جافی کرد و داوای لێکرد هاوکاری بەریتانیا بکات، بەڵام ڕازی نەبوو[3]، ئەم ڕازی نەبوونە ئەوە دەسەلمێنێت کە مەحموود پاشای جاف لە کاتی جەنگدا پەیوەندیی بە بەریتانیاوە نەبووە، کەچی حەسەن جاف[4] پێی وایە ئەم هەڵوێستەی مەحموود پاشا تەنها بە هۆی پیری و نەخۆشی نەبووە بەڵکو بینوویەتی بەریتانیا زیاتر ڕوویان لە شێخ مەحموود کردووە، ئەم ڕەفتارەیانی بە کەمکردنەوەی شان و شەوکەتی خۆی لە قەڵەم داوە[5].

شێخ مەحموود داوای لە (ولسن، فەرمانڕەوای سیاسی بۆ عێراق لە لایەن ئینگلیزەکان داندرابوو) کرد، نۆئێل ڕەوانەی سلێمانی بکات، بە گەیشتنی ناوبراو بەریتانیا بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود ئیدارەی کوردیان ڕاگەیاند و شێخ مەحموود کرا بە (حوکمداری سلێمانی) لەم کۆبوونەوەیەدا هۆزە کوردەکان ئامادەبوون، یەکێک لەم هۆزانە هۆزی جافە، هەروەها لە کەسایەتی هۆزی جاف (عززەت عوسمان پاشای جاف)[6] وەک نوێنەری هۆزی جاف ئامادە بوو لە بۆنەکەدا و بنەماڵەکەی لەگەڵ شێخ مەحموددا بوون لە سەرەتا تا بۆ ئەوەی بتوانن بەیەکەوە سەربەخۆیی بۆ گەلی کورد بە دەست بهێنن، چونکە بڕوایان بە بەریتانیا هەبوو کە داواکاری کورد جێبەجێ دەکەن هەروەها کەریم بەگی فەتاح بەگیش لە گەرمیانەوە چووە سلێمانی بۆ پیرۆزبایی کردن لە شێخ مەحموود[7].

ئەو دەمەی شەریف پاشا لە کۆنگرەی ئاشتیی پاریسدا بەشدار بوو داوای مافی کوردی کرد، شێخ مەحموود وەک پاڵپشتێک بۆ شەریف پاشا[8] نامەو مەزبەتەی نووسی کە بە (ئەحمەد بەرزنجی)[9] (ڕەشید

کابان) [10]یدا نارد[11] چەندین کەسایەتی سلێمانی ئەم نامەیان واژوو کرد هەندێکیان جاف بوون وەک (حامید بەگی[12] جاف، میرزا عەبدوڵڵا مکائیلی، حەسەن جافی هارونی، ساڵحی عەبدولقادر، حەسەنی تەرخانی، رۆستەمی روغزایی)[13]، کاتێک ئاشکرا بوو بەریتانیا نەخشەیەکی بەدەستەوەیە بۆ لکاندنی کوردستانی تورکیا بەعێراقەوە شەریف پاشا بروسکەیەکی لە پاریسەوە نارد بۆ والی مووسڵ (رەشید پاشا) تیایدا لە نەخشەی بەریتانیا ئاگاداری کردەوە، هەر لەو بروسکەیەدا داوا دەکات کە لە داواکانی مەحموود پاشای جاف ئاگاداری بکاتەوە سەبارەت بە داخوازی کوردەکان بۆ چوونە پاڵ حکوومەتی ئیران چونکە (مەحموود پاشا) لەو باوەڕەدایە کە لەبارەی رەگەزایەتی و ئاینییەوە بەلایەوە باشترە وەک چوونە پاڵ عێراق[14].

پەیوەندیی نێوان شێخ مەحموود و بەریتانیا تێکچوو بەهۆی تێنەگەیشتنی هەردوولا لەسەر وشەی حکمدار[15]، بەریتانیا لە ئازاری ١٩١٩ لە کۆنگرەیەکیدا لە بەغدا بەسترا بۆ تاوتوێکردنی بارودۆخی کوردستان، لەم کۆبوونەوەدا (کۆلۆنێل لیجمن ١٨٨٠-١٩٢٠) ئەفسەری هەواڵگری بەریتانی)، (مێجەر سۆن ١٨٨١-١٩٢٣) لەلایەن ئینگلیزەکان بە حاکمی سیاسی سلێمانی داندرا)، (مێجەر نۆئێل) بەشدارییان کرد بڕیاریاندا کە مێجەر سۆن لە جێگای مێجەر نوئێل دابندرێت و دەسەڵاتی شێخ مەحموود کەم بکرێتەوە[16]، یەکەم هەنگاو بۆ لاوازکردنی شێخ مەحموود دابڕانی هەڵەبجە و رانیە و کۆیە بوو[17]، جافەکانی هەڵەبجە سووربوون کە راستەوخۆ لەگەڵ بەریتانیا مامەڵە بکەن، لەبەرئەوە بەریتانیا نوێنەری خۆی نارد بۆ هەڵەبجە[18]، ئەم نوێنەرە (کاپتن لیز) بوو پێش ئەوەی بچێتە هەڵەبجە سەردانی کفری کرد، چاوی بە بەگزادەکانی هۆزی جاف کەوت، پارەی مانگانەی دەدا بە بەگزادەکان، کە پێشتر لە شێخ مەحموودیان وەردەگرت[19]، کە بەریتانیا ئەم سیاسەتەی پەیڕەو کرد، جافەکان بۆیان دەرکەوت بەریتانیا سیاسەتی خۆی گۆڕیوە بەرانبەر بە شێخ، بەریتانیا لە ئازاری ١٩١٩دا کفری و کەرکوکی لە دەسەڵاتی شێخ مەحموود جیا کردەوە[20]، بێگومان مێجەر سۆن هەر لە خۆیەوە ئەو ئەفسەرەی دانەناوە بۆ هەڵەبجە، سۆن لە ڕاپۆرتێکی دیکە کە لە ساڵی ١٩١٩ ناردوویەتی بۆ

کاربەدەستانی باڵای وڵاتەکەی لە بەغدا، باسی ئەوەی کردووە کە لە کۆبوونەوەیەکیدا لە کەلار کە کەوتووەتە کەناری ڕووباری سیروان بە ئیجازەی حاکمی گشتی مەدەنی لە بەغداد ئەفسەرێکی پێشکەش بە جافەکان کردووە هەرچەندە ناوی نەهێناوە، بەڵام مەبەستی (کابتن لیز)ە، جافەکان پێشوازییان لەو ئەفسەرە کردووە[٢١].

بەریتانیا سیاسەتی خۆی بەرامبەر شێخ مەحموود گۆڕی بە تایبەتی کە زانی شێخ مەحموود پەیوەندی لەگەڵ بنکەی شەرناخ (واتە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی پەیوەندی نەپچڕاندبوو) هەیە[٢٢]، شێخ مەحموود کە زانی دەسەڵاتی لە نێو هۆزەکانی لاواز بووە دەستی کرد بە شۆڕشکردن[٢٣]، بۆ ئەنجامدانی ئەم شۆڕشە پشتی بەهێزی هۆزەکان بەست یەکێک لەم هۆزانە هۆزی جاف بوو[٢٤].

بەریتانیا کە هاتە کوردستان توانییان (عادیلە خانم) بۆ لای خۆیان رابکێشن، زانییان (عادیلە خانم) دەسەڵاتێکی بەهێزی هەیە لە هەڵەبجە و دەوروبەری[٢٥]، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو جافەکان لەگەڵ بەریتانیا بووبن، هەندێکیان لایەنگری شێخ مەحموود بوون[٢٦] بەگزادەکانی جاف لەم ماوەیەدا دوو دەستە بوون دەستەی یەکەم بە سەرکردایەتی عادیلە خانم و کوڕەکانی (ئەحمەد موختار جاف[٢٧]و عززەت پاشا) هەروەها (عەلی بەگی مەحموود پاشای جاف) لایەنگری بەریتانیا بوون دەستەی دووەم (حامید بەگی جاف، داود بەگی جاف[٢٨]، حەمە سەعیدی جاف) لایەنگری شێخ مەحموود بوون[٢٩] تێبینی ئەوە دەکرێت ئەم دوو هەڵوێستە تەواوی ئەندامەکانی هۆزەکە و تیرەکانیان ناگرێتەوە هەر وەک چۆن ئەم قسەیە بۆ نەوەکانیشیان هەر ڕاستە[٣٠]، ناکۆکی نێوان بنەماڵەی شێخان و بەگزادەکانی جاف دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (مەولانا خالیدی نەقشبەندی)[٣١] و (شێخ مارفی نۆدێ[٣٢])[٣٣].

ئەم ناکۆکییە زیادی کرد لە سەردەمی شێخ سەعیدی بەرزنجی کە بووە خاوەن زەویوزار، بەڵام هەرگیز نەبووە مایەی شەڕ و ئاژاوە لە ناوچەکەدا[٣٤].

شێخ مەحموود بە هاوکاری (مەحموود خانی دزڵی)[٣٥]، توانی سلێمانی بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی[٣٦]، (لیز) هەوڵیدا بەرهەڵستی

مـەحموود خـانی دزڵـی بکـات لەگـەڵ (ئەحمـەد موختـار جـاف) هێزێکـی ئامادەکرد کە لە پەنجا سواری جاف پێکهاتبوون بەڵام بەرەنگاری (دزڵی) نەبوونـــەوە، چونکـــە ژمـــارەی هێزەکانیـــان کـــەم بـــوو[٣٧]، لـــە هەڵەبجـــە پۆلیسەکان پشتگیری هێزی شێخ مەحموودیان کرد پشتیان لە لیز کرد[٣٨]، (لیز) لەلایـەن حامید بـەگی جاف گـەمارۆ درا[٣٩]، شـێخ مـەحموود حامید بـەگی کـردە قایمقـامی هەڵەبجـە[٤٠] بـەریتانیا ئاگـاداری لیـزی کـرد کـە بکشـێتەوە بـۆ خانـەقین، بۆیـە ئـەویش نەخشـەی کشـانەوەی دانـا داوای یارمەتی لە (عادیلە خانم) کرد کە هاوکاری بکات، نەخشەکەی بەم شێوەیە بوو، کە (عادیلە خانم) دوو سـوار بنێرێت بـە رێگـەی خانـەقین بـۆ مـاوەی دوو کاتژمێر دوور بکەونەوە، بە هەمان رێگەشدا بگەڕێنەوە، وەک ئەوەیـە کە لـە خانـەقین گەڕاونەتـەوە (لیـز) ڕایگەیانـد کـە هەشـت فڕۆکـەی جـەنگی دێت بۆ هەڵەبجە دەبێت شوێن بۆ فڕۆکەکان خۆش بکەن تا فڕۆکەکانی لێ بنیشێت، شۆڕشگێڕەکان بارەگای لیزیان چۆڵ کرد، لیز وا خۆی پیشـان دا کە سەرپەرشتی کارەکە دەکات، سـواری ئەسـپ بـوو لەگـەڵ عـەلی بـەگی جـاف و ئەحمـەد موختـار جـاف و بیسـت سـوار بـەرەو شـاری خانـەقین کشایەوە[٤١].

ئەو هێزەی کە شـێخ مـەحموود ئامـادەی کردبـوو کـە دژی بـەریتانیا بجـەنگێ بەشـێکی لـە تیـرەی ئیسـماعیل عـوزێری بـوون کـە تیرەیەکـە لـە هـۆزی جـاف[٤٢]، لـە شـەڕی تاسـلوجە[٤٣] و بازیـان[٤٤]، کـە شـێخ مـەحموود دژی بەریتانیا ئەنجامیدا، جافەکان لەم شەڕانەدا رۆڵیان هەبوو، بە تایبـەتی تیرەی ئیسماعیل عوزێری و میکائیلی، لـە شـەڕی دەربەنـدی بازیـان شـێخ مـەحموود شـکا و دەسـتگیر کـرا[٤٥]، عادیلـە خـانم نامـەی بـۆ سـەرۆک هۆزەکان نارد کە لایەنگری شێخ مـەحموود نەکـەن ئەمـەش دەبێتـە مایـەی نیگەرانی لە هەڵەبجە، لە ئاکامدا شێخ رەشید و شێخ کـەریمی عەبابـەیلێ و حامیـد بـەگی جـاف دژی بـەریتانیا و عادیلـە خـانم راپـەڕین لـە ئەنجامـدا (شەڕی ئەشکەوەل) [٤٦] کە دەکەوێتە نێوان هـەر دوو گونـدی عەبابـەیلێ و هـاوارەوە روویـدا[٤٧] بەریتانییـەکان بـەردەوام ترسـی ئـەوەیان هـەبوو کـە جافەکان هاوکاری شێخ مەحموود بکەن تـا سـەر لـە شـەڕەکاندا بـێ لایـەن نەمێنێتـەوە[٤٨] وەک لـە راپۆرتەکانیانـدا هـاتووە جافـەکان دەتـوانن بـە

مـاوەیـەکی کـەم شـەش هـەزار سـوارچاك کۆبکەنـەوە، بۆیـە بـەریتانیا بـەردەوام هـەوڵی دەدا کـە جافـەکان لـە شـێخ دوور بخاتـەوە[٤٩]، لـە دوای شکانی شێخ مـەحموود (لیز) گەڕایەوە هەڵەبجە، بەریتانیا نازناوی (خـان بـەهادور) [٥٠] ی دا بـە عادیلـە خـانم[٥١] جەنـەراڵ ( فریـزەر) خـۆی هاتـە هەڵەبجە سوپاسی عادیلە خانمی کرد[٥٢].

له سەر داوای عادیلە خانم و ئەحمەد موختار جاف لە حامید بەگی جاف و شێخەکانی عەبابەیلێ خۆش بوون و گەڕانەوە هەڵەبجە، هـەروەها لـە سـەر داوای ئـەم دووانـە مـەحموود خـانی دزڵیـان ئـازاد کـرد[٥٣] بـەڵام بەریتانیا سەرانەی خستە سەر حامید بەگ و داود بەگی جاف بەتۆمـەتی ئەوەی کە هاوکاریی شۆڕشی شێخ مەحموودیان کردووە[٥٤]. بە تێڕوانینی ئێمە عادیلە خانم بۆ پاراستنی هۆزەکەی و بۆ ئەوەی بە سەربەستی بژین و کەس فەرمانی لەسەر نەکات، و ئەحمەد موختار جافیش باوەڕی وابوو ئەگەر کورد لەگەڵ بەریتانیا بێت مافەکان بەدەست دەهێنن، بۆیە لایەنگری بەریتانیا بوون.

کە شێخ دەستگیر کرا ڕەوانـەی بەغدا کرا و درا بـە دادگـای عـورفی (سەربازی) بەریتانی[٥٥]، بەریتانیا لە کاتی دادگاییکردندا چەند شایەتێکی لە سلێمانی برد بۆ بەغدا کە دژی شێخ مـەحموود شـایەتی بـدەن یـەکێک لـەم شـایەتدەرانە عـززەت بـەگی جـاف بـوو[٥٦]، سـەرۆکی دادگـا پرسـیاری لـە عززەت بەگی جاف کرد: ئایا شـێخ هـانی خەڵکەکـەی دا، بـۆ خۆپیشـاندان؟ عززەت پاشا وتی: نەخێر، هانی کەسی نەدا بەڵکو خۆشی هاوبەشـی گـەلی کـرد لـە هەسـتەکەیدا بـۆ خۆپیشـاندانەکە و بەرهەڵسـتی کـردن لـە مـافی گەلەکەی[٥٧] ئەم قسانەی عززەت بەگ ئـەوە دەگەیـەنێت کە شـاهێدی دژی شـێخ نـەداوە. بـەریتانیا لـە سـەرەتا فـەرمانی لـە سـێدارەدانی بـۆ شـێخ مـەحموود دەرکـرد، بـەڵام دواتـر گـۆڕا بـۆ دوورخسـتنەوەی لـە وڵات[٥٨]. دوای دوورخسـتنەوەی شـێخ مـەحموود، کوردسـتان لەلایـەن بـەریتانیاوە ڕاسـتەوخۆ بـەڕێوە دەبـرا، کـە ئـەوان لـەم کارەیانـدا پشـتیان بـە جافـەکان بەسـت، یـەکێک لـە ئەندامـەکانی ئـەو ئەنجوومەنـەی لـە شـاری سـلێمانی دروستیان کردبوو (حامید بـەگی جـاف) بـوو[٥٩]، هـەمان ئەنجوومـەنیان لـە هەڵەبجـەش دروسـتکرد ئەندامـە دیارەکـانی بریتـی بـوون لـە (ئەحمـەد

موختـار جـاف، عـەلی بـەگی مـەحموود پاشـای جـاف، کـەریم بـەگی فـەتاح بەگی جاف...)[٦٠]، هەروەها ئەحمەد موختار کرایە قائیمقامی هەڵەبجە[٦١].

**دووەم/ رۆڵی هۆزی جاف له شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەڵۆ[٦٢]دا:**

لە دوای دوورخستنەوەی شێخ مەحموود چەندین شۆڕش و راپەڕین بەرپابوو، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٢٠ لە ژاڵە لای دێی (کرپچنە) هەندێک لە سـەرۆک هۆزەکـانی کـورد کۆبوونـەوە[٦٣] و بـەرەنگاری هێـزی بـەریتانیا بوونـەوە تـا بـەریتانیا ناچاربێت شـێخ مـەحموود بگەڕێنێتـەوە. یـەکێک لـەو هۆزانەی کە بەشدارییان کرد هۆزی جاف بوو، بەتایبەتی لقی میکائیلی و روغزایـی[٦٤]، هـەروەها هـۆزی جـاف و دەڵـۆ لـە نێـوان ناوچـەی دوزخورمـاتوو و کـەرکووک لـە سـاڵی ١٩٢٠ هێزیـان کـۆکردەوە بـۆ دەرکردنی ئیدارەی بەریتانیا[٦٥].

لـە شـاری کفریدا لـە بـەر چەند هۆکارێک شـۆڕش سـەری هەڵدا[٦٦]، ئیبراهیم خانی دەڵۆ، لە ٢٢ی ئابی ١٩٢٠ روویکردە چیای (بـاوە شاسـوار) کە دەڕوانێتە سەر کفری تەقەی لە بنکەی پۆلیسی کفری کرد هێزەکانی لە هەردوو تیرەی روغزایی و میکائیلی پێکهاتبوون[٦٧]، سالمون کە ئەفسەری سیاسی بەریتانیا بوو لە کفری لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە دەستگیر کرا[٦٨]، ئیبـراهیم خـانی دەڵـۆ شـاری کفـری ئـازاد کـرد[٦٩] شۆڕشـگێران بـۆ بـەڕێوەبردنی شـار ئەنجوومـەنێکیان دامەزراند دوو لـە ئەندامـەکانی جـاف بوون (حەمە جافی روغزایی، حاجی محەمەدی تەرخانی)[٧٠]، چەکدارەکان دەستیان بەسەر مەترەلۆز (جۆرە چەکێکە بە خێرایی گوللە دەهاوێژێت) دا گـرت یـەکێک لـە سـوارچاکان (ئەسـعەدی تـەرخانی) بـوو[٧١]، موکـەڕەم تاڵەبانی لە کتێبەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە بـەگزادەکانی جاف رێگـەیان نەداوە هاوکاری بۆ ئیبراهیم خانی دەڵۆ بچێت[٧٢]، بـەڵام حەسـەن جـاف لـە کتێبەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف پەیوەندی لەگـەڵ ئیبـراهیم خـانی دەڵـۆ بـاش بـووە، رۆژانـە هـەواڵی جووڵانـەوەکانی بەریتانیای بۆ ئیبراهیم خانی دەڵۆ لـە رێگـەی (عـەلی جغـەرە) ناردووە[٧٣]، کە بەریتانیا داوای یارمەتی لە کەریم بەگی جاف کردووە بۆ هێرشکردنە

سەر ئیبراهیم خانی دەڵۆ، کەریم بەگ بە نهێنی نامەی نارد بۆ ئیبراهیم خان تا خۆی رزگار بکات[٧٤].

بەریتانیا لەگەڵ شێخ وەهاب تاڵەبانی و عەبدولکەریم وادی هێزیان کۆکردەوە بۆ هێرشکردنە سەر کفری[٧٥]، توانییان کفری داگیربکەن بەریتانیا شێخ حەمید تاڵەبانی کردە قائیمقامی کفری[٧٦]، شێخ وەهابی کردە مودیری دەرەک (جەندرمە هێزێکی سەربازی نیزامی بوو ئەرکی جۆربەجۆری پێ دەسپێردرا)، عەبدولکەریمی وادی کرا بە بەرپێوەبەری ناحیەی زەنگەنە[٧٧]، هەر چەندە کەریم بەگی فەتاح بەگ لەگەڵ شۆڕشی ئیبراهیم خان نەبوو بەڵام دژیشی نەوەستاوە، توانی هەندێک لە ماڵ و ماڵاتی شۆڕشگێڕەکان لە تالانی ئینگلیز بپارێزێت[٧٨]. بە بۆچوونی ئێمە لەم دابەشکردنە ئیدارییەدا دەردەکەوێت کە بەگزادەکانی جاف هاوکاری بەریتانیایان نەکردووە چونکە هیچ پۆستێکی ئیدارییان بە بەگزادەکانی جاف نەبەخشیوە.

لەم ماوەیەی کە شێخ لە کوردستان نەبوو، پەیوەندیی عادیلە خانم و بەریتانیا کەمێک تێکچوو لەبەر چەند هۆکارێک لەم هۆکارانە، لە دوای مردنی مەحموود پاشای جاف، عەلی کوڕی کرا بە سەرۆکی جاف، بەڵام (دەنگلیز)، کە جێگری حاکمی سیاسی بەریتانیا بوو لە هەڵەبجە ئەم پلەی لە عەلی بەگ وەرگرتەوە و دای بە کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، بە هۆی لێنەهاتوویی عەلی بەگ، ئەمەش بووە هۆی ناڕەزایی عادیلە خانم و بەگزادەکانی هەڵەبجە بە دانی ئەم پلەیە بە ئەندامی لقێکی بچووکی بنەماڵە بە دڵیان نەبوو[٧٩]، هەروەها بەریتانیا ئەحمەد بەگی ریشێنی دەستگیرکرد بە تۆمەتی ئەوەی کە پەیوەندیی بە مەحموود خانی دزڵییەوە هەیە[٨٠]، ئەحمەد ریشێن زاوای عادیلە خانم بوو، ئەمەش بووە هۆی ناڕەزایی عادیلە خانم لە بەریتانیا، دواتر ئەحمەد ریشێن توانی ڕابکات و لەگەڵ سوپای بەریتانیا شەڕی کرد لە ئەنجامدا (کاپتن ڤیز گیفن) کوژرا[٨١]، هەروەها لەم ماوەیەدا لە هەڵەبجە کۆمەڵێک پەیدابوو کە بیری نەتەوایەتی لە هەڵەبجە بڵاودەکردەوە[٨٢].

ئیدمۆندس وای بۆ دەچێت ئەم ئاژاوەیە کە لە هەڵەبجە ڕوویدا بە نەخشەی بەگزادەکانی جاف بووە لە سەرووی هەموویانەوە عادیلە خانم ،

بەڵام عادیلە خانم هەر ئەوەی دووپات دەکردەوە، ئێستاش هەر بۆ دەوڵەتی خاوەن شکۆ وەفادارە، بەڵام لەگەڵ نوێنەری نوێی بەریتانیا پەیوەندیی باش نەبوو[٨٣]، چونکە عادیلە خانم بە دەستی پۆڵایین فەرمانڕەوایی هۆزەکەی دەکرد، ئێستاش لەوە بێزارە لەلایەن ئەفسەرێکی لاوەوە بەرزەفت بکرێت[٨٤].

**سێیەم/ رۆڵی هۆزی جاف لە حکومەتی دووەم و سێیەمی شێخ مەحموود دا:**

بە هۆی شۆڕش و راپەڕینەکانی کوردستان و هاتنی سوپای تورک بە سەرکردایەتی ئۆزدەمیر پاشا بۆ رەواندز[٨٥]، بەریتانیا بڕیاریدا شێخ بگەڕێنێتەوە کوردستان، بەریتانیا بە مەرجێک شێخ دەگەڕێنێتەوە، کە سوپای تورک لە کوردستان دەربکات[٨٦]، پێش ئەوەی شێخ بگاتە کفری وەفدێک بۆ پێشوازی شێخ چوو بۆ کفری عززەت بەگی جاف بوو بە یەکێک لە ئەندامانی وەفدی پێشوازی[٨٧]، لە کفریش حەمە بەگی جاف بوو لە نێو ئاپۆرەی پێشوازیکەراندا بوو[٨٨] هەروەها بەگزادەکانیش روویان کردە ئەو شارە بۆ هەمان مەبەست وەک (کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، حامید بەگی جاف، ئەحمەد موختار جاف)[٨٩]، شێخ گەیشتە سلێمانی و بەگزادەکانی جاف و کوێخاکانی جاف وەکو تەرخانی و روغزایی و سادانی ..هتد، سەردانی شێخیان کرد[٩٠]، عادیلە خانم لەگەڵ ژمارەیەک لە دەست و پێوەندەکانی بۆ پیرۆزبایی سەردانی شێخ مەحموودی کرد[٩١]، هەندێک لە سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کە بەگزادەکانی جاف بەگەڕانەوەی شێخ رەشبین بوون[٩٢] بەڵام ئەو پێشوازییەی کە لەلایەن بەگزادەکانی جاف کرا بۆ شێخ بە پێچەوانەی ئەم قسانەیە.

بۆ لکاندنی هەڵەبجە بە شاری سلێمانییەوە شێخ مەحموود (محەمەد غەریب ئەفەندی[٩٣]) ناردە هەڵەبجە کە رەئیسی داخلی (وەزیری ناوخۆ)ی کوردستان بوو، بە ئامادەبوونی بەگزادەکانی جاف ئاڵای سەربەخۆیی لەم شارەدا هەڵکرد[٩٤]، حکومەتی بەریتانیا و عێراق لە (٢١ی کانوونی یەکەمی١٩٢٢) بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە، کە تێیدا دان بە حوکمەتی کوردیدا دەنێت لە چوارچێوەی عێراقدا[٩٥]، بۆ ئەو مەبەستە شێخ مەحموود وەفدی نارد بۆ بەغدا یەکێک لە ئەندامەکان عززەت بەگی جاف بوو بەریتانیا زۆر سەرسام بوو کاتێک کورد بەناوی ئەندامانی حکومەتی

کوردی قسەیان دەکرد[٩٦]، دووبارە لە (١٩ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣) وەفدێکی تری نارد بۆ کەرکووک بە سەرکردایەتی (محەمەد بەگی جاف[٩٧]و تاهیر ئەمین جاف) [٩٨]، جارێکی تر شێخ مەحموود وەفدی بۆ کەرکووک بە سەرکردایەتی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف و چەند کەسانی تر نارد، بەڵام ئەم گفتوگۆیانە سەری نەگرت[٩٩].

لە ئەنجامی سەر نەگرتنی ئەم گفتوگۆیانە شێخ مەحموود پەیوەندی بە تورکیا کرد[١٠٠]، شێخ مەحموود کرا بە (سەرۆکی دەستەی نوێنەرانی کوردستان) بۆ ئەوەی بەناوی کوردەکان لەگەڵ ئۆزدەمیر پاشا گفتوگۆ بکات، لەگەڵ سەرۆک هۆزەکان کۆبووەوە، لە ئەنجامدا بیست و شەش سەرۆک هۆز واژوویان کرد شێخ مەحموود سەرکردایەتی ئەم هەیئەتە بکات، هەندێک لەم سەرۆک هۆزانە کە واژوویان کرد جاف بوون بۆ نموونە حامید بەگی جاف[١٠١].

ئەحمەد موختار جاف لە ساڵی ١٩٢٣ سەردانی شێخ مەحموودی لە سلێمانی کرد، لەم ماوەیەدا سلێمانی بەسەر دوو دەستە دابەش بوو دەستەی یەکەم لایەنگری تورکیا بوون، کۆمەڵەی دووەم لایەنگری بەریتانیا بوون، ئەحمەد موختار جاف لایەنگری دەستەی دووەم بوو لەوباوەڕە دابوو کە کورد لە ڕێگەی بەریتانیا ماف بەدەست دێنن، بۆیە پێویستە شێخ سیاسەتی لەگەڵ بەریتانیاوە نەگۆڕێت بە نزیکبوونەوە لەگەڵ ئۆزدەمیر پاشا[١٠٢]، لەو کاتەدا کە شێخ بەرەو شاخەکانی کوردستان چوو ئەحمەد موختار جافیش هاوەڵی بوو[١٠٣]، بەڵام بە هۆی نەیارانی وایان لە شێخ گەیاند کە ئەحمەد موختار جاف لەگەڵ بەریتانیادایە، بۆچوونێکی تریش ئەوەیە دەڵێت کە ئەحمەد موختار کۆمەڵێک هەڵوێستی هەبووە بەرامبەر بە خەڵکێک کە لە دەوروپشتی شێخدا بوون و شێخیان زۆر بە هەڵەدا بردووە نەیانویستووە خوێندەوار و ڕۆشنبیر لە شێخ نزیک ببنەوە، هەر ئەوانەش بە دووزمانی و نەخوێندەوارییان و خۆبردنە پێشەوە شێخیان تووشی ئەو هەڵەیە کردووە[١٠٤]، بۆیە شێخ، ئەحمەد موختاری زیندانی کرد و ڕەوانەی ئەشکەوتی جاسەنەی کرد لە سووررداش، ڕەنگە شێخ لەوە نەگەیشتبێ کە لاوێکی خوێن گەرمی دڵسۆزی وەک ئەحمەد موختار پشت بکاتە

کەسوکارو دەسەڵاتی خۆی ژیانی ئەشکەوتی لە پاڵ شێخدا لەو هەڵوێستی ئەوان پێ باشتر بێت[١٠٥].

بیروبۆچوونی جیاواز هەیە دەربارەی ئازاد کردنی ئەحمەد موختار جاف هەندێک دەڵێن رایکردووە[١٠٦]، بەڵام ئەم بۆچوونە لاوازە، چونکە دوای دامەزراندنی حکومەتی سێیەمی شێخ مەحموود ئەحمەد موختار جاف سەردانی شێخی کردووە. ئەو بۆچوونەی کە زۆربەی مێژوونووسان لە سەری کۆکن ئەوەیە کە ئەحمەد موختار جاف پارچە شیعرێک بۆ شێخ مەحموود دەنووسێ و دەنێری دەستبەجێ شێخ ئازادی دەکات[١٠٧].

**سەبا عەرزی خلووسی و بەندەگیم و  هەم دوعاخوانی**

**ببە بۆ خزمەتی شاهی موحیتی  گشت سلێمانی**

**بڵێ قوربانی تۆ  بم   ئەی  سەلاحەددینی**

**بە زۆری پەنجە وەک حەیدەر،  بە سیما یووسفی  سانی**

لەو کاتەدا حکومەتی شێخ مەحموود دەڕووخێ، شێخ مەحموود بەرەکانی شەڕ دابەش دەکات بەرەی شارەزوور دەدرێتە (خەلیفە یونس روغزایی و حەمە عەلی رۆستەم روغزایی)[١٠٨]، شێخ مەحموود دووبارە لە (١٧ی حوزەیرانی١٩٢٣) دەگەڕێتەوە سلێمانی بەگزادەکانی جاف سەردانی شێخ مەحموود دەکەن وەک ئەحمەد موختار جاف و حامید بەگی جاف و عززەت بەگی جاف[١٠٩]، بەریتانیا چاودێری بەگزادەکانی جافی دەکرد، کە زانی سەردانی شێخیان کردووە، ئینزارێکی توندوتیژی بۆ بەگزادەکانی جاف نارد، کە تیایدا ئاگاداری ئەوەی کردنەوە کە حکومەتی شێخ مەحموود هەڵوەشاوەتەوە، هەروەها هەڵەبجەش لە ئیدارەی سلێمانی جیاکراوەتەوە، داوایان لێ کرا راستەوخۆ پەیوەندی بە ئەفسەرە بەریتانییەکانەوە بکەن لە رێگەی کفرییەوە[١١٠].

بەریتانیا لە بەڵگەنامەکاندا ئەوەی روونکردۆتەوە کە هەندێک لە بەگزادەکانی جاف لایەنگری شێخ مەحموودن  وەک ئەحمەد موختار و عززەت پاشا، ترسیان لەوە هەیە کە ئەمانە وەلائیان بۆ بەریتانیا نەبێت[١١١]، عادیلە خانم پەیوەندی بە ئیدمۆندس کرد داوای لێ کرد کە چاویان بەیەکتر بکەوێت، ئەوە بوو لە گوندی پیسەکان یەکتریان بینی

لەگەڵ خۆی ئەحمەد موختار جاف و عززەت پاشای برد دووبارە گوێڕایەڵیی خۆیان بۆ بەریتانیا دووپاتکردەوە[١١٢]، هەرچەندە ئەحمەد موختار جاف گوێڕایەڵیی خۆی بۆ بەریتانیا دووپات کردەوە، لەگەڵ شێخ مەحموود نەبوو، هەرگیز تیر و توانج و قسەی ناشیرنی بەرامبەر شێخ بەکار نەهێناوە[١١٣].

لەو کاتەدا حکومەتەکەی شێخ مەحموود لەناوچوو هەندێک لە جافەکان سەرکردایەتی هێزەکانی شێخ مەحموودیان کرد، وەک محەمەد عەلی ڕۆستەم روغزایی، خەلیفە یونس، مەحموود خاتر ئیسماعیل عوزێری[١١٤]، خەلیفە یونس لە چەندین شەڕدا بەشداری کردووە، وەکو شەڕی (کۆزە ڕەقە) [١١٥] کە تیادا سەرکەوتن[١١٦]، خەلیفە یونس زۆر ئازایانە شەڕی دەکرد، بۆیە بەریتانیا بیست هەزار ڕوپیەی کردە خەڵات بۆ ئەو کەسەی دەستگیری بکات[١١٧]. بەهۆی ئازایەتی تیرەی روغزایی بەریتانییەکان بەردەوام چاودێرییان دەکردن، داوایان لێ دەکرا خۆیان بەدەستەوە بدەن[١١٨]، چەندین جار ناوچەی جافایەتی بە تایبەتی روغزاییەکان بۆمباباران کراون، بە هۆی لایەنگیری کردنیان بۆ شێخ مەحموود[١١٩] تەنانەت گوندەکانیان سووتێندراوە لە لایەن هێزی بەریتانیاوە بە تایبەتی گوندەکانی شاتری و روغزایی[١٢٠] ئەم بۆمباباران کردنە وای کردووە کە هۆزەکانی جاف لە شێخ مەحموود جیابنەوە[١٢١]، لە (٤ی ئەیلوولی ١٩٢٦) گفتوگۆ لە نێوان شێخ مەحموود و بەریتانیا کرا لە خورماڵ، لەم کۆبوونەوەیەدا بەریتانیا ڕایگەیاند لەو کەسانە خۆش نابێت کە گوناهی گەورەیان کردووە، کە مەبەستی لە خەلیفە یونس ڕوغزایی بووە[١٢٢]، لە ترسی هاوکاری ماددی و سەربازیی جافەکان بۆ شێخ مەحموود لە مانگی تشرینی یەکەمی١٩٢٥موتەسەریفی سلێمانی ئاگاداری دەرکرد بۆ هۆزی جاف کە هیچ سەرپێچییەک لە دژی حکومەتەکە ئەنجام نەدەن لە کاتی پەڕینەوەیان لە سنووری ئێران بۆ عێراق[١٢٣].

**چوارەم/ هەڵوێستی بەگزادەکانی جاف دەربارەی کێشەی ویلایەتی مووسڵ:**

لـە دوای کۆتاییهـاتنی جـەنگی یەکـەمی جیهـان، کێشـەی ویلایـەتی مووسـڵ لـە نێـوان تورکیـا و بـەریتانیا سـەری هەڵـدا، بـە تایبـەتی دوای سـەرکەوتنی کەمالییـەکان بەسـەر یۆنانییەکانـدا، ئینجـا تورکیـا داوای ویلایەتی مووسڵی دەکرد، تورکیا رایگەیاند، کە ویلایەتی مووسڵ بەشێکە لە تورکیا[١٢٤] کێشەی نێوان بەریتانیا و تورکیا بە گفتوگۆ چارەسەر نەکرا، بۆیـە بڕیـاردرا لیژنەیـەک لـە لایـەن کۆمەڵـەی گـەلان پێکبهێنرێـت بـۆ چارەسەرکردنی کێشەکە[١٢٥].

کاتێک لیژنەکە دەگاتە کفری (کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف) زۆر بە راشـکاوی لایـەنگری عێراقـی کـرد و دژی چوونـە پـاڵ دەوڵـەتی تورکیـا بوو[١٢٦]، پێش ئەوەی لیژنەکە بگاتە سلێمانی (جەواد پاشا، نوێنەری تورکیا بوو بۆ چاودێری لیژنـەی کۆمـەڵـەی گەلان تایبـەت بـە ویلایـەتی موسـل) لیسـتێکی دا بـە لیژنەکـە کـە نـاوی ئەحمـەد موختـار جـاف و کـەریم بـەگی جـافی تیـا بـوو، کـەوا ئەمانـە هـاتوون بـۆ سـلێمانی بـۆ نانـەوەی ئـاژاوە و لایەنگری بەریتانیا دەکەن[١٢٧]، کە لیژنەکە گەیشـتە سـلێمانی یـەکێک لەوانـە کە پرسی پێکرا کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف بوو، کە رازی بوو مووسـڵ بخرێتە سەر عێراق بە مەرجێک مافی کورد دابین بکرێت و زمانی کوردی زمـانی فـەرمی بێـت لـە قوتابخانـە و دادگاکانـدا[١٢٨]. لـە کـاتی هـاتنی ئـەم لیژنەیە شێخ مەحموود هێمنی پاراست، کەچی بـەریتانیا زۆر دەترسـا کـە شێخ ئاژاوە دروست بکات لەکاتی هاتنی لیژنەکە[١٢٩] هەرچەندە لە کۆتاییدا ئەحمەد موختار جاف بە پارچە هۆنراوەیەک بێ هیـوایی خـۆی دەردەبـڕێ لە بەڵێنی کۆمەڵەی گەلان[١٣٠].

**دێتە گوێم دەنگێ بەسۆز و شیوەن و گریانەوە**
**ناڵەی دڵمە لە حەسرەت خاکی کوردستانەوە**

**پێنجەم/ رۆڵی هۆزی جاف لە راپەڕینی بەردەرکی سەرا ١٩٣٠:**

حکومـەتی عێراق داوای گۆڕانی پـەیمانی ١٩٢٦ی دەکرد، کـە لەگـەڵ بەریتانیا مۆرکرابوو، چونکە بەپێی ئەم پەیمانە عێراق بۆ ماوەی ٢٥ساڵ لە ژێـر (ئینتیـداب)[١٣١]ی بـەریتانیا دەمایـەوە[١٣٢]، چەنـدین گفتوگـۆ لـە نێـوان

عێراق و بەریتانیا بەڕێوەچوو بۆ گۆڕینی ئەم پەیمانە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو تا (کلبیرت کلایتۆن) (١٨٧٥-١٩٢٩) بووە مەندوبی سامی لە عێراق و بەڵێنی دا بە گۆڕینی ئەم پەیمانە و عێراق ببێتە ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان[١٣٣]، پەیمانی (١٩٣٠)[١٣٤] لە نێوان عێراق و بەریتانیا مۆرکرا[١٣٥]، ئەم پەیمانە گومانی خستە دڵی کوردەوە بە تایبەتی ئەو خاڵەی کە پەیوەندیی بە ئەندامبوونی عێراقەوە هەبوو کۆمەڵەی گەلان بەبێ مەرج، ئەمە واتای ئەوەیە ئەو بەڵێنانەی کە پێشوو بە کورد دراوە جێبەجێ ناکرێت[١٣٦]. ئەم پەیمانە لە هیچ خاڵێکیدا باسی کورد ناکات[١٣٧]، بۆیە کوردەکان دەستیان کرد بە یادداشت نووسین بۆ کۆمەڵەی گەلان، بۆ نموونە لە (٦ی تەمووزی١٩٣٠) کۆمەڵە کەسانێک یادداشتێکیان نووسی داوای جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلانیان کرد، کە تایبەتە بە کورد یەکێک لە وانەی یادداشتەکەی واژوو کردبوو عززەت بەگی جاف بوو[١٣٨].

هەروەها بیست و چوار سەرۆک هۆزی کورد[١٣٩] لە (٢٠ی تەمووزی١٩٣٠) بروسکەیان بۆ وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن نارد، داوایان کردبوو کە مافی کورد لە پەیمانەکەدا هەبێت، هەروەها داوای خودموختارییان کردبوو، لە بەگزادەکانی جاف کە ئەم بروسکەیان واژوو کردبوو پێکهاتبوون لە (حەسەن بەگ، حوسێن بەگ، عەبدوڵڵا و ئەحمەد بەگ و داود بەگ و عەلی بەگ و شێخ رەشید و عەبدوڵڵا نەوڕۆڵی) [١٤٠].

مەعرووف جیاووک[١٤١]، محەمەد پاشای جاف یادداشتێکیان نارد بۆ مەندوبی سامی بەریتانیا داوای مافی کوردیان کردووە[١٤٢]، حکومەتی عێراق بڕیاریدا هەڵبژاردن لە (١٠ی تەممووزی١٩٣٠ تا١٠ی ئەیلوولی١٩٣٠) ئەنجام بدرێت[١٤٣]، ئامانجی ئەم هەڵبژاردنە دیاریکردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران بوو تا پەیمانی١٩٣٠ واژوو بکات[١٤٤]، لە سلێمانی کۆمەڵەیەک دامەزرا بە ناوی کۆمەڵەی (هەیئەتی وەتەنی) کە یەکێک لە ئەندامەکانی عززەت بەگی جاف بوو[١٤٥]، بڕیاریاندا بەشداری لە هەڵبژاردنەکەدا نەکەن و داواشیان لە خەڵکی سلێمانی کرد بەشداری هەڵبژاردن نەکەن[١٤٦].

بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخی سلێمانی میر غازی (١٩١٢-١٩٣٩) بڕیاری دا سەردانی سلێمانی بکات ئەم کۆمەڵەیە پێش گەیشتنی میر غازی

داوایان لە خەڵک کرد کە خۆپیشاندانێکی هێمنانە بکەن بۆ داوا کردنی مافی کورد لە (١٦ی تەمموزی١٩٣٠) (میر غازی) گەیشتە سلێمانی[١٤٧].
هەر بۆ مەبەستی هێورکردنەوەی کوردستان حکومەتی عێراق شاندێکی بە سەرکردایەتی جەعفەر عەسکەری و (میجەر یۆنگ) پێکهینا بۆ ئەوەی سەردانی شارەکانی کوردستان بکەن[١٤٨]، لە کفری مەعرووف جیاووک چاوی بە محەمەد پاشای جاف دەکەوێت، ناوبراو بە جیاووک دەڵێت کە بە فەرمی لەلایەن موتەسەریفی کەرکووکەوە بانگ کراوە بۆ بەشداریکردن لەم کۆبوونەوەیەدا بۆیە جیاووک داوای لێ دەکات کە لەم کۆبوونەوەیەدا داوای جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان تایبەت بە کورد بکات[١٤٩].

کاتێک شاندەکە گەیشتە کەرکووک نوێنەرەکان وتاریان خوێندەوە، بەڵێنیاندا کە هەموو بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان کە تایبەتە بە کورد جێبەجێ بکەن، عەبدوڵڵا سافی ڕایگەیاند کە کەرکووک تەنها لە عەرەب و تورک پێکهاتووە، محەمەد جاف هەڵساوە و وتی (لیوای کەرکووک زۆربەی هەرە زۆری کوردن یەعنی لە ١٥٠ هەزار نفوس١٢٠ هەزار کوردێکی خالیصە....)، ئینجا عەبدوڵڵا سافی هەڵساوە و وتی (ئەم زاتە بەناوی کێوە قسە دەکات؟ ئەم جافانە عائیدی سلێمانیەنە، هەموو دوو ساڵە بە شاری کەرکووک بەستراوە...)، محەمەد جاف وەڵامی داوە وتی (من بە ناوی ١٥٠ هەزار جافەوە قسە ئەکەم، من کوردم، بە کوردی ئەژیم بە کوردی ئەمرم، ئەم مەملەکەتە کوردە...)[١٥٠]، جەعفەر عەسکەری (١٨٨٥-١٩٣٦) ڕووی کردە محەمەد جاف پێی وت (بە شەرەفی خۆم و حکومەتم دڵنیات دەکەم بە تەواوی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان بۆت جێبەجێ بکەم، سەرۆکەکانی هەمەوەند و جاف و دزەیی زۆر بەبڕواوە بە جەعفەر عەسکەرییان وت (ڕازی بیت یان نا ئێمە مافی خۆمان بە دەست دێنین) [١٥١].

شاندەکە لە (١٠ی ئابی١٩٣٠) گەیشتنە سلێمانی و خەڵک پێشوازی لێکردن، داوای مافی کوردیان کرد، ئەندامانی هەیئەتی وەتەنی وتاریان خوێندەوە، یەکێک لە ئەندامەکانی عززەت بەگی جاف بوو باسی ئەوەی کرد کە کوردستان تەنها لە سلێمانی پێکنەهاتووە لە زاخۆ تا خانەقین

داوای مافی کورد دەکەن، هەروەها ئەوەی دووپات کردەوە کە جارێکی تر کورد لەگەڵ عێراق ناژی، بۆ وەرگرتنی مافمان روو دەکەینە بەریتانیا و کۆمەڵەی گەلان، ئەم جارە سیلاح و تفەنگمان قەڵەم و موراجەعاتە[١٥٢]، پێش ئەنجامدانی هەڵبژاردن، حکومەتی عێراق توفیق وەهبی[١٥٣] لادا کە موتەسەریفی سلێمانی بوو، ئەمەش بووە هۆی تووڕە بوونی خەڵکی سلێمانی کە داوای گەڕانەوەیان دەکرد، بڕیار درا کە لە ٦ی ئەیلوولدا لە شاری سلێمانی هەڵبژاردن ئەنجام بدرێت، دەستەی پشکنین سەرپەرشتی هەڵبژاردنەکەی دەکرد، کە لەلایەن مەندوبی سامی بەریتانیا سەرکردایەتی دەکرا[١٥٤]، خەڵکی سلێمانی بەشدارییان لە هەڵبژاردندا نەکرد، لە ئەنجامدا راپەڕین بەرپابوو، هەموو چین و توێژەکان بەشدارییان تیادا کرد[١٥٥]، ئەحمەد سال مەرجانی قادر روغزایی بەشداری ئەم راپەڕینەی کرد[١٥٦]، حکومەتی عێراق چەندین کەسی دەستگیر کرد بە تۆمەتی واژووکردنی یادداشتەکان و راپەڕینەکە یەک لە گیراوەکان عززەت بەگی جاف بوو[١٥٧].

**شەشەم/ ڕۆڵی هۆزی جاف لە شەڕی ئاوباریک**[١٥٨]:

کە رووداوی بەردەرکی سەرا روویدا، شێخ مەحموود پەیمانی (١٩٢٧)[١٥٩]ی شکاند و گەڕایەوە عێراق نامەیەکی بۆ مەندوبی سامی نارد تیایدا داوای دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی کرد لە ژێر ئینتیدابی بەریتانیادا[١٦٠] لەم پێناوەدا پەیوەندیی لەگەڵ محەمەد بەگی جاف و مەعرووف جیاووک هەبوو لە رێگەی ئەفسەرەکانی سوپا، لەوانە نەجمەدین و عادل ئەفەندی[١٦١]، سەرەتا ناوچەی شارەزووری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، حامید بەگی جاف داوای لێکرد کە واز لە داگیرکردنی هەڵەبجە بێنێت، ناوچەکانی تر داگیر بکات هەڵەبجە خۆی دەگیرێت، شێخ پەلاماری خورماڵی دا[١٦٢].

نامەی بۆ کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف و سەرۆکی روغزایی و تەرخانی و شاتری نووسی ئەوانیش کۆبوونەوە، بڕیاریاندا هاوکاری بکەن، کەریم بەگی جاف پەیوەندی پێوە کرد بێتە گەرمیان، بە هۆی بێ هیوا بوونی لە بەریتانیا کە هیچ بۆ کورد ناکەن و سەربەخۆیی نەتەوەیی بۆیان فەراهەم ناکەن کەواتە تا سەرەتای سییەکان جافەکان بڕوایان بە

بەریتانیا هەبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، بەڵام دواتر ئەم بڕوایەشیان لاواز بوو بۆیە لە شەڕی ئاوباریک هاوکاری شێخ مەحموودیان کرد[١٦٣] لە ئاکامی ئەو نامانەی کە لەلایەن سەرۆک هۆزەکانی گەرمیان ئاراستەی شێخ کرا، ناوبراو بڕیاریدا چالاکییەکانی بۆ دەوروبەری کەرکووک بگوازێتەوە بە هاوکاری لایەنگرەکانی لە هۆزی جاف و هەمەوەند و دەلۆ[١٦٤]، ئەوە بوو چالاکییەکانی گواستەوە بۆ گەرمیان بۆ ئەوەی پاڵەپەستۆ بخاتە سەر شاری کەرکووک[١٦٥].

جافەکانی گەرمیان بێزارببوون لە حکومەت کە هەوڵیدەدا ئیدارەی ڕاستەوخۆ بەسەریاندا بچەسپێنێ، جا بۆیە داوایان لە موتەسەڕیفی کەرکووک کرد باجی ڕاستەوخۆ نەهێڵێت، حکومەت ئەم داوایەی بە دەستی شێخ مەحموود دەزانی، بۆیە هێزی بەکارهێنا بۆ کۆکردنەوەی باج کە دەخرایە سەر مەڕو ماڵات[١٦٦]، بەریتانیا زانی بەگزادەکانی جاف بە نیازن هاوکاری شێخ مەحموود بکەن، بۆیە کەریم بەگ و براکەیان دەستگیرکرد، لەو کاتەدا (داود بەگ) و(محمد ئەمین) [١٦٧] برای لەنێو هۆزەکانی جاف دەسووڕانەوە بۆ کۆکردنەوەی چەکدار بۆ شێخ مەحموود، کە داود بەگ زانی براکانی گیراون گەڕایەوە کفری چووە سەرقەڵا و (کاپتن لاین)ی کردە بارمتە و ڕایگەیاند کە (لاین) بارمتەیە لەلای تا براکانی ئازاد دەکرێن[١٦٨]، بەریتانیا ناچار بوو ئازادیان بکات، ئەم ڕێگەیە سەری نەگرت، بۆیە ڕێگەی تریان گرتەبەر، ئەمجارە لە ٨ی مارت بەفڕۆکە بەیاننامەی بەسەر ئەندامەکانی هۆزی جاف بڵاوکردەوە، کە تیادا هەڕەشەیان لە هۆزی جاف کرد، کە نابێ پەیوەندی بە شێخ مەحموودەوە بکەن[١٦٩]، بە بۆچوونی ئێمە ئەم هەوڵانەی کە بەریتانیا بەکاریهێنا بۆ ڕێگرتن لە جافەکان کە هاوکاری شێخ نەکەن، ئەوە دەردەخات کە بەریتانیا لە هۆزی جاف ترساوە، چونکە بەهێز و بە ژمارە زۆر بوون.

هۆزی جاف لایەنگری شێخیان کرد بە سەرکردایەتی کەریم بەگ و داود بەگ و مینە جاف ناوچەی کفری کە ناوچەیەکی مەترسیدار بوو بۆ حکومەتی عێراق[١٧٠]، کە شێخ لە شارەزوور ڕووی کردە گەرمیان لە ڕێگەدا هێزەکانی کەریم بەگ تێکەڵی هێزەکانی شێخ مەحموود بوون[١٧١]. شێخ مەحموود دڵنیا بوو کە هۆزی جاف و دەلۆ دەتوانن ناوچەی کفری

ئازاد بکەن، هێزێکی ئامادە کرد لە هۆزی زەنگەنە و هەمەوەند و داودە بۆ رزگارکردنی کەرکووک[172]، چونکە ئامانجی شێخ مەحموود ئازاد کردنی شاری کەرکووک بوو[173].

شێخ هێزی نارد بۆ بناری گل[174]، لە گوندی ئاوباریک لە ماڵی عەبدولمەجید تاڵەبانی میوان بوو، چونکە ئەم گوندە بچووک بوو تەنها شێخ مەحموود و داود بەگ و چەکدارەکان مانەوە[175]، بەڵام بەهۆی چەند کەسانێک شوێنی شێخ مەحموود ئاشکرا دەبێت، حکومەتی عێراقی هێزیان نارد بۆ ئەم گوندە[176]، لەم شەڕەدا داود بەگ لە شوێنی ترسناک شەڕی دەکرد، داود بەگ و براکانی لە چوار لاوە گوللەباران دەکران، بەڵام توانییان خۆیان لەم گەمارۆیەدا رزگار بکەن[177]، داود بەگ لەم شەڕەدا ئازایەتییەکی زۆری نواند، بۆیە شێخ پێی وت داود شێرە[178]. تیرەی گلاڵی جاف بە سەرکردایەتی (کەریم قوباد و حەمەی کوڕی) و تیرەی سۆفییە و بەسەرکردایەتی تۆفیق مستەفا و نامیق هەر یەکەو بە سەد سوارە بەشدارییان کردووە، بێجگە لەمانەش تیرەی روغزایی و تەرخانیش بەشدارییان کرد[179]، هەرچەندە هێزەکانی شێخ مەحموود سەرکەوتن، بەڵام بەهۆی پاڵپشتی فرۆکەی بەریتانی بۆ سوپای عێراق شێخ ناچار بوو پاشەکشە بکات[180].

لە دوای شەڕی ئاوباریک شێخ مەحموود لە دێی (بایەوە) کۆبوونەوەیەکی بە سەرۆک هۆزەکان کرد داوای درێژە پێدانی شۆڕشی لێکردن، بەڵام تەنها نۆ سەرۆک هۆز رازی بوون شۆڕش بەردەوام بێت، یەکێکیان کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف بوو[181]، ماوەیەک کەریم بەگی جاف بە یاخییەتی مایەوە تا شێخ خۆی رادەستی حکومەت کرد، ئینجا حکومەت لێبووردنی بۆ ئەوانیش دەرکرد[182]، لە شەڕی ئاوباریک جافەکان جافەکان تا دوا هەناسە لەگەڵ شێخ مەحموود بوون[183]، بۆ سەلماندنی ئەو راستییە شێخ رەئووفی کوڕی شێخ مەحموود لە یادداشتەکانی باسی باوکی دەکات و دەڵێت (کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف تا دوا رۆژی شۆڕش لەگەڵ شێخ مەحموود مایەوە) [184]، جافەکان چەندین کەسیان لێ کوژرا، لەوانە مەجیدی مامە خان، محەمەد ئەمین یارە، لە بریندارەکانیش حەسینە روغزایی[185].

لەبەر ئەوە کۆمەڵەی گەلان گوێڕایەڵی بەریتانیا بوون، وەڵامی یادداشتەکانی کوردی نەدایەوە بەریتانیا لە کۆمەڵەی گەلاندا پاکانەی بۆ عێراق دەکرد، گەواهی دەدا کە عێراق هەموو خواستەکانی کوردی بەجێهێناوە، ئەحمەد موختار کە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران بوو، دیارە لە کەین و بەینی ژێربەژێری کۆمەڵەی گەلان ئاگادار بووە، بۆ ئەوەی کوردەکان ئاگادار بن لە کۆمەڵەی گەلان ئەم دێرە شیعرەی وتووە، سەر ئەنجام پێشبینیەکەی هاتەدی[١٨٦].

**ئەم قەراری عسبەیە واخەلق ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ**

**هەر قسەی ڕووتە و قسەیش ناچێتە ناو گیرفانەوە!**

ئەحمەد موختار جاف کوردێکی نیشتمان پەروەر بووە[١٨٧]، بە بۆچوونی جەمال نەبەز کە ئەحمەد موختار جاف ئاڵای کوردستانی دانەوە کە دەڵێت: (( ئاڵای کوردستان لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، لە لایەن هۆنەری نیشتمانپەروەری کورد، ئەحمەد موختار جافەوە لە هەڵەبجە نەخشەی کێشراوە و، دوایی پاش تەواوبوونی جەنگ، لە لایەن مێجەر نۆئێلەوە براوە بۆ سەرکردە کوردەکانی باکووری کوردستان، لە کاتێکدا کە مێجەر نۆئێل بە دزییەوە گەشتێکی بەوێدا کردووە))[١٨٨]، بەڵام د. ئازاد عوبێد ساڵح پێی وایە ئەحمەد موختار جافی شاعیر لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی تەمەنی بەو جۆرە نەبووە بیر لە دانانی ئاڵا بکاتەوە، تەنانەت وشەی (ئاڵا، بەیداخ، پەرچەم)ی لە شیعرەکانیدا بەکارنەهێناوە[١٨٩].

بە تایبەتی دوای ڕووداوەکەی بەردەرکی سەرا بە چاوێکی دوژمنکارانە سەیری حکومەتی عێراقی دەکرد لە هەمان کاتدا ئومێدی بە بەریتانیا نەما کە هاوکاری کورد بکات، بۆیە بیری کردەوە پارتێکی سیاسی دامەزرێنێت، کەوتە جموجووڵ بنکەیەکی شۆڕشگێڕانە لە نێو هۆزی جافدا پێکبێنێ[١٩٠]، ئەحمەد موختار جاف کە زانی بەریتانیا کێشەی کورد بە ئاشتی چارەسەر ناکات، دەستی کرد بە شۆڕش لە ساڵی ١٩٣٤ لەگەڵ ژمارەیەک چەکدار لە حکومەت یاخی بوون، ڕوودەکاتە ناوچەکانی بالامبۆ مەرەخل و سازان و ناوچەکانی سەر سنووری ئێران و عێراق، ئەم بزافەی ئەحمەد موختار جاف، کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق و

بەریتانیا تەنگاو دەکات، بۆیە دەکەونە هەوڵ و تەقەللایەکی بێ وچانەوە بۆ سەرکوتکردنی ئەم بزووتنەوەیە[191] ئەم بزووتنەوەیە زۆری نەخایاند لە ساڵی ١٩٣٥ ئەحمەد موختاری جاف لە ڕووداوێکی نادیاردا لە سەر ڕووباری سیروان بریندار کرا، بە هۆی سەختیی برینەکەی کۆچی دوایی کرد[192]، بۆچوونی حامید بەگی جاف دەربارەی بزووتنەوەی ئەحمەد موختار جاف دەڵێت: (( کە ئەحمەد موختار دەستی دابووە بابەتێک لە توانا و وزەی ئەودا نەبوو، یاخیبوون لە دەسەڵاتی دەوڵەتی ئێراق لەو قۆناغەدا بە تەواوی دژ بە بەرژەوەندی ئینگلیزەکان بوو، مەودای ئەوەیان بە هیچ کەسێک نەداوە دژ بەو دەوڵەتە بجووڵێتەوە))[193].

**حەوتەم/ ڕۆڵی هۆزی جاف لە بزووتنەوەی مایسی ١٩٤١:**

جەنگی دووەمی جیهان لە ساڵی ١٩٣٩ دەستی پێکرد، دووبارە بیرۆکەی خودموختاری لە لای گەلی کورد سەری هەڵدایەوە، ئەمەش لە ئەنجامی گەشەکردنی هەستی نەتەوەیی هەروەها هەندێک لە پروپاگەندەی دەوڵەتە گەورەکان، ئەڵمانیاش بڵاوی کردەوە کە هاوکاری کوردەکان دەکات بۆ دامەزراندنی حکومەت، بەریتانیاش بەڵێنی بە کوردەکان دا سەربەخۆیی خۆجێیی بۆ کورد دابین بکات[194]، ئەو وڵاتانە کە لە کاتی جەنگدا هەوڵی نزیکبوونەوەیان دەدا لە کورد چونکە کەمال ئەتاتورک (١٨٨١-١٩٣٨) ئەوەی دووپاتکردەوە هەر لایەنێک کە دەیەوێت لە جەنگی داهاتوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا سەربکەوێت، ئەو لایەنەیە کە کورد بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت[195].

لە کاتی جەنگدا لە شاری بەغدا دژی بەریتانیا بزووتنەوەیەک بەڕێوەچوو، کە کاریگەری لە سەر کورد هەبوو ئەویش بزووتنەوەی مایس بە سەرکردایەتی ڕەشید عالی گەیلانی (١٨٩٢-١٩٦٥) بوو[196]، بەریتانیا زۆر دەترسا لەوەی کە کوردەکان لایەنگری ئەڵمانیای (نازی)[197] بکەن، بۆیە چاودێری لەسەر ئەو کەسانە دانابوو کە سەردانی سەربازگەی ئەڵمانیایان دەکرد، کە لە سەرچنار دامەزرابوو، یەکێک لەو کەسایەتیانە کە سەردانی ئەم سەربازگەیەی دەکرد عززەت بەگی جاف بوو[198].

بزووتنەوەی مایس بەرپابوو زۆر لە قوتابیانی کورد لایەنگرییان کرد، قوتابیانی کۆلیژی ماف لە بەغدا پارەیان کۆکردەوە، خۆیان ناونووس کرد بۆ چەک هەڵگرتن، یەکێک لەم قوتابیانە (ئەنوەر جاف)[١٩٩] بوو[٢٠٠]، چەندین بروسکە لەلایەن قوتابیانی کورد لە خانەی مامۆستایانی باڵا لە بەغدا نێردرا بۆ سەرکردایەتی بزووتنەوەکە یەک لەو قوتابیانە (بورهان جاف)[٢٠١] بوو[٢٠٢]، تەنانەت سەرۆک هۆزەکانی کوردیش بروسکەیان نارد بۆ رەشید عالی گەیلانی لایەنگریی خۆیان بۆ شۆڕش بەدیارخست، یەکێک لەم سەرۆک هۆزانە (سەعید فەهمی جاف)[٢٠٣] بوو، رەشید عالی گەیلانی وەڵامی بروسکەکەی دایەوە[٢٠٤]، هەروەها داود بەگی جاف خۆپیشاندانی بە لاوان و قوتابیانی کەلار کرد بۆ پشتیوانی بزووتنەوەی ڕەشید عالی گەیلانی[٢٠٥].

(عەلی کەمال)[٢٠٦] لە یادداشتەکانیدا باسی ئەوە دەکات کە لەگەڵ حەمە ئاغای عەبدولرەحمان کە ئاغای پشدەر بووە بڕیاریاندا کە بەرەیەک لە کوردستان بکەنەوە بۆ ئەوەی بەرهەڵستی بەریتانیا بکەن، بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندییان بە سەرۆک هۆزە کوردەکان کرد، بۆ نموونە پەیوەندییان بە هۆزی جاف و تیرەی ئیسماعیل عوزێری[٢٠٧] و بەگزادەکانی جاف کردووە لەوانە (حامید بەگ، حسێن بەگ، ئەحمەد جاف) لە هەڵەبجە پەیوەندیشیان بە داود بەگ لە گەرمیان کرد[٢٠٨].

شێخ مەحموود دەرفەتی لە بزووتنەوەی مایس وەرگرت لە ١٦ی مایس لە بەغدا ڕایکرد لە (١٩یا٢٠) گەیشتە سلێمانی[٢٠٩]، کە شێخ گەیشتە کفری، کاتێک قایمقامی کفری دەزانێت شێخ مەحموود لە سەر قەڵایە هێز دەنێرێت شێخ دەگاتە دێی (پیازەجار) کە شوێنی تیرەی تەرخانیە، ئەم تیرەیە هێزیان کۆکردەوە دژی حکومەت شەڕیان کرد، لەئەنجامدا سەرکەوتن[٢١٠]، زۆر لەو کەسانەی کە هاوکاری شێخیان کرد تا گەیشتە گوندی (سیتەک) لە شارباژێر، ئەوانەن (عەزیز مەحموود روغزایی و فاتح سادانی) کە جافن[٢١١]، شێخ بڕیاریدا شۆڕش بەرپا بکات هێزی چەکداری کۆکردەوە هەندێک لە هێزەکانی هۆزی جاف بوون[٢١٢]، وەفدێک چووە لای لای شێخ مەحموود داوایان لێکرد کە کارێک نەکات ئاسایشی ناوچەکە تێکبدات، یەک لە وەفدەکە عززەت بەگی جاف بوو[٢١٣]، حکومەتی عێراق

زۆر کەسی دەستگیر کرد بە تۆمەتی ئەوەی کە هاوکاری شێخ مەحموود و رەشید عالی گەیلانیان کردووە وەک حەمە سەعیدی جاف و خەلیفە یونس روغزایی[٢١٤].

**ئەنجام**

لە ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە (رۆڵی هۆزی جاف لە چالاکییە سیاسییەکانی باشووری کوردستان لە ١٩١٨ – ١٩٤٥ز) گەیشتینە ئەم ئەنجامانە:

بەریتانیا هەوڵیداوە بۆ ڕاکێشانی هۆزی جاف، چونکە ئەم هۆزە بە هێز و ژمارە زۆر بوونە، پێگەیەکی گەورەیان لەنێو هۆزە کوردەکان هەبووە. هەروەها سوودی لە ناکۆکی مێژوویی بنەماڵەی بەگزادەکانی جاف و شێخەکان وەرگرتووە، ڕاستە ناکۆکی لە نێوان ئەم دوو بنەماڵەیەدا هەبووە، بەڵام نەگەیشتە شەڕو پێکدادانی چەکداری، ناکۆکییەکان لەسەر زەویوزار بووە نەک لەسەر سەرکردایەتی.

لەکاتی ئیدارەی یەکەمی شێخ مەحموود بەگزادەکانی جاف دوو بەرە بوونە، بەرەیەک لایەنگیری شێخ و بەرەکەی تر لایەنگیری ئینگلیز بوون، رەنگە هۆکارەکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە بەشێک لە بەگزادەکانی جاف لەم باوەڕەدابوونە کورد بە یارمەتی بەریتانیا بە مافی خۆی دەگات، چونکە بەهێز و دەسەڵاتە. هەروەها هۆزەکە لەبەر گەورەیی هەڵوێستی جیاوازی تیادا بەدەرکەوت، بەڵام دیارە بەگزادەکان زیاتر ئاراستەی هۆزەکەیان لە ڕووداوەکاندا دیار دەکرد.

ئافرەتانی جاف شان بە شانی پیاوان بە ڕاپەڕاندنی کاروبار و بەڕێوەبردنی هۆزەوە پەیوەست بوونە، بە چاو نەترس و ئازا و سەرسەخت ناسرابوون وەک عادیلە خانم و چەندان ئافرەتی تری نێو ئەم هۆزە.

دەتوانین بڵێین جافەکان کاریگەرییان بەسەر ڕووداوە سیاسییەکانی ئەم ماوەیە مێژووییەی توێژینەوەکە بە گشتی هەبووە. ئەوە بوو تاڕادەیەک بەشداری شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆیان لە ساڵی ١٩٢٠ کردووە. بەشێک لە ناوچەکانی جاف و هەندێک لە گوندەکانیان لەلایەن

ئینگلیز بۆردومان كرا بەهۆی لایەنگیرییان بۆ شێخ مەحموود. لە كێشەی ویلایەتی موسڵ پشتگیری ئەوەیان دەكرد ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر عێراق نەک توركیا و بەشێک لە جافەكان بە یادداشت و قەڵەم داوای مافی كوردیان كرد و بەشداری ڕاپەڕینی بەردەركی سەرای شاری سلێمانی ساڵی ١٩٣٠ یان كرد.

لە سەرەتای سییەكان ژمارەی ئەو جافانە كەم بووەوە كە ئومێدیان بە بەریتانیا هەبوو بۆ یارمەتیدانی بەدیهێنانی ئاواتە نەتەوەییەكانی كورد. بۆیە لە شەڕی ئاوباریک لە سەرەتای سییەكان جافەكان زۆر بە توندی لایەنگیری شێخ مەحموود بوون، تەنانەت بەشێک لە جافەكان لە ڕقی ئینگلیز لایەنگیرییان لە بزووتنەوەی مایس ١٩٤١ و ئەڵمانەكان كرد بە هۆی بێ ئومێدبوونیان لە ئینگلیز و بەمەبەستی گەیشتن بە مافە نەتەوەییەكانی كورد.

**پەراوێزەکان:**

(*) توێژینەوەیەکی دەرهێنراو (مستل) لە نامەی ماستەر بە ناوونیشانی: ڕۆڵی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی هۆزی جاف لە باشووری کوردستان ١٩١٨ – ١٩٤٥ لە لایەن سەیران سالح ئیسماعیل، بە سەرپەرشتی، پ.ی.د.محەمەد عەبدوڵلا کاکەسوور

(١) تاهیر بەگی جاف کوڕی وەسمان پاشای جافە و دایکی عادیلە خانمە لە سالانی (١٨٧٥-١٩١٧) ژیاوە، زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی زانیوە، شاعیر بووە: محمد امین زكی، مشاهیر الكرد وكردستان، اعداد: رفیق صالح، منشورات بنكەی ژین، مطبعة شیڤان، السلیمانیة، ٢٠٠٥، ج٢، ص٢٥٥.

(٢) عەلی ئەکبەرخانی سنجاوی سەردار موقتەدر، بیرەوەرییەکانی، ساغکردنەوەی کەریمی سنجاوی، وەرگێڕانی حەسەن جاف، هەولێر، چاپخانەی حاجی هاشم، ٢٠١٢، ل ٥٧٠.

(٣) کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، تەئریخی جاف، لێکۆڵینەوە، چاپخانەی دار الكتب والوثائق، بغداد، ١٩٩٥، چ١، ل٩٠.

(٤) حەسەن جاف کوڕی کەریم بەگی فەتاح بەگی جافە ساڵی ١٩٤٣ لە کەلار لە دایک بووە، توێژەری مێژووە، نامەی ماستەر و دکتۆرای لە مێژووی شارستانی ئیسلامی لە کۆلێژی تاران هێناوە، لە کۆلێژی تاران و بەغدا وانەی وتۆتەوە چەندین کتێبی وەرگێڕاوە وەک مێژووی ئەردەلان و لێکۆڵینەوەی لە سەر چەندین کتێب کردووە وەک کتێبی تاریخی جاف تا ئێستا لە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە بەردەوامە. جمال بابان، اعلام الكرد، اربیل، دار اراس للطباعة والنشر، ٢٠١٢، ط٢، ص١٣٦.

(٥) حەسەن جاف. دوو هەڵوێست لە تەرازووی مێژوودا، "مێژوو"، گۆڤار، ژ١٦، ساڵی چوارەم، پایزی٢٠١٠، ل١٤٤.

(٦) عززەت عوسمان پاشای جاف کوڕی عوسمان پاشای جافە لە سالانی (١٨٩٥-١٩٤٥) ژیاوە، چەند جارێک ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق بووە لە سەردەمی پاشایەتی عێراق. جمال بابان، م. س، ج٢، ص٣١٥-٣١٦.

(٧) رفیق حلمی، یادداشت (کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود)، بغداد، مطبعة المعارف، ١٩٥٦، ل٦١-٦٢؛ ئەحمەد خواجە، چیم دی (شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی مەزن)، چ٢، هەولێر، چاپخانەی ئاراس، ٢٠١٣، ل ٢٢؛ حەسەن

جـاف، دوو هەڵوێسـت...، ل١٤٠-١٤١؛ مسـتەفا نـەریمان، پەیوەندیـەکانی نێـوان سلێمانی و کفری، "رۆشنبیری نوێ: (گۆڤار)، بەغدا، ژ١٠٦، ١٩٨٥، ل١٢٥.

(٨) مـحەمەد شـەریف پاشـا گەورە کـوڕی سـەعید پاشـای کـوڕی حوسـێن پاشـای کـوڕی ئەحـمەد ئاغـای بنەمـاڵەی خەنـدان، هەنـدێک جـار بە جەنەرال شـەریف سـەبری پاشـا نـاوبرابوو. سـالی ١٨٦٨ لە قـاهیرە لە دایک بـووە و لە ١٩٢٦ لە پاریس کۆچی دوایی کردووە، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: میر بەسری، نـاودارانی کـورد، وەرگێڕانـی لە عەرەبییەوە: عەبدولخالق عەلائەدین، هەولێر، چاپخـانەی منارە، ٢٠٠٩، ل ل٢٩-٣١.

(٩) ئەحمـەد بـەرزنجی: راوێژکـاری شـێخ مـەحموود بـووە لـە حکومـەتی دووەمـدا، لـە شۆڕشـەکانی شـێخ مـەحموود بەشـداری کـردووە، نوێنـەری کـورد بـووە لـە کاتی گفتوگۆ لەگەڵ بەریتانیا لە ساڵانی (١٩٢٢-١٩٢٣): مامۆستا جەعفەر (فـازل کـەریم ئەحمـەد)، شـاری سـلێمانی لـە نێوان ململانێی گرووپـە کۆمەڵایەتییـەکان (١٨٢٠-١٩٢٠)، چا: رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٤، ل٥٠١.

(١٠) رەشـید کابـان: رەشـید زەکـی کـوڕی مـەعروفی عـەزیز مەرگـەیی لـە سـاڵانی (١٨٧٦-١٩٤٠) ژیاوە، ئامانجی رۆشنبیری کورد بـووە، بۆیـە لـە سلێمانی زیـاتر لە سی قوتابخانەی کردۆتەوە. جەمال بابان، م.س، ج١، ص٢٢٣.

(١١) ئەحمەد خواجە، س.پ، ب١، ل٤١؛ محەمەد عەبدوڵلا کاکە سـور، رۆڵـی سیاسـی و کـەلتوری ئەفسـەرانی کـورد لـە بزاڤـی کوردایـەتی کوردسـتانی باشـوردا لـە ١٩٢١ ١٩٤٥، هەولێر چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٠، ل٣٦.

(١٢) حامید جـاف: کوڕی عەبدولمەجید کوڕی عوسمان پاشـای کـوڕی محەمـەدی جافـە، لە نێوان سـاڵانی (١٨٨٧-١٩٨٨) ژیـاوە، لـە سـەرکردە دیارەکـانی هـۆزی جافــە، دەســەڵاتداری بــەریتانیا کردییــان بــە جێگــری فــەرمانڕەوای سیاســی هەڵەبجە، چەندین جار ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران بـووە. جمـال بابـان، م.س، ج١، ص١٦٣.

(١٣) شـێخ لـەتیف، س.پ، ل٤٣-٤٤؛ شـێخ رەشـید عەبـدولرەحمان قـادر، بـەریتانیا – تورکیا – ئێران – کورد ١٩١٥ – ١٩٢٣، چ١، هـەولێر چاپخانـەی حـاجی هاشـم، ٢٠١٠، ل١٥٨-١٥٩.

(١٤) ولید حمـدی، کـورد و کوردسـتان لـە بەڵگەنامـەکانی بـەریتانیـادا، و: موحەمـەد نوری تۆفیق، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چا: ئۆفسـێتی تیشـک، سلێمانی، ١٩٩٩،ل٣١٥.

(١٥) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەم ناکۆکییە بڕوانە: م. ر. هاوار، کورد و باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووهەمی جیهان، ب١، سلێمانی، چاپخانەی خاک، ٢٠٠٠، ل٤٨؛ عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، سياسة بريطانيا تجاه كرد العراق ١٩١٤ – ١٩٣٢، السليمانية، مطبعة شيڤان، ٢٠٠٨، ص٢٢١-٢٢٢.

(١٦) DR.G.M.LEES, M.C. 'D.F.C 'TWO YEARS IN SOUTH KURDISTAN, P255.

(١٧) مەحموود مەلا عیززەت، حکومەتی کوردستان لە ناو مەتەڵی سیاسەتی بەریتانیادا ١٩٢١-١٩٢٤، بڵاوکراوەی بنکەی ژین، چا: شیڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٢١١.

(١٨) سێرئارنۆڵد ویڵسن، شۆڕشەکەی عێراق ( لە ماوەی داگیرکاری بەریتانیا بۆ عێراق و کوردستان)، و: سەرمەند ئەحمەد، چ١، چا: رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٨٥.

(١٩) Op. cit, P.23.

(٢٠) وديع جويدة، الحركة القومية الكردية نشأتها وتطورها، ترجمة: مجموعة من المترجمين، ط١، الناشران دار الفارابي، بيروت، دار أراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠١٣، ص٤٢٥؛ جەرجیس فەتحوڵڵا، وریا بوونەوەی کورد (مێژووی سیاسی ١٩٠٠ – ١٩٢٥)، وەرگێرانی، حەسەن جاف، چ١، ب١، ب٢، دهۆک، چاپخانەی خانی، ٢٠٠٩، ل٢٤٩.

(٢١) عادل صدیق، هەڵەبجە ١٨٨٩-١٩٣٠( لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە)، چ١، بڵاوکراوەی پرۆژەی تیشک، چا: کۆمپانیای چاپ و پەخشی نووسەر، ب.ش، ٢٠٠٨، ل١٠٣-١٠٤.

(٢٢) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی پەیوەندیی شێخ مەحموود بە بنکەی شرناخ بڕوانە: عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕان، کامەران جەمال بابان زادە، ب١، ب٢،چ١، سلێمانی چاپخانەی رێ نوێ، ٢٠١٠، ل٣٧٨.

(٢٣) م. س. لازاريف، الامبريالية والمسالة الكردية...، ص٨٤-٨٥؛ ديرك كنيين، الكورد وكردستان، ت: صلاح عرفان، منشورات مركز الدراسات الكردية، كوردلوجى، السليمانية، ٢٠١٠، ص٤٩.

(٢٤) سیسیل جۆن ئیدمۆندس، کورد تورک عەرەب، وەرگێڕان، حامید گەوهەری، چ٢، هەولێر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠٠٤، ل٥٥-٥٦.

(۲۵) عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرينات، ط۲، بغداد، مطبعة الانتصار، ۱۹۸۵، ص۹٤.

(۲٦) حەسەن ئەرفەع، کوردەکان، و: حامید گەوهەری، چ۱، چا: منارە، هەولێر، ۲۰۰۷، ل۱۷٥.

(۲۷) ئەحمەد موختار جاف: کوڕی عوسمان پاشای کوڕی محەمەد پاشای جافە، لە نێوان ساڵانی (۱۸۹۷-۱۹۳٥) ژیاوە لە ساڵی ۱۹۲۲پۆستی قائیمقامی هەڵەبجەی وەرگرتووە، لە خولی یەکەم و دووەم ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران بووە شاعیر و ئەدیب بووە، گەلێک هۆنراوی جوانی بە زمانی کوردی و فارسی هۆنیوەتەوە ، چیرۆکە بەناوبانگەکەی نووسیوە بە ناوی (مەسەلەی ویژدان). بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: جمال بابان، م.س، ج۱، ص٧٤.

(۲۸) داود بەگی جاف: سەرکردەی هۆزی جاف بووە، لە ساڵانی (۱۸۹٤-۱۹٦٦) ژیاوە، چەندین جار ئەندام بووە لە ئەنجوومەنی نوێنەران، زمانی تورکی و فارسی زانیوە، لە دوای شۆڕشی تەمموزی ۱۹٥۸ عێراقی جێهێشت چوو بۆ ئێران. عبدالمجيد فهمي حسن، دليل تاريخ مشاهير الالوية، بغداد، مطبعه دجلة، ۱۹٤۷، ج۲، ص۳٤٦؛ جمال بابان، م.س، ج۱، ص۲۰٦.

(۲۹) م. ر. هاوار، س. پ، ل۲۰٦؛ عوسمان عەلی، س.پ، ل۱۲۷.

(۳۰) فؤاد حمه خورشيد، العشائر الكردية، بغداد، مطبعة الحوادث، ص۷۸؛ عادل صديق، هەڵەبجە ۱۸۸۹-۱۹۳۰...، ل۱۰۷.

(۳۱) مەولانا خالید: ناوی خالید کوڕی حوسەینە لە نێوان ساڵانی (۱۷۸۳-۱۸۲٦) ژیاوە، لە تیرەی میکائیلی جافە دایکی ناوی فاتیمەیە و لە ساداتی پیر خدرییە، ڕێبازی نەقشبەندی لە هیندا خوێندووە زانایەکی ئایینی سەردەمی خۆی بووە شیعرەکانی بە زمانی فارسی و عەرەبی نووسیوە، بەشێکی بە زمانی کوردی نووسیوە، لە شام کۆچی دوایی کردووە، بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ناوبراو بڕوانە: مەلا عبدالکریمی مدرس، یادی مەردان (مەولانا خالیدی نەقشبەندی)، ب۱، چا: کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ۱۹۷۹.

(۳۲) شێخ مارفی نۆدێ: سەید محەمەد کوڕی سەید مستەفا کوڕی سەید ئەحمەد کوڕی محەمەد نۆدێ یە لە ساڵانی (۱۷٥۲-۱۸۳٥) ژیاوە، هەر لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنی سلێمانی بەشداری لە ڕووداوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان کردووە، ئەم بەشداریکردنە تا دوا ڕۆژی ژیانی بەردەوام بووە، زانایەکی ناسراوی دەستەی مامۆستایانی بابان بووە دەمڕاستی قادری و بەرزنجییەکان

بووە. مامۆستا جەعفەر (فازل کەریم ئەحمەد)، شاری سلێمانی لە نێوان ململانێی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان، (١٨٢٠-١٩٢٠)، هەولێر، چاپخانەی رۆژهەڵات، ٢٠١٤، ل١٠٤.

(٣٣) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی پەیوەندیی نێوان شێخ مارفی نۆدێ و مەولانا خالیدی نەقشبەندی، بڕوانە: کلودیس جیمس ریچ، گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و: محەمەد حەمە باقی، دهۆک، چاپخانەی خانی، ٢٠١٢،چ٤، ل٢٩٩.

(٣٤) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ناکۆکییەکانی نێوان شێخ سەعید و جافەکان، بڕوانە: م. ر. هاوار، س. پ، ل٢٠٢-٢٠٤؛ عوسمان عەلی، س. پ. ، ل٢٣٥-٢٣٦؛ حەسەن جاف، خوایە لە دۆستەکانم بمپارێزی وە دوژمنانم لەسەرخۆم. مامۆستای کورد (گۆڤار)، سوید، ژ١٧-١٨، بەهار و هاوین ١٩٩٣، ل٧٧؛ عادل صدیق، هەڵەبجە ١٨٨٩-١٩٣٠ (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە)، سلێمانی، چاپخانەی کۆمپانیای چاپ و پەخشی نووسەر، ٢٠٠٨، ل٩١-٩٨.

(٣٥) مەحموود خانی دزڵی: کوڕی عەزیز خانی کوڕی بارام بەگە، لە نێوان ساڵانی (١٨٧٠-١٩٤٦) ژیاوە، کە زۆربەی ژیانی بە خەباتکردن بەسەربرد دژی ئێران و عێراق وەستا، یەکەم کەس بوو کە شاری سلێمانی لە دەست ئینگلیزەکان ئازاد کردووە، لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمود بەشداری کردووە، بەهۆی خەبات و تێکۆشانی چەندین جار دەربەدەر کراوە و خراوەتە گرتووخانەکانی (هندستان، سنە، قەسری قاجار، رومادی، سلێمانی...)، لە ساڵی ١٩٤٦ فەرمانڕەوای ئێران داوای لە مەحموود خانی دزڵی کرد کە دەست بکەن بە گفتوگۆ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، بەڵام فەرمانرەوای ئێران دەرمان خواردی کرد، کە بووە هۆی مردنی، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە، عومەر مەعروف بەرزنجی، مەحموود خانی دزڵی، چ٢، چا: نووسینگەی ئازاد، ٢٠٠٠، ل٣١-٣٩.

(٣٦) ودیع جویدة، م. س، ص٤٢٧-٤٢٨.

(٣٧) LEES ., op.cit, p258.

(٣٨) ولید حمدی، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا، وەرگێران: موحەمەد نوری توفیق، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، چاپخانەی ئۆفسێتی تیشک، ١٩٩٩، ل٥٩.

(٣٩) س. پ.، ل١٨٩؛ کەمال مەزهەر، گاڵتە و گەپ و گەمەکانی نێوان شێخ مەحمود و فڕۆکەوانە ئینگلیزەکان، "رۆشنبیری نوێ" (گۆڤار)، بەغدا، ژ ١٣٦، ١٩٩٥، ل١١.

(٤٠) سدیق ساڵح، حکومەتی کوردستان ١٩١٨-١٩٢٤، چ٢، بڵاوکراوەی بنکەی ژین، چا: شیڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٢.

(٤١) LEES.,op.cit , p261-264.

(٤٢) حسين الجاف، الشيخ محمود الحفيد ١٨٨٢-١٩٥٦ الانسان والمجاهد والملك، ط١، الناشر دار الثقافة والنشر الكوردية، بغداد، ٢٠١٢، ص٩٢.

(٤٣) تاسلوجە: دەکەوێتە رۆژئاوای سلێمانی کە لە نێوان کەرکووک و سلێمانییە بیست و پێنج کیلۆمەتر لە سەنتەری شاری سلێمانی دوورە: حسین جاف، ن.م، ص٩٢؛ عبد الرحمن ادريس صالح البياتي، م.س.، ص١٥٩.

(٤٤) بازیان: دەکەوێتە رۆژئاوای سلێمانی کە چل و هەشت کیلۆمەتر لە سلێمانی دوورە ١٢ میل لە رۆژئاوای چەم چەماڵ دوورە، : عبدالرزاق الحسني، العراق قديما وحديثا، ط١، مط: الرافدين، بيروت، ٢٠١٣، ص٢٣١.

(٤٥) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەم شەڕانە بڕوانە: محسن محمد المتولي، كرد العراق منذ الحرب العالمية الاولى ١٩١٤حتى سقوط الملكية في العراق ١٩٥٨، ط١، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ٢٠٠١، ص١٩٤؛ عبدالمنعم الغلامي، ثورتنا في شمال العراق ١٩١٩-١٩٢٠، ج١، مط: شفيق، بغداد، ١٩٦٦، ص٩٩.

(٤٦) شەڕی ئەشکەوەل: ئەم شەڕە لە نێوان هێزەکانی بەریتانیا و کورددا روویدا بەسەرکردایەتی حامید بەگی جاف و شێخ رەشید، بەریتانییەکان سەرکەوتن، بۆ زانیاری دەربارەی ئەم شەڕە بڕوانە: بەکر حەمە صدیق عارف، لاپەڕەیەک لە مێژووی هەڵەبجە١٧٠٠-١٩٥٨، چ١، چا: کتێبخانەی رۆشنبیری، سلێمانی، ١٩٩٧، ل٦٦-٦٩؛ عادل صدیق، هەڵەبجە ١٨٩٩-١٩٣٠...، ل١١٠-١١٥.

(٤٧) بەکر حەمە صدیق عارف، ە.س، ل٦٤.

(٤٨) رەمزی قەزاز، بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد، چ٢،چا: وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر،٢٠٠٨،ل١٤٠؛ رفیق حلمی، س.پ، ل١٣٣.

(٤٩) علي سيدو الگوراني، من عمان الى العمادية او جولة في كوردستان الجنوبية، اربيل، مطبعة آراس، ٢٠١٢، ص١٠٧.

(٥٠) خان بەهادور. ئەم میدالییە هندییە دەدرێتە کەسانی ئازا. بەکر حەمە صدیق، س. پ، ل٦٢-٦٣.

(٥١) بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٢).

(٥٢) ئیدمۆدنس، س.پ، ل٨٠-٨١.

(٥٣) عادل صدیق عەلی، هەڵەبجە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، چا: کارۆ، سلێمانی، ٢٠١١، ل١٧٧.

([54]) شێخ لەتیف، یادداشتەکانی شێخ (لەتیف)ی حەفید، ساغکردنەوە: کمال نوری مەعروف، هەولێر، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ڕۆشنبیری پارتی دیموکراتی کوردستان، ١٩٩٥ ، ل٦١.

([55]) محسن محمد المتولي، م. س.، ص١٩٤؛ احمد فوزي، قاسم.. الأكراد خناجر و جبال، ب.م،١٩٦١، ص٨٣.

([56]) ئەحمەد خواجە، س.پ، ل٤٥؛ شێخ رەشید شێخ عەبدورەحمان قادر، س. پ، ل٥٨.

([57]) شێخ لەتیف، س.پ، ل٦٤.

([58]) عبدالامیر هادي العكام، الحركة الوطنية في العراق ١٩٢١-١٩٣٣، مط: الاداب، النجف، ١٩٧٧، ص٣١؛ عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية في العهد الملكي، ج١، ط٧، مط: دار الشؤون الثقافية العامة ((افاق العربية))، بغداد، ١٩٨٨، ص٢٧٩؛ محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، بيروت، دار الطليعة للطباعة والنشر، ١٩٦٩، ص١٤٠.

([59]) جمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٢، مط: دار الحرية، بغداد، ١٩٩٨، ل٨٠؛ م. ر. هاوار، س. پ، ل ٢١٢.

([60]) حەکیم مەلا صالح، س. پ، ل٢٩؛ عادل سدیق، هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا، ب١، چ٢، چا: چوار چرا، ب. ش، ل٣٠.

([61]) ئیدمۆندس، س.پ، ل٢٠١.

([62]) ئیبراهیم خانی دەلۆ کوڕی ساڵح ئەمین کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی ئەحمەد بەگە، نێوان ساڵانی (١٨٧٤-١٩٢١) ژیاوە لە هەیەرەکەل (حیدرەکانی) لە دایک بووە، لە تیرەی ( خوبیاروەندی) هۆزی دەلۆیە، بنەماڵەی ئیبراهیم خانی دەلۆ ڕۆژهەڵاتی شاری کفری بە دەستەوە بوو، ناوبراو خاوەن زەوییەکی بچووک بوو. مستەفا نەریمان، شۆڕشەکانی ئیبراهیم خانی دەلۆ١٩٢٠، چ٢،چا: رۆژ، کەرکووک، ٢٠٠٧، ل١١٢-١١٣.

([63]) زۆربەی سەرۆک هۆزەکانی ناوچەی چەم چەماڵ و سەنگاو و گەرمیان بەشدارییان تێدا کرد، کە ژمارەیان (٥٠٠) کەس بوو، ئەمانە نوێنەرایەتی هەریەک لە هۆزەکانی ( هەمەوەند و جەباری و شێخانی و سەنگاو و زەنگەنە و ڕەبات و تیرەی جافی مکایلی بوون). فەرهاد عەبدولعەزیز محەمەد ئەمین، ناوچەی چەم چەماڵ لە نێوان (١٩١٨-١٩٣٩) توێژینەوەیەک لە بارودۆخی

كۆمەڵایەتی و رامیاری و رۆشنبیری، نامەی ماستەر بڵاونەكراوە، پێشكەش بە بەشی مێژووی كۆلیژی ئەدەبیاتی زانكۆی سەلاددین - هەولێر، ٢٠٠٩، ل٨١.

(٦٤) عبدالرقیب یوسف، له كەلەپووری بەڵگەنامەی كوردی،"رۆشنبیری نوێ" (گۆڤار)، ژ١١٠، ١٩٨٦، ل٧٤.

(٦٥) عوسمان عەلی، س. پ، ل٣٧٤.

(٦٦) دەربارەی هۆكارەكانی شۆڕشی كفری بڕوانە. عبدالرزاق الحسني، الثورة العراقية الكبرى، ط٢، مط: العرفان، لبنان، ١٩٦٥، ص١٨٠.

(٦٧) مكرم الطالباني، ابراهيم خان ثائر من كردستان، مط: اسعد، بغداد، ١٩٧١، ص ٧٣ على الوردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، ج٥ ، ((القسم الثاني)) حول ثورة العشرين، ط٢، دار الراشد، بيروت، ٢٠٠٥، ص٧٦.

(٦٨) سێر ئارنۆڵد ویڵسن، س. پ، ل١٢٤.

(٦٩) ساڵح هەلاج، چەردێك لە مێژووی دەڤەری گەرمیان، چ١، چا: گەنج، ب.ش، ٢٠١١، ل ٥٥-٥٦.

(٧٠) حوسێن ئیسماعیل خانی دەلۆ، ناوچەی كفری لە نێوان ١٩١٤-١٩٤٥، چ١، لە بڵاوكراوەی بنكەی رۆناكبیری كۆمەڵایەتی كەركووك، ٢٠١٠، ل٧٠؛ كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، مط: الحوادث، بغداد، ١٩٧٨، ص١٢٧.

(٧١) مستەفا نەریمان، شۆڕشەكانی ئیبراهیم خانی دەلۆ١٩٢٠، چ٢، چا: رۆژ، كەركووك، ٢٠٠٧، ل١١٧.

(٧٢) م.ن، ص٩١-٩٤.

(٧٣) حەسەن جاف، ئەم قسانە بەم پێوانە باویان نەماوە، دار الكتب والوثائق، بغداد، ١٩٩٦، ل ٧٥-٧٦.

(٧٤) لاوان ئەحمەد، شاری كفری لە مێژوودا، چ١، چا: كەمال، ب. ش، ٢٠١٣، ل٢٤.

(٧٥) مستەفا نەریمان، س.پ، ل١١٦-١١٧.

(٧٦) علي الوردي، م. س، ص٧٧.

(٧٧) مستەفا نەریمان ، س. پ، ل١١٥.

(٧٨) مستەفا نەریمان، چۆن گەلاوێژ بۆ میری جاف فرمێسكی رشت، "كاروان" (گۆڤار)، هەولێر، ژ٧٨، ساڵی حەوتەم ١٩٨٩، ل٧٩.

([٧٩]) عادل صدیق، عادیلە خانم (کەسایەتی و ئەردەڵان بوون و ساحێبقرانی بوونی)، سلێمانی، بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی، ٢٠١٠، ل١١٥؛ ئیدمۆندس، س.پ، ل٢٠١.

([٨٠]) رفیق حلمی، س. پ، ل٦٣؛ سدیق صالح، س. پ.، ل٨٥.

([٨١]) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەم شەڕە بڕوانە، بیرەوەری و شیعرەکانی محەمەد سەعید بەگی سەلیم بەگی جاف، ئامادەکردنی: سدیق ساڵح، چا: شیڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨،ل٣٢-٣٣؛ م. ر. هاوار، س. پ، ل٢٢٣

([٨٢]) جەمال بابان، گەشتێک بە ناخی تەمەندا، چ١، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٧، ل١٦٨-١٧٣.

([٨٣]) س.پ، ل١٦٠.

([٨٤]) مذكرات والاس ليون في العراق ١٩١٨-١٩٤٤، الكورد والعرب والبريطانيون، مراجعة وتقديم: فيلد هاوس، ت: عماد جميل مزوری، ط١، مط: سپيريز، دهۆک، ٢٠١٠، ص١٧٠.

([٨٥]) عبدالفتاح علي بوتاني، دراسات ومباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر، ط١، مط: حجى هاشم، اربيل، ٢٠٠٧، ص٢٠٧.

([٨٦]) شێخ لەتیف، س. پ، ل٨٤-٨٥؛ شاكر خدو محوى، المسألة الكوردية في العراق المعاصر، ترجمة، عبدي حاجي، ط١، دهوک، دار سبيريز للطباعة والنشر، ٢٠٠٨، ص٤٤.

([٨٧]) "بانگ کردستان"، (رۆژنامە)، سلێمانی، ژ٧، ساڵی یەکەم، ٢٢ ئەیلوول ١٩٢٢، ل٤؛ شێخ رەشید شێخ عبدالرحمان قادر، س.پ، ل١١٧.

([٨٨]) حوسێن ئیسماعیل خانی دەڵۆ، س. پ، ل٨٨؛ عبدالكريم حميد عبدالكريم، كفری میوانداریێتی شێخ مەحمودی نەمر دەکات، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد عەلی ئەفێچی، رەنگین (گۆڤار)، بەغدا، ژ١٩، مایسی ١٩٨٩، ل٣٥.

([٨٩]) "بانگ کردستان"، ژ٩، ساڵی یەکەم، ٨ی تشرینی اول ١٩٢٢، ل٤؛ ئەحمەد خواجە، س.پ، ب٢، ل١٤٥.

([٩٠]) "بانگ کردستان"، ژ١٠، ساڵی یەکەم، ١٥ تشرینی اول ١٩٢٢، ل٤-٥.

([٩١]) م. ر. هاوار، س. پ، ب١، ل٤٥٤.

([٩٢]) جەرجیس فەتحوڵڵا، س. پ، ب١، ل٢٣٦؛ ا. م. منتشاشفيلی، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ترجمة، هاشم صالح التكريتي، بغداد، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٧٨، ص٣١٧.

([٩٣]) شێخ غەریبی کوڕی شێخ مەعرووف زاوای شێخ مەحمودە، فاتیمە خانمی کچی خواستووە، چالاکانە هاوکاری ئەوەی کرد لە یاخیبوونەکەیدا لە ١٩١٩، دەستگیرکراوە خرایە زیندانەوە، لەگەڵ شێخ مەحموود گەڕایەوە سلێمانی، کرایە وەزیری ناوخۆ لە ئیدارەی کوردی شێخ مەحموود و کاتێک لە ئازاری ١٩٢١دا کرایە دەرەوە لە سلێمانی یاوەری کرد. مامۆستا جەعفەر، س.پ، ل٥٠٦.

([٩٤]) "رۆژ کوردستان"، (رۆژنامە)، سلێمانی، ژ٤،ساڵی یەکەم، ١٣کانون اول ١٣٣٨، ل٣.

([٩٥]) بۆ ناوەرۆکی ئەم پەیمانە بڕوانە: بەشیر حوسێن سەعدی، پەیام لە مێژووی نەتەوەی کورد، چا: دارا، هەولێر، ١٩٧٩، ل٧٨-٧٩.

([٩٦]) شاکر خدو محوی، م. س.، ت: عبدي حاجي، ط١، مط: خاني، دهوک، دار سپيريز للطباعة والنشر، ٢٠٠٨، ل٤٩؛ سدیق ساڵح، س.پ، ل٨٤؛ جەلیلی جەلیل و ئەوانی تر، شۆڕشەکانی کورد لە سەردەمی نوێدا، وەرگێڕان: بەهائەددین جەلال مستەفا، هەولێر، چاپخانەی رۆژهەڵات، ٢٠١٣، ل٢٠٧.

([٩٧]) محەمەد بەگی جاف: کوڕی فەتاح بەگی کوڕی محەمەد پاشای جافە، لە نێوان ساڵانی (١٩٠٠-١٩٣٢) ژیاوە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق بووە لە سەردەمی پاشایەتیدا، یەکێک لە سەرکردەی عەشیرەتەکان بوو کە لە کۆبوونەوەی شاری کەرکووکی کرد، کە بە سەرپەرشتی راوێژکاری بەریتانیا بەسترا. جمال بابان، م.س، ج٢، ص٤١٢.

([٩٨]) ولید حمدی، س.پ، ل ١٣٥.

([٩٩]) ئیدمۆندس، س.پ، ل٣٥٩.

([١٠٠]) کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا، و: حەمە کەریم عارف، چ٦،چا : رۆژهەڵات، هەولێر،٢٠١١، ل٥٢؛ حەسەن ئەرفەع، س.پ، ل١٧٢.

([١٠١]) رفیق حلمی، س، پ، ب١، بەشی٢، ل١٢٥-١٢٧.

([١٠٢]) عادل صدیق، هەڵەبجە...، ل١٨١.

([١٠٣]) دیوانی ئەحمەد موختار جاف، ئامادەکردنی: عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، چا: الادیب، بەغداد، ١٩٨٦،ل٢٠-٢١.

([١٠٤]) عادل صدیق، هەڵەبجە ١٨٨٩-١٩٣٠...، ل١٢١-١٢٢.

([١٠٥]) نەوشیروان مستەفا ئەمین، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی رۆژنامەوانیی کوردی ساڵانی نێوان دوو جەنگی جیهانی (١٩١٨-١٩٣٨)، ب٢، بڵاوکراوەی وەزارەتی

ڕۆشنبیری، چا: شیڤان، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢١٦؛ دیوانی ئەحمەد موختار جاف، س. پ، ل٢١.

(١٠٦) عادل صدیق، هەڵەبجە...، ل١٨٤.

(١٠٧) بڕوانە دیوانی ئەحمەد موختار جاف، س. پ، ل٢١؛ حەکیم مەلا صالح، س. پ، ل٢٦٩.

(١٠٨) ئەحمەد خواجە، س.پ، ب٢، ل٣١؛ سەرحەد خەلیفە یونس، دەوری جاف و خەلیفە یونس لە شۆڕشی شێخ مەحمود، "کۆچ"، (گۆڤار) سلێمانی، ژ٦، حوزیرانی ٢٠٠٧، ل٣١٦-٣١٧.

(١٠٩) ئیدمۆندس، س.پ، ل٤٤٨.

(١١٠) ولید حمدی، س.پ، ل٣٣٨-٣٣٩.

(١١١) عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، م.س.، ص٣١٦.

(١١٢) ئیدمۆندس، س.پ، ل٤٥٠.

(١١٣) سەعد فارووق شێخ بزێنی، ئەحمەد موختار جاف، k21 (گۆڤار)، هەولێر، ژ١٢، ٢٠١١، ل٣٥٢.

(١١٤) عمر علي شريف، صفحات من تاريخ الجاف في كوردستان العراق، گولان العربی (المجلة)، اربیل، عدد ٦٦، تشرين الثاني٢٠٠١، ص٩٤-٩٥.

(١١٥) کۆزە ڕەقە: دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی سلێمانی نزیک شارۆچکەی عەربەتە، دارا ئەحمەد کەریم بەگ، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند (بەشێک لە مێژووی ڕزگاریخوازی گەلی کورد)، چ١، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠١، ل٢٠٠.

(١١٦) شێخ لەتیف، س.پ، ل١٣٢-١٣٣.

(١١٧) کمال مظهر، وثيقة سرية مهمة حولة موقف الانكليز من الشيخ محمود وحركاته، "گولان العربي"(مجلة)، اربيل، عدد٦٤، ايلول ٢٠٠١، ص٥١.

(١١٨) عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، م.س.، ص٢٩٩-٣٠٠.

(١١٩) شێخ مەحموودی حەفید زادە لە بەڵگەنامەی فرانسی دا ١٩١٩-١٩٢٤، و: نەجاتی عەبدوڵڵا، ب١، بڵاوکراوەی بنکەی ژین، چا: شیڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٧٠.

(١٢٠) جی- کیلبرت براون، قوات الليفي العراقية ١٩١٥-١٩٣٢، الترجمة والتحقيق: مؤيد ابراهيم الونداوي، مراجعة: رفيق صالح، منشورات بنكەی ژین، مط: شيڤان، السليمانية، ٢٠٠٦، ص١٤٠-١٤٣.

([١٢١]) میرزا محمد ئەمین مەنگوڕی، حقائقی بەسەرهاتی شێخ مەحموود لە پەنای ئیستقلالی کورد، ب.چ، ب.ش، ١٩٩٢، ل٢٢-٢٣.

([١٢٢]) علاءالدین سەجادی، شۆڕشەکانی کورد وە کورد و کۆماری عێراق، ئامادەکردنی و لەچاپدانەوەی: ئەحمەد موحەمەدی، چا: ئەتلەس، تاران، ٢٠٠٥، ل٧٣.

([١٢٣]) سروه اسعد صابر، کوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل (١٩١٤-١٩٢٦) دراسة تأريخية سياسية وثائقية، ط١، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١، ص٢٥٢

([١٢٤]) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی کێشەی ولایەتی موسڵ بڕوانە: فاضل حسین، کێشەی ویلایەتی مووسڵ ، و: محەمەد شاکەلی، چ٢، چا: رۆژ، کەرکووک، ٢٠٠٧.

([١٢٥]) عەبدوڵڕەحمان قاسملو، کوردستان و کورد، وەرگێڕان، عبدالله حسن زادە، چ٦، هەولێر، چاپخانەی رۆژهەڵات، ٢٠١٢، ل٧٦.

([١٢٦]) جەرجیس فەتحوڵڵا، س.پ، ب٢، ل٤٦٢-٤٦٣.

([١٢٧]) ئیدمۆندس، س.پ، ل٥٠٠.

([١٢٨]) منتشاشفلی، م.س، ص٣٣٠-٣٣١.

([١٢٩]) عبدالفتاح علي بوتاني، دراسات و...، ص٢١٠.

([١٣٠]) حەکیم مەلا صالح، س.پ، ل٢٧٨.

([١٣١]) ئینتیداب: سیستەمێکە بۆ بەڕێوەبردنی ئەو گەلانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئەڵمانیادا بوون، ئەم گەلانە ناتوانن خۆیان بەڕێوە ببەن، پێویستە لەلایەن دەوڵەتێکی پێشکەوتوو سەرپەرشتی بکرێن، ئەم سیستەمە لەلایەن جەنەڕاڵ (سمتس) سەرۆک وەزیرانی باشووری ئەفریقا دانرا. کمال مظهر احمد، اضواء على قضايا دولية في الشرق الأوسط، منشورات وزارة الثقافة والفنون، مط: دار الحرية، بغداد، ١٩٧٨، ص٧٣.

([١٣٢]) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی پەیمانی ١٩٢٦ بڕوانە: فاروق صالح العمر، المعاهدات العراقية-البريطانية واثرها في السياسة الداخلية ١٩٢٢- ١٩٤٨، منشورات وزاراة الاعلام، مط: دار الحرية، بغداد، ١٩٧٧، ص٧٠-٧٣.

([١٣٣]) عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، ج٣، ط٧، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٩، ص٦٥-٦٦.

([١٣٤]) بۆ زانیاری دەربارەی ئەم پەیمانە بڕوانە: عبدالرزاق الحسنی، العراق في ظل المعاهدات، ط١، الرافدين، بيروت، ٢٠١٣، ص٢٢٦-٢٦٢.

([١٣٥]) عەزیز شەریف، مەسەلەی کورد، و: حەمە کەریم عارف، چ١، چا: سەردەم، ٢٠١٤سلێمانی، ل٨١.

([١٣٦]) سروه اسعد صابر، كوردستان الجنوبية ١٩٢٦-١٩٣٩ (دراسة تاريخية سياسية)، ط١، مط: بەخشی حەمدی، السليمانية، ٢٠٠٦. ص١٠٦-١٠٧.

([١٣٧]) ژێرار شالیان، تراژیدیای کورد لە ڕاپۆرتێک بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان، و: وریا ڕەحمانی، پێداچوونەوە: ئاسۆ کەریم، چ١، چا: خانی، دهۆک، ٢٠١٠، ل١٦.

([١٣٨]) کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا، پێشەکی و پێداچوونەوە: سدیق ساڵح، و: سەلمان عەلی، ب١، بڵاوکراوەی بنکەی ژین، چا: شیڤان، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٥٥-٥٦؛ فاتیح ڕەسوڵ، بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ لە کوردستان، چ٢، چا: چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢٨٠.

([١٣٩]) لە سەرۆک هۆزەکانی کورد کە داوای مافی کوردیان کرد، لە سەرۆک هۆزەکانی هەورەمان: مستەفا جافەر سولتان و ئەفراسیاو سوڵتان، لە پشدەر: حەسەن ئاغا و حەمە ئاغا و ئەمین بەگ و حەسەن بەگ و ئەحمەد هاوار ئاغا رەشید ئاغا و مستەفا بەگ و سەعید بەگ و هەمزە ئاغا و محەمەدی حاجی عەباس ئاغا محەمەد ئاغا، لە هەمەوەند: فەتاح ئاغا و سەلمان ئاغا و ئەمین محەمەد ئاغا، ، کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا، ئامادەکرنی: عەبدوڵڵا زەنگەنە - شەهلا تاهیر حەیدەری، ب١، چ٢، چا: گرین گلۆری، لوبنان، ٢٠٠٩، ل١٥٨-١٨٩.

([١٤٠]) هـس، ل١٥٨.

([١٤١]) مەعرووف جیاووک کوڕی عەلی ئەسغەرە لە ساڵانی (١٨٨٥-١٩٥٨ز) ژیاوە، کاری دادوەری کردووە و یانەی سەرکەوتنی دامەزراندووە: بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ئازاد عوبێد ساڵح، رۆڵی سیاسیی کارگێڕی و ڕووناکبیری مەعرووف جیاووک ١٨٨٥ – ١٩٥٨، هەولێر، چاپخانەی حاجی هاشم، ٢٠١٢.

([١٤٢]) عبدالفتاح علي البوتاني، الحركة القومية الكوردية التحررية دراسات و وثائق، تقديم: خليل علي مراد، ط١، مط: وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٤، ص٧٩.

([١٤٣]) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج٣، ط٧، ص٦٧.

([١٤٤]) ديرك كينن، الكرد و كردستان، ترجمة: صلاح عرفان، سليمانية، منشورات مركز الدراسات الكوردية (كوردولوجی)، ٢٠١٠، ص٥٣.

([145]) معروف جیاووک، مأساة بارزان المظلومة، ط٢، دار آراس للطباعة و النشر، اربیل، ٢٠٠١، ص ٦٩.
([146]) نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردستانی عێراق سەردەمی قەڵەم و موراجەعات ١٩٢٨-١٩٣١، چ١، چا: ئۆفسێتی دەزگای سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٦١.
([147]) سروه اسعد صابر، کردستان الجنوبیة...، ص١١٢-١١٣؛ ژیان، (رۆژنامە)، سلێمانی، ژماره ٢٥٢، ٢١ تەمووز، ١٩٣٠، ل١-٢.
([148]) علاءالدین سەجادی، س.پ، ل١١٩.
([149]) معروف جیاووک، م.س، ص٨٠-٨١.
([150]) ئەحمەد خواجە، س. پ، ب٣، ل٢٦٥؛ ژیان، (رۆژنامە) ژماره ٢٥٧، ساڵی پێنجەم، له ١٤ی اغستوس ١٩٣٠، ل١-٢.
([151]) غانم محمد الحفو-عبدالفتاح علي البوتاني، الکورد والاحداث الوطنیة في العراق خلال العهد الملکي١٩٢١-١٩٥٨، ط١، مط: وزارة التربیة، اربیل، ٢٠٠٥، ص٣٩.
([152]) نەوشیروان مستەفا، س.پ، ل١١١.
([153]) توفیق وەهبی کوڕی مەعروف ئەفەندی محەمەد بەگی حەسەنە لە ساڵانی (١٨٩١-١٩٨٤) ژیاوە، ئەفسەر بووە لە سوپای عوسمانی دواتر بووە ئەفسەر لە سوپای عێراقی. محمد علي الصویرکي، معجم الاعلام (الکرد في تاریخ الاسلامی والعصر الحدیث)، السلیمانیة، مطبعة حمدي، ٢٠٠٥، ص١٦٤.
([154]) هیوا حمید شریف، توفیق وهبي (حیاته ودوره السیاسي والثقافي)، منشورات بنکەی ژین، مط: شیڤان، السلیمانیة، ٢٠٠٦، ص٧٣؛ دیڤید مەکداوڵ، س.پ، ل٢٩٤؛ ژیان، ژماره ٢٥٩، ساڵی پێنجەم، ٤ی ئەیلول ١٩٣٠، ل١.
([155]) دەربارەی راپەڕینی بەردەرکی سەرا بڕوانە: ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، س.پ، ل٢٤٠-٢٤٣؛ کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان...، ل١٦٢-١٧٢؛ جەلال تاڵەبانی، کوردایەتی...، ل٧٧-٨٠.
([156]) سەرحەد خەلیفە یونس، دەوری جاف و خەلیفە یونس لە شۆڕشی شێخ مەحمود، "کۆچ" (گۆڤار)، ژ٦، حوزەیرانی ٢٠٠٧، ل٢٩٨.
([157]) کریس کوچیرا، س. پ، ل١٤٤؛ ئەحمەد خواجە، س.پ، ب٣، ل٢٦٤-٢٦٥.
([158]) ئاوباریک: گوندێکە دەکەوێتە بناری گل کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی خورماتوو بە بیست میل لە سنووری ناوچەی گەرمیان. ئەحمەد باوەڕ، دۆزی کورد لە پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و ئێراندا، چ١، سلێمانی، چاپخانەی سەردەم، ٢٠١٤، ل٨٨؛ عبد الرحمن ادریس صالح البیاتي، السیاسة البریطانیة...، ص٣٨٣.

(١٥٩) بۆ ناوەرۆکی ئەم پەیمانە بڕوانە: محسن محمد المتولي، م.س، ص٢٠٨-٢٠٩؛ علاءالدین سەجادی، س، پ، ل١٠٨؛ ایوب بارزاني، المقاومة الكردية للاحتلال ١٩١٤ – ١٩٥٨، بدون مكان طبع، دار نشر حقائق المشرق، ٢٠٠٢، ص٧٧.

(١٦٠) عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق...، ج٣، ص٣١٣؛ احمد فوزي، م. س، ص٨٩؛ "ژیان"، (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە ٢٦٢، ساڵی پێنجەم، ٦ی تشرینی دووەم، ١٩٣٠، ل٢.٣.

(١٦١) عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، م. س.، ص٣٧١-٣٧٢.

(١٦٢) بیرەوەری و شیعرەکانی محمد سەعید بەگی سالیم بەگی جاف، س. پ، ل٣١٧-٣١٨.

(١٦٣) حەسەن جاف، دوو هەڵوێست...، ل١٥١-١٥٢.

(١٦٤) مصطفی نەریمان، تیشکێک بۆ سەر سووچێکی ژیانی داود بەگی جاف: "رەنگین"، ژمارە ٤١، ١٩٩٢، ل١٧؛ جەلال دارا جاف، جەنگی ئاوباریک لە بیرەوەری مێژوودا، "نەوشەفەق" (گۆڤار)، کەرکووک، ژمارە٤٠، تەمووزی ٢٠٠٦، ل٨؛ حەسەن جاف، گرنگی شەڕی ئاوباریک ١٩٣١ لە مێژووی شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی حەفید، "مێژوو"(گۆڤار)، هەولێر، ژ٦، ساڵی دووەم، بەهاری ٢٠٠٨، ل١٠٥.

(١٦٥) ئەحمەد باوەڕ، س.پ.، ل٨٧.

(١٦٦) عوسمان عەلی، س.پ.، ب٢، ل٢٢٦؛ سروه اسعد صابر، م.س، ص١٨٤.

(١٦٧) محەمەد ئەمین کوڕی کەریم بەگی جافە لە ساڵانی (١٩١١-١٩٦٥) ژیاوە، شاعیر بووە شیعرەکانی بەناوی مینە جاف بڵاوکراوەتەوە: دیوانی مینە، کۆکردنەوە و ڕێکخستنی: مصطفی نەریمان، پێشەکی: حەسەن جاف، مط: الجاحظ، بغداد، ١٩٩٠، ل٣.

(١٦٨) کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، س. پ، ل١٠٩-١١٠.

(١٦٩) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، ئامادەکردنی: عەبدوڵڵا زەنگەنە، ب٢، چ١، چا: وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٥١ ؛ ئەحمەد باوەڕ، س.پ، ل٨٨.

(١٧٠) مکرم طالبانی، شەڕی ئاوباریک بۆچی شکستی هێنا، "رەنگین"، ژ٦٨، ٩٩٤، ل٦٠.

(١٧١) ئەحمەد خواجە، س.پ، ل٢٨٦-٢٨٧.

(١٧٢) مکرم طالبانی، س.پ، ل١٠-١١.

(١٧٣) عەبدولڕەحمان قاسملو، س.پ، ل٨٢.

(١٧٤) بناری گل: کەوتوتە ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکووک باکووری توزخورماتوو: ساڵح هەلاج، چەردێک لە مێژووی دەڤەری گەرمیان، چاپخانەی گەنج، ٢٠١١، ل١٩٢.

(١٧٥) ئەحمەد خواجە، س.پ، ل٢٨٦.

(١٧٦) سوارە حەسەن باجەڵان، مێژووی کەلار، چ١، چا: چوارچرا، سلێمانی،٢٠١١، ل٦٨؛ ژیان، ژ٢٧٩، سالی شەشەم، ١٦ی نیسانی ١٩٣١، ل١.

(١٧٧) بەشیر حوسێن سەعدی، س. پ، ل١١٤؛ ئەحمەد خواجە، س. پ، ل٢٨٧.

(١٧٨) عمر علي شريف، الانتفاضة الاخيرة للشيخ الحفيد معركة ئاوباريک، "گولان العربي" (مجلة)، اربيل، عدد٧٠، اذار ٢٠٠٢، ص٦٤.

(١٧٩) حەسەن جاف، س.پ، ل١٠٥.

(١٨٠) اللورد لويد دولبران، العراق من الانتداب الى الاستقلال ١٩١٤-١٩٣٢، ت: الدار العربية للموسوعات، ط١، دار العربية للموسوعات، لبنان، ٢٠٠٢، ص١٨٦.

(١٨١) شێخ ڕەشید شێخ عەبدولرەحمان قادر، س.پ، ل٢٠٩-٢١٠.

(١٨٢) کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، س. پ، ل١٠٠.

(١٨٣) علاءالدين سەجادی، س.پ، ل١٣٦.

(١٨٤) م. ر. هاوار، س. پ، ب٢، ل٧٧٠.

(١٨٥) ساڵح هەلاج، س. پ، ل٢١٦-٢١٧.

(١٨٦) نەوشیروان مستەفا، س. پ، ل٦٠.

(١٨٧) شاکر فەتاح، ئاوێنەی ژینم (یادداشتەکانی شاکر فەتاح)، ب١، چ١، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣، ل٢١٠.

(١٨٨) جەمال نەبەز، کۆبەرهەم، ژمارە-٧- زنجیرەی وتاری وتووێژ لەگەڵ دەزگەی ڕاگەیاندنی گشتی، ژمارە (٢)، چ١، چا: منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٤٠١.

(١٨٩) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئاڵای کوردی بڕوانە: ئازاد عوبێد ساڵح، مێژووی ئاڵای کوردستان، "ئەکادیمیای کوردی" (گۆڤار)، هەولێر، ژ٢٣، ل٢٤٩.

(١٩٠) عادل سدیق عەلی، هەڵەبجە...، ل١٩٤-١٩٥.

(١٩١) حەسەن جاف، حامد بەگی مەجید بەگی وەسمان پاشای جاف (١٣٠٥-١٤٠٩ک) (١٨٨٧-١٩٨٨ز)، "ڕامان" (گۆڤار، ژ٢٢٤، خ٣، ساڵی بیستەم، کانوونی دووەمی، ٢٠١٦، ل١٥٦.

(١٩٢) مینتشاشفیلی، س. پ، ل٢٣؛ عادل صدیق، عادیلە خانم...، ل٨٥؛ حەسەن جاف، ئەم قسانە...، ل٨١-٨٢.

(١٩٣) حەسەن جاف، حامد بەگی...، ل١٥٨.

(١٩٤) حامد محمود عیسی، م. س، ص٢٣٨.

(١٩٥) م. لازاریف، المسالة الکوردية ١٩٢٣-١٩٤٥ النضال والاخفاق، ت: عبدي حاجي، ط١، مط: اراس، اربيل، ٢٠٠٧، ص٣١٨.

(١٩٦) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەم بزووتنەوە بڕوانە: بيرند فليب شرويدر، حرب العراق ١٩٤١، ت: فاروق الحريري، مطبعة المطابع العسكرية، ١٩٨٢؛ يونس بحري، اسرار ٢مايس ١٩٤١ والحرب العراقية الانكليزية، تقديم: علي الخاقاني، منشورات دار البيان، مط: الحرية، بغداد، ١٩٦٨؛ محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، ط١، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٦٩.

(١٩٧) نازی: کورتکراوەی (پارتی کرێکارانی سوسیالیستی نیشتمانی ئەڵمانی) یە، کە لە ساڵی ١٩١٩ لە شاری میونیخ دامەزراوە، ئەدۆلف هیتلەر(١٨٨٩-١٩٤٥) لە ساڵی ١٩٢٤ بوو بە سەرۆکی ئەم پارتە، لە ساڵی ١٩٣٣ دەسەڵاتی ئەڵمانیای وەرگرت، لە ساڵی ١٩٤٥ دوای سەرکەوتنی هاوپەیمانەکان و خۆکوشتنی هیتلەر ڕێگەی کاری ئاشکرای ئەم پارتە لە ئەڵمانیا قەدەغە کرا. مەهدی محەمەد قادر، پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق ١٩٤٥ – ١٩٥٨، سلێمانی، بڵاوکراوەی سەنتەری لیکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، ٢٠٠٥، ل٢٨٠.

(١٩٨) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەی...، ل٢٩٦.

(١٩٩) ئەنوەر جاف کوڕی جەمیل بەگی عەلی جافە لە ساڵانی (١٩١٠-١٩٩١) ژیاوە، پارێزەر بووە، لە خولی یازدەیەم لە ئەنجوومەنی نوێنەران ئەندام بووە. ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر، ئەندامە کوردەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عیراق لە ڕۆژگاری پاشایەتیدا ١٩٢٥-١٩٥٨، چ١، چا: کۆمەڵگای چاپەمەنی شەهاب، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٤.

(٢٠٠) کمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەکی ون لە مێژووی خەباتی شێخ مەحمود دەربارەی هەڵوێستی کورد بەرامبەر ڕاپەڕینی مایسی ١٩٤١، "ڕۆشنبیری نوێ، ژ١٢١، ئاداری ١٩٨٩، ل١٦٩.

([201]) بورهان جاف کوڕی عەبدولحەمیدە لە بنەماڵەی عوسمان پاشای جافە لە ساڵی ١٩٢٠ لە سلێمانی لە دایک بووە  پارێزەر بووە: عبدالمجيد فهمي حسن، م. س، ج١، ص١٧١.

([202]) کمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەکی ون...، ل١٦٩.

([203]) سەعید فەهمی جاف کوڕی عەلی کوڕی پاشای جافە لە ساڵانی (١٩٠٥-١٩٧٠) ژیاوە، لە گۆڤاری گەلاوێژ وتاری بڵاوکردۆتەوە، مير بصري، اعلام الكرد، لندن، رياض الرئيس للطباعة والنشر، ١٩٩١، ص٢٤٥-٢٤٦.

([204]) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک...، ب٢، ل١٣١-١٣٢.

([205]) فؤاد حەمە خورشید، وتووێژێک لەگەڵ مصطفی بەگی کریم بەگ، "رەنگین"، ژ٩٢، ١٩٩٦، ل١٥.

([206]) عەلی کەمال: ناوی عەلییە نازناوی کەمال کوڕی عەبدولرەحمانی حاجی قادرە، لە ساڵانی (١٨٩٨-١٩٩٨) ژیاوە ئەفسەر بووە لە سوپای عوسمانی، دواتر لە ساڵی ١٩٢٢ گەڕایەوە کوردستان، چەندین جار ئەندام بووە لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق. جمال بابان، م.س، ج١، ص٣٧٤.

([207]) مذكرات علي كمال عبدالرحمن ١٩٩٠-١٩٩٨، تقديم وتحقيق: جمال بابان، مط: الخنساء، بغداد، ٢٠٠١، ص٣٨.

([208]) میرزا محمد ئەمین مەنگوڕی، س.پ، ل٦٥.

([209]) وليد محمد سعيد الاعظمي، انتفاضة رشيد عالي الگيلاني والحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، مط: دار العربية، بغداد، ١٩٨٦، ص١٣٢؛ لازاريف، م. س، ص٣٢١.

([210]) بیرەوری و شیعرەکانی محەمەد سەعید بەگی سەلیم بەگی جاف، س. پ، ل١٨-١٩.

([211]) مصطفی نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، چا: دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٩٤، ل ٥٨؛ کەریم زەند، تۆماری تەمەن-١-گەشت، چ١، چا: ئەزمر، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل١٥٧.

([212]) دارا تۆفیق کاکەئەمین، ناوچەی پشدەر لە سەردەمی پاشایەتیدا ١٩٢١ – ١٩٥٨، سلێمانی، بڵاوکراوەکانی سەنتەری ستراتیجی کوردستان، ٢٠١٠، ل٢٠٩.

([213]) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکان...، ل٣٦٥.

([214]) میرزا محمد ئەمین مەنگوڕی، س. پ، ل٧٩-٧٠.

## ملخص البحث


العشيرة مكون مهم من مكونات المجتمع الكوردي في النصف الأول من القرن العشرين. وعلى الرغم من الجوانب الإيجابية والسلبية للعشيرة، الا انها كانت حقيقة واضحة في تاريخ الكورد. ولا يمكن فهم التاريخ الكوردي بدون فهم دور العشيرة في كوردستان.

وتعد عشيرة الجاف من اكبر العشائر الكوردية في كوردستان العراق في تلك الفترة، وكانت لها تأثير على اوضاع كوردستان والعراق لذلك اخترنا هذا العنوان لبحثنا ( دور عشيرة الجاف في النشاطات السياسية في كوردستان الجنوبية من ١٩١٨- ١٩٤٥م ).

وتم تقسيم البحث الى ست عناوين فرعية وهي: دور عشيرة الجاف في حكومة شيخ محمود الأولي، دور عشيرة الجاف في ثورة ابراهيم خان دلو، دور عشيرة الجاف في حكومتي الشيخ محمود الثانية والثالثة، موقف بكزادة الجاف من مسألة ولاية الموصل، دور عشيرة الجاف من انتفاضة ١٩٣٠ في السليمانية، وأخيرا دور عشيرة الجاف من معركة آوباريک.

من الطبيعي ان لا تكون لهذه العشيرة الكبيرة موقف موحد من هذه الاحداث، ولكن بصورة عامة كانت لها مشاركة فعالة فيها وكانت تؤيد المطالب القومية الكوردية. وان هذه العشيرة كانت تؤلف جزءا كبيرا من قوات الشيخ محمود البرزنجي وخاصة ان الشيخ محمود لم يكن له عشيرة كبيرة بالمقارنة مع عشيرة الجاف.

اضافة الى الجانب القتالي شارک قسم من الجاف بالقلم في نضال الكورد في كوردستان العراق. وكان للمرأة دور كبير في هذه العشيرة مثل (عادلة خاتون)، وكانت هذه العشيرة موزعة على لوائي السليمانية وكركوک.

## Abstract

Tribalism is one of the most important components of Kurdish society in the first half of the 20th century. Since the tribe has good and bad aspects, although it is a clear historical fact for the Kurds. Without knowledge of the role of tribes in Kurdistan it is difficult to understand the history of the Kurds. Jaff one of the largest Kurdish tribes in the Kurdistan of Iraq in this period had a (significant impact on political activities in south Kurdistan (1918 - 1945)). We decided to limit it to the title of our research.

The research is divided into six sub-sections:

The Role of the Jaff Tribe in the First Government of Sheikh Mahmud, The Role of Jaff Nest in the Ibrahim Khan uprising, The Role of the Jaff Nest in the Government of Sheikh Mahmoud II and III,The opinion of the princes of the Jaff tribe about the Mosul state, the role of Jaff Nest in Darkai Sara 1930, and there roles in Aw Bareek war .

It is a natural condition that a large clan did not have a single opinion in these events, but it had an active role and in general was a supporter of the national rights of the Kurds, the Jaff clan that played a large role among the Sheikh Mahmud forces.

However, they had large forces, a group of them who participated in their words in the struggle of the Kurdish people in Iraq. Women had an important role with men in this tribe, especially Adela Khan, Jaff clan distributed in Sulaymaniyah and Kirkuk .

# تێکچوونی پەیوەندیی کورد و ئاسووری- فاکتەر و لێکەوتەکانی

**مامۆستای یاریدەدەر : فارس لەتیف یەحیا** **مامۆستای یاریدەدەر : نعمەت عەلی مەحموود**

بەشی مێژوو / فاکەڵتی ئاداب/ زانکۆی سۆران

**پێشەکی:**

ئاسوورییەکان بەو پێیەی لە دێر زەمانەوە لە کوردستان گیرساونەتەوە، مێژوویەکی دوور و درێژیان لەگەڵ گەلی کورد هەیە، بەدرێژایی ئەو ماوەیە ئاماژە بە هیچ شەڕێکی ئایینی و مەزهەبی لەنێوان ئەو دوو گەلە نەکراوە، تاکو لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم. پرسی ئاسووری لەلایەن وڵاتانی هەرێمی و زلهێزی ئەوروپاییەوە کراوەتە پاساوێک بۆ دەستوەردان لە کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتی عوسمانی. دووبەرەکی و نانەوەی پشێوی لە نێوان هەردوو گەلی کورد و ئاسووری ئامرازێک بووە بۆ مەرامە نارەواکانی خۆیان، بە پاساوی نێوانگیری و هەوڵدان بۆ چارەسەری دۆزەکە، بە ئارەزووی خۆیان دەستیان خستۆتە ناو کاروباری ناوخۆیی ناوچەکە.

ئەوەی لە ماوەی هەردوو سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا ڕووبەڕووی هەردوو گەلی کوردو ئاسووری بۆتەوە لە تێکچوونی پەیوەندیی نێوانیان تاکو گەیشتووە بە چەندین شەڕی خوێناوی، هەموو بە زیان بەسەر هەردوو لایاندا شکاوەتەوە و بۆتە هۆی لەدەستدانی توانایەکی مرۆیی زۆر، دوای کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی، هیچ کام لەو دوو گەلە بە ئامانجی خۆیان نەگەیشتن.

گرنگیی توێژینەوەکەمان لەوەدایە، کە ڕەنگە زۆر کەس وابزانن کورد ستەمکار بووە و، ستەمی دەرحەق بە گەلێکی ستەمدیدەی هاوشێوەی خۆی کردبێت، دەرکەوتووە کە ناکۆکییەکان خۆڕسک نەبوون، بەڵکو بە

فاکتەری دەرەکییەوە ورووژێنراون و هەر کاتێک کاریگەری ئەم فاکتەرانە لەسەریان نەمابێت، پەیوەندییەکانیان گەڕاوەتەوە دۆخی جارانی.

**چەردەیەک لەسەر ئاسووری و ڕەچەڵەکیان:**

ئەوەی کە گەلی ئاسووری لە کوێوە هاتوون و کەی بەم ناوە ناسراون، مشتومڕو لێکدانەوەی جیاوازی بۆ کراوە. سەبارەت بە ڕەچەڵەک و ناو و نیشتمانی ئاسوورییەکان چەندین تیۆر و بیروڕای جیاواز هەن. یەکێکیان پێی وایە ئەوانە ئەو کلدانییانەی سەر زەویی نێوان دوو ڕووبار (میزۆپۆتامیا)ن و لە سەردەمێکی زوودا پاش تەنگ پێهەڵچنینیان ناوچەکانی خوارووی عێراقیان جێ هێشتووە و لەژێر گوشاری هێزە دراوسێکانیان ڕوویان لە ناوچە شاخاوییەکان کردبێت[١].
یەکێکی تریان وای بۆ دەچێت کە پاشماوەی ئیمپراتۆری ئاشوری بن، کە لە سەدەی (١٠) هەمی پێش زایین زۆر پەرەی سەند، پاشان لەلایەن میدییەکانەوە ڕووخێنرا و پایتەختەکەیان کە نەینەوا بوو کاول کرا، پاشماوەکەشیان لە چیاکانی کوردستان جێگیر بوون[٢] .

ئاسورییەکان خۆشیان لەسەر ئەو باوەڕەن و لە لێکۆڵینەوەکانیاندا هەوڵی سەلماندنی ئەو تیۆرەیان داوە. لەوانەش نووسەری ئاسووری بە ڕەگەز سۆڤیەتی (ماتقیڤ بارمتی). ئاسوورییەکان بڕوایان وایە دوای ئەوەی لەلایەن میدییەکانەوە تێکشکێنران بە ناچاری لە ناوچە شاخاوییەکانی نێوان دەریاچەی ورمێ و وان گیرساونەتەوە و کردوویانە بە مەڵبەندی خۆیان[٣]. ڕایەکی تریشیان وای دەبینێت ئاسورییەکان پاشماوەی ئەو (١٠) خێڵە جوولەکە بزرە بن، کە ئیمپراتۆری ئاشوری (٩١١–٦١٢پ.ز) لە سێ هێرشی یەک لەدوای یەک پاش لەناوبردنی مەملەکەتی ئیسرائیل بەدیل گرتوونی و بۆ فەڵەستین ڕاگوێزراون بۆ ناوچەکانی ژێر دەستی ئاشوری و لە ناوچە شاخاوییەکاندا نیشتەجێیان کردوون. دواتر پاش بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی وازیان لە ئایینی پێش خۆیان هێناوەو بوونە مەسیحی و چوونەتە سەر مەزهەبی نەستوری[٤].

ناوهێنانیان بە (نەستوری) دەگەڕێتەوە بۆ مەزهەبەکەیان. نەستوریۆس، یەکێ لە پێشەوا گەورەکانی مەسیحییەکانی شاری (ئورفا) لە

ساڵی (٤٢٤) باوەڕێکی نوێی هێنایە ناو ئایینی مەسیحییەوە، ئەمەش یەکەم دابەشبوونی قووڵی لەناو ئەم ئایینە دروست کرد. نەستوریۆس باوەڕی وابوو کە (عیسا) خاوەن دوو کەسایەتی جیاوازە، کەسایەتییەکی مرۆیی (کوڕ) و کەسایەتییەکی خوایی (باوک). نابێت (مەریەم) بە دایکی خوا دابنرێت، چونکە ئەویش مرۆڤە و مەسیحی لێ بووە. ئەم باوەڕە لەگەڵ باوەڕەکانی نێو مەسیحییەتدا ناکۆک بووە، بۆیە پێشەوا ئایینییەکانی تر و بە تایبەت ئەوانی ڕۆما و ئەسکەندەرییە بە لە دین دەرچوونیان لە قەڵەم دا، بەڵام نەستوریۆس بەردەوام بوو لەسەر ئەم باوەڕەی و لایەنگرێکی زۆری پەیدا کرد، بۆیە بە نەستوری ناسران[٥].

سەبارەت بەو زمانەی ئاسوورییەکان قسەی پێدەکەن زۆربەی زمانناسان لەو بڕوایەدان زمانی قسەکردنی ئاسوورییەکان زمانی ئارامییە، و هەروەها زمانی کلدانییەکانیشە، کەوا دەگەڕێتەوە سەر کۆمەڵەی زمانی سامی[٦].

ئاسوورییەکان لە سەردەمی نوێدا کەوتبوونە ژێر هەژموونی هەردوو دەوڵەتی زلهێزی (عوسمانی و ئێران). لە ڕواندز و ئامێدییەوە تاکو دەریاچەی ورمێ، لە وێشەوە بۆ دەریاچەی وان بڵاو بووبوونەوە[٧]. ئاسوورییەکان لە ئێران لە هەرێمی ئازەربێجان و لە شارەکانی ورمێ و خوی و سەڵماس و دیلمان و مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ نیشتەجێ بوون[٨]. ئاسوورییەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیش لەناو سنووری میرنشینەکانی (هەکاری، بۆتان، بادینان، سۆران) بڵاو بووبوونەوە. (لۆرد کیرزون) لە ساڵی (١٨٩١) دا ژمارەی هەموویانی بە (١٠٠–٢٠٠) هەزار کەس خەمڵاندووە، لەوانە (٤٠) هەزاریان لە ئازەربێجان بوون، کەوا بە زۆری لە ناوچە کوردییەکان بوون بەم شێوەیە دابەش کراون:

| | |
|---|---|
| سەڵماس | ٧٠٠ خێزان |
| سۆماو چرا | ١٠٠ خێزان |
| ورمێ | ٣٦٠٠ خێزان |
| سوڵدوز | ٤٠٠ خێزان |
| باراندوز | ١٠٠ خێزان |
| تەرگەوەڕ | ٥٠٠ خێزان [٩] |

ئاســوورییەکان لە چەنــدین هــۆزی جیــاواز پێکهــاتوون، تیــاری گەورەترینی هۆزەکانیان بوو[١٠] و، چەند هۆزێکی تریش هەبوون بەناوی (تخوبـا، بـاز، جیلـۆ، ئاشـوتی، سـز، نۆجێیـا، داس، لیـون، نـودیس)[١١]. ئاسورییەکانی ئازەربێجان زۆربەیان بە شێوەی ژیانی لادێیی دەژیان، بەڵام ئاســوورییەکانی بــن دەســەڵاتی دەوڵەتــی عوســمانی شــێوەی هۆزایەتییان هەبوو[١٢]. یەک سەرۆکی رۆحییان هەبوو کە پشتاوپشت دەسەلاتی بۆ نەوەکانی دەگواسترایەوە بە ناوی (مار شەمعون [١٣]) [١٤].

## پەیوەندیی کورد و ئاسووری لە سەدەی نۆزدەهەم:

پەیوەنــدیی نێــوان کــوردی موســڵمان و ئاســوریی مەســیحی بە شێوەیەکی گشتی و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ هێمن و ئاسایی بووە. تاکو سەدەی نۆزدەهەم هیچ شەڕێکی ئایینی و مەزهەبی لە نێوانیاندا نەقەومـاوە. ئاسـوورییەکان لە سنووری میرنشینەکانی (هەکاری، بۆتان، بادینان، سۆران) بە ئاسوودەیی ژیاون و سەرکردەکانی خۆیان بەرپرسی هۆزەکانی خۆیان بوون[١٥]. پێشتر مار شەمعونی سەرۆکی ڕۆحیی ئاسوورییەکان ملکەچی دەسەڵاتی میری بۆتان بووە، لە کاروباری دونیایی هۆزەکان هیچ ڕۆڵێکی نەبووە[١٦]. سەرۆک هۆزەکانیان لە بەرامبەر کورد و کوردیش لە بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی بەرپرسیاری کۆکردنەوەی باج و سەرانە بوون[١٧].

سەرەتای چلەکانی سەدەی نۆزدەهەم، ئاسورییەکانی ژێر دەسەڵاتی (نــوروڵڵا بەگ[١٨])ی هەکــاری لە گــوێڕایەڵیکردنی میــری هەکــاری دەرچــوون[١٩] و مــار شــەمعــونی ســەرکردەکەیان دەســتی کــرد بە دەستوەردان لە کاروباری سیاسی و پیلانگێڕان دژی نوروڵڵا بەگ بە هاندانی دەستی دەرەکی[٢٠]. بۆیە میری هەکاری داوای هاوکاری کرد لە میر (بەدرخان بەگ[٢١])ی میری بۆتان و ئەو دەڤەرەی بۆ ئەو بەجێ هێشت[٢٢]. هۆزی تیاری وەکو گەورەترین هۆزی نەستوری هاتنی میسیۆنەرە ئەوروپی و ئەمریکییەکانیان بۆ ناوچەکە بەهەل زانی و خۆیان لە باجدان بە میرە کوردییەکان و دەوڵەتی عوسمانی دزییەوە، تەنانەت ئامادە نەبوون دان بە دەسەڵاتیشیاندا بنێن[٢٣].

بە گەیشــتنی میســیۆنەرە بەریتــانی و ئەمریکییەکــان بــۆ نــاوچەی هەکاری، ناکۆکییەکانی نێوان ئاسووری و کورد گەرمتر بوو، لە ساڵی (١٨٣٨) میسیۆنەری بەریتانی (بادجەر) گەیشت، پێش ئەویش بە دوو ساڵ (بیسـتر بـیکن) گەیشـتبووە نـاوچەکە. هەردوو میسـیۆنەرەکە بە ئاشـکرا بانگەوازیـان بـۆ هەڵـگەڕانەوەی ئاسـوورییەکان کـردووە، دژی ئەوانەی پێیاندەوتن (کوردە دەمارگیرەکان)[٢٤].

وڵاتــانی ئەوروپــی کــاریگەریی زۆریــان هەبــوو لە ورووژانــدنی ئاسـوورییەکان دژی کـورد، بە تـایبەتی لەو کاتـانەی میر بەدرخـان پاشـا خەریکـی ڕاپەڕینێکـی گەورە بـوو دژی دەوڵەتـی عوسـمانی، ئەویـش بە نــانەوەی دووبەرەکــی لە نێــوان کــورد و ئاســووری بە هانــدانی ئەو میســیۆنەرانەی لەو ناوچــانەی ئاســوورییەکان بڵاویــان کردبــوونەوە[٢٥]. میسیۆنەری ئەمریکی (گرانت) یەکێک بوو لە جێبەجێکارانی ئەو سیاسەتە و توانی پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵ مارشەمعون ببەستێت بۆ ئەنجامدانی ئەو مەبەستە[٢٦]. یەکێک لەو میسیۆنەرانەی لە ساڵی (١٨٣٦) لە نامەیەکدا بـۆ مارشــەمعـون نووســیویەتی دەڵێـت: **" ئەو کـوێرەوەریەی خـۆت و گەلەکەت لەم نـاوچەیەدا، بە درێژایـی ئەو مـاوەیە بەسـەرتان هـاتووە، هەمووی لە ئەنجامی زوڵمی ئیسلامی دایە. ئەوەش بەزەیی و هاودەردی بـرا مەسـیحییەکانی ئەمریکاتـانی ورووژانـد و سـەرنجی ڕاکێشـاون بـۆ مەســـەلەکەتان"**[٢٧]. هەروەهــا بــادجەر لە ڕاپۆرتێکیــدا بــۆ (کــۆمەڵی بڵاوکـردنەوەی ئینجیـل) نووسـیویەتی **" نـورولڵا بەگ میـری هەکـاری سەربەخۆیی لە نەستورییەکان زەوت کردووە، ئەگەر ئەو یارمەتییە کاتییە نەبوایە کە ئێستە پێیان ئەدرێ، کوردەکان سەریان پێ دانەواندبوون بۆ یاساکانی خۆیان کە یاسای جەنگەڵە"**[٢٨].

کۆنسـوڵی بەریتـانی لە موسـڵ و وان هـانی ئاسـوورییەکانی دا بـۆ ئەوەی دژ بە (بزووتنەوەکەی[٢٩]) بەدرخـان پاشـا بوەستنەوە و باجی پێ نەدەن، ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی شـەڕێکی گەورە لە نێوان هەردوو گەلـی کـورد و ئاسـووری لە نێـوان سـاڵانی (١٨٤٢-١٨٤٦). لەم شـەڕانەدا ئاسـوورییەکان زیـانێکی گەورەیـان پـێکەوت، ئەمەش پـاڵی بە وڵاتـانی ئەوروپییەوە نـا بـۆ خـۆ تێهەڵقورتانـدن و گوشـار خسـتنە سـەر دەوڵەتـی

عوسمانی تاوەکو کورد تەمێ بکات و دەسەڵاتی ناوەندی بەهێز بکاتەوە لە ناوچەکەدا[٣٠]. ئەمە لە کاتێکدا پێویست بوو بەدرخان پاشا خۆشی باج بداتە دەوڵەتی عوسمانی، هەروەکو بە(دبلیو ستیڤن) یاریدەدەری کونسوڵی بەریتانی لە موسڵی ڕاگەیاندووە، **"پێشتر (٤٠٠) قوروشی داوە بە والیی دیاربکر، بەڵام دوای ئەوەی ناوچەکە خرایە سەر ولایەتی موسڵ پێویست بوو (١٤٠٠) قوروش بداتە (محەمەد پاشا)ی والیی موسڵ"**[٣١]، جگە لەمەش، بەدرخان پاشا یارمەتی هەزاران بێوەژن و کەسانی کەم دەرامەت و خاوەن پێداویستی تایبەتی دەدا[٣٢].

لە ساڵانی (١٨٤٣) و (١٨٤٦) بەدرخان پاشا ناچار بە شەڕێکی گەورە بوو و، پەلاماری هەزاران ئاسووری دا، کەوا لەژێر سایەی میرە کوردییەکاندا ژیانیان بەسەر دەبرد[٣٣]. ئەو هێزە کوردییانەی لەژێر سایەی میر بەدرخان یەکیان گرتبوو هێرشیان کردە سەر نەستورییەکانی ناوچەی تیاری، تاکو ئەیلوولی (١٨٤٣) بە تەواوی دەستیان گرت بەسەر ناوچەی تیاری و سیاسەتی کوشتن و گرتنیان بە شێوەیەکی بەرفراوان ئەنجامدا[٣٤]. لە ئەنجامی هێرشەکەدا مارشەمعون لەگەڵ هەندێک لە خزمەتکارەکانی هەڵات و پەنای بردە بەر نوێنەری کونسوڵی بەریتانی لە موسڵ[٣٥]. لە خولی یەکەمی شەڕدا تارادەیەک زیانەکان کەم بوون، بەڵام لە خولی دووەمی شەڕەکە لە ساڵی (١٨٤٦) ڕێگە دراوە بە هۆزەکان بەشداری بکەن لە پەلاماردانی ئاسوورییەکان، بۆیە قوربانییەکانی ئەم شەڕە گەلێک زیاتر بوون، بە جۆرێک کەوا لە هەندێک شوێن کوشتارگە ڕێک خراوە[٣٦].

سەبارەت بە زیانەکانی شەڕەکان بۆچوونی جیاواز هەیە. سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان زیادەڕەوی دەکەن لە ژمارەی قوربانییەکان و بە ترسناکی باسی لە کوشتاری ئاسووری و زەوتکردنی ماڵ و سامانیان کردووە. (هنری لایارد) سیخوڕی بەریتانی ژمارەی کوژراوەکان بە (١٠) هەزار و بریندارەکانیشی بە سەدان هەزار مەزەندە کردووە[٣٧]. لەلای خۆشییەوە مارشەمعون ژمارەی کوژراوەکانی بە (٤) تاکو (٥) هەزار کەس خەمڵاندووە[٣٨]، کەچی ژمارەی ئاسوورییەکان لەو کاتەدا لە (٦) هەزار کەس زیاتر نەبووە و لەسەر زاری خودی بەدرخان پاشاوە ژمارەی

کـوژراو و برینـداری هەردوولای بە (٢-٣) هەزار کەس دانـاوە[٣٩]. لە ٦ی کـانوونی دووەم ســەبارەت بەم باســە (لــورد بالمرســتون) ی وەزیــری دەرەوەی بەریتانی نامەیەکی بۆ (ویلزلی) ڕاگری کاروبـاری باڵوێزخـانەی بەریتانیـا لە ئەسـتەمبۆڵ نـاردووە کە دەڵێت **" حکومەتی خـاوەن شـکۆی بەریتـانی بەوپەڕی نیگەرانییەوە ئاگاداری (٥٠٠ بۆ ٦٠٠) کوژراوی ئەم دواییەی نەستورییەکانە بە دەستی بەدرخان بەگ"**[٤٠].

مارشەمعون هاوپەیمانێکی بەهێزی لەپاڵ خۆیدا دەبینی کە بەریتانیا بوو، بۆیە هیواکانی پێوە گرێدابوو[٤١] و ئامـانجی خۆی لە وەدەستخستنی ســـەربەخۆیی نەدەشـــاردەوە[٤٢]. بەڵام دەبێــت ئەوەش بــزانین کە دوای لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانی و بە تایبەت سەرەتای سـەدەی نۆزدەهەم، بەرژەوەندیی وڵاتانی زلهێزی ( بەریتانیا، فەرەنسا، رووسیا، ئەلمانیا) ڕۆژ دوای ڕۆژ زیادی دەکرد و هەموو دەست تێوەردانێکیـان بۆ بەرژەوەنـدیی تایبەتی خۆیان دەکرد، لە پێناو قایمکردنی شوێن پێگەی خۆیـان نـاکۆکی و دووبەرەکـی ئـایینی و نەتەوەییـان پەرە پێـدەدا[٤٣]. لەلایەکـی تریشــەوە بەرپرسـانی دەوڵەتـی عوسـمانی ڕۆڵێکـی دیاریـان هەبـوو لە بـرەو پێدانی ناکۆکی کورد و ئاسووری[٤٤].

باڵوێزی بەریتانیا لە ئەستەمبۆڵ (ستراردفۆر کانگ) ئاگاداری داوەتە دەوڵەتی عوسمانی کە والییەکانی عوسمانی لە ئەرزەڕۆم و موسڵ بەشدار بـوون لەو هێرشـانەی کراوەتە سـەر ئاسـوورییەکان، (سـیر کانـگ) ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە دەوڵەتی عوسمانی پێشتر بەڵێنی دابوو ڕێنمایی بداتە ئەو دوو والیـیە، بەڵام پێـدەچێت ئەو بەڵێـنەی لەبیـر خـۆی بـردبێتەوە[٤٥]. میسیۆنەری ئەمریکیش (گرانت) بڕوای وابـوو والیی موسڵ لەگەڵ کـورد هاوکار بووبێت بۆ لێدانی ئاسوورییەکان، چونکە لەکاتی شـەڕەکانی سـاڵی (١٨٤٣)دا سـنووری ولایەتـی موسـڵی لەگەڵ ولایەتـی هەکـاری داخسـتووە، تـاکو کارئاســانی بــۆ کــوردان بکـات بەدوای لایەنگرانــی مارشــەمعـون بـکەون[٤٦]. بـۆیە حکـومەتی بەریتـانی بە ڕاشـکاوانە دەوڵەتـی عوسـمانی ئاگـــادار کـــردۆتەوە کە ئاکـــامی ئەو کوشـــتارە چ زیـــانێکی گەورەی مەترسیداری لەسـەر بەرژەوەندییەکانی عوسمانی دروست کردووە، چونکە لە بەرمـبەردا نـاڕەزایی فەرمـی و میللیـی ڕای گشـتی وڵاتـانی ئەوروپـایی

لێکەوتــوتەوە دژی دەوڵەتــی عوســمانی. ڕاســتە وڵاتــانی ئەوروپــایی بەرژەوەنــدییان لە یەکپــارچەیی خــاکی عوســمانی دەبینــەوە، بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو وڵاتانە هەموویان ئەوە تێبگەن و لە ئاست ئەو کوشتارە بێدەنگ بن[٤٧]. ئەو هەرەشانە فاکتەری سەرەکی بوونە بۆ ئەوەی دەوڵەتی عوســمانی لەپێنــاو دەربــازبوونی لەم تەنگــژەیەدا بڕیــاری گەڕانــدنەوەی دەســەڵاتی مەرکەزی بــدات بــۆ نــاوچەکە، چــونکە بــوونی کوردســتانێکی ســەربەخۆ نەک لە بەرژەوەنــدیی ئەو وڵاتــانە نەبــووە، بەڵکــو دەبــووە هۆکارێــک بــۆ تێکەڵکردنــی هەمــوو کارتەکــانی ڕکــابەری تونــد لەســەر خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە لە کۆتاییدا لە بەرژەوەندیی رووسیای ڕکابەری توندی بەریتانیا تەواو دەبوو[٤٨].

لە ١٧ تشرینی یەکەمی (١٨٤٧) شاڵاوەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر میرنشینی بۆتان سەرکەوتنی بەدەست هێنا و میر بەدرخان و خان مەحمود خان خۆیان دا بەدەستەوە[٤٩]. میر بەدرخان ئۆباڵی شکستهێنانی ڕاپەڕینەکەی خستۆتە ئەستۆی نەستورییەکان، چونکە ئەوان هۆکار بوونە بۆ ئەو نەهامەتیانەی ڕووبەڕووی میرنشینەکە بۆتەوە. هەر بۆیە دوای ڕووخــانی میرنشــینەکە لە شــاری ورمــێ زانایــانی ئــایینی کــۆنگرەیەک دەبەستن و لە بەیاننامەیەکدا ئۆباڵی ڕووخانی میرنشینی بۆتان بە پلەی یەکەم دەخەنە ئەستۆی نەستورییەکان و دواتریش میسیۆنەرە ئەوروپایی و ئەمریکییەکان[٥٠].

دوای کۆتاییهــاتنی شۆڕشــی میــر بەدرخــان پاشــا، وردە وردە پەیوەنــدیی کــورد و ئاســووری گەڕاوەتەوە دۆخــی ئاســایی. لە کــاتی شۆڕشــەکەی یەزدان شــێری بــرازای میــر بەدرخــان لە (١٨٥٣–١٨٥٦)دا ئاسوورییەکان بەشداریيەکی کەمیان کردووە و لە ژێر فەرماندەیی ئەو دابوون[٥١]. لە سەردەمی شۆڕشی (شێخ عوبەیدوڵڵا)ی نەهریش لە (١٨٨٠) دا، شــێخ هەوڵیــدا بــۆ ئەوەی بیانکــاتە هاوپەیمــانی خــۆی دژی ئێــران و عوســمانی، بەڵام ســەبارەت بە بەشــداری ئاســوورییەکان لەتەک شــێخ عوبەیدوڵڵا ڕای جیاواز هەیە. هەیانە دەڵێت لە ژێر کاریگەریی میسیۆنەرە بیانییەکان بێلایەنییان هەڵبژارد و بەشداری شۆڕشیان نەکردووە، شێخیش لە لایەن خۆیەوە پارێزگاری لێکردوون و نەیهێشتووە زیانیان پێبگات[٥٢].

هەشیانە پێی وایە مارشەمعونی سەرکردەی ئاسوورییەکان پاڵی داوەتە لای شۆڕشگێڕان و ئەو هەڵوێستەش لەبەر ئەوە بووە چونکە شێخ ڕەفتار و کردەوەی دۆستانەی لەگەڵ ئاسوورییەکانی ناوچەکە هەبووە و دژی ئەوە بووە ستەمیان لێ بکرێت[٥٣]. دواتریش لە سەدەی بیستەم، دوای ئەوەی (شێخ عەبدولسلامی بارزانی) کاتێک لەبەر هێرشی تورکەکان خۆی پێناگیرێت و ناچار دەبێت لە بارزان بکشێتەوە، ماوەیەک خۆی لە شوێنێکی هێمن حەشار بدات، ڕووی کردۆتە بارەگای سەرەکی ئاسوورییەکان لە (قوچانس). مارشەمعون لەوێ داڵدەی داوە و شاردوویەتییەوە تاکو سەرلەنوێ هێزەکانی ڕێک بخاتەوە[٥٤]. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەوا ئەوەی لە پەیوەندیی کورد و ئاسووری هاتۆتە ئاراوە شتێکی خۆڕسک و خوازراو نەبووە، بەڵکو بەفیت و هاندانی دەستی دەرەکی بووە، بۆیە بە کەمبوونەوەی ئەو کاریگەرییە جارێکی تر ئەو پەیوەندییانە بەرەو ئاساییبوونەوە چوونەتەوە.

**پەیوەندییەکان لە سەدەی بیستەم:**

ئێران لە سەرەتای سەدەی بیستەم دەوڵەتێکی دواکەوتوو بوو، لەلایەن شایەکانی قاجاری بە شێوەیەکی ڕەها و بێ لێپرسینەوە فەرمانڕەوایی دەکرا. ئەم وڵاتە لە ڕووی ئایینی و فرە مەزهەبییەوە هەمە چەشن بوو، کە پەیوەستێکی بەهێزی هاوبەش پێکەوە کۆی نەکردبوونەوە[٥٥]. هەر لە سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانی عوسمانییەکان سەرکەوتنی گەورەیان لە باکووری کوردستانی ڕۆژهەڵات بەسەر هێزەکانی رووسیا تۆمار کرد[٥٦]، بەڵام زۆری نەبرد رووسەکان شوێنی عوسمانییەکانیان گرتەوە[٥٧].

لە سەروبەندی ململانێی نێوان رووس و عوسمانی لەسەر ناوچەی باکووری خۆرئاوای ئێران (ئازەربێجان) و باکووری کوردستان. ئاسوورییەکان بە هاندانی رووسەکان لە دەوڵەتی عوسمانی راپەڕین و توانییان شاری جولەمێرگی ناوەندی ولایەتی هەکاری بگرن. لەم ڕووبەڕوو بوونەوانەدا کوردەکان هاوکاری دەوڵەتی عوسمانی بوون و لە هەڵمەتەکانی سەر ناوچەکانی (تیاری و تخوما) دژ بە ئاسوورییەکان

بەشدار بوون[٥٨]. لە ٣٠ كانوونی یەكەمی ١٩١٤ هێزەكانی رووسیا بە فەرمانی سەركردایەتیەكەیان لە هەرێمی ورمێ كشانەوە و هێزە عوسمانییەكان شوێنیان گرتنەوە. كشانەوەی لە ناكاوی هێزەكانی رووسیا پشێوییەكی گەورەی نایەوە و ترسی خستە دڵی ئاسوورییەكانەوە. لە ماوەی مانەوەی توركەكان لە ورمێ زیاتر لە هەزار ئاسووری كوژران و ژمارەیەكی زۆریشیان لە برسان و بێ خۆراكی و نەخۆشی مردن[٥٩]. لە مانگی ئایاری ١٩١٥ مارشەمعونی گەورەی ئاسوورییەكان نامەیەكی بۆ سەركردایەتی هێزە رووسییەكان نارد. لە نامەكەدا باسی لە نەهامەتییەكانی ئاسورییەكان كردبوو لە ماوەی ئەم چەند مانگەی ڕابردوو بە دەستی كورد و هێزەكانی تورك لە كوشتن و سووتاندنی دێهاتەكانیان لە هەكاری. بۆیە لە وەڵامی نامەكەدا رووسەكان داوایان لە مارشەمعون كرد شوێنەكانیان جێ بهێڵن و ڕوو بكەنە ئێران و لە ناوچەكانی سەڵماس و ورمێ نیشتەجێ بن[٦٠].

سەبارەت ژمارەی ئەو ئاسوورییانەی ڕوویان كردبووە ئێران ئاماری جیاواز هەیە، ئەدمۆندز ژمارەی نەستورییەكانی پەنابەر بە (٣٥) هەزار كەس[٦١] و، كسرەوی بە (٥٠) هەزار دادەنێ[٦٢]. سەرچاوەكانی ئاسووریش جەخت دەكەنەوە كەوا ژمارەكە (٣٥) هەزار كەس بووە[٦٣].

لە كانونی یەكەمی ١٩١٥ مارشەمعون سەرۆكی ئاسورییەكان بۆ گفتوگۆی سیاسی و سەربازی ڕووی كردە (تەفلیس) و لەگەڵ فەرماندەی بەرەی قەفقاس ( نیكولای نیكولافیج) كۆبووەوە. لەم دیدارەدا هەردوولا پێكهاتن ئاسوورییەكان لە پاڵ رووسەكان و وڵاتانی هاوپەیمانی بەشداری بكەن و دەوڵەتێكی سەربەخۆ بۆ خۆیان دابمەزرێنن، هەروەها گەیشتنە ڕێكەوتنێک بۆ پێكهێنانی سوپایەكی ئاسووری سەربە رووسەكان و مووچەیەكی مانگانەی (٥٠٠) روبل بۆ خۆی و (٦) روبل بۆ هەرگەورە پیاوێك و (٣) روبل بۆ هەر منداڵێك لەلایەن رووسەكانەوە تەرخان بكرێت[٦٤].

ئەو ئاسوورییانەی هاتبوونە ئێران، لە ورمێ و سەڵماس و خوی و ئاواییەكانی دەوروبەری، پشێوییان خستبووە ناوچەكەو، بە شەو و بە ڕۆژ خەریكی ڕاو و ڕووت و تاڵانكردن بوون. دەستیان لە كوشتنی خەڵك

نە دەپاراست و، دەسەڵاتدارانی رووسیش چاوپۆشییان لێ دەکردن[٦٥]. لە بەرامبەر ئەوەی بە درێژایی سنووری ئێران لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی درێژ بوو بوونەوە و وەکو قەڵغانێک بۆ بەرگریکردن لە هێرشی تورکەکان[٦٦].

لە سەرەتای ساڵی ١٩١٦ ئاسوورییەکان یەکەیەکی رامیارییان پێکهێنا، کە بە (یەکێتی ئازاد) ناسرابوو و هێزی چەکدارییش بە بازووی سیاسی هەژمار دەکرا. ئامانجی ئەم یەکێتییە دامەزراندنی سیستەمێکی کۆماری و بنیاتنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ، کە سنووری دەسەڵاتی بریتی بوو لە (ورمێ، موسڵ، تور عابدین، نوسێبین، جەزیرەی بۆتان، جولەمێرگ)[٦٧].

لە سەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە رووسیا تووشی داتەپینی ناوەخۆ بوو، لە شوباتی ١٩١٧ شۆرشێکی ناوخۆیی روویدا و رژێمی قەیسەری رووخا. ئەو رژێمەی هاتە سەر دەسەڵات سەرەرای رووداوەکانی ناوەخۆی روسی تاکو پایزی هەمان ساڵ لە شەر لەگەڵ هاوپەیمانەکانی بەردەوام بوو[٦٨]. دوای ئەمە سوپا بەرەو بڵاوە پێکردن و لەبەریەک هەڵوەشانەوە دەچوو[٦٩]. بۆیە بە ناچاری بریاری پاشەکشەیان دا لە ئێران و ژمارەیەکی زۆری چەک و تەقەمەنی و تۆپ و رەشاش و تفەنگیان لەگەڵ (٢٠٠) ئەفسەریان بەجێ هێشت و بۆ ئاسوورییەکان مایەوە[٧٠]. لەلایەکی تریشەوە سمکۆ بە هۆی تالانکردنی عەمبارەکانی رووسەکان لە (شەرەفخان) توانیبووی چەک و جبەخانەیەکی زۆر بەدەست بخات و خۆی بەهێز بکات[٧١].

دوای کشانەوەی رووسەکان لە ئێران، بەریتانیا رایگەیاند ئەرکی پاراستنی ئاسوورییەکان لە ئەستۆ دەگرێت. (سورمە خانم[٧٢])ی خوشکی مارشەمعون ئاماژە دەکات کە ئاسوورییەکان لەگەڵ ئەرمەنەکان و بە هاوکاری بەریتانیا خەریکی دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوون[٧٣]. لەسەر زاری ئەفسەری بەریتانی گریسی (Grese) لەسەرەتای ساڵی (١٩١٨) لە کاتی کۆبوونەوەی لەگەڵ جێگری کۆنسوڵخانەی رووسیا لە ورمێ (نیکیتین) ئەرکی پارێزگاری کردن و دامەزراندنی دەوڵەتی ئاسووری خستۆتە ئەستۆی بەریتانیاوە[٧٤].

بەریتانییەکان لە سەرەتای بەدەستەوە گرتنی ئەو بەرپرسیارییە، هەوڵیدا جۆرێک لە هاوپەیمانی لە نێوان ئاسوورییەکان و (سمکۆ خان[٧٥])ی شکاک ببەستێت و لە ڕێگەی (گریس)ەوە هەوڵەکانی خستۆتەگەڕ[٧٦]. لە ڕێگەی میسیۆنەرەکانیانەوە پەیوەندییان بە سمکۆوە کردبوو، بەڵکو لەگەڵ مارشەمعون دەست بدەنە دەستی یەکتریەوە[٧٧]. بەریتانیا لەو هەوڵەیدا دەیەویست بە یەکخستنی کورد و ئاسوورییەکان بتوانێت قەرەبووی هەرەسهێنانی بەرەی رووسیا بکاتەوە دژ بە عوسمانییەکان، بەڵام ئەم کارەیان بۆ نەچووە سەر[٧٨]، چونکە سمکۆ بنیامین مارشەمعونی سەرکردەی ئاسوورییەکانی کوشت[٧٩].

لە (١٧) ئازاری ١٩١٨ مارشەمعونی پێشەوای ئاسوورییەکان بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆ سمکۆی بانگهێشت کرد بۆ گوندی (کۆنەشار) لە سەڵماس و لەلایەن سمکۆشەوە بانگهێشتەکە قبوڵ کرا[٨٠]. سەرانی ئاسووری زۆر هەوڵیاندا مارشەمعون لەم دیدارە پەشیمان بکەنەوە، چونکە ڕایان وابوو ئەگەر سمکۆ مەبەستییەتی یەکێتی نێوان ئاسووری و کورد قبوڵ بکات پێویستە ئەو بێتە دیداری مارشەمعون، بەڵام هەوڵەکەیان سەری نەگرت. مارشەمعون بە یاوەری دوو ئەفسەری هەواڵگری بەریتانی و (کۆندراتۆف)ی سەرهەنگ و چوار ئەفسەری تری رووسی لەگەڵ نزیکەی (١٥٠) چەکداری خۆیان ڕێگای گرتەبەر[٨١]. لە کاتی گەیشتنی بە کۆنەشار، چەکدارەکانی سمکۆ کە پێش گەیشتنی مارشەمعون هاتبوونە شوێنەکە و ئامادەکارییان کردبوو، لەسەر بانیماڵەکان بڵاوەیان پێکرابوو، وەکو ئەوەی بۆ پێشوازیکردن بێت لە میوانەکان. دوای گەیشتنی مارشەمعون سمکۆ بە گەرمی بەخێرهاتنی کرد و بانگهێشتی کرد بۆ ژوورەوە[٨٢].

سەبارەت بە وتوویژی نێوانیان چەندین لێدوانی جیاواز دراوە. هەیانە دەڵێت مارشەمعون گوتوویەتی ئێمە نیازمان نییە زیان بە ئێران بگەیەنین یاخود داگیری بکەین، بەڵکو دەمانەوێت پارێزگاری لە خۆمان بکەین و سمکۆش لەگەڵی هاوڕا بووە[٨٣]. هەشیانە پێی وایە ئاسوورییەکان کاتێک لە هێنانەدیی ئامانجەکانی خۆیان لە بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لەخۆیان ڕانەدیت، بیرۆکەی بەستنی پەیمانێکی سەربازیان لەگەڵ کورد لە

هزردا گەلالە بوو[٨٤]. بەلام مێژوونووسانی ئێران دەلێن مارشەمعون بە سمکۆی گوتووە ئەو سەرزەمینەی کە ناوی کوردستانە نیشتمانی ئێمەمانان بووە، بەلام جیاوازی ئایین ئێمەی لە یەکتری کرد. دەبێت ئیتر هاودەست بین و ئەو سەرزەمینە بگرینەوە دەست. ئێمە سوپامان هەیە، بەلام سوارەمان نییە، ئێوە سوارەتان زۆرە ئەگەر لەگەل ئێمە بن دەچینە سەر تەورێز و ئەوێش دەگرین[٨٥].

پاش تەواوبوونی دیدارەکەیان، بە مەبەستی مالاواییکردن سمکۆ تاکو کەژاوەکەی یاوەری کرد. دوای ئەوەی هەردووکیان دەستیان لە یەکتری بەردا، پیاوانی سمکۆ لە پەنجەرەی مالەکانەوە کەوتنە دەستڕێژیکردن لە چەکدارەکانی ئاسووری و کۆمەلکوژیان کردن، مارشەمعون یەکێک بوو لە کوژراوەکان و تەنیا (داود)ی برای مارشەمعون بە سەلامەتی ڕزگاری بوو[٨٦]. دوای ئەو کارەساتە، سمکۆ فەرمانی کرد ئەو شوێنە بەجێ بهێلن، چونکە دلنیا بوو ئاسورییەکان لە خوێنی سەرکردەکەیان خۆش نابن و توانای شەڕکردنی ئەوانیشی نەبوو، بۆیە بە پەلە خۆیان گەیاندە گوندی (چەهریق[٨٧])[٨٨].

سەبارەت بە کوشتنی مارشەمعون چەندین لێکدانەوەی جیاواز هەن. هەندێکیان پێیان وایە مارشەمعون لە ڕووی هێزی سەربازییەوە زۆر بالا دەستتر بووە لە سمکۆ. خاوەنی (٢٥) هەزار چەکداری مەشق پێکراو بووە و ولاتێکی وەکو رووسیاش پشتگیری بووە، بەلام سمکۆ بەو ئەندازەیە و ڕێکوپێکیەوە هێزی نەبووە. هێزی ئەو هەمووی خێلەکی بووە، بۆیە ئەو کارەی کردووە چونکە کوشتنی سمکۆ بۆ مارشەمعون زۆر ئاسان بووە[٨٩]. یەکێکی تریان دەلێت مارشەمعون و ئاسورییەکان لە ولاتێکی ترەوە هاتبوون لە ڕێڕەوی تێپەڕبوونی خۆیان بە دێهاتەکانی کوردستان، ناوچەکانی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕیان تالان کردبوو و خەلکیان کوشتبوو. هەروەها دوای هاتنیان بۆ ورمێ خەلکیان ئازار دابوو، بۆیە سمکۆ نەیتوانی متمانەیان پێبکات و دەسەلاتی ئەوان لە ناوچەکانی خۆی ببینێ[٩٠]. ڕای تریشیان پێی وایە دەبێت بە هاندانی حکومەتی ئێران بێت، چونکە لەو کاتەوەی کۆنەشار لەلایەن ئاسوورییەکان دەستی بەسەردا گیرا لە مالی سمکۆ بەلگەنامەیەک دۆزراوەتەوە کە ئاماژەیە بە

هەماهەنگیی نێوان سمکۆ و حکومەتی ئێران دژی ئاسوورییەکان، چونکە سمکۆ پێی وابوو مارشەمعون کەسایەتییەکی دیارەو بە کوشتنی ئاسوورییەکان لاواز دەبن[91]. نووسەری مێژووی (خوی)یش دەڵێت " **زیاد بوونی چالاکی مەسیحییەکان بۆتە هۆی ئەوەی هۆزە کوردیەکان و لە سەرووی هەمووشیانەوە هۆزی شکاک کە لەو کاتەدا دەسەڵاتیان پەیدا کردبوو، هەوڵ بدەن بەسەر ڕۆژئاوای ورمێدا زاڵ بن"[92].**

ئەو ڕایەی لە هەموویان زیاتر ڕێگەی تێدەچێت ئەوەیە کە سمکۆ ویستوویەتی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دابمەزرێنێ. بە تایبەتی دوای ئەوەی لەگەڵ کەسایەتی ناوداری کورد (عەبدولڕەزاق بەدرخان[93]) هەستان بە دامەزراندنی دوو کۆمەڵەی سیاسی ئەوانیش کۆمەڵەی (جیهاندانی) لە ساڵی ١٩١٢، هەروەها کۆمەڵەی (ئیستخلاسی کوردستان). کە داخوازی یەکێتی نێوان کوردان و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆی یەکگرتووی دەکرد[94]. بۆیە زیادبوونی دەسەڵاتی ئاسوورییەکانی بە هەڕەشە بۆ سەر دەسەڵاتی خۆی زانیوە، کەچی لەگەڵ هەبوونی ئەو هێزو دەسەڵاتەشەوە هیچ ئامادەکاریەکی بۆ بنیاتنانی ئەو دەوڵەتە نەکردووە. ئەوەتە کاتێک (مستەفا پاشای یامولکی[95]) لە پایزی ١٩٢١ چاوی بە سمکۆ دەکەوێت و پرسیاری لێدەکات، سمکۆ مەترسی ئاسوورییەکان ناشارێتەوە کە ویستوویانە بۆ ماوەیەک لەگەڵ کورد ڕێک بکەون و ئەو نیازە لە کورد بشارنەوە تاکو دەرفەت دەڕەخسێت ئەو دەوڵەتەی دەیانەوێت دایبمەزرێنن، چونکە لەو کاتەدا هۆزی شکاک خاوەن هێزو دەسەڵات بوون[96].

کوشتنی مارشەمعون پەیوەندییەکانی نێوان کورد و ئاسووری زیاتر تێکدا، تەنیا کاتژمێرێک و نیو دوای کوشتنی مارشەمعون ئاسوورییەکان شالاویان هێنایە سەر کۆنەشار، جگە لە کوشتن و گرتن ماڵ و دووکانی خەڵکیان سووتاند و تالان کرد[97]. دوو ڕۆژ دواتر، پاش ئەوەی ئەو هەواڵە گەیشتە شاری ورمێ، ئاسوورییەکان بۆ ماوەی (٣) ڕۆژ بەربوونە گیانی خەڵک و ژمارەیەکی یەکجار زۆریان لێ کوشتن. نووسەرانی مێژووی ورمێ ژمارەی قوربانییەکانی دەستی ئاسووری لە ورمێ بە (١٠-١٥) هەزار کەس مەزەندە دەکەن، لەوانە زۆربەیان کوردو ئازەری

بوون[٩٨]. بۆیە چەندین هەزار کەس بۆ پاراستنی گیانی خۆیان پەنایان بردۆتە بەر ماڵی (Mr. Shit) کۆنسوڵگەری ئەمریکی و نەخۆشخانەی ئەمریکی و بارەگای میسیۆنی فەرەنسی[٩٩].

سەرکردایەتی ئاسورییەکان دوای دانانی پلانی هێرشکردنە سەر سمکۆ، لە (٢)ی نیسان بە سەرکردایەتی (بترۆس ئاغا[١٠٠]) و بە هاوکاری کاپتن (گاسفیلد)ی فەرەنسی و کۆلۆنێلێکی رووسی پەلاماری قەڵای چەهریقی بارەگای سمکۆیان دا. لەم هەڵمەتەدا (٤٠٠) کەسی قەڵەویان بۆ کردنەوەی ڕێگاکە لە بەفر بەکار هێنابوو، هەرچی باربەر و چوارپێ هەبوو بۆ گواستنەوەی تفاقی شەڕ کۆیان کردبووەوە، بۆیە سمکۆ لە بەرامبەر ئەم شەڕەدا خۆی ڕانەگرت و بۆ سنووری تورکیا کشایەوە[١٠١]. پەلامارەکەیان (١٠) ڕۆژی خایاند بەو پەڕی دڵڕەقییەوە کەوتنە کوشتاری کوێرانەی خەڵکی، تاڵانی ناوچەکە. بەشێوەیەک مەڵبەندی سەڵماسیان لە کورد پاک کردەوە[١٠٢]. ئەو هەزاران کەسەی لە هەڵمەتی ئاسوورییەکاندا کوژران زۆربەیان خەڵکی ورمێ و دیلمان و خوی و گوندەکانی دەوروبەری سەڵماس بوون[١٠٣].

وەنەبێت هێرش و پەلاماردانەکە تەنیا لەو کاتانەوە بێت، بەڵکو هەرلە سەرەتای هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیەوە ئەم جۆرە پەلاماردانانە درێژەی هەبووە. هاملتۆن ئاماژە بە هەڵمەتی ئاسوورییەکان دەکات لەگەڵ رووسەکان چۆن دوو جار دوای کوشتن و گرتن شاری ڕواندزیان سووتاندووە و تاڵان کردووە[١٠٤]. مێجەر نوئێلیش لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێت **" ئەم زستانە کە سەرم لە ناوچەی ڕواندز دا، سەیرم کرد شارۆچکەکە بەدەستی رووسەکان و سوپای ئەرمەنی و ئاسووری کە لەگەڵیان هاتبوون تێکوپێک درابوو، هەروەها (١٠٠) گوندی باڵەک سووتێنرابوون و تەخت کرابوون، جگە لەوەی پیاو و ژن و منداڵێکیان نەمابوون"**[١٠٥]. لەلایەکی تریشەوە (بارمتی) باس لە کەسایەتییەکی کوردی بەناوی (شێخ جەلالەددین) دەکات وەکو پاڵپشتی کارێکی تورکەکان و لە سەروبەندی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە پەلاماری ئاسوورییەکانی داوە لە ورمێ و شنۆ[١٠٦]. لە کانونی دووەمی ١٩١٥، لەگەڵ پاشەکشە کردنی رووسەکان لە سەڵماس و قوتور، سمکۆ بە

ئاشکرا لای تورکەکانی گرتووە و نزیکەی هەزار کەسی ئاسووری و ئەرمەنی کوشتووە[107]. ئەم کوشت و کوشتارەش بە بەرچاوی کاربەدەستانی ئەوسای ئێران و هێزەکانی عوسمانی بووە[108]. ئەم ژمارانە ئەگەر زیادەڕەویشی تێدا کرابێت، پاساوێکن بۆ تێوەگلانی سمکۆ لەو کارانەوە.

ئاسوورییەکان لە توانایاندا بوو تاکو کۆتایی جەنگ شەڕ بکەن و بەرگری لە خۆیان بکەن، بەڵام لە پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراودا لایەنگرانی بەریتانی کەوتنە بڵاوکردنەوەی گومان و دوودڵی، ئەوەش بووە هۆی پەکخستنی هێڵی بەرگری، بۆیە لە کۆتایی ئابی (1918) دانیشتوانی ئاسووری و ئەرمەنیی ناوچەی ورمێ تووشی کۆچڕەوییەکی بە کۆمەڵ بوون بەرەو باشوور بە ئاراستەی کرماشان و ساین قەڵا کەوا ئینگلیزەکان لە چاوەڕوانییاندا بوون. نزیکەی (١٤) هەزار ئاسووری لە شاری ورمێ و دەوروبەری مابوونەوە، بەشی هەرە زۆریان لەلایەن هێزەکانی سەربازی تورک و ئێران لەناوبران. تاوەکو بەرەو باشوور لێژ دەبوونەوە زیاتر تووشی پەلاماری کورد و فارسەکان دەبوونەوە.[109].

لە ساڵی (1919) ئینگلیزەکان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان چوونە دەرەوە، ژمارەیەک ئەرمەنی و ئاسوورییان لەگەڵ خۆیان بردە بەعقوبە، دوای سێ ساڵ مانەوەیان لەم شوێنە حکومەتی بەریتانی هەستا بە گواستنەوەیان بۆ (دهۆک، زاخۆ، ئاکرێ، ئامێدی)و کردنەوەی سەربازگەیەک بۆیان لە مەندان[110]. ئاسوورییەکان وا حاڵی بووبوون کە نیشتەجێکردنیان لە عێراق واتا پاداشتکردنیان لە بری ئەوەی لە شەڕدا پشتگیری هاوپەیمانەکانیان کردووە و دواتر بۆ زێدی خۆیان دەنێرنەوە[111]. لەلای خۆشییەوە بەریتانیا بەڵێنی پێدابوون کە خودموختاریان پێبدات لەو کاتەی موسڵ دەکەوێتە سەر دەوڵەتی عێراقی نوێ [112]، بەڵام لە ژێرەوە هەریەک لە حکومەتی بەریتانی و عێراقی هاوڕا بوون لەسەر ئەوەی لە یەک شوێن کۆیان نەکەنەوە تاوەکو لە ئایندە داوای سەربەخۆیی نەکەن، بەڵکو بە شێوەی کۆمەڵ بەسەر ناوچەکاندا دابەشیان کردن[113]. لەوێ هێزێکی چەکداریان لێ دروست کردن بە ناوی

هێـزی (لیڤـی[114]) کە بـوونەتە هـۆی مەترسـی بـۆ سـەر تورکەکـان، لە بەرامبەریشدا تورکەکان بڕیاریاندا یارمەتی سمکۆ بدەن[115].

سەرەتا بەریتانیا ئەو هێزانەیان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان خستبووە بەر دەستی شێخ مەحمود، بە یارمەتی ئەو هێزانە بوو شێخ مەحمود لە کۆتایی ئەیلولی (١٩٢٢) توانی ڕواندز بگرێت و تاکو قەزای شەمزینان و هەکـاری پێشـڕەوی بکـات[116]. ئەو هێـزانە نەک تەنیـا لە ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان، بەڵکـو لە باشـووریش بـوونەتە سەرئێشـە بـۆ کـوردانی ئەم دەڤەرە و (فـارس ئاغـا)ی زێبـاری کە دوژمنـی ئینگلیزەکـان بـوو لەبەر ئەو هێـزە ئاسـوورییانە هەڵات و پەنـای بـردۆتە بەر سـمکۆی شـکاک[117]. ئاسـوورییەکان بە هەمـان چـاوی ڕق و قینەوە لە سمکۆیان دەڕوانی، لەو کاتەی سمکۆ پەنای بۆ لای شێخ مەحمود هێنابوو، هەندێک لە ئەفسەرانی ئاسـوریی نـاو هێـزی لیڤـی لە هەوڵـی کوشـتنی سـمکۆ بـوون، بۆیە شـێخ مەحمـود، سـمکۆی ڕاسـپارد بـۆ ئەوەی کاروبـاری ڕێکخراوەیـی و پڕوپاگەندەیی لە نێو کوردەکاندا بکات[118].

ئەو هێزەی ئینگلیز پێکی هێنابوو بۆ لەناوبردن و لێدانی بزووتنەوەی نیشـتمانی کـورد و عێراق بـوو، بەریتانیا هەوڵـی دەدا بڕوایـان پێبکات کە مافەکانیـان لە چوارچێـوەی (حـوکمی زاتـی) و لە ژێـر چـاودێری خۆیـان پێدەدەن، بەڵام ئاسوورییەکان لە هەوڵی سەربەخۆیی و گەڕانەوە بوون بۆ زێـدی خۆیـان و دژی لکانـدنی ولایەتـی موسـڵ بـوون بە عێـراق[119]. ئاسوورییەکان دوای تەواوبوونی کێشەی موسڵ مەترسییان زیاتر بوو، بە تـایبەتی دوای ئەوەی بەریتانیـا دەسـتی کـرد بە کەمکـردنەوەی ژمـارەی هێزەکانی لیڤی و سوپای عێراق جێگەی ئەو هێزانەی گرتەوە. حکومەتی عێـراقیش دوای ئەوەی بـووە ئەنـدام لە کـۆمەڵەی گەلان و سـەربەخۆیی تەواوی وەرگرت، ئاماژەی بە هیچ مافێک نەکردبوو بۆ ئاسوورییەکان. پاش ئەوە ئاسوورییەکان بەبێ پرسکردن ڕوویـان کردە نـاوچە کوردنشـینەکان و کـارو چالاکییـان زیـاتر پەرە پێدا. لە (١٥ حـوزەیرانی ١٩٣٢) لە (سـەرێ ئامێـدی) کۆنفرانسـێکیان بەسـت و پـڕۆژە بڕیارێکیـان بە نـاوی (میثـاقی نیشـتمانی ئاسـووری) دایە کـۆمەڵەی گەلان و مەنـدوبی سـامی بەریتـانی، بەڵام گوێیـان لـێ نەگیرا و لە ئەنجامـدا بەشـێک لە ئەفسـەرانیان لە هێـزی

لیڤی و سوپای عێراق کشانەوە. ئەم هۆکارانە و مردنی مەلیک فەیسەڵ هۆکاربوون بۆ ئەوەی حکومەتی عێراق لە دەرفەتێکی گونجاو هێرشیان بکاتە سەر. ئەوە بوو لە ڕۆژانی (٤-١٧ی ئابی ١٩٣٣) لە (سێمێل) بە سەرکردایەتی سوپا سالار (بەکر صدقی) پەلاماریان دان و نزیکەی (٣٥٠٠) کەس لە پیر و منداڵ و ژنیان کوشت و زەرەر و زیانێکی زۆری ماددی لێدان و چەندین گوندی سووتاندن و تاڵان کردن[١٢٠]. ئەم هێزانە بە بەردەوامی کێشەیان لەگەڵ کورد و دەوڵەتی عێراق هەبوو، تاکو بە بڕیارێکی سیاسی لەلایەن حکومەتی عێراقی لە (١٩٣٣) هەڵوەشێنرانەوە[١٢١].

سەبارەت بە گەڕاندنەوەی ئاسورییەکانیش بۆ شوێنی خۆیان لە هەکاری کارێکی مەحاڵ نەبوو، چونکە لەو سەردەمەدا دەوڵەتی تورکیا لە دوای شکستهێنانی لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە کەوتبووە دۆخێکەوە توانای ئەوەی نەبوو بڕیاری گەڕاندنەوەی ئاسورییەکان ڕەت بکاتەوە. هەروەها ئێرانیش سوپایەکی ئەوتۆی نەبوو پێشیان لێ بگرێت، بە هەمان شێوە کوردیش نەیدەتوانی ئەگەر پشتگیری بەریتانیایان هەبوایە. **ویگرام دەڵێت :" کوردەکان ئامادەبوون بە نیازپاکییەوە هەموو ئەو ناوچانەی لێیان داگیر کردبوون ڕادەستیان بکەنەوە، بەڵام ئینگلیز ئامانجی تری هەبوو، نەوتی موسڵ کە بەشێک بوو لە نەوتی ولایەتی کەرکوکی دەوڵەمەند بە نەوت بۆ ئینگلیز هەزار جار باشتر بوو لە دەوڵەتی ئاشوری کە زەحمەت بوو بەپێی بەرژەوەندیی ئەوان بجوولێنەوە"** [١٢٢].

لە شرۆڤە کردنی قسەکانی ویگرام دەتوانرێت ئاماژە بە دوو ڕاستی بکرێت. یەکەمیان نیازپاکی کورد لە ئاساییکردنەوەی پەیوەندیی نێوانیان و ئامادەییان بۆ ڕادەستکردنەوەی ئەو شوێنانەی لێیان داگیر کردبوون. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تێکچوونی پەیوەندیی کورد و ئاسووری بەهۆی کاریگەریی دەرەکییەوە بووە و پاش نەمانی ئەو کاریگەریانە دۆخەکە ئاسایی بۆتەوە. دووەم دۆزی ئاسووری لەلایەن بەریتانیا تەنیا بۆ بەرژەوەندیی تایبەت بووە، بەریتانیا هەرگیز لە بەرنامەیدا نەبووە دەوڵەتێکی ئاسووری دابمەزرێنێ، بەڵکو خەریکی مسۆگەرکردنی

بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی خۆی بووە بۆیە زۆر بە ئاسانی سازشی لە دۆزی ئاسووری کرد.

**فاکتەرەکانی کاریگەر لەسەر پەیوەندیی کورد و ئاسووری:**

بێگومان پەیوەندیی کورد و ئاسووری کە بەدرێژایی مێژوو پەیوەندییەکی دۆستانە و پێکەوە ژیان بوو، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم گرژی تێکەوتووە، دیارە ئەو دوژمنایەتییەی لەنێوان کورد و ئاسووری هاتە کایەوە دروستکراو بووە و دەستی وڵاتانی دەورووبەر و ئەورووپایی تێدا بوو بە مەبەستی هێنانەدی بەرژەوەندییەکانی خۆیان.

**یەکەم: ڕۆڵی بەریتانیا لە تێکدانی پەیوەندیی کورد و ئاسووری**

لە سەروبەندی ڕاپەڕینی میر بەدرخان پاشا، بەریتانیا لە ڕێگەی کونسوڵەکانییەوە ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕا لە سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە. کونسوڵی بەریتانی لە ئەرزەڕۆم گەشتێکی بە کوردستاندا کردبوو بۆ ئەوەی زانیاری دەربارەی ئەو سەرۆکە کوردانە کۆبکاتەوە کە جێگەی مەترسی بوون بۆ دەوڵەتی عوسمانی، لە ڕێگەی دیاری و بەڵێنەوە هەوڵیداوە سەرۆکە کوردەکان بۆلای خۆی ڕابکێشێت[١٢٣]، لەلایەکی تریشەوە ئاسوورییەکانی هانداوە گوێڕایەڵی میر بەدرخان نەکەن و یارمەتی سەربازی و دارایی پێشکەش نەکەن، ئەمەش بووە هۆی بزواندنی قینی کوردەکان دژی ئاسورییەکان[١٢٤]. چونکە بەریتانیا لەو باوەڕەدا بوو کە هەرەسهێنانی دەوڵەتی عوسمانی تەنیا لە بەرژەوەندیی ڕووسەکان بوو، بۆیە ئەم چاوتێبڕینەی ڕووسەکان وای لە بەریتانیا کرد دژی ڕاپەڕینە کوردیەکان بوەستێتەوە. چونکە پێیان وابوو ئەگەر بەدرخان پاشا سەرکەوتوو بێت ئەوا دەوڵەتی عوسمانی بێبەش دەبێت لە (٧٢) فەوجی سوارە کوردەکان، ئەو فەوجانەی کۆڵەکەی هێزەکانی عوسمانییان پێکهێنابوو لە بەرەنگاربوونەوەی ڕووسەکان کەوا لە هۆزەکانی (حەیدەرانلی، جەبرانلی، میران، دودری، کەهان، ئەتروش و میللی) پێکهاتبوون[١٢٥]. بۆیە هەوڵیدا بە دروستکردنی کێشەی کورد و ئاسووری هۆزە کوردییەکان سەرقاڵ بکات.

هاوکات لەگەڵ جەنگی جیهانی یەکەمیشەوە، دوای ئەوەی سمکۆ بۆ ماوەیەک خۆی بە بەریتانییەکانەوە شەکەت کردبوو، بۆ ئەوەی سۆزیان ڕابکێشێت، بەڵام سوودی نەبوو، چونکە لەنێو هەگبەی سیاسەتی بەریتانیا جێگای بۆ نەمابۆوە[١٢٦]. هەڵوێستی بەریتانیا سەبارەت بە سمکۆ و نیازەکانی دوژمنکارانە بوو، چونکە پێیان وابوو مەترسی بوو لەسەر یەکێتی خاکی ئێران و ڕژێمی ئێران کەوا زامنکاری بوونی دەسەڵاتی ئیمپریالیزمی بەریتانیا بوو لە وڵات[١٢٧]. بۆیە گەلی ئاسوورییان بەکارهێنا بۆ پارێزگاری کردن لە قۆرخکردنی بەرژەوەندییە نەوتییەکانیان و وەستاندنی هێرشی تورکەکان لەسەر سنووری باکووری عێراق[١٢٨]. لە نامەیەکی ئاسوورییەکانی یەکێتی سۆڤیەت کە بۆ ئاسوورییەکانی تورکیا و ئێران و میزۆپۆتامیا نێردراوە، ئاماژە بەوە کراوە کە بەریتانیا بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیی خۆی لە ئاسوورییەکان زیاتر کەسی تری نەدۆزیوەتەوە، بۆیە دەبێت بە بەریتانیا هەڵنەخەڵەتێن[١٢٩].

**دووەم: ڕوسیای قەیسەری:**

سەبارەت بە رووسەکانیش، وێڕای هەوڵی سەرکردەکانی کورد و لە سەرووی هەمووشیانەوە (یوسف کامیل بەدرخان[١٣٠]) لەگەڵ فەرماندە (نیکولای نیکولاڤیدج) بۆ داوای مافە ڕەواکانی گەلی کورد، کەچی دەسەڵاتدارانی رووس لە تەفلیس ڕایانگەیاند کە دۆزی کورد لە ڕوانگەی سیاسییەوە لەبەرچاو ناگرن[١٣١]، ئەمە لە کاتێکدا بوو کەوا سمکۆ بۆ ماوەیەکی زۆر خزمەتی بە رووسەکان کردبوو و تەنانەت هێزی رووسەکانیشی لە گەمارۆی تورکەکان ڕزگار کردبوو[١٣٢]. بەلشەفییەکانیش تاکو ئەو جێگایەی پێیان کرابێت بۆ نزیک کردنەوەی هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی و ئامۆژگاری کردنیان دژی هەر کیانێکی کوردی دەستکردی ئینگلیزەکان کە مەترسی هەبێت بۆ سەر تاران و ئەنکەرە درێغییان نەکردبوو[١٣٣]. دەسەڵاتدارانی رووسیا نەیاندەویست خۆیان پەیوەست بکەن بە بزووتنەوەی کورد و پێشکەشکردنی پشتگیری بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ، چونکە پێیان وابوو ئەمە سەرکەشییە و هەڕەشەیە لەسەر پەلکێشکردنی وڵات بۆ ئاڵۆزییەکانی ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاست و پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی تری زلهێز[١٣٤]، هەروەها مانەوەی چەتری پاراستنی تورک یان بەریتانیا بەسەر کوردستانەوە بێ گومان مەترسی سیاسی و لەشکریی ڕاستەوخۆی دەبێت بۆسەر بەرژەوەندییەکانی رووسیا، بۆیە بە هەموو شێوەیەک دژی داشکانی کورد بوون بەلای تورکەکان یان بەریتانیاوە لە ڕێگەی سەرقاڵکردنیان بە کێشە ناوخۆییەکانەوە[١٣٥].

**سێیەم: ئێران:**

دەوڵەتی ئێران وێڕای گۆشەگیری و لاوازی لە ڕووی سیاسی و سەربازییەوە، ئەویش لەلای خۆیەوە ڕۆڵی هەبووە لە قووڵکردنەوەی ناکۆکیی نێوان کورد و ئاسووری، بۆ ئەوەی لەلایەکەوە هەردوولا بە ململانێی نێوخۆیی لاواز بکات و لەلایەکی تریشەوە کات بەدەست بهێنێت تا ئەو کاتەی دەسەڵاتی دەگەڕێتەوە بۆ ئازەربێجان و کوردستان. ئەوەتە سمکۆ لە کاتی دیدارەکەیدا لەگەڵ مستەفا پاشای یامولکی لە ساڵی (١٩٢١) ئاماژە دەکات کەوا کاتێک دەسەڵاتدارانی ئێران بە ئامانج و جموجووڵەکانی ئاسوورییەکانیان زانی، داوایان لێکردم لە دژی ئێران نەچمە پاڵ ئاسوورییەکان، هەروەها بەڵێنیان پێدام ئەگەر مارشەمعون بکوژم دیاریم پێ دەدەن، لەبەر چەند هۆیەک ڕازی بووم بە کوشتنی مارشەمعون[١٣٦]. هەبوونی ئەو جۆرە پەیوەندییەش پشتڕاست کراوەتەوە کاتێک هێزەکانی ئاسووری پەلاماری بنکەی سمکۆیان دا لە (چەهریق) لە ماڵی سمکۆ نامەیەکی والی (خوی) یان دۆزیوەتەوە کە بۆ سمکۆ نێردراوە و داوای لێکراوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئاسوورییەکان[١٣٧]. هەروەها لەلایەن والیی تەبریزیش (مەهدی ئەلشەمس) نامەیەک بۆ سمکۆ نێردراوە کە ئەگەر مارشەمعون بکوژێت ڕەزامەندی حکومەتی ئێران بەدەست بێنێت[١٣٨].

**چوارەم: تورکیا:**

تورکەکانیش لەم هاوکێشەیەدا دوورە پەرێز نەبوون، هەر لە سەرەتای ئاڵۆزبوونی بارودۆخ و هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە، دەستییان کردووە بە هاندانی کوردەکان و پێدانی چەک و تفاقی شەڕ بۆ

ئەوەی بەگژ رووسەکان و ئاسوورییەکانی هاوپەیمانیان بنێنەوە[١٣٩].
سەرەڕای هەموو ئەو خزمەتانەی کوردەکان لە ماوەی جەنگی جیهانییەوە بە تورکیایان کردووە، کەچی تورکەکان گومانیان لە سمکۆ کردووە، هەروەکو لە یەکێک لە نامەکاندا کە لەلایەن هەوالگریی تورکیاوە بۆ ئوزدەمیر لە ڕواندز نێردراوە، دەردەکەوێت کە تیایدا هاتووە: " **سمکۆ پیاوێکی فێڵبازە و بەهۆی زیرەکی ئەو خەنجەرەی هەڵیگرتووە لە کاتی خۆیدا بەکاری دەهێنێ. هەروەها ئەو پیاوە بیرۆکەی سەربەخۆیی لە مێشکدایە وە دەیەوێت پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێمە بپارێزێت تا هێز و دەسەڵاتی لە ئێران زیاد دەکات و بەمەش ئامانجەکانی جێبەجێ دەکات. هەرچەندە پەیدابوونی سمکۆ لەنێو هێزە کوردییەکان و بەهێزبوونی دەسەڵاتی بەم شێوەیە لەگەڵ بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانی حکومەتەکەمان ناگونجێت، بەڵام باش نییە لەو هەلو مەرجەدا پەیوەندیمان لەگەڵیدا تێکبچێت**"[١٤٠].

مێژوو نووسی گەورەی ئێرانیش دەڵێت " **خراپترین تۆوی ناکۆکی و دووبەرەکی کە بێگانە لە ڕۆژهەلات چاندیان ئارەزووی سەربەخۆیی نەتەوەکان بوو، دوای ئەوەی سیخوڕی ئەوروپییەکان بەناو کورد و ئەرمەن و ئاسوورییەکاندا گەڕان، ئەم تۆوە گلاوەیان لەنێو چاندن**"[١٤١].

**ئەنجام:**

١- کورد و ئاسووری بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەم ناوچەیە پێکەوە ژیاون، بێ ئەوەی ئاماژە بە هیچ ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی ئایینی و مەزهەبی بکرێت لە نێوانیاندا. تاکو سەدەی نۆزدەهەم.

٢- وڵاتانی ئەوروپایی کاریگەریی زۆریان هەبوو لە وروژاندنی ئاسوورییەکان دژی کورد، بە هاتنی میسیۆنەرە بەریتانی و ئەمریکییەکان بۆ ناوچەی هەکاری، ناکۆکییەکانی نێوان ئاسووری و کورد گەرمتر بوو.

٣- دەرەنجامی ململانێی کورد و ئاسووری ڕووخانی میرنشینی بۆتانی لێکەوتەوە، ئەم ڕووداوانە بوونە پاساوێک بۆ وڵاتانی ئەوروپایی بۆ فشار خستنە سەر دەوڵەتی عوسمانی تاکو ڕێوشوێنی دژ بە کورد بگرێتەبەر، چونکە هەڕەشەی تێکدانی یەک پارچەیی خاکی عوسمانییان دەکرد.

٤- لەلایەکی ترەوە هێرشی بەردەوامی تورکەکان بۆ سەر ئاسوورییەکان و ئەو کوشت و بڕە بۆتە هۆکارێکی ناسەقامگیری و کاریگەری لەسەر پەیوەندیی کورد و ئاسووری هەبووە.

٥- سەرەتای تێکچوونی پەیوەندیی کورد و ئاسووری لە سەدەی بیستەم، بارگرژی لە ئازەربێجان بوو. ئەو شەڕو کوشتارەی لە نێوان ئازەری و ئاسوریيەکان لە ئارادا بوو، بەهۆی کاریگەریی ئایینەوە کوردیشی پەلکێشی ئەو ململانێیە کرد.

٦- ئامانجی سمکۆی شکاک لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی، هەمان ئەو ئامانجە بوو کە ئاسوورییەکان بۆی تێئەکۆشان، بەڵام بەهۆی هەبوونی مەترسییان لە دەوڵەتی ئێران خۆیان لە کورد نزیک دەکردەوە. هەر لەبەر ئەمەش بوو سمکۆ مارشەمعونی کوشت.

٧- ئەوەی لە پەیوەندیی نێوان کورد و ئاسووری تێبینی دەکرێت، فاکتەری ئایینی هۆکاری خۆرسک نەبووە لە پەیوەندیی نێوانیان، بەڵکو ئەم فاکتەرە لەلایەن هێزە دەرەکییەکانەوە وروژێنراوە و بۆ قووڵکردنەوەی ناکۆکیی سیاسی سوودی لێ وەرگیراوە، چونکە دوای هێور بوونەوەی دۆخی سیاسی ئەم فاکتەرانەش کاڵ بوونەتەوە.

٨- هەردوو گەلی کورد و ئاسووری بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی وڵاتە ڕکابەرەکان بەکار هاتوون، دۆزە ڕەواکەشیان بۆتە قوربانی ململانێی تەماحکاری وڵاتە زلهێزەکان، هەرچەندە دەرئەنجامەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی گۆڕانێکی گەورەی بەسەر نەخشەی سیاسیی ناوچەکەدا هێنا، بەڵام دۆزی کورد و ئاسووری وەکو خۆی مایەوە.

سەرچاوە:


([1]) احمد سوسه، ملامح من التاريخ القديم ليهود العراق، مركز الدراسات الفلسطينية، جامعة بغداد ١٩٧٨، ص٥٩.

([2]) احمد سوسه، ص٦٣ ؛ علی دهقان، رضائیه یا سرزمین زردشت، تهران ابن سینا، اسفند ١٣٤٨، ص ص٧٠-٧١.

([3]) قسطنطين بتروفيج ماتفيف بارمتي، الاشوريون والمسألة الاشورية في العصر الحديث، الطبعة الاولى، مؤسسة الاهالي للطباعة والنشر والتوزيع، دمشق ١٩٨٩، ص ص١٥-١٦.

([4]) احمد سوسه، ص ص٦٨-٧٠' ٣٢-٣٣.

([5]) المصدر نفسه، ص ص٩٤-٩٥.

([6]) دکتر توحید ملک زاده دیلمقانی، آزربایجان در جنگ جهانی اول یا فجایع جیلولوق، انتشارات هاشمی، سودمند با همکاری نشر اختر، چاپ دوم، تبریز ١٣٨٦، ص٦٠ ؛ البرت.م. منتشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، جامعة بغداد، ص٣٤٤ ياسين ؛ خالد سردشتي، صفحات من تاريخ آشوري كردستان ابان الحرب العالمية الاولى، تحقيق تاريخي عن اغتيال الزعيم الاشوري بنيامين مارشمعون من خلال النصوص التاريخية، الطبعة الاولى، مطبعة خبات، دهوك ١٩٩٩، ص ص٧'١٥.

([7]) سینان هاکان، کورد و بەرخودانەکانی (١٨١٧-١٨٦٧) لە بەڵگە نامەکانی ئەرشیفی عوسمانیدا، و: بەکر شوانی، بڵاوکردنەوەی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی هاشم، هەولێر ٢٠١٢، ل ل١٦٩-١٧٠.

([8]) بارمتي، ص٣٧.

([9]) جرج ن. کرزن، ایران و قضیه ایران، ت: وحید مازندرانی، جلد اول، چاپ دوم، مرکز انتشارات علمی و فرهنگی، تهران ١٣٦٢، ص ص٦٨٢'٦٩٣.

([10]) سینان هاکان، ل١٧٠.

([11]) سردشتي، ص١٥.

([12]) دیلمقانی، ص٦٢.

([13]) مارشمعون پۆستێکی پێشەوای ئایینی نەستورییەکان بوو، ئەم پۆستە بە میرات بۆیان ماوەتەوە. بنکەی سەرەکی مارشمعون ماوەیەک لە ئەلقۆشی نزیک موسڵ و دواتر لە عەینکاوەی هەولێر و پاشان لە سەردەمی مارشمعونی سێزدەهەم (١٦٦٠-١٧٠٠) گوازرایەوە بۆ گوندی (قوچانس) لە نزیک جولەمێرگ لە چیای هەکاری. احمد سوسه، ص١٢٠.

([14]) دیلمقانی، ص٦٢.

(١٥) نەوشیروان مستەفا ئەمین، کورد و عەجەم، مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران، چاپی دووەم، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی ٢٠٠٥، ل٣١٥.

(١٦) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، و: کامەران جەمال زادە، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠١٣، ل١٧.

(١٧) نەوشیروان مستەفا، ل٣١٦.

(١٨) (نورولڵابەگ) فەرمانڕەوای هەکاری بوو، یەکێک بووە لە ڕکابەرەکانی بەدرخان پاشای میری بۆتان. دوای شکستهێنانی دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕی قۆنیا لەگەڵ میسرییەکان لە ساڵی (١٨٣٩) ڕێکەوتن لەنێوانیان هاتەکایەوە لەپێناو بەرپاکردنی ڕاپەڕینێک دژی دەوڵەتی عوسمانی .لازاریف وآخرون، الحركة الكوردية في العصر الحديث، ت: عبدي حاجي، مطبعة خاني، الطبعة الاولى، دهوک ٢٠١٢، ص٢١.

(١٩) سینان هاکان، ل١٧١.

(٢٠) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل١٧ ؛ لازاريف وآخرون، الحركة الكوردية في العصر الحديث، ص٢٣.

(٢١) میر بەدرخان (١٨٠٣-١٨٦٧) کوڕی عەبدوالخانە، دەچنەوە سەر خێزانی (عەزیزیە)ی بەدرخانی کە بۆ ماوەی (٥٠٠) ساڵ میرنشینی بۆتانیان بەدەستەوە گرتبوو، میر بەدرخان لە ساڵی (١٨٢١) بۆتە میری بۆتان، لە ئەنجامی شکستهێنانی بزووتنەوەکەی لە (١٨٤٧) لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی دوور خرایەوە تاکو ساڵی (١٨٦٧) لە شام مرد. رفيق صالح. الاثار الكاملة للمؤرخ الكوردي محمدامين زكي- مشاهير الكرد و كردستان، منشورات مؤسسة ژين، مطبعة شڤان، سليمانية ٢٠٠٥، ص ص١٣٨-١٣٩.

(٢٢) سینان هاکان، ل١٧١.

(٢٣) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل١٧.

(٢٤) عوسمان عەلی، چەند لاپەڕەیەک دەربارەی بزاڤی کورد، و: کامەران جەمال زادە، بەرگی یەکەم چاپخانەی ڕێی نوێ، ٢٠١٠، ل٦٤ ؛ لازاريف وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ص٢٢،

(٢٥) م. س. لازاریف، کێشەی کورد (١٨٩٦-١٩١٧)، و: کاوس قەفتان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی جاحز، بەغدا ١٩٨٩، ل٤٩.

(٢٦) جەلیلی جەلیلی، ڕاپەڕینی کوردەکان (١٨٨٠)، و: کاوس قەفتان، بەغدا ١٩٨٧، ل ٢٣٨.

(٢٧) جليلي جليلی، نهضة الاكراد الثقافية، ت: بافی نازی، بیروت ١٩٨٦، ص١٢٧.

(٢٨) سوسە، ص١٢٤.

(٢٩) ڕاپەڕینی میر بەدرخان لە پێناوی هێنانەدی حکومەتێکی کوردی گەورەی بەرفراوان بوو. بۆ کۆکردنەوەی هەموو کوردان لەژێر یەک کارگێڕیّ بەهێز و یەکگرتوو بە ئامانجی ڕزگار کردنیان لە ژێردەستەیی بێگانە. دوای فراوانبوونی دەسەڵاتی و بەڵێن پێدانی ژمارەیەکی زۆری کوردان لەژێر ناوی (پەیمانی پیرۆز)، میر بەدرخان لە ساڵی (١٨٤٧) دەستی بە ڕاپەڕینەکەی کرد، بەڵام لەلایەن یەزدان شێری برازای ناپاکی لێکراو بەو هۆیەوە بزووتنەوەکەی شکستی هێناو خۆی دا بەدەستەوە. رفيق صالح، ص ص١٣٨-١٣٩.

(٣٠) نەوشێروان مستەفا، ل٣٢٦.

(٣١) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل٢٢.

(٣٢) لازاريف وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ص٢٢.

(٣٣) ويليام ايغلتون، القبائل الكردية، ت: احمد محمود خليل، مؤسسة موكريانی للطباعة والنشر، اربيل ٢٠٠٦، ص٤٢.

(٣٤) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل ل٢٨-٣٠.

(٣٥) عوسمان عەلی، چەند لاپەڕەیەک، ٦٦.

(٣٦) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل١٨.

(٣٧) عوسمان عەلی، چەند لاپەڕەیەک، ل٦٦.

(٣٨) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل٢٠.

(٣٩) عوسمان عەلی، چەند لاپەڕەیەک، ل٦٧.

(٤٠) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل٤٧.

(٤١) هەمان سەرچاوە، ل٢٠.

(٤٢) ويليام ايغلتون، ص٤١.

(٤٣) سردشتی، ص١٧.

(٤٤) مالميسانژ، بدرخانيو جزيرة بوتان ومحاضر اجتماعات الجمعية العائلية البدرخانية، ت: شكور مصطفى، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل ١٩٩٨، ص٣٩.

(٤٥) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل٢٩.

(٤٦) عوسمان عەلی، چەند لاپەڕەیەک، ل٦٩.

(47) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل٤٧.
(48) لازاريف وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ص٤٠.
(49) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل٤٨.
(50) عوسمان عەلی، چەند لاپەڕەیەک، ل٥٥.
(51) باسيل نيكيتين، الكرد- اصلهم- تاريخهم- مواطنهم- عقائدهم- عاداتهم- ادابهم- لهجاتهم- قبائلهم، من منشورات مجلة (Aso)-١٩٩٢، www.al-mostafa.com ، ص٢٠.
(52) اسكندر غوريانس، قيام شيخ عبيدالله شمدينى در كردستان، به اهتمام عبدالله مردوخ، دناى دانش، تهران ٢٥٣٦، ص٩٩.
(53) جەلیلی جەلیلی، ڕاپەڕینی کوردەکان، ل٩١.
(54) مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية: انتفاضة بارزان الاول ١٩٣١-١٩٣٢)، مطبعة خبات، ١٩٨٦، ص٢٠.
(55) یاسین سەردەشتی، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی ٢٠٠٧، ل٣٠.
(56) كمال مظهر، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، الامانة العامة للثقافة والشباب، بغداد ١٩٨٥، ص٢٥٠.
(57) لازاریف، کێشەی کورد، ل٦١٠ ؛ نەوشێروان مستەفا، ل٣٣٧.
(58) بارمتی، ص٩١.
(59) المصدر نفسه، ص ص٨٤، ٨٨.
(60) المصدر نفسه، ص٩٢ ؛ مهدى آغاسى، تاريخ خوى، انتشارات و مؤسسه تاريخ و فرهنگ ايران، ١٣٥٠، ص٣٥٢.
(61) سيل جى ادموندز، كردها- تركها- عربها، ت: ابراهيم يونس، (تهران روزبهان) ١٣٦٧، ص٤٢١.
(62) احمد كسروى، تاريخ هجدة ساله آزربايجان يا سرنوشت طردان و دليران، جلد دوم، مؤسسه انتشارات امير كبير، تهران ٢٥٣٧، ص ص٧٦٢-٧٦٣.
(63) ديلمقانى، ص٧٤.
(64) بارمتى، ص٩٦.
(65) على دهقان، ص٤٨٢ ؛ كسروى، ص٦٨٥.
(66) بارمتى، ص٩٤.

(٦٧) محمد تمدن، اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیة، تهران، چاپخانه اسلامیه، ص ص ٢٠٤-٢٠٧.

(٦٨) باسیل نکتین، ایران که من شناختم، ت: همایون سایق، تهران لاله زار، ص٢١١؛ بارمتی، ص١٠٠.

(٦٩) بارمتی، ص٣٦.

(٧٠) دیلمقانی، ص٩٠.

(٧١) ئەفراسیاو هەورامی، کورد لە ئەرشیفی رووسیا و سۆڤیەت، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٦، ل٨٨.

(٧٢) سورمە خانم (١٨٨٣-١٩٧٥) لە بنەماڵەیەکی پاتریاکی و خوشکی بنیامین مارشمعونی گەورەی ئاسوری بوو. بە درێژایی ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی چەندین ناخۆشی و تاڵی ژیانیان چەشتووە بە دەستی هێزەکانی تورک و ئێران و کوردەوە. سورمە هاوەڵی خێزانەکەی بووە لە کاتی کۆچ کردنیان لە ناوچەی هەکاری بۆ ورمێ. ئەو خانمە بە درێژایی ژیانی یەکێک بووە لە داکۆکیکارانی مافی گەلی ئاسوری، لە ئەیلولی (١٩١٩) وەکو نوێنەری گەلی ئاسوری بەشداری لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس کردووە. بەردەوام بووە لە سەر بەرگریکردن لە مافی گەلەکەی تاکو بەریتانییەکان دووریان خستەوە بۆ قوبرس و دواتر بۆ بەریتانیا و پاشان ئەمریکا و لە ساڵی (١٩٧٥) لەوێ مرد. بڕوانە: کلیر ویبل یعقوب، سورما خانم (١٨٨٣-١٩٧٥) السیدة الکلدو آشوریة في قلب الاعصار المدمر الذی اجتاح بلاد مابین النهرین، ت: نافع توسا، منشورات مجلة الفکر المسیحي، بغداد ٢٠١١.

(٧٣) دیلمقانی، ص١٣٢.

(٧٤) بارمتی، ص١٠٢.

(٧٥) (سمکۆ) ئیسماعیل ئاغا (١٨٩٥-١٩٣٠) ناسراو بە سمکۆی شکاک، کوڕی محەمەد ئاغای سەرۆکی هۆزی شکاکەو دوای مردنی باوکی و کوژرانی جەعفەر ئاغای برای لە ساڵی (١٩١٥)، دەسەڵاتی هۆزەکەی گرتە دەست، تاکو لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێران تیرۆر کرا. کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستەمدا، و: حمە کەریم عارف، چاپی شەشەم، کتێبخانەی ئاوێر، هەولێر ٢٠١١، ل ٥١.

(٧٦) بارمتی، ص١٠٣.

(77) حسێن مدنی، کوردستان و ستراتیژی کوردستان، بەرگی دووەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر ٢٠٠٩، ل٨١.
(78) کریس کۆچێرا، ل٥٦.
(79) لازاریف، الامبریالیة والمسألة الکردیة (١٩١٧-١٩٢٣)، ت: عبدي حاجي، مؤسسة موکریاني للبحوث والنشر، الطبعة الثانیة، اربیل ٢٠١٣، ص١٠٣.
(80) محمد تمدن، ص١٨٦.
(81) دیلمقاني، ص١٣٨.
(82) بارمتی، ص١٠٦.
(83) المصدر نفسه، ص١٠٦.
(84) لازاریف، الامبریالیة والمسألة الکردیة، ص١٠٣.
(85) احمد کسروی، تاریخ هجدة ساله، ص ص٧٢٦-٧٢٧. ؛ علی دهقان، ص ص٥١١-٥١٢.
(86) بارمتی، ص١٠٦ ؛ دیلمقاني، ص١٤٠.
(87) (قەڵای چاری) مەڵبەند و شوێنی سەرەکی هۆزی شکاک بوو، دەکەوێتە نزیک سنووری تورکیاوە لەوپەڕی باکووری دەریاچەی ورمێوە، محەمەد ڕەسول هاوار، سمکۆ (ئیسماعیل خانی شکاک)و بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، چاپخانەی ئاپێک، سوید- ستۆکهۆلم، ١٩٩٥، ل٢٦٤.
(88) علاءالدین سوجادی، شۆڕشەکانی کورد وە کوردو کۆماری عێراق، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەتلەس، تاران ١٣٨٤، ل٢٤٦ ؛ دیلمقاني، ص١٤١.
(89) علاءالدین سوجادی، ل٢٤٤.
(90) رحیم شنۆیی محمود زادە، ژەنەڕاڵ ئیحسان نوری پاشا و چەند بابەتێکی دی، و: شێرکۆ ئەحمەد حەوێزی، چاپخانەی شەهاب، هەولێر ٢٠١٢، ل٣٣.
(91) بارمتی، ص١٠٦.
(92) آغاسی، ص ص٣٦٨-٣٦٩.
(93) عەبدولڕەزاق بەدرخان کوڕی نەجیب پاشا کوڕی بەدرخان پاشایە، لە ساڵی ١٨٦٤ لە ئەستەمبۆڵ لە دایک بووە. هەر لە سەرەتای منداڵییەوە فێری زمانەکانی ئەوروپایی بووە، لەوانە (فەرەنسی و رووسی). لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم بۆتە سکرتێری سێیەم لە باڵیۆزخانەی عوسمانی لە (بترسبۆرگ) و فێری زمانی رووسی بووە و ئاشنایەتی بە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئیمپراتۆری رووسی پەیدا کردووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە. صلاح سلیم

الهـروري، الاسـرة البدرخانيـة النشـاط السياسـي والثقـافي (١٩٠٠–١٩٥٠)، دار العربية للموسوعات، الطبعة الاولى، بيروت ٢٠٠٦، ص٣٩.

(٩٤) سردشتی، ص٣٧.

(٩٥) مستەفا پاشـای یـامولكی بە (مسـتەفا پاشـای نەمـرود) ناسـراوە، مـاوەیەک لە ئاسـتانە كـراوە بە سـەرۆكی (دیـوانی حەربـی عـورفی). كەسـایەتییەكی گرنگـی هەبـووە، سـەردەمێک والـی بۆرسـە بـووە. یەكێک بـووە لەوانەی بڕیـاری زۆری لەسـێدارەدانیان دەركـردووە. لەوانە بڕیـاری لەسـێدارەدانی مسـتەفا كەمـال ئەتـاتورک و هاوەڵەكـانی. پلـەی سـەربازی گەیشـتۆتە پلـەی (فەریـق). لە سـاڵی (١٩٢٢) ئەستەمبۆڵ بەجێ دەهێڵێت و دەگەڕێتەوە بۆ باشـووری كوردسـتان و بەشداری لە شۆڕشی شێخ مەحمود كردووە و پلەی وەزیری پەروەردەی پێ سپێردراوە، لە ساڵی (١٩٣٦) كۆچی دوایی كردووە. بڕوانە. ڕۆژهـات ئالاكوم، كوردەكانی ئەستەمبۆڵی كۆن(١٤٥٣–١٩٢٥)، ئەحمەد تاقانە، دەزگـای موكریـانی، هەولێر ٢٠٠٥، ل ل١٠٨–١٠٩.

(٩٦) عوسمان عەلی، كورد لە بەڵگەنامەكانی بەریتانیدا، ل٢٠٧ ؛ نەوشێروان مستەفا، ل٣٧٩.

(٩٧) دیلمقانی، ص١٤٣.

(٩٨) علی دهقان، ص٥١٥ ؛ محمد تمدن، ص ص١٨٨–١٨٩.

(٩٩) احمد كسروی، تاریخ هجدة ساله، ص ص٧٢٨ ؛ علی دهقان، ص٥٢١ ؛ آغاسـی، ص٣٩٠

(١٠٠) بطـرس ایلیـا شـلیمون تعیـرا، لە سـەرەتای نیسـانی (١٨٨٠) لە بـازێ سـەر بە نـاوچەی هەكـاری لەدایـک بـووە، لە قوتابخـانەی میسـیۆنێرە فەرەنسـییەكان بڕوانامەی وەرگرتووە و فێری زمـانی فەرەنسـی بـووە. كاتێک خـانەوادەكەی لە هەكـاری كۆچیـان كـرد بـۆ ورمـێ لە نێـوان سـاڵانی (١٩٠٢–١٩٠٥) چـووە قوتابخـانەی ئەمریكی و فێری زمـانی ئینگلیزی بووە. بوتروس جگە لە زمـانی ئاسـوریی دایـک، هەریەكە لە زمانەكـانی (فەرەنسـی، تـوركی، ئینگلیـزی، فارسـی، عەرەبـی، كـوردی) زانیـوە. لە سـاڵی (١٩٠٧) بـۆتە فەرمـانبەر لە كونسـوڵخانەی توركی لە ورمێ. بە هۆی بوونی تایبەتمەندیی سـەركردایەتییەكی بەرز نازنـاوی (ئاغا)ی پێ وتراوە. لە پاڵ كاری سیاسی و دبلۆماسیدا سەركردەیەكی بەتوانا و بێ وێنە بـووە و لە چەنـدین شـەڕدا توانیـویەتی هەریەكە لە سـوپای تـورک و ئێران و هۆزە كوردەكانیش بشكێنێت. دوای دوور خسـتنەوەی لەلایەن بەریتانیـا لە ساڵی (١٩٢١) ڕووی كردە فەرەنسا و لە شوباتی (١٩٣٢) لەوێ مرد. بڕوانە:

نینوس تیراری، آغا بطرس سنحاريب القرن العشرين- احداث و وقائع المسيرة الاشورية في الحرب العالمية الاولى ١٩١٤م، ت: فاضل پولا، سان دياغو ١٩٩٦.

(١٠١) محمد تمدن، ص١٩٣ ؛ دیلمقانی، ص١٥٣.

(١٠٢) محمد تمدن، ص١٩٣ ؛ على دهقان، ص ص١٨٨-١٨٩.

(١٠٣) دیلمقانی، ص١٤٤.

(١٠٤) ا. م. هاملتن، ڕێگایەک بە کوردستان، و: عەلی عەبدولڕەحمان عەسکەری، چاپی یەکەم، خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٣، ل١١٣.

(١٠٥) مێجەر نۆئێل، سەرنجێکی بارودۆخی کورد، و: سەدیق سالح، چاپخانەی ئۆفەری سەرکەوتن، سلێمانی ٢٠٠١، ل٤٨.

(١٠٦) بارمتی، ص٨٢.

(١٠٧) موجتەبا بورزویی، بارودۆخی کوردستان (١٨٨٠-١٩٤٦)، و: نازناز محمد قادر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠٠٥، ل١٩٧.

(١٠٨) نەوشێروان مستەفا، ل٣٤٩.

(١٠٩) محمد تمدن، ص٢٠٣ ؛ بارمتی، ص١١١.

(١١٠) خالد العاني، موسوعة العراق الحديث، م١، بغداد ١٩٧٧، ص٩٩٤.

(١١١) علي رشيد ناجي الحيدري، الاثوريين في العراق، ١٩١٨-١٩٢٦، مطبعة الجيلاوي، القاهرة ١٩٧٧، ص٩٥.

(١١٢) منتشاشفيلي، ص٣٥٩.

(١١٣) بارمتي، ص١٣١.

(١١٤) (هێزی لیڤی) یەکێک بوو لەو هێزانەی کە لەلایەن بەریتانیا لە عێراق دروست کراوە لەو کەسانەی خەڵکی عێراق بوون و، یەکەم هێزیش لە (٤٠) کەسی خەڵکی ناسریە لەسەر دەستی رائید (ایدی) پێکهێنراوە. یەکەم جار تەنیا عەرەب لەو هێزە بوون، بەڵام دواتر ئەم هێزە فراوانتر بوو و، کورد و ئاسوریشی گرتۆتەوە. ژمارەی چەکدارەکانی گەیشتۆتە (٦١٩٩) چەکدار، دواتر ئەم هێزە بووە بە هێزێکی تایبەت بە ئاسورییەکان. لە ساڵی (١٩٣٢) ڕۆڵیان نامێنێت و تێکەڵ بە هێزی عێراق دەکرێن. بڕوانە: جي. كيلبرت براون، قوات الليفي العراقية (١٩١٥-١٩٣٢)، ت: رفيق صالح، مطبعة شفان، سليمانية ٢٠٠٦.

(١١٥) ئەفراسیاو هەورامی، ل١٥٨.

(١١٦) ئەفراسیاو هەورامی، ل١٦١.

(١١٧) سەید کەمال ئیبراهیمی، سمکۆ، چاپخانەی لەریا، سلێمانی ٢٠١٢، ل٧٥.

(١١٨) ئەفراسیاو هەورامی، ل ل١٦٢-١٦٤.

(١١٩) سروە صابر اسعد، کوردستان الجنوبية ١٩٢٦-١٩٣٩، سليمانية ٢٠٠٦، ص٢٦٧.

(١٢٠) سروه صابر اسعد، ص ص٢٦٧-٢٧٦.
(١٢١) كيلبرت براون، ص١٢٧.
(١٢٢) بيث شمويل، الاشوريون في مؤتمر الصلح باريس ١٩١٩، الطبعة الاولى، دهوك ٢٠٠٠، الموسوعة الاشورية،
http://www.betnahrain.net/Arabic/Books/Rubin/rbsh1.htm
(١٢٣) جەلیلی جەلیلی، ڕاپەڕینی کوردەکان، ل٤٨ ؛ عوسمان عەلی، چەند لاپەڕەیەک، ل٢٠.
(١٢٤) عوسمان عەلی، چەند لاپەڕەیەک، ل٦٤.
(١٢٥) هەمان سەرچاوە، ل ل٢٠'٢٢'٧٠-٧١.
(١٢٦) حسێن مدنی، ل٩٧.
(١٢٧) لازاريف، الامبريالية والمسألة الكردية، ص١٢٥.
(١٢٨) بارمتی، ص١١٢.
(١٢٩) ئەفراسیاو هەورامی، ل٤٣٩.
(١٣٠) کەسایەتییەکی ناوداری کورد و بنەماڵەی بەدرخانی بوو، نازناوی شازادەشیان پێوتووە، هەر لە سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە تاکو (١٩٢٣) لە رووسیا بووەو بەو هیوایەی رووسیا بۆ پشتگیری لە کێشەی کورد ڕابکێشێت. خۆی و بنەماڵەکەی خزمەتێکی زۆری رووسیایان کردووە، لە بەڵگەنامەکاندا دیارە هەوڵیداوە بە پشتیوانی رووسیا و دواتر سۆڤیەت کوردستانێکی سەربەخۆ ڕابگەیەنێت. ئەفراسیاو هەورامی، ل٣١.
(١٣١) لازاريف وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ص١١٧.
(١٣٢) ئەفراسیاو هەورامی، ل٨٩.
(١٣٣) هەمان سەرچاوە، ل١١٩.
(١٣٤) لازاريف وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ص٨٩.
(١٣٥) ئەفراسیاو هەورامی، ل٥٢.
(١٣٦) عوسمان عەلی، کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیدا، ل٢٠٨.
(١٣٧) دیلمقانی، ١٣٧.
(١٣٨) بارمتی، ١٠٥.
(١٣٩) المصدر نفسه، ص٨٦.
(١٤٠) نەوشێروان مستەفا، ل٣٧٠.
(١٤١) احمد كسروى، تاريخ مشروطه ايران، چاپ چهاردهم، انتشارات امير كبير، تهران ١٦٣٢، ص٨٣.

## الملخص

كان آشوريو كوردستان يعيشون في حدود الامارات الكوردية (هكارى، بوتان، بادينان، سوران) التابعة للولايات العثمانية (وان، دياربكر، موصل). وكما كان هنالك مجموعة منهم يعيشون في شرقي كوردستان تحت السلطة الايرانية. كانت الحياة في هذه المناطق عادية ولم تكن هناك أية صراع ديني أو مذهبي بين الكورد و الآشوريين حتى القرن التاسع عشر، وكانت علاقاتهم مع زعماء الكورد علاقات تحالف اكثر مما هي علاقات تبعية.

في نهاية النصف الاول من القرن التاسع عشر، شهدت المنطقة عدة نزاعات دينية بين الطرفين، حين شن بعض الزعماء الكورد هجمات عدة على المناطق التى يقطنها الآشوريون في عامي (١٨٤٣) و(١٨٤٦)، و ساهم الامير بدرخان باشا في هجمات عام (١٨٤٦) وانتصر عليهم.

كانت الدول الاوربية لها تأثير كبير في إثارة الآشوريين ضد الكورد و زرع بذور الشقاق بينهم وبين الكورد، وذلک بواسطة المبشرين الذين كانوا قد انتشروا في المناطق التي يقطنها المسيحيون في كوردستان.

وأثناء الحرب العالمية الاولى، نشبت النزاعات بين الكورد والآشوريين مرة اخرى. وبلغت ذروتها حين قام (سمكو خان) زعيم عشيرة شكاك الكوردية بإغتيال بطريک الاشوريين (بنيامين مارشمعون) في مارس (١٩١٨). واثر ذلک استغل تلک الدول الصراع وحثوا الآشوريين ضد الكورد وكانت تنحصر مطالبهم في استخدامهم كدروع بشرية لصد هجمات الدولة العثمانية في شمال غربي ايران. كما ان كلا من رووسيا التي كانت ترى عدم الارتباط بالحركة الكوردية ودعم فكرة كوردستان المستقلة، كذلك البريطانيون لهم موقفا عدائيا من نوايا الكورد، لأنها شكلت خطرا حقيقيا على وحدة اراضي ايران و وجود نظام طهران الذي كان طمأنة لهيمنة النفوذ البريطاني في هذه البلاد.

## Abstract

The Assyrians of Kurdistan lived their life in the area of Kurdish Emirates (Hakary, Botan, Badinan, and Soran) related to Ottoman state, and the rest of them settled in East of Kurdistan under the control of Iran State. At that time, there were no religious and sectarian conflicts between both Kurdish and Assyrian till nineteenth century. Their relation was just allies' relation not commitment.

From the beginning of First World War, conflicts and hostile relations occurred. For that reason, (Semko xan) who was pioneer of Shkak Tribe; killed (Binyamin Mar Shamhoon) in 1918, the great religious man of Assyrians.

In the last half of nineteenth century, the hostility and desperation between them seen. Some of the Kurdish leaders attacked the Assyrian settlement in 1843 and 1846. King of Botan Emirate (Badraxan) played a vital role in 1846 attacks. European countries played an effective misconduct behavior in boosting the Assyrians spirit emotions against Kurds in particular, due to those missionaries who spread among those Assyrians lived in Kurdish areas.

The alliance countries exploited this big opportunity for their own benefit. They wished to use the Assyrians as human shields against the Turkish attacks in west of Iran. The Russians believed that they don't need to busy their mind with building an independent Kurdistan for Kurdish. On the other hand, the British officials showed their hostility towards Kurdish lawful rights, because they thought it is a risk on the unified of Iran state and remaining their interests in Tehran and implementing their desires by Iranian government.

# هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا بەرامبەر عێراق، کاریگەریی لەسەر پرسی کورد لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٤- ١٩٧٥)

**م. ی . ئیسماعیل عەبدوڵڵا ئیسماعیل**
بەشی مێژوو - کۆلێژی ئەدەبیات –
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

## پێشەکی

بەپێی ئەوەی کە عێراق پێگەیەکی گرنگی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبوو بەردەوام ببووە شوێنی چاوتێبڕینی وڵاتانی زلهێز، لەم سۆنگەوە هەردوو وڵاتی زلهێزی یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا، دوای جەنگی دووەمی جیهانی کە جیهان دابەش بوو بۆ سەر دوو بلۆکی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی، ئەوا هەردوو وڵات چاویان بڕیبووە وڵاتانی ناوچەکە ویستیان هەژموونی خۆیان لەو ناوچانە زیاد بکەن یەکێک لەم وڵاتانە عێراق بوو، کوردیش یەکێک بوو لەو نەتەوانەی کە لە عێراق دەژیا، بۆیە هەڵوێستی سۆڤیەت و ئەمریکا بەرامبەر عێراق کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر پرسی کورددا هەبوو، ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر بابەتەکە وابەستەیە بەبەدیارخستنی ئەو گۆڕانکارییانەی کە ئەو وڵاتە بەخۆیەوەی بینیوە.

سەبارەت بە هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا بەرامبەر عێراق، کاریگەری لەسەر پرسی کورد لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٤- ١٩٧٥)، تایبەتە بە ماوەیەکی گرنگ لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی عێراق و کوردستان، چونکە پڕە لە ڕووداوی سیاسی و بایەخدار.

سەبارەت بە بایەخی توێژینەوەکە، خستنەڕووی زانیاریی دروست لەسەر هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا بەرامبەر عێراق، کاریگەری لەسەر پرسی کورد لە ماوەی توێژینەوەکە، بەپێی ڕووداوە مێژووییەکان

باسی لێوە کراوە کە بەهۆیەوە پەیوەندییەکان هەڵکشان و داکشانیان بەخۆیەوە بینیوە.

میتۆدی توێژینەوەکە بریتییە لە میتۆدی خستنەڕوو و شیکردنەوە، واتە خستنەڕووی پەیوەندییەکانی عێراق لەگەڵ هەر یەک لە یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا، پاشان شیکردنەوەی ئەم پەیوەندییانە و کاریگەرییان لەسەر بارودۆخی کوردستاندا.

پلانی توێژینەوەکە : لە پێشەکییەک و دەروازە و سێ تەوەری سەرەکی و چەند دەرئەنجامێک پێکدێت. هەریەک لە تەوەرەکانیش چەندین بابەتیان لە خۆوە گرتووە. لە دەروازە باس لە پەیوەندیی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا لەگەڵ عێراق و ڕەنگدانەوەی لەسەر پرسی کورد بەر لە ساڵی ١٩٧٤ کراوە، دواتر لە تەوەری یەکەمدا : تیشک خراوەتە سەر شەڕی نێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و حکومەتی عێراق ١٩٧٤-١٩٧٥. تەوەری دووەم : تەرخانکراوە بۆ باسکردن لە هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت لەسەر شەڕی نێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و حکومەتی عێراق ١٩٧٤-١٩٧٥، لە تەوەری سێیەمیشدا : باسمان لە هەڵوێستی ئەمریکا لەسەر شەڕی نێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و حکومەتی عێراق ١٩٧٤-١٩٧٥ کردووە. لە کۆتایی توێژینەوەکەشدا، گەیشتوونەتە چەند دەرئەنجامێک کە لە چەند خاڵێکدا ئاماژەیان پێکراوە.

دەروازە :

## پەیوەندیی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا لەگەڵ عێراق و ڕەنگدانەوەی لەسەر پرسی کورد بەر لە ساڵی ١٩٧٤

پەیوەندیی عێراق لەگەڵ هەر یەک لە یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا لە (١٤ تەموز ١٩٥٨ تا ١١ ئاداری ١٩٧٤)، هەڵکشان و داکشانی بەخۆیەوە بینیوە، دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ لە عێراق، پەیوەندیی عێراق لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت باش بوو، چونکە پشتیوانی لە شۆڕشی ١٩٥٨ کرد[١]، هەروەها ئەو شۆڕشەی بە کۆتاییهێنانی دەسەڵاتی ئەمریکا و ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دادەنا، لەو کاتەدا سەرۆک وەزیرانی سۆڤیەت نیکیتا سێرگێیڤیچ خرۆشێف[٢] نامەیەکی بۆ بەریتانیا و ولاتانی زلهێز نارد ، داوای لێکردن کە هەڵوێستی خراپ دژ بە بڕیارەکانی شۆڕش لە عێراقدا نەنوێنن، لە هەمان کاتدا هەڕەشەی ڕوودانی جەنگی سێیەمی جیهانی لێکردن[٣]، لەو ئان و ساتانەدا پەیوەندیی عێراق لەگەڵ ئەمریکا باش نەبوو، چونکە پشتیوانی لە شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ نەکرد، بەڵکو مەترسی لە کۆنترۆڵی کۆمۆنیستی لەلایەک و کاریگەرییەکانی یەکێتی سۆڤیەت و جوولانەوەی عەرەبی بە سەرکردایەتی جەمال عەبدولناسردا هەبوو، هەروەها ئەمریکا دوودڵی لە شۆڕشەکەی عەبدولکەریم قاسم هەبوو، لە هەمان کاتدا بە مەترسییەکی گەورەی لەسەر بەرژەوەندییەکانی ڕۆژئاوا بە گشتی و ئەنگلۆ – ئەمریکی بە تایبەتی لە عێراق دادەنا[٤]، هەر بۆیە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکی داوای لە سەرۆکی دەزگای ناوەندی هەواڵگری "الان دالاس" کرد کە ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەلیان لەسەر ئەو گۆڕانکارییە سیاسییانەی کە لە عێراق هاتۆتە کایەوە بۆ بنێرێت[٥].

پاشان ئەمریکا لە ڕێگای (الدیمر جولمان)ی باڵوێزی لە بەغدا بە شێوەیەکی فەرمی دانیان بە کۆماری عێراقدا نا، هەروەها داوایان لێکردن کە پێویستی بەرژەوەندیی سیاسی و تەقەنی و ئابووریی هەردوو ولات لەبەرچاو بگیرێت، عێراقیش ڕەزامەندی دەربڕی[٦].

لەلایەکی دیکە دوای زیادبوونی هەژموونی سۆڤیەت لە عێراق، ئەمریکا لە هەلێک دەگەڕا بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم، لەو سۆنگەدا کاتێک پەیوەندیی نێوان عەبدولکەریم قاسم و جەمال عەبدولناسر لەسەر بەشداری پێکردنی عێراق لە یەکێتی عەرەبیدا تێکچوو، ئەمریکا پشتگیری لە جەمال عەبدولناسر کرد، پاشان بە پاڵپشتی دەزگای هەواڵگری ئەمریکی (C.I.A)[٧]، جەمال عەبدولناسر هاوکاری هەڵگەڕانەوەی (عەبدولوەهاب شەواف)ی دا دژ بە دەسەڵاتی قاسم، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە کورد لە ناوخۆ و یەکێتی سۆڤیەت لە دەرەوە پشتیوانی و هاوکاری حکومەتی عێراق بوون، هەڵگەڕانەوەکە شکستی هێنا[٨]، پاش ئەو رووداوە ریکەوتنامەیەکی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری لە نێوان یەکێتی سۆڤیەت و عێراق لە ساڵی ١٩٥٩ مۆرکرا[٩].

لەلایەکی دیکە لە ساڵی ١٩٦١، مستەفا بارزانی رابەری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە باشووری کوردستان داوای مافی ئۆتۆنۆمی پێشکەش بە عەبدولکەریم قاسم کرد، بەڵام داوایەکە لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەو کاتەی عێراق رەتکرایەوە[١٠]، ئەوەبوو لە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١، شۆڕشێک بە ناوی شۆڕشی ئەیلول دژی حکومەتی قاسم بەرپابوو[١١] سەبارەت بە هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا بەرامبەر بە شەڕی نێوان کورد و حکومەتی عێراق، بەپێی ئەوەی سۆڤیەت پەیوەندیی باشی لەگەڵ عێراق و مستەفا بارزانیدا هەبوو، هەوڵی نێوەندگیری دەدا[١٢].

لەلایەکی دیکە دوای ئەوەی رێبەرانی کورد و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە باشووری کوردستان هەوڵی زۆریان دا کە یەکێتی سۆڤیەت هاوکارییان بکات، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، ئەمجارەیان هەوڵیان دا ئەمریکا رازی بکەن بۆ ئەوەی پشتیوانی لە خەباتی کورد بکات، یان لایەنی کەم رێگر نەبێت لە بەرامبەر ئەوەی کێشەی کورد لەلایەن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان تاوتوێ بکرێت، هەر بۆیە لە یەکەمین هەوڵدا لە ساڵی ١٩٦٢دا، دوو نوێنەری کورد چوون بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، لە بەرامبەردا لایەنی دووەم لە (٢٢ی حوزەیرانی ١٩٦٢)دا پەیامێکی نارد بۆ باڵوێزخانەی خۆی لە عێراق و رایگەیاند ((ئێمە ناتوانین چالاکانە لایەنگری کوردەکان

بکەین یاخود کورد بۆ بەدیهێنانی مافی ئۆتۆنۆمی هان بدەین))، هەروەها گوتی ((دەبێ کوردەکان هەوڵ بدەن لەگەڵ عێراق رێکبکەون))، دواتر گوتی ((ئەگەر ئەمریکا هاوکاری کوردیش نەکات تەنها هاوخەمی و بە پەرۆشی خۆی بۆ کورد دەرببڕێ ئەوا کێشەکە ئاڵۆزتر دەبێ))[١٣].

ئەمریکا لە هەوڵەکانی بۆ لەناوبردنی عەبدولکەریم قاسم هەر بەردەوام بوو لە دوا هەوڵیدا دەزگای هەواڵگری ئەمریکی (C.I.A) توانی هاوکاری بەعسییەکانی عێراق بکات و لە رێگای کودەتایەک لە ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣، کۆتایی بە دەسەڵاتی ناوبراو بهێنێ لە عێراق[١٤].

پەیوەندیی عێراق لەگەڵ ئەمریکا لە نێوان ساڵانی (١٩٦٣ - ١٩٦٧) بەرەو باشبوون چوو، هەر بۆیە رۆژێک دوای کودەتاکە ئەمریکا لە رێگای (میلبورن) کە بەڕێوەبەری کاروبارەکانی ئەمریکا بوو لە عێراق دان پێدانان و بەشەرعی ناساندنی وڵاتەکەی بۆ کودەتاکە و حکومەتی نوێی عێراق بە وەزیری دەرەوەی عێراق (تالب شەبیب) راگەیاند[١٥].

پەیوەندیی عێراق لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت لە نێوان ساڵانی (١٩٦٣ – ١٩٦٧) بەرەو لاوازی چوو، چونکە یەکێتی سۆڤیەت بە کودەتای ١٩٦٣ خۆشحاڵ نەبوو، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە عێراق لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم هاوپەیمانێکی ستراتیجی سۆڤیەت بوو[١٦]، لەو کاتەدا عەبدولسەلام عارف هەوڵی زۆری دا کەوا رای سۆڤیەت بەرامبەر کودەتای ١٩٦٣ بەشێوەیەکی ئەرێنی ببات[١٧]، و رایگەیاند کە ((زانیاریی نا دروست سەبارەت بە کودەتای ١٩٦٣ دراوە بە سۆڤیەت،و دەیانەوێت بە هەمان شێوەی پێشوو سۆڤیەت هاوکارو هاوپەیمانی عێراق بێت))[١٨] دوابەدوای ئەمە وتەبێژی فەرمی حکومەتی سۆڤیەت دانی بە دەسەڵاتی کودەتاچییەکان لە عێراقدا هێنا، لە هەمان کاتدا جەختیشیان لەسەر هاوکاریی سەربازی بۆ عێراق کردەوە[١٩].

لەلایەکی دیکە شەڕ لە نێوان شۆڕشی کورد و حکومەتی عێراقی دەستی پێکرد ، ئەمەش دوای پێنەدانی مافی نەتەوەیی و خۆبەڕێوەبردن و رۆشنبیری و سیاسی و کەلتووری بە گەلی کورد هات[٢٠]. دوای ئەوە عێراق

داوای چەکــی لە ســۆڤیەت کــرد، بەڵام بە هەوڵ و تەقەلای شــیوعییەکان ســۆڤیەت داواکەی لەو کــاتەدا ڕەتکــردەوە، ئەمریکــا ئەمەی بە هەل زانــی و داوای لە عێراق کرد پەیوەندییەکانی لەگەڵ سۆڤیەت بپچڕێنێت، ئەم هەنگاوەی ســۆڤیەت، عێراقــی بەرەو ئەمریکــا و ڕۆژئــاوا بــرد، لەو کــاتەدا بەریتانیــا و فەرەنســا و ئەمریکا چەک و تەقەمەنی بدەن بە عێراق، بەڵام ئیسرائیل بەم هەنگاوەی ئەمریکا نیگەران بوو[21].

پەیوەنــدیی نێــوان ئەمریکــا و عێــراق لە مــاوەی (١٩٦٣ - ١٩٦٧) کاریگەرییەکی نەرێنی لە سەر سیاسەتی ئەمریکی بەرامبەر پرسی کورد لە عێراقدا دروست کردبوو، چونکە پەیوەندییەکی بەتینی دبلۆماتی و سیاسی و ئابووری و سەربازی لەنێوانیاندا هەبوو، ئەمەش وای لە ئەمریکا کردبوو کە تــاکە هەوڵــی پارێزگــاریکردن بێت لە بەرژەوەنــدییەکانی لەو پەیوەنــدییانەدا، ســـەرباری ئەوەش بەردەوام ڕایدەگەیانــد کە کێشـــەی کــورد کێشـــەیەکی نێوخۆیی عێراقە و حکومەتی واشنتۆن دەست لەو کێشەیە وەرنادات، بەڵام بەپــێچەوانەوە لەم قۆنــاغەی پەیوەنــدیی دۆســتانەی لەگەڵ عێراقــدا، ئەمریکــا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ سیاسەتی خۆی ئاڕاستەی پرسی کورد لە عێراقدا دەکــرد، دوای ئەوەش پەیوەنــدیی نێــوان عێــراق و ئەمریکــا لە ســاڵی ١٩٦٧، بەهۆی جەنگی حوزەیرانی ١٩٦٧ تێکچوو[22]، بەڵام ئەمریکا هیچ هەڵوێستێکی ئەرێنی بەرامبەر پرسی کورد دەرنەبڕی[23].

دوای شـــەڕی عەرەب – ئیســـرائیل لە ســـاڵی ١٩٦٧دا پەیوەنـــدییەکانی یەکێتی سۆڤیەت و عێراق بەهێزتر بوو، لەهەمان کاتدا سۆڤیەت گرنگی بە پرســی کــورد دەدا و هاوکــاری بــۆ بــزووتنەوەی ڕزگــاریخوازی کــورد لە باشــووری کوردســتان تــا بەیاننــامەی ١١ی ئــاداری ١٩٧٠ بەردەوام بــوو[24]. هەڵوێســـتی ئەمریکـــا بەرامـــبەر پرســـی کـــورد (١٩٦٨ - ١٩٧٠) هـــیچ گۆڕانکارییەکی بەخۆیەوە نەبینی[25].

دوای گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتی سیاسیی کورد و حکومەتی عێراق توانرا بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ لەنێوان کورد و حکومەتی عێراق مۆر بکرێت[26]. دوای ڕاگەیانــدنی بەیاننــامەکە یەکێتــی ســۆڤیەت لە ڕێگــای خــودی

(لیۆنید بریجنێف) سەرکردەی یەکێتی سۆڤیەت بەناردنی برووسکەیەک بۆ ڕابەری شۆڕشی کورد، پیرۆزبایی بەیاننامەکەی لە گەلی کورد لێکرد[٢٧] لەلایەکی دیکە ئەمریکا دژایەتی بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ نەکرد، بەڵکو بە پێشهاتێکی گرنگی لە قەڵەم داوە، بەڵام گومانی لە جێبەجێکردنی بەندەکان هەبوو، هەروەها سەبارەت بە ڕۆڵی سۆڤیەت لە مۆرکردنی ئەو بەیاننامەیە هۆشداری دا[٢٨].

دوابەدوای ئەمە ئەمریکا دەستبەجێ لە ڕێگەی هاوپەیمانەکانیەوە کەوتە جموجوول و سەرەتای دەستپێکێکی تازە لە چالاکی دبلۆماتی، یەک لەو کەناڵانەش ئێران بوو، دواتر مستەفا بارزانی بەرەو تاران بەڕێکەوت و چاوی بە شای ئێران کەوت (شا)ش بە ناوی خۆی و ئەمریکا بەڵێنی زۆری پێدا بەو مەرجەی بەیاننامەکە هەڵوەشێنێتەوە، بەڵام بارزانی پابەندبوونی خۆی بۆ بەیاننامەکە دووپات کردەوە[٢٩]. دوای ئەوە حکومەتی عێراق لە نیسانی ١٩٧٠، ڕێکەوتنامەیەکی سەربازی لەگەڵ سۆڤیەت واژوو کرد، چەندین چەکی جۆراوجۆری لێ کڕی، پاشان لە سەرەتای ساڵی ١٩٧١، عێراق پابەندی جێبەجێکردنی بەندەکانی ناو بەیاننامەکەی لەگەڵ کورد نەبوو، بۆیە کورد هەوڵی دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا دا، بەڵام کاربەدەستانی ئەمریکا ڕایانگەیاند کەوا دەست لەکاروباری نێوخۆی عێراق وەرنادەن[٣٠].

دوابەدوای ئەمە لە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١ هەوڵی تیرۆرکردنی مستەفا بارزانی درا[٣١]، بۆیە هەر یەک لە ئەمریکا و سۆڤیەت نیگەرانیی خۆیان بەرامبەر بەو کارە دەربڕی، لەو کاتەشدا ئێران سەرقاڵی کێشەی کەنداو بوو، ئەمەش دوای ئەوە هات کە بەریتانیا داوای پاشەکشەی لێکردبوو لە کەنداو، بەڵام ئێران لە کۆتایی ساڵی ١٩٧١دا هەرسێ دوورگەی (تونبی بچووک و گەورە و ئەبوموسا)ی بە پشتگیری ئەمریکا داگیر کرد[٣٢]، چونکە پەرەسەندنی هەژموونی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا بایەخدانی ئەمریکای لە کەنداو زیاتر کرد، دوای ئەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هاوکاری و پەیوەندییەکانی عێراق و یەکێتی سۆڤیەت ڕووی لە زیادبوون دەکرد بەشێوەیەک لە ٩ی نیسانی ١٩٧٢ پەیماننامەی دۆستایەتی و هاوکاریی ئابووری و سەربازی و

سیاسی و تەکنیکییان بۆ ماوەی (١٥) ساڵ واژوو کرد[٣٣]. دواتر لە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٢ عێراق نەوتی خۆماڵی کرد، پاش ئەو هەنگاوەی عێراق ئینجا ئەمریکا بڕیاری دا یارمەتی کورد بدات[٣٤]، لەلایەکی دیکە لە ساڵانی (١٩٧٣-١٩٧٤)دا پەیوەندیی نێوان عێراق و یەکێتی سۆڤیەت لە ئاستێکی بەرزدابوو، هەر بۆیە حکومەتی عێراق لە ساڵی ١٩٧٣ بەرەی هاوپەیمانی نیشتمانی پێشکەوتنخوازی لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق پێکهێنا، و بە دوو وەزیر حزبی شیوعی عێراق بەشداری لە کابینەی وەزاری لە عێراقدا کرد[٣٥].

پەیوەندیی نێوان عێراق و ئەمریکا لە (١٩٧٣ - ١٩٧٤)، بەهۆی ئەو ڕووداوانەی کە لەم ماوەیەدا ڕوویاندا بەرەو خراپی هەنگاوی نا، بە تایبەتی پێکهێنانی بەرەی هاوپەیمانی نیشتمانی لەگەڵ حزبی شیوعی کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی یەکێتی سۆڤیەت یەکی دەگرتەوە، ئەمەش پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بوو لە عێراق، ئەوەبوو نوێنەری ئەمریکا لە عێراق وڵاتەکەی لە گرنگیی عێراق لە ڕووی بەرهەمهێنانی نەوت و پارێزەری سەقامگیری ناوچەی کەنداو لە گەیاندنی نەوت بۆ ڕۆژئاوا ئاگادار کردەوە، بۆیە داوای لە وڵاتەکەی کرد بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراقدا بچێتەوە[٣٦]، بەڵام بەهۆی ئەوەی لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣ شەڕ لە نێوان عەرەب و ئیسرائیل ڕوویدا و عێراق بەشداری لە شەڕەکە کرد، بەو هۆیەوە نرخی نەوت بەرز بۆوە، لەو کاتەدا ئەمریکا هەوڵیدا هەژموونی یەکێتی سۆڤیەت لە عێراق کەم بکاتەوە، ئەمەش لە ڕێگای ئەو پلانەی کە لەگەڵ ئێران و ئیسرائیل دژ بە ڕژێمی بەعسی فەرمانڕەوا لە عێراق دایانڕشتبوو، کە بریتی بوو لە هاوکاریکردنی کورد و بەکارهێنانی دژی حکومەتی عێراق[٣٧] سەرباری ئەوەی عێراق لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٣ هەوڵە دبلۆماتییەکانی دەستپێکرد بۆ ئەوەی لە ئێران نزیک ببێتەوە و ئامادەیی خۆی دەربڕی کە گشت جیاوگەکانی شەتولعەرەب بدات بە ئێران بۆ ئەوەی ئێران هاوکارییەکانی بۆ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە عێراق ڕابگرێت، بەڵام ئێران گومانی لە عێراق هەبوو و هەنگاوی نەنا[٣٨]، دوابەدوای ئەمە نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە عێراق پێشنیازی بۆ وڵاتەکەی کرد کە

پەیوەنـــدییەكانی لەگەڵ كـــورد بپچڕێنێـــت، ((چـــونكە لەلایەک ســـەركەوتنی بـزووتنەوەی كـورد دژی سـەقامگیریی نـاوچەكە و پەیوەنـدییەكانمانە لەگەڵ عێراق، لەلایەكی تر بارزانی تا یارمەتی لە ئێران و ئەمریكا وەربگرێت سازش بـۆ عێـراق ناكـات))، كەوا بـوو چـاوەڕوانی ئەوە دەكرێت شـەڕ لەگەڵ عێـراق هەڵبگیرسێت و ناوچەكەش ناسەقامگیر بێت[٣٩]، زۆری نەبرد حكومەتی عێراق یاسای ئۆتۆنۆمی لە ساڵی ١٩٧٤ دەركرد، كوردیش بەم یاسایە ڕازی نەبوو، ئەوەبوو لە نیسانی ١٩٧٤ شەڕ لە نێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد و حكومەتی عێراق دەستی پێكردەوە[٤٠].

## تەوەری یەکەم :
## شەڕی نێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد
## لە باشووری کوردستان و حکومەتی عێراق ١٩٧٤-١٩٧٥

بەر لەوەی حکومەتی عێراق لە ١١ی ئاداری ١٩٧٤ یەکلایەنە یاسای ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچەکانی کوردستان ڕابگەیەنێت، سەرکردایەتی سیاسی کورد لە باشووری کوردستان بە مەبەستی جێبەجێکردنی بەندەکانی بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠، و دوورخستنەوەی کوردستان لە هەڵگیرسانەوەی شەڕ(٤١)، لەو کاتەدا پارتی دیموکراتی کوردستان پرۆژەیەکی سەبارەت بە ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی پێشکەش بە حکومەت کرد، هەروەها داوای درێژکردنەوەی ئاگربەستیان بۆ ماوەی شەش مانگ کرد، بەڵام حکومەتی عێراقی پێشنیازەکەی ڕەتکردەوە، و ڕایگەیاند کە ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی تەنها پارێزگاکانی (هەولێر، سلێمانی، دهۆک) دەگرێتەوە، هەر یەک لە ناوچەکانی (کەرکوک و شەنگار و شێخان و خانەقین و مەندەلی و جەلەولا) بەشێک نین لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی(٤٢).

دوای چەندین هەوڵی کورد بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی لە کوردستان، بەڵام حکومەت موکڕ بوو لەسەر بڕیارەکەی خۆی، بۆیە لە نیسانی ١٩٧٤ مستەفا بارزانی هێزەکانی پێشمەرگەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای عێراق ئامادەکرد، و بڕیاری دا ناوچەیەک لە شێوەی مانگی یەک شەوە بە درێژایی هێڵێک کە لە زاخۆوە دەگاتە دەربەندیخان بپارێزێ، ئەمەش بە ئومێدی ئەوەی بتوانن ناوچە نەوتییەکانی کەرکوک لەمەودای تۆپەکانیان دابێ، تا بەم هۆیەوە بە ئەمریکییەکان نیشان بدات کە بەکردەوە دەستیان بە کەرکوک دەگات ، هەرچەند بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە کورد تۆپخانەی دوور هاوێژی نەبوو(٤٣).

شایانی باسە لە ٢٥ی ئاداری ١٩٧٤ ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق بەپێی بڕیاری ژمارە (٤٠٤)(٤٤)، ئابلۆقەی ئابووری خستە سەر تێکڕای گوندەکانی کوردستان، بەمەش دانیشتوانی گوندەکان تووشی زەرەرو زیانێکی زۆر هاتن(٤٥)، هەر بۆیە لە سەرەتای مانگی نیسانی ١٩٧٤ هێزەکانی

پێشمەرگە لە ناوچەکانی شەڕ بەو شێوەیە دابەش بوون، هێزێک لە زۆربەی ناوچەکانی هەولێر و ڕێگای سەرەکی (هەولێر – ڕەواندز) و گەرووەکانی (سەلاحەددین – کۆڕێ – شەقڵاوە – میراوە– سپیلک – گەلی عەلی بەگ)، هێزێکی تر لەو ناوچانەی کە دەکەونە سەر قەزای ڕەواندز و حاجی ئۆمەران تا سنووری ئێران، پاشان هێزێک لە دەوری سەربازەکانی عێراق لە سەربازگەکانی (سەلاحەددین – شەقڵاوە – سپیلک – خەلیفان – ڕەواندز – هاودیان) دانران[٤٦].

بەم جۆرە هێرشەکانی حکومەت لە ٢٣ی نیسانی ١٩٧٤ بۆ سەر ناوچەکانی کوردستان دەستی پێکرد، لەئەنجامدا گوندەکانی سەر بەپارێزگای هەولێر ڕووبەڕووی ئەم هێرشانە بوونەوە، هەروەها حکومەت بە تۆپی دوور هاوێژ و فڕۆکەکانی لە جۆری (تۆپۆلیف ٢٢) بۆردمانی گوندەکانی هەولێر و ناوچەی خڕبوونەوەی ئۆتۆمۆبیل لەو پردەی کە دەکەوێتە نزیک (گەلاڵە و باڵەک) کرد، بەڵام هێزەکانی پێشمەرگە توانییان زەرەرو زیانێکی زۆر بە سوپای عێراق بگەیەنن[٤٧].

فڕۆکەی تۆپۆلیفی عێراق لە ٢٤ی نیسان ١٩٧٤ فڕۆکە سەربازییەکانی عێراق بۆردومانی شاری قەڵادزێیان کرد کە لە ئەنجامدا زیاتر لە (١٣١) کەس کوژران و نزیکەی (١٥٢) کەسیش برینداربوون، هەروەها لەبەر گەورەیی ئەو کارەساتە مەکتەبی سیاسی پارتی بڕیاری دا ڕۆژی بۆردومانکردنی قەلادزێ بکرێتە ڕۆژی ماتەمی نەتەوەیی[٤٨].

دوای ئەوە فڕۆکە سەربازییەکانی سوپای عێراق لە ٢٦ی نیسانی ١٩٧٤ بە یارمەتی پسپۆرانی یەکێتی سۆڤیەت بۆردومانی بنکە و بارەگاکانی هێزی پێشمەرگەیان کرد[٤٩].

ڕۆژی دواتر بۆردومانی ناوچەکانی ( گەلاڵە و ڕەواندز و حاجی ئۆمەران)یان کرد[٥٠]، هەروەها لە ١٥ی ئایاری ١٩٧٤ دووبارە سوپای عێراق دەستیان بە هێرشی بەر فراوان بۆ شاری زاخۆ کرد، و توانییان داگیری بکەن[٥١]، دوای ئەوە هێزەکانی عێراق هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی (شەقلاوە و مەسیف و ڕەواندزو قەڵادزێ)، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون[٥٢].

سەرەڕای ئەوەی هێزی پێشمەرگە توانییان ڕووبەڕووی سوپای عێراق ببنەوە، بەڵام تا دەهات شەڕەکان فراوانتر دەبوون، ئەمەش وای لە پارتی کرد کە بە ناچاری بارەگاکانی خۆی لە هەندێک ناوچەی کوردستان بەتایبەتی هەولێر بگوازێتەوە بۆ ناوچەیەکی دوور لە مەیدانی شەڕ، لەوانە گواستنەوەی بارەگای لقی دوو لە ناوچەی هیران بۆ ناوچەی زێوە لە نزیک بێتواتە کە ئەو کاتە ئەو ناوچەیە بەتالیۆنی شەشی بێتواتەی لێبوو ، ئینجا هێزی دەشتی هەولێر بارەگاکانیان لە دەشتی هەولێر گواستەوە بۆ ناوچەکانی خۆشناوەتی و بێتواتە و چیای شیشار [٥٣].

دوابەدوای ئەوە سوپای عێراق لە ١٣ی ئایاری ١٩٧٤ تاکو ٢٩ی ئایاری ١٩٧٤ هێرشەکانی بۆ سەر پێشمەرگە لە دەشتی هەولێر و سەفین چڕتر کردەوە، ئەوە بوو لە ١٣ی ئایار بۆردومانی چیای زۆزکیان کرد، بەڵام بەهۆی بەرگری هێزی پێشمەرگە نەیانتوانی ناوچەکە داگیر بکەن[٥٤]، دواتر لە ١٤ تا ٢٩ی ئایار سوپا چەند جارێک هێرشی یەک لەدوای یەکیان کردە سەر ناوچەکانی ڕەواندز و گەرووی عومەر ئاغا و باڵەک و ناوپردان و قەڵادزێ و سۆران و چەند ناوچەیەکی دیکە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون[٥٥] بەپێچەوانەوە ئەمجارەیان هێزەکانی پێشمەرگە لە دەشتی هەولێر لە چەند لایەکەوە هێرشیان کردە سەر سوپای عێراق و توانییان بارەگا سەربازییەکانیان لە ناوچەی سماق شیرینی گەورە و بچووک بسووتێنن، لە ئاکامی ئەوەدا سوپای عێراقیش دوو هێرشی یەک لەدوای یەکیان کردە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە لەهەمان ناوچەدا، بەڵام لە هەردوو هێرشدا تووشی شکست هاتن، پاشان دوای دوو ڕۆژ سوپا بە نەخشەیەکی سەربازیی تازە هێرشی کردە سەر پێشمەرگە، نەخشە و پلانەکە لەچوار هێز پێکهاتبوون کە بەو شێوەیە بوو، هێزی یەکەم: لەناوچەی باوە قوب، هێزی دووەمیش لە گوندی گۆمەتاڵ، هێزی سێیەمیش سەرچیا و سەرچیا، هێزی چوارەم کە کۆتا هێز بوو کە هێزێکی گەورەی تر بوو زۆربەیان لەو کوردانە بوون کە لە شۆڕشی کوردستان جیاببوونەوە، ئەوانە لە دێگەڵە لەگوندی (عەلیاوە) بەگوندی (کانی بی)دا هاتن، دوای هاتنی هێزەکە شەڕ دەستی

پێکرد، پێشمەرگەی کوردستان توانییان هێرشەکانی سوپای عێراق لە هەموو بەرەکاندا تێکبشکێنن(٥٦).

دوای تێکشکانی هێرشەکانی سوپای عێراق بۆ سەر پێشمەرگە، ئەمجارەیان سوپای عێراق بەچەک و تفاقێکی زۆری سەربازی هێرشی کردە سەر ناوچەکانی هیران و نازەنین و توانی لە ٢ی حوزەیران داگیری بکات، بەوەش نەوەستا، بەڵکو دەستیکرد بە بۆردومانکردنێکی سەختی گوندەکان، پاشان لە ١٨ی حوزەیران ١٩٧٤ بە دواوە بەهۆی ئەو زوڵم و زۆردارییەی کە حکومەتی عێراق لە کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی دەکرد ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەی ئەو خێزانانەی دەهاتنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش ڕووی لە زیادبوون کرد، هەر بۆیە سەرکردایەتی سیاسی کورد لە باشووری کوردستان لیژنەیەکی بۆ وەرگرتنی ئەو خێزانانە پێکهێنا، دواتر مەکتەبی سیاسی پارتی بۆ ڕاییکردنی ئیش و کارەکانی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش بڕیاری دا دەزگایەکی بەڕێوەبردن (کارگێڕی) لە ناوچە ئازادکراوەکان دابمەزرێنێت، ئەو دەزگایە کارگێڕییە وەکو هەموو دامودەزگایەکی دەوڵەتی هەر لە ئەمینداریەتی و پارێزگارەوە تا دەگاتە سەر بەڕێوەبەرایەتییەکان و فەرمانبەر و مووچەخۆر بەناوی حکومەتی ئۆتۆنۆمی کوردستان لە ناوچە ڕزگارکراوەکان پێکهێنران، ئەو دەزگایە لە هەشت ئەمینداریەتی پێکهاتبوو، ئەوانیش بریتی بوون لە سەرۆکی ئەمینداریەتییەکان کە (حەبیب محەمەد کەریم) بوو، دوای ئەوە چەند ئەمینداریەتییەکی تریش دامەزران کە بریتی بوون لە ئەمینداریەتی ئەشغال و شارەوانی لەلایەن (نوری شاوەیس) و ئەمینداریەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن و لاوان لە لایەن (دارا تۆفیق) ، ئەمینداریەتی تەندروستی و کاروباری کۆمەڵایەتی لەلایەن (مەحمود عوسمان) ، ئەمینداریەتی ئەوقاف و داد لەلایەن (ساڵح یوسفی)، و ئەمینداریەتی پەروەردە لەلایەن (دکتۆر کەمال سەعید خەیات) و ئەمینداریەتی کاروباری پەنابەران لەلایەن (سەدیق ئەمین) بەڕێوە دەبردران، لەوانە دەزگای پاراستن و مەکتەبی سەربازی و ڕۆشنبیری و پەیوەندییەکانی

دەرەوە و سـەندیکا و ڕێکخـراوە پیشـەییەکان سـەربە مەکتەبـی سیاسـی بوون[٥٧].

دوا بەدوای ئەمە سـوپای عێـراق لە ١٩ حـوزەیرانی ١٩٧٤ هێرشـێکی بەرفراوانی بۆ سەر هەردوو ڕێگای نێوان (سپیلک – ڕەواندز) و (سپیلک – سـۆران) دەسـت پێکـرد، دوای ڕووبەڕووبـوونەوەیەکی زۆری هێـزی پێشـمەرگە، بەڵام بەهـۆی ناهاوتـابوون لە ژمـارەی سـەرباز و چەک هێـزی پێشـمەرگە پاشەکشـەیان کـرد و سـوپا داگیـری کـرد و لە ڕوانـدز نزیـک بـوونەوە، هەر بۆیە هێزی پێشمەرگەی کوردستان کە پێکهاتبوون لە هێزی دەشتی هەولێر و هێزی سەفین لەگەڵ هێزی بێتواتە لە دەوروبەری ڕەواندز هێڵێکی بەرگری تۆکمەیان لە شێوەی نیو بازنەیی دروست کرد تا بتوانن لەگەڵ هێزی پشدەر یەک بگرنەوە و پاشان بتوانن هەر لە قەڵادزێ تا دەگاتە دۆڵی بالیسان ڕێ لە هێرشەکانی سوپای عێراقدا بگرن و بەرگری لەناوچەی سەرکردایەتی شۆڕش بکەن کە ئەو کات لەناوچەی باڵەکایەتی بوو ، دوای ئەوە شـەڕ دەسـتی پێکرد، هێزی پێشـمەرگە توانییـان هێرشـە یەک لە دوای یەکەکـانی سـوپای عێـراق بـۆ سـەر ناوچەکـانی چیـای شیشـار و مـاکۆک تێکبشکێنن[٥٨].

سـەبارەت بە نەخشـە و پلانەکـانی سـوپای عێـراق بـۆ داگیرکردنـی ناوچەکـانی ژێـر دەسـەڵاتی پێشـمەرگە لە سـاڵانی (١٩٧٤-١٩٧٥) مەسـعود بارزانی دەڵێت پلانەکانی سوپای عێراق بەو شێوەیە بوو:

یەکەم : پێشـکەوتن لە دۆڵـی شـەهیدانەوە بـۆ نـاوچەی ناودەشـت و هەڕەشـەکردن لەنـاوچەی دیلمـان و قەسـرێ و دواجـار گەڵاڵە، ئەمەش بـۆ یارمەتیدانی ئەو هێزانە بوو کە لە پێشـەوە بۆ نـاوچەی گەڵاڵە دەچنە پێش، ئەگەر سەرکەوتن.

دووەم : پێشـڕەویکردن لە دۆڵـی سـەرکەپکانەوە لەگەڵ داگیرکردنـی چیـای کێـوەڕەش و مـاکۆک بـۆ داگیرکردنـی گەرووی کـارۆخ و هەنگاونـان بەرەو وەرتـێ و دەرگەڵە، دواتـر یەکگـرتنەوە لەگەڵ ئەو هێـزانەی کە لە نـاوچەی بەرزێوەوە بەرەو پردی حافیز دەڕۆن. ئامانجی دووەمیـان بریتـی

بوو لە بڕینی ڕێگاکانی هاتوچۆ و گەیاندن لەگەڵ دەشتەکانی هەولێرو کۆیە. دەبێ بزانین کە فشارو پاڵەپەستۆ و زیانەکانی سوپای عێراق لەو ناوچەیە کەمتر نەبوو لە پاڵەپەستۆی ناوچەی ڕەواندز، چونکە سوپای عێراق هەرچەندە توانی ئامانجی گرنگ بەدەست بێنێ، بەڵام ڕووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان هەموو ئامانجەکانی سوپای عێراقی تێکشکاند، هەروەها بەرگری پێشمەرگە و پشتیوانیکردنی تۆپخانە وایان لە سوپای عێراق کرد کە تاکتیک و پلانی خۆیان بگۆڕن و لەجیاتی ئەوەی ئامێرەکانیان لە سەربازگەیەک کۆبکەنەوە بۆ چەند شوێنێکی نادیار بڵاوەیان پێکرد[٥٩].

دوای ئەوە سوپای عێراق لە کۆتایی مانگی ئاب تا سەرەتای مانگی ئەیلولی ١٩٧٤ لە ڕێگەی فەوجی کۆماندۆ چەندین هێرشیان کردە سەر هێزەکانی پێشمەرگە، لە ئەنجامدا سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام لە هێرشەکانیان نەوەستان ئەمجارەیان هێرشیان کردە سەر سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە لە ڕێگای (هەولێر-ڕەواندز) و توانییان پێشڕەوی بکەن و گەیشتنە گەلی عەلی بەگ، دواتر سوپای عێراق هەوڵیدا لە ڕێگەی چیای کۆڕەکەوە بچێتە ناو قەزای ڕەواندز، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، هەر بۆیە دووبارە لە سەرەتای مانگی ئەیلولی ١٩٧٤ هێزەکانی عێراق بۆماوەی (١٧) ڕۆژ بەتۆپ و تانک و فڕۆکە بۆردومانی ناوچەکانی زۆزکیان کرد، ئینجا دوای نۆزدە ڕۆژ واتە لە ڕۆژی ٢٨/٢٧ی ئەیلولی ١٩٧٤ هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی زۆزک کە ئەو شەڕە بە شەڕی (١٩ ڕۆژە) ناسراوە، لە ئەنجامدا سوپای عێراق توانی شاخی زۆزک لە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧٤ داگیربکات، بەڵام لە بەرە بەیانی ٣٠ ئەیلولی ١٩٧٤ بەر لەوەی سوپای عێراق بتوانێ خۆی لەو ناوچەیە قایم بکا هێزی پێشمەرگە بە فەرماندەیی (مەسعود بارزانی) هێرشیان کردە سەر هێزەکانی عێراق و توانییان پاشەکشە بە هێزەکان بکەن لە ناوچەکەدا، بەڵام لە ٣ی تشرینی یەکەم ١٩٧٤ جارێکی تر سوپا هێرشیان کردەوە سەر ئەو ناوچەیە، ئەو جارەیان توانییان بە تەواوی زنجیرە شاخی زۆزک داگیربکەن، بەم هۆیەوە بارەگای (مستەفا بارزانی) گوازرایەوە بۆ حاجی ئۆمەران،

هەروەها لە ٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ سوپای عێراق هێرشێکی تریان بە سەرکردایەتی عەقید ڕوکن (حامد النعیمی) کردە سەر هێزی پێشمەرگە لە قەزای ڕەواندز، بەڵام بەهۆی بەرگرییەکی توندی هێزەکانی پێشمەرگە سوپای عێراق نەیتوانی ئامانجەکەی بێنێتەدی و لە شەڕەکەدا شکا[٦٠].

دوابەدوای ئەوە لە سەرەتای مانگی تشرینی دووەم تا ئاداری ١٩٧٥ حکومەتی عێراق هەوڵی زۆری دا شکست بە هێزی پێشمەرگە بهێنێت و ناوچەکانی ژێر هەژموونی پێشمەرگە داگیربکات، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، ئینجا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە بە زەبری هێزی سەربازی ناتوانێ کۆتایی بە شۆڕشی کوردستان بێنێ، لەهەمان کاتیشدا هیچ هیوایەکی بە سەرکەوتنی سوپاکەی بەرامبەر بە هێزی پێشمەرگەدا نەما، هەروەها ئامادەش نەبوو ملکەچ بکات بۆ ماف و خواستە نەتەوەییەکانی کورد، بۆیە بەناچاری لە ٦ی ئاداری ١٩٧٥ ڕێککەوتننامەی جەزائیری لەگەڵ وڵاتی ئێران مۆرکرد[٦١]. ئیتر لە ٢٠ی ئاداری ١٩٧٥ بە بڕیاری مستەفا بارزانی شەڕ لەنێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەی کوردستان ڕاگیرا[٦٢].

## تەوەری دووەم :
## هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت بەرامبەر شەڕی نێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەی کوردستان ١٩٧٤-١٩٧٥

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ یەکێتی سۆڤیەت هەوڵی زۆری دا تا شەڕ لە نێوان هێزی پێشمەرگەی کوردستان و سوپای عێراق ڕوونەدات، ئەمەش بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی لە ناوچەکەدا(٦٣). لەلایەکی تر یەکێتی سۆڤیەت دەیزانی کە پرسی کورد لە عێراق بە شەڕ چارەسەر نابێت، لەهەمان کاتدا هەستی کرد کە ڕژێمی فەرمانڕەوا لە عێراق بەنیازە ڕێککەوتننامەیەک کە لە دەقێکی کورت و سێ پرۆتۆکۆڵی تایبەت بە ڕێکەوتنی ئاسایش و سنووری ئاوی بەپێی هێڵی تالووک لەگەڵ ئێران مۆربکات بەرامبەر بەوەی ئێران هاوکارییەکانی بۆ شۆڕشی کورد ڕابگرێت و یارمەتی بدات بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکە، بەم شێوەیەش پێگە و نفووزی یەکێتی سۆڤیەت لە ناوچەکە دەکەوێتە مەترسی، لەهەمان کاتدا یەکێتی سۆڤیەت هەستی بەوەکرد ئەگەر هاوکاریی سەربازی و سیاسی حکومەتی عێراق بکات دژی شۆڕشی کورد، ئەوا دەکەوێتە بەر نارەزایی وڵاتانی جیهانی سێیەم(٦٤).

هەروەها بەر لە دەستپێکردنی شەڕیش سۆڤیەت بە بارزانییان ڕاگەیاندبوو کە ناتوانن پشتیوانییان بکەن، چونکە لەگەڵ عێراق پەیماننامەی هاریکاری و دۆستایەتییان مۆرکردووە، بۆیە پێویستە لەگەڵ عێراق ڕێکەون(٦٥). دوای ئەوە یەکێتی سۆڤیەت هەوڵەکانی خۆی چڕکردەوە لە پێناو بەرقەرارکردنی ئاشتی لە ناوچەکەدا، لەو میانەدا دوای ڕۆژێک لە ڕاگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی واتە لە ١٢ی ئاداری ١٩٧٤ داوایان لە سەدام حوسێنی جێگری سەرۆک کۆماری عێراق کرد سەردانی مۆسکۆ بکات، دوای ئەوەی ناوبراو سەردانی مۆسکۆی کرد لەگەڵ گەورە بەرپرسانی سۆڤیەت کۆبۆوە و باسیان لە پرسی کورد و یاسای ئۆتۆنۆمی و جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەی ئاسایش و سنووری ئاوی بەپێی هێڵی تالووک لەگەڵ ئێران لەپێناوی لەناوبردنی شۆڕشی کورد کرد، بەرپرسانی سۆڤیەت بە سەدام حوسێنیان

ڕاگەیاند شەڕکردن لەگەڵ کورد هیچ ئاکامێکی باشی نابێت و پرسی کوردیش لە عێراق بە شەڕ چارەسەر ناکرێت، بۆیە پێویستە پرسی کورد لە عێراق بە گفتوگۆو ئاشتی چارەسەر بکرێت، بەڵام ناوبراو هەر موکڕ بوو لەسەر لەناوبردنی شۆڕشی کورد و جێبەجێکردنی یاسای ئۆتۆنۆمی بەو شێوەیەی کە عێراق دەیویست، لەهەمان کاتدا سەدام حوسێن ڕایگەیاند کە دانیشتن و گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی کورد هیچ ئاکامێکی نابێ[٦٦].

شایانی باسە یەکێتی سۆڤیەتیش دەیویست بەرژەوەندییەکانی خۆی لە عێراق و ناوچەکەدا بپارێزێت، هەر بۆیە کاتێک شەڕ لە نێوان هێزی پێشمەرگەی کوردستان و سوپای عێراق دەستی پێکرد[٦٧]، هەر دوای هەفتەیەک لە سەردانەکەی سەدام حوسێن بۆ مۆسکۆ وەزیری بەرگری سۆڤیەت (جریتشیکو) و هەندێک لە ڕاوێژکار و پیسپۆڕانی سەربازی سەردانی بەغدایان کرد[٦٨]، ئەو سەردانەشیان بە مەبەستی ئامادەکردنی هێزەکانی عێراق بۆ هێرشکردنە سەر ناوچەکانی کوردستان بوو[٦٩]. لەلایەکی تر دوای دەستپێکردنی شەڕ لە نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق، یەکێتی سۆڤیەت دەستی بە هێرشێکی توندی ڕاگەیاندن کرد بۆ سەر سەرکردەکانی کورد و بە بەکرێگیراوی ئێران و ئەمریکا و ئیسرائیل و کۆنەپەرست ناوزەدی کردن[٧٠].

هەروەها بەهۆی ئەوەی کە پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە بەرەی نیشتمانی پێشکەوتنخواز و بەشداری حکومەتی عێراق بوو، بۆیە هاوکاریی سوپای عێراقی کرد و لە ڕیزی سوپای عێراق دژی هێزی پێشمەرگە دەجەنگان، ئیتر یەکێتی سۆڤیەت ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هاوکارییە سەربازییەکانی بۆ سوپای عێراق زیاد دەکرد، چەندین تانک لە جۆری (T٦٢) و فڕۆکەی پێشکەوتووی جۆری (توبولیف ٢٢) و چەندین چەک و تفاقی جۆراوجۆری تری پێشکەوتووی دا بە سوپای عێراق بۆ ئەوەی بتوانن لە شەڕەکانی دژ بەهێزی پێشمەرگە بەکاریان بهێنن و لە بەرەکانی شەڕ سەرکەوتوو بن ، سەرباری ناردنی زیاتر لە (٣٠٠) شارەزای سەربازی بۆ بەرەکانی شەڕ بۆ ئەوەی هاوکاریی هێزەکانی عێراق بکەن[٧١].

شایانی باسە هەموو ئەو هاوکارییانەی یەکێتی سۆڤیەت خزمەتێکی زۆری بە سوپای عێراق کرد و توانییان چەند ناوچەیەک لەژێر هەژموونی شۆڕشی کوردستان دەربهێنن و داگیری بکەن، بەتایبەتی هێرشی فڕۆکەکانی سۆڤیەت کە بەبێ گوێدانە کەسانی سڤیل، پێشمەرگەی بۆردومان دەکرد کە بەهۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لە منداڵ و ئافرەت و پێشمەرگە و کەسانی سڤیلی کردە ئامانج[٧٢].

دوابەدوای ئەوە لە ناوەڕاستی ١٩٧٤ یەکێتی سۆڤیەت زیاتر لە (٦٠) هەزار دەمامکی غازی بەسەر سوپای عێراقدا دابەش کرد، ئەمەش سەرکردەکانی کوردی تووشی دڵەڕاوکێ کرد لەوەی کە لەوانەیە سوپای عێراق چەکی کیمیاوی بەرامبەر بە هێزی پێشمەرگە و خەڵکی ناوچە ڕزگارکراوەکان بەکاربهێنێت، دواتریش شارەزایانی سەربازیی سۆڤیەت پێشنیازیان کرد بۆ سوپای عێراق کە نەخشە و پلانێکی سەربازیی تۆکمەیان بۆ دارشتوون تاوەکو بتوانن ڕێگای نێوان شاری سلێمانی و کەرکووک بکەنەوە و سوپا بتوانێت لەم ڕێگایەوە ئامانجەکانی بپێکێنێت و بەرگری و هێرشەکانی هێزی پێشمەرگە لە گۆڕەپانی جەنگ کەم بکاتەوە و هێزی پێشمەرگە پەرتوبڵاو بکات و ناوچەیەکی تری شەڕی بۆ زیاد بکات[٧٣]، دوای ئەوە فڕۆکە سەربازییەکانی عێراق لە کۆتایی مانگی نیسانی ١٩٧٤ بە یارمەتی پسپۆرانی یەکێتی سۆڤیەت بۆردومانی بنکە و بارەگاکانی هێزی پێشمەرگەیان کرد[٧٤]، ڕۆژی دواتر بۆردومانی ناوچەکانی ڕێگای سلێمانی و کەرکوک و ڕەواندز و حاجی ئۆمەرانیان کرد، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، هەر بۆیە ئەمجارەیان بە سەرپەرشتی پسپۆرێکی سەربازی بەناوی عەقید (ئەلکسندەر فاسلیف) و چەند پسپۆرێکی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات سوپای عێراق بە هاوکاری پارتی کۆمۆنیستی عێراق و بە چەکی قورس و تانک هێرشیان کردە سەر ڕەواندز، بەڵام بەهۆی بەرگریی بێ وێنەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە هێرشەکانیاندا سەرکەوتوو نەبوون، بەڵکو تووشی زەرەرو زیانێکی زۆریش هاتن[٧٥]. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە سوپای عێراق و هاوپەیمانەکانی بە زەبری هێزو چەکی پێشکەوتوو نەیانتوانی کۆتایی بە

شۆڕشی کورد لە باشووری کوردستان بهێنن، بەڵکو بەپێچەوانەوە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە هاوکاریی ئێران و ئەمریکا توانی سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنێت.

جێگای ئاماژەیە دوای ئەو شکستە یەک لەدوای یەکانەی کە سوپای عێراق لەسەر دەستی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دووچاری بوون، سەرکردەکانی یەکێتی سۆڤیەت بیریان لەوە کردەوە کە بارگرژی و خراپیی پەیوەندییەکانیان و ئەو هێرشە ڕاگەیاندنانە کە لەلایەن هەردوولاوە دەکرایە سەر یەکتری لە ڕێگەی ناردنی نامەیەک بۆ نوێنەری شۆڕشی کورد جەلال تاڵەبانی بنێرێت بۆ مستەفا بارزانی، ئەوە بوو بریماکۆف داوای لە جەلال تاڵەبانی کرد کە بە بارزانی ڕابگەیێنێت کە (( دەمانەوێت پەیوەندییەکانمان لەگەڵ شۆڕشی کوردستان ئاسایی بکەینەوە و شەڕی ڕاگەیاندنی کورد لە ڕێگەی ئێزگەی شۆڕشی کوردستان دژی مۆسکۆ بوەستێنرێت، چونکە ئێمە پێشتر دۆستی یەکتری بووینە و یەکێتی سۆڤیەت لە ڕابردوو و ئێستاشدا دژی شەڕی نێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەی کوردستان بووە، بەردەوام هەوڵی نێوەندگیری و سەقامگیریی ناوچەکەی داوە، لە هەمان کاتدا ئێمە هەوڵدەدەین پرسی کورد لە عێراق بە ئاشتی چارەسەر بکرێت، و داوا لە عێراقیش دەکەین کە بۆ چارەسەرکردنی پرسی کورد بە ڕێگەی ئاشتی بێنە پێش و گفتوگۆو دانوستان دەستپێبکاتەوە و شەڕ کۆتایی پێبێت و دەبێت کوردیش پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەمریکا و ئێران و هێزە ئیمپریالییەکان و ئیسرائیل بپچڕێنێت))[٧٦].

بەڵام بەهۆی سەرهەڵدانی بارگرژی و پێکدادان لە نێوان عێراق و ئێران لە ناوچەی بەدرە، ئەم نێوەندگیرییەی یەکێتی سۆڤیەت نەچووە بواری جێبەجێکردن، بەهۆی ئەو پێکدادانەی سوپای عێراق و ئێران، سەرباری ئەوەی لەوکاتەدا یەکێتی سۆڤیەت درکی بەوەکرد کە ئەگەر عێراق لاوازبێت و لە بەرەکانی شەڕ تووشی شکست بێت، ئەوا بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت دەکەوێتە مەترسی و بارودۆخەکە بە قازانجی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دەشکێتەوە ، بۆیە کاتێک سوپای عێراق لە چەند ناوچەیەکی کوردستان

تووشـی شکسـت هـات، داوای چەکـی پێشـکەوتوو بەتـایبەتی فـڕۆکەی (مێـک ٢٣)ی لە یەکێتـی سـۆڤیەت کـرد بـۆ ئەوەی ڕووبەڕووی هێـزی پێشـمەرگە ببێــتەوە، چــونکە هێــزی پێشــمەرگە لە نــاوچەیەکی ســەختی شــاخاوی ڕووبەڕووی ســوپای عێــراق دەبــوونەوە و چەکەکــانی عێــراق ئەوەنــدە کاریگەرییان لەسەر بەرەکانی شەڕ نەبوو، تاوەکو بتوانن کۆتایی بە شۆڕشی کوردستان بهێنن(٧٧).

بەم جۆرە هێرشـەکانی سوپای عێراق بۆ سـەر ناوچەکانی کوردسـتان زیـاتر بـوو، لە ئەنجامی ئەو هێرشـانە گوندەکانی سـەر بە پارێزگای هەولێر ڕووبەڕووی بۆردمـانی، تـۆپی دوورهـاوێژ و فڕۆکەکـانی لەجـۆری (توبولیـف ٢٢) بـوونەوە، سـەرەڕای ئەو تۆپبارانـانەش، سـوپای عێـراق تووشـی زەرەرو زیانی زۆر هات، بەڵام سوپا هەر بەردەوام بوو لە هێرشـەکانی و لە درێـژەی هەڵمەتەکانی بۆ سەر ناوچەکانی کوردسـتاندا سـوپای عێراق هێرشـێکی تـری کـردە سـەر ناوچەکـانی ڕەوانـدز و گەڵاڵە و چەنـد نـاوچەیەکی تـر، خەڵکـی کوردســتان بە چیـنە جیاوازەکـانەوە لەگەڵ هێـزی پێشـمەرگە ڕووبەڕووی سـوپای عێـراق بـوونەوە، دەکـرێ بڵێـین بە هـۆی بـوونی بەرەی نیشـتمانی پێشـکەوتنخوازی نێـوان حزبـی شـیوعی و حزبـی بەعـس و هاوهەڵوێسـتی شـیوعی لەگەڵ یەکێتـی سـۆڤیەت، بەشـێک لە ئەنـدام و لایەنگرانـی حزبـی شــیوعی بەشــدارییان لەم شــەڕانەدا کــرد و لە بەرەکــانی شەڕیشــدا هەماهەنگییـان لەگەڵ هێزەکانی عێراقدا کرد، هاوکات بەشداریکردنی حزبـی شیوعی لە بەرەی سوپای عێراق بە هێزی چەکداری و سیاسـی و کۆمەکی ڕاگەیانــدن پــێچەوانە بــوو لەگەڵ هەڵوێســتی بەشــێک لە ســەرکردەکانیان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد(٧٨).

دوابەدوای ئەوە تا دەهات یارمەتییەکانی ئێران و ئەمریکا بۆ شۆڕشـی کورد زیادیان دەکرد، بەشێوەیەک لە شـەش مـانگی یەکەمـی هەڵگیرسانەوەی شـەڕدا گۆڕانکـاریی زۆر هـاتەدی لەوانە وەرگرتنـی چەکـی قورسـی ئێرانـی و بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی پسپۆڕانی سـەربازیی ئێرانی لە بەرەکانی شـەڕ لەپــاڵ فەرمانــدەکانی هێــزی پێشــمەرگە دژی ســوپای عێــراق، بە ڕادەیەک

هاوکاریی ئێرانییەکان زیادیان کرد، هەندێ دەڵێن سەرکردایەتی شەڕەکانی کوردستانیان ناڕاستەوخۆ کەوتبووە دەست، لەولاشەوە سوپای عێراق سەرەڕای هاوکارییەکانی سۆڤیەت لە هێرشکردنەوە چووە حاڵەتی بەرگریکردن[٧٩]، هەر بۆیە سەدام حوسێن دوو داواکاری پێشکەش بە سۆڤیەت دەکات، یەکەم داوای قەرەبووکردنەوەی ئەو چەک و تەقەمەنییانە دەکات کە بەهۆی شەڕیان لەگەڵ شۆڕشی کورد لەناوچوونە و داوا دەکەن لەبری ئەوە چەکی پێشکەوتووی تریان پێبدات، داواکاریی دووەمیش بریتی بوو لە هێنانی هێزی سۆڤیەت بۆ سەر سنووری ئێران بۆئەوەی شای ئێران ناچار بکات کە هاوکارییەکانی لە شۆڕشی کورد ببڕێت[٨٠].

شایانی باسە سۆڤیەت یەکەم داواکاری جێبەجێکرد، بەڵام تێبینی لەسەر داواکاری دووەم هەبوو، بۆیە هەوڵی دا لە ڕێگەی گفتوگۆ کێشەی نێوان عێراق و ئێران چارەسەر بکات، بۆ ئەو مەبەستەش محەمەد ڕەزا شای ئێرانیان داوەت کرد بۆ مۆسکۆ، دوای چەند ڕۆژێک شای ئێران گەیشتە مۆسکۆ، گفتوگۆیان لەسەر کێشەی نێوان عێراق و ئێران کرد، لەو گفتوگۆیانەدا دەسەڵاتدارانی مۆسکۆ داوایان لە ئێران کرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سنوور لەگەڵ عێراق بگەڕێنەوە بۆ ڕێکەوتننامەی سەعد ئابادی ساڵی ١٩٣٧[٨١]، بەڵام شای ئێران ئەمەی ڕەتکردەوە و گوتی ((ئەم ڕێکەوتننامەیە لەلایەن بەریتانیاوە سەپێندرابوو بەسەر ئێران ئێمە ڕازی نابین، بەڵکو دەبێت ڕێکەوتننامەیەکی تر ئیمزا بکەین))[٨٢].

دوای ئەوە گفتوگۆی ڕاستەوخۆ بۆ ناوبژیوانی عێراق و ئێران لەمانگی ئابی ١٩٧٤ دەستی پێکرد، نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت، بە بەشداری وڵاتانی عەرەبی دەستپێشخەری ناوبژیوانی بوون بۆ کۆتاییهێنان بەو بارگرژی و ناکۆکییانەی کە لە نێوان عێراق و ئێراندا هەبوو، هەر بۆیە  لەسەر بڕیاری ژمارە (٣٤٨)ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی نوێنەری عێراق و ئێران بە سەرۆکایەتی سەعدون حەمادی وەزیری دەرەوەی عێراق و عەلی خەلعەتبەری وەزیری دەرەوەی ئێران لە ڕۆژانی ١٢-١٨ی ئابی ١٩٧٤ لە ئەستەمبۆڵ بەردەوام بوو، دواتر لە تشرینی یەکەم

لە نیویۆرک کۆبوونەوە، لەوێ ڕێکەوتن کە درێژە بە کۆبوونەوەکانیان بدەن، لە گەرمەی شەڕەکانی نێوان شۆڕشی کورد و سوپای عێراق لە تشرینی دووەمی ١٩٧٤ محەمەد ڕەزا شای ئێران سەردانی مۆسکۆی کرد و لەو کۆبوونەوەدا باسیان لە چارەسەرکردنی کێشەی نێوان عێراق و ئێران بە ڕێگەی ئاشتی کرد، سەرباری ئەمانە سەدام حوسێن ئامادە نەبوو لەگەڵ شای ئێران ڕێکبکەوێ، چونکە وایدەزانی بەیارمەتی و پشتیوانی سۆڤیەت بەسەر شۆڕشی کورد سەردەکەوێت، بەڵام دوای شکستە یەک لە دوای یەکەکانی سوپای عێراق و کەمبوونەوەی توانای بەرگری سوپای عێراق بەرامبەر هێزەکانی پێشمەرگە، هەروەها هەوڵەکانی ئەمریکا و سۆڤیەت و وڵاتانی دراوسێ و تری عەرەبی لە ٤ی ئاداری ١٩٧٥ سەدام حوسێن و محەمەد ڕەزا شا لە جەزائیر کۆبوونەوە[٨٣]، لە ئەنجامدا بڕیاردرا ڕێکەوتننامەیەک مۆر بکەن بۆ کۆتاییهێنان بە کێشەی نێوانیان، ئەوە بوو لە ٦ی ئاداری ١٩٧٥ بە ئامادەبوونی سەرۆکی جەزائیر (هەواری بومیدیان) ڕێکەوتننامەی جەزائیر لە نێوان عێراق و ئێران مۆرکرا[٨٤].

## تەوەری سێیەم :
## هەڵوێستی ئەمریکا بەرامبەر شەڕی نێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەی کوردستان ١٩٧٤-١٩٧٥

هەڵوێستی ئەمریکا بەرامبەر شەڕی ١٩٧٤-١٩٧٥ نێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگە، هەڵوێستێکی نادیار بوو، چونکە لەلایەک بە نهێنی لە ڕێگەی ئێران هاوکاری پێشکەش بە کورد دەکرد، لەهەمان کاتیشدا هەوڵی دەدا پێگەی سۆڤیەت لە عێراق کەم بکاتەوە،و پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکومەتی عێراق ئاسایی بکاتەوە، لەو ڕوانگەوە چەندین هەوڵی دا، سەرباری ئەوەش دوای دەستپێکردنی شەڕ لە نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق، مستەفا بارزانی هەموو کارەکانی خۆی بەو پشتیوانییەوە گرێدابوو کە ئێران و ئەمریکا بەڵێنیان پێدابوو، چونکە بەر لە دەستپێکردنی شەڕ بە ئەمریکییەکانی گوتبوو ((ئەگەر ئێوە چەکی وامان بدەنێ هاوتای چەکەکانی عێراق بێت ئێمە شەڕ دەکەین، دەنا ئاشتی دەکەین و نامانەوێت ڕەشەکوژی بکرێت))[٨٥]، ئەمریکا و ئێرانیش بەهۆی ئەوەی کە پەیوەندییان لەگەڵ عێراق باش نەبوو هاوکاری شۆڕشی کوردیان دەکرد[٨٦].

دوای ئاڵۆزبوونی پەیوەندیی نێوان شۆڕشی کورد و حکومەتی عێراق لەسەر یاسای ئۆتۆنۆمی لە مانگی نیسانی ١٩٧٤ شەڕ دەستی پێکرد، سوپای عێراق بەپاڵپشتیی پارتی شیوعی عێراق و بەهاوکاری سەربازی و ڕاگەیاندنی یەکێتی سۆڤیەت سوپای عێراق هێرشی بەرفراوانی کردە سەر ناوچەکانی کوردستان، لەئەنجامدا چەندین گوندو شاری کوردستان ڕووبەڕووی ئەم هێرشانە بوونەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە سوپای عێراق بە تۆپی دوورهاوێژ و فڕۆکەکانی لە جۆری (توبولیف ٢٢) بۆردمانی گوندو شارەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی کوردی دەکرد، بەڵام هێزەکانی پێشمەرگە توانییان زەرەرو زیانێکی زۆر بە سوپای عێراق بگەیەنن[٨٧].

سەرەڕای ئەوەی هێزی پێشمەرگە توانییان ڕووبەڕووی سوپای عێراق ببنەوە ، بەڵام تا دەهات شەڕەکان فراوانتر دەبوون، لە سەرەتای ئایاری ١٩٧٤ تاکو سەرەتای حوزەیرانی ١٩٧٤ هێرشەکانی سوپای عێراق

بەهاوکاریی پسپۆرانی سەربازی و فرۆکەکانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ سەر گوندەکانی دەشتی (هەولێرو سەفین و چیای زۆزک و ڕەواندز و گەلاڵە و زاخۆ) و هەندێک ناوچەی ئازادکراوی کوردستان لەوانە ڕێگای نێوان (کەرکوک – سلێمانی) فراوانتر بوو، لە ئەنجامی ئەو هێرشەی سوپای عێراق توانرا چیای زۆزک و زاخۆ داگیربکەن[٨٨]، ئەمەش بە هۆی ئەوەوە بوو کە هاوکارییە سەربازییەکانی یەکێتی سۆڤیەت تا ئاستێکی زۆر زیادی کرد، لەهەمان کاتدا ئەو کۆمەک و یارمەتییانەی کە لەلایەن ئەمریکا پێشکەش بە شۆڕشی کورد دەکرا ڕوویان لە کەمی کرد، سەرباری ئەوەی ئەو شتانەی لە سنووری ئێران دەهاتن بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ و بەبڕی کەم دەگەیشتن، بۆیە نوێنەرانی شۆڕشی کورد لە واشنتۆن، کاربەدەستانی باڵای ئەمریکایان لە پەلەکردنی یارمەتی و کۆمەک بۆ شۆڕشی کورد ئاگاداركردەوە[٨٩].

دوابەدوای زیادبوونی هاوکاری و یارمەتییە سەربازییەکانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ سوپای عێراق و فراوانبوونی شەڕەکان، مستەفا بارزانی وەک نوێنەری شۆڕشی کوردستان هەریەکە لە (سامی عەبدولڕەحمان و موحسین دزەیی و شەفیق قەزاز)ی نارد بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەوەبوو داوایان لە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کرد دیداریان لەگەڵدا بکەن، بەڵام وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئەو داواکارییەی ڕەتکردەوە، لەو کاتەدا (لی هاملتون) سەرۆکی کومیسیۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا و ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا ڕۆژی ١٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٤ لە نامەیەکدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەی داوای کرد جێگری وەزیر (سیسکۆ) یاخود یارمەتیدەری وەزیر (ئەسێرتۆن) لەگەڵ نوێنەرە پایە بەرزەکانی شۆڕشی کورد دیدار بکەن، لە بەرامبەردا (لینۆد هاڵتۆن) یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە بۆ پەیوەندییەکانی کۆنگرێس وەڵامی دایەوە کەوا هەڵوێستی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئەوەیە کێشەی کورد پێش هەموو شتێک کێشەیەکی ناوخۆیی عێراقە و وەزارەتی دەرەوە نایەوێت کوردەکان بگەنە ئەو بڕوایەی کە ئەمریکا ئامادەیە بە ئاشکراو بە نهێنی پشتیوانی لە شۆڕشەکەیان دژی عێراق بکات، هەر بۆیە نایەوێ لەگەڵ ئەو نوێنەرانە دیدار بکات[٩٠].

له بەڵگەنامەکـانی وەزارەتــی دەرەوەی ئەمریکــادا هــاتووە کە ئەمریکـا لەکاتی گفتوگۆی زۆرتر لەگەڵ نوێنەرانی بارزانی ((دەبیٚ چاوەڕوانییەکانیـان له ئاستی واقیعیدا پەسند بکەین و ئەوەندە یارمەتییان بدەین کە دواتر بتوانین حاشـای لیٚ بکەیـن و لە هەمـان کاتـدا وایـان لـیٚ بکەیـن کە هـیچ کـردەوەیەک ئەنجـام نەدەن ببێتە مـایەی بەربەرەکـانی نێو نەتەوەیـی، هەروەهـا چۆنیەتی دابینکردنی پشتیوانیی سەربازی و ماددی بۆ شۆڕشـی کوردسـتان لە عێراق بەوە گرێدراوە کە ئێمە چەندە دەمانەوێت ئەم یارمەتییە نهێنی بێت و چەندە دەمانەوێت کوردەکان لە ڕووی سـەربازییەوە بە توانـابن و دەمانەوێت بە چ ئامانجگەلێـک بگەیــن، بەپــێچەوانەوە دابینکردنــی چەک و تەقەمەنــی، ئــێمە دەتــوانین ڕاســتەوخۆ و ناڕاســتەوخۆ بە کەمتــرین گرفــت لە ڕووی نهێنــی پارێزییەوە یارمەتی ماددی کوردەکان بدەین، هەروەها لە قازانجی ئێمەیە کە لەسـەر بنەمـای کـۆمەڵیٚ هۆکـاری ئەمنـی لەلایەک و بەهێزکردنـی بەشـداری ئێران لەلایەکی تر، سـەرەڕای ئەوەش دەتوانین هاوکاریی مـاددیی زیـاتریش بدەین بە ئێران بۆئەوەی ڕۆڵی زیاتر بگێڕێت لە شەڕدا، هەروەها بۆ ئەمریکا قـازانجە کە ڕاســتەوخۆ بڕێـک پـارە بە خـودی کوردەکـان بـدات بـۆئەوەی دەسەڵاتمان بەسەریانەوە هەبێت و لەلایەن خۆمانەوە کۆنترۆڵیان بکەین و لە ڕووی هەواڵییەوە بیـانخەینە خزمەتـی ئەمریکـاوە، سـەرباری ئەوەی کە ئـێمە پێشتر بە سەرکردەکانی کوردمان وتووە ئێمە دەتوانین میکانیزمی یارمەتی و هاوکارییەکانمـان بـۆ کـورد دەبـیٚ لەلایەن لایەنـی سـێیەمەوە پێشـکەش بە کوردەکان بکرێت، ئێران بەهـۆی هەڵکەوتەی جوگرافیـاوە دەتوانێت ببێت بە نێوەندگیر بۆ گەیاندنی چەک و هاوکارییەکان بە کورد )). لەلایەکی دیکە (لی هــاملتۆن ) لە دانیشــتنی ١١ی تەمــوزی ١٩٧٤ دەڵێــت "بەڕێــز ســـەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران، ئەوەی لەم ڕۆژانەی دواییدا لە ڕۆژنامەکاندا سـەرنجی پێدراوە شـەڕێکی دیـکە لە ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا دەسـتی پێکـردووە، ئەم شەڕەش لەنێوان هێزە کوردییەکان و لایەنگرانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەلایەک و هێزەکانی سوپای عێراق لەلایەکی دیکە. ئەم شـەڕە لەسـەر ئەوەیە کە کوردەکـان لە عێـراق داوای جۆرێـک لە ئۆتۆنـۆمی نـاوچەیی دەکەن لەنـاو

دەوڵەتی عێراقدا، هەرچەندە ئەم شەڕە تازە نییە، بەڵکو ماوەی زیاتر لە (١٣) ساڵە پەیتا پەیتا بەردەوام بووە، لەم دواییانەدا داوام لە وەزارەتی دەرەوە کرد کە پێشوازی لە نوێنەرانی شۆڕشی کورد بکەن تا سەبارەت بەم شەڕەو کاریگەرییەکانی لەسەر ئاشتی و سەقامگیری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست قسەو باس بکەین. بێ ئەوەی بیروڕای خۆمان سەبارەت بە شایانبوونی پرسی کورد و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەم شەڕانەدا و کێشە ناوخۆیی و بنەڕەتییەکانی دیکەی عێراق دەرببڕین، پێویستە ئەمریکا بیروڕای نوێنەرانی کورد بەهەند وەربگرێت و بەشێوەیەکی نا فەرمی لەگەڵیان دابنیشین، بەڵام داواکەم لەلایەن وەزارەتی دەرەوە ڕەتکرایەوە، هەرچەندە من لەو بڕوایەم کە نابێت هیچ جۆرە یارمەتییەکی نهێنی و ئاشکرا بە کوردە ڕاپەڕیوەکان بدرێت، بەڵام پێویست بوو بەشێوەیەکی نا فەرمی لەگەڵیان دابنیشین تاوەکو ئاگاداری ڕەوشی شەڕەکە بین" (٩١).

دوای ئەوە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا وەڵامی داواکەی (لی هاملتۆن)ی دایەوە، و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ((ئەمریکا لەگەڵ ئەوەی هاوسۆزی خۆی بۆ کوردەکان دەردەبڕێت، بەڵام کێشەکەیان کێشەیەکی ناوخۆیی عێراقە و ئەوان نایانەوێت کوردەکان باوەڕ بەوە بکەن کە ئەمریکا بە شێوەیەکی نهێنی یاخود بە ئاشکرا پشتگیری شۆڕشەکەیان دەکات، کەوا بوو ئێمە هەموو هەلێک دەدەین بە نوێنەرانی کورد تا باسی کێشەی خۆیان بکەن، بەڵام نەک لەو ڕوانگەیە کە ئێمە پشتیوانی لە کێشەکەیان دەکەین، پێویستە ئەوەش بزانین ئەگەر ئێمە سیاسەتی پێشوومان لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان بگۆڕین و دیدار لەگەڵ نوێنەرەکانیان ساز بکەین، بێگومان ئەمە سەرنجی دەوڵەتی عێراق و وڵاتانی عەرەبی ڕادەکێشێت و لەوانەیە وەک دەستتێوەردان لەکاروباری ناوخۆی عێراق شرۆڤە بکرێت و زەرەری زیاتر لە پەیوەندیی نێوان ئەمریکا و عێراق بدات. هەر چەشنە یارمەتییەک کە ئەمریکا بیدات بە کوردەکان لە خەباتیاندا بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی لە عێراق دژی دەوڵەتێکی عەرەبی وەک عێراق، لەوانەیە ببێتە جێگای گومان و تێڕامانی جیهانی عەرەبی لە نیەتەکانی ئەمریکا

لە ناوچەکەدا، هەر بۆیە وا باشە ئەمریکا ئەم دیدارە ساز نەکات، چونکە خزمەت بە ئامانجەکانی ئەمریکا ناکات، هەرچەندە ئەمە بە واتای ئەوە نایەت کە ئێمە لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتی عێراق بەرامبەر بە گەلی کورد کۆکین، یاخود لە بایەخی ئامانجە نەتەوەییەکانی خەڵکی کوردستان کەم بکەینەوە ، بەڵکو هەڵوێستی ئێمە لە بنەڕەتدا ئەوەیە کە بێ لایەن بین و لە هەر ناکۆکییەکی ناوخۆیی عێراق کە هەست دەکەین بوونی هەیە خۆمان بە دوور بگرین، بەڵام خۆشحاڵ دەبین دیدارەکە لەکاتێکی تر بێت))[٩٢]. لێرەدا سیاسەتی دووفاقیی ئەمریکامان بۆ دەردەکەوێت.

سەرباری ئەوەی کە ئەمریکا پێشوازی لە نوێنەرانی کورد نەکرد، بەڵام بە نهێنی و لە ڕێگەی ئێران یارمەتییەکی کەمی کوردی دەدا، کە بڕی هاوکارییەکانی ئەمریکا لە (١٩٧٢ – ١٩٧٥) بۆ شۆڕشی کوردستان لە (١٦) ملیۆن دۆلار تێپەڕی نەکرد، کە زۆربەی ئەو پارەش بۆ کڕینی ئەو چەکە سۆڤیەتییانە بوو کە ئیسرائیل لە جەنگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧دا لە بەرامبەر سوپای عەرەب دەستی کەوتبوو[٩٣].

شایانی باسە عێراق ئەو هەڵوێستەی ئەمریکا کە بریتی بوو لە پێشوازی نەکردن لە نوێنەرانی کورد بووە مایەی خۆشحاڵیی حکومەتی عێراق، هەروەک یەکێک لە کاربەدەستانی ئەمریکا لە وەزارەتی دەرەوە بەناوی خاتوو (Bakr) ڕایگەیاندووە کە دەوڵەتی عێراق خۆشحاڵ بووە بەو هەنگاوەی ئەمریکا بەرامبەر کورد، هەرچەندە عێراق بە چاوی گومانەوە سەیری هەڵوێستی ئەمریکای سەبارەت بە کورد و کێشەی عەرەب و ئیسرائیل دەکرد، لەهەمان کاتدا خاتوو (Bakr) دەڵێت "دەوڵەتی عێراق هەست دەکات کە ئەمریکا دەتوانێت لە ڕێگای گوشار خستنە سەر وڵاتی ئێران بۆ ئەوەی چیتر یارمەتی کوردەکانی عێراق دژ بە سوپای عێراق نەدات، لەهەمان کاتدا دەڵێت "پرسی کورد لە عێراق پرسێکی ناوخۆییە و ئەمریکا هیوادارە عێراق بتوانێت بە شێوەیەکی دبلۆماسی و ئاشتییانە چارەسەری بکات"، سەرباری ئەوەش کیسنجەر کە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو ئەوپەڕی هەوڵ و تواناکانی خۆی خستبووە گەڕ لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە ناوچەکەدا[٩٤].

سەرەڕای هەموو ئەمانەش تا دەهات ڕۆڵی سەربازی و ماددیی ئێران بۆ شۆڕشی کوردستان زیادیان دەکرد، بەشێوەیەک لە سەرەتای هەڵگیرسانەوەی شەڕدا تا تەموزی ١٩٧٤ گۆڕانکارییەکی بەرچاو لە گۆڕەپانەکانی جەنگ هاتە کایەوە و سەرکەوتنەکانی هێزی پێشمەرگە، بەهۆی وەرگرتنی چەکی قورسی ئێرانی و بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی پسپۆڕانی سەربازی ئێرانی لە بەرەکانی شەڕ لەپاڵ فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دژی سوپای عێراق ، سوپای عێراقی لە حاڵەتی هێرشکردن خستە حاڵەتی بەرگریکردن[٩٥].

دوای ئەوە عێراق داوای هاوکاری سەربازیی زیاتری لە یەکێتی سۆڤیەت کرد، یەکێتی سۆڤیەتیش هاوکارییە سەربازییەکانی بۆ سوپای عێراق دژی شۆڕشی کوردستان زیاد کرد، لەو کاتەدا کوردەکان داوای هاوکارییان لە ئەمریکا کرد، بەڵام ئەمریکا یارمەتییەکانی زیاد نەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە کەمیان کرد، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەمریکا خوازیاری سەرکەوتنی کوردەکان نەبووە، بەڵکو تەنها مەبەستی کەمکردنەوەی هەژموون و ڕۆڵ و دەسەڵاتی یەکێتی سۆڤیەت بوو لە ناوچەکەدا[٩٦]. دوا بەدوای ئەمە لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٧٤ نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پەیامێکیان بە ناوی (هەوڵی کوردە ناسیۆنالیستەکان بۆ پشتیوانی ئەمریکا لە پرسی کورد لە نەتەوە یەکگرتووەکان) بە وەزارەتی دەرەوە ڕاگەیاند کە سێ کاربەدەستی کورد ڕۆژی ١٩ی حوزەیرانی ١٩٧٤ سەردانی نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکایان لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد بۆ ئەوەی چالاکیەکانیان لە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەمریکا شی بکەنەوە و پشتیوانیی ئەمریکا بەدەست بهێنن، بەڵام نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا پێیان ڕاگەیاند کە ئەمریکا ناتوانێت خۆی بخاتە ناو کێشەی کوردەکان لە عێراق، بەڵام ئەمریکا هاوخەمی بارودۆخی کوردەکانە لە عێراق، لەو کاتەدا ئەمریکا بە دوای چەسپاندنی ئاشتیدا دەگەڕێت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بە تایبەتی کێشەی عەرەب و ئیسرائیل، ئەمریکا ناتوانێت شتێک بخاتە ڕوو کە دەوڵەتی عێراق

هـان بدات، چونکە عێراق دەتوانێ ڕەوتی ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تێکبدات[٩٧]. ئیتر لێرە بە دواوە ئەمریکا ستراتیجیەتی خۆی لە ناوچەکەدا گۆڕی، و لە ڕێکەوتی ١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ هینری کیسنجەر لەگەڵ تالیب شەبیب نوێنەری عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان کۆبۆوە و باسیان لە ئاساییکردنەوەی پەیوەندیی نێوان عێراق و ئەمریکا کرد[٩٨] دوای ئەوەش سەدام حوسێن دەستی کرد بە بەهێزکردنی پەیوەندیی عێراق لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە پەیوەندییان لەگەڵ ئەمریکا بەهێز بوو لەوانە سعودیە و میسر و ئوردن[٩٩] لەو کاتەشدا ناوچەکانی کوردستان کەوتبوونە ژێر بۆردومانی هێزە سەربازییەکانی عێراق بە هاوکاری یەکێتی سۆڤیەت، بەڵام ئەمریکا هیچ هەڵوێستێکی کرداری نەنواند و کیسنجەریش نەگەڕایەوە سەر ئەو شەترەنجە کوردییەی کە گەمە سیاسییە نهێنییەکەی خۆی لێوە دەستپێکردبوو[١٠٠]. لێرە بە دواوە پەیوەندیی نێوان کورد و ئەمریکا بەرەو لاوازی چوو، ئەمریکا پشت لە شۆڕشی کورد دەکات و هەوڵی نێوەنگیری دەدات لە نێوان عێراق و ئێران تاوەکو بگەنە ڕێکەوتن بۆ ئەوەی لەو وێستگەیەوە بەرژەوەندییەکانی خۆی لە عێراق بە دەست بهێنێتەوە، لەو پێناوەدا چەندین هەنگاو هاوێژرا، یەکێک لەمانە ١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ بوو کە لە نیویۆرک نوێنەرانی عێراق و ئێران چاویان بەیەکتری کەوت و گفتوگۆیان لەسەر چارەسەرکردنی کێشەی نێوانیان کرد[١٠١]. دواتر هەر یەک لە یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا و وڵاتانی عەرەب و هەرێمی هەوڵەکانیان چڕ کردەوە بۆ ئەوەی عێراق و ئێران بگەنە ڕێکەوتن، یەکێک لەو هەوڵانە بریتی بوو لە لێک نزیککردنەوەی هەردوولا لە میانی کۆنگرەی لووتکەی عەرەبی ڕیبات لە ٢٦ی تشرینی دووەم ١٩٧٤ بوو کە تیایدا سەدام حوسێن کێشەی عێراقی لەگەڵ ئێران بۆ وڵاتانی عەرەبی ڕوون کردەوە، ئەوانیش ئەرکی نێوەنگیرییان سپارد بە شا حوسێن پادشای ئوردن، بەڵام دواتر میسر توانی ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرێت[١٠٢].

لەو کاتەدا بارودۆخی سیاسی و سەربازی کوردستان بەرەو خراپبوون دەچێت، ئینجا دوای ئاگاداربوونی زیاتری بارودۆخەکە مستەفا بارزانی لە ٢٢ی شوباتی ١٩٧٥ نامەیەکی بۆ هینری کیسنجەر نارد، دوای شیکردنەوەی

بارودۆخی سیاسی و سەربازی ناوچەکەی لەو نامەیەدا، بارزانی داوای لە کیسنجەر کرد لە نزیکەوە چاوی پێبکەوێت یان نوێنەر بنێرێت بۆ واشنتۆن بۆ داواکردنی پشتگیریی ئەمریکا، بەڵام کیسنجەر لە وەڵامدا لە ڕێگەی نامەیەکدا بۆ بارزانی، پاش دەربڕینی هاوسۆزی خۆی بۆ پشتگیریی کورد و پێشوازی لە نوێنەری بارزانی بۆ واشنتۆن، لە هەمان کاتدا داوای لە بارزانی کرد دۆخەکە بەنهێنی بهێڵێتەوە و دوودڵیی خۆی نیشان دا لەمەڕ هەر جۆرە چاوپێکەوتنێک لەو کاتەدا[١٠٣]. ئەمە ئەوە دەردەخات کە کیسنجەر لە هەوڵی لەباربردنی شۆڕشی کورد بووە، بۆیە نەیویست چاوی بە سەرکردایەتی سیاسی کورد بکەوێت، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوە بوو کە لە کۆتایی شوباتی ١٩٧٥ کیسنجەر سەردانێکی نهێنی بۆ شاری بەغدا دەکات، لەو سەردانەیدا لەگەڵ ژمارەیەک لە سەرکردەکانی پارتی بەعس کۆبووبوویەوەو لەبارەی ڕێکەوتنی عێراق و ئێران وتوتوێژیان کردبوو، هەروەها لەم کاتەدا ئەمریکا دەیویست پەرەیەکی نوێ لەگەڵ حکومەتی عێراق هەڵداتەوە و هەر لەمانگی شوباتدا ڕێکەوتنێکی لەگەڵ عێراقدا واژوو کرد کە بەهاکەی (٢٢٥) ملیۆن دۆلار بوو ، ئەمەش بۆ فرۆشتنی فڕۆکەی جۆری (بۆینگ) بە حکومەتی عێراقی[١٠٤]. ئیتر دوای هەوڵە نێو دەوڵەتییەکانی لە ٦ی ئاداری ١٩٧٥دا عێراق و ئێران ڕێکەوتننامەی جەزائیریان مۆرکرد و کۆتاییان بە شۆڕشی کورد هێنا لە عێراق[١٠٥].

## ئەنجام :

لە ڕێگای ئەم تویژینەوەیە گەیشتینە چەند ئەنجامێک کە لەم خاڵانەی خوارەوە ئاماژەیان پێدەکەین:

١- پەیوەندیی نێوان عێراق و ئەمریکا بەر لە شەڕی نێوان هێزی پێشمەرگەی کوردستان و سوپای عێراق ١٩٧٤ باش نەبوو ، ئەمەش لەلایەک بەهۆی شەڕی نێوان عەرەب و ئیسرائیل ١٩٧٣ و بەشداریکردنی عێراق لەم شەڕەدا، لەلایەکی دیکەش بەهۆی زیادبوونی هەژموونی سۆڤیەت لە ناوچەکە و بەستنی پەیماننامەی دۆستایەتی و هاریکاریی نێوان عێراق و سۆڤیەت پەیوەندیەکە تێکچوو.

٢- پەیوەندیی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و عێراق لە دوای بەستنی پەیماننامەی دۆستایەتی و هاریکاریی نێوانیان باش بوو، لە شەڕی نێوان شۆڕشی کورد و سوپای عێراق هاوکارییەکی زۆری سەربازی پێشکەش بە عێراق کرد ، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەشداری شەڕی دەکرد.

٣- سەرەڕای بوونی هاوکاریی سەربازی و ڕاگەیاندن لەلایەن سۆڤیەتەوە بۆ سوپای عێراق، بەڵام سوپای عێراق نەیتوانی بە زەبری هێز کۆتایی بە شۆڕشی کورد بهێنێت.

٤- هەر یەک لە ئەمریکا و ئێران و ئیسرائیل لە شەڕی نێوان سوپای عێراق و شۆڕشی کورد هاوکارو پشتیوانیی ناڕاستەوخۆی شۆڕشی کوردیان کرد.

٥- هەڵوێستی سۆڤیەت لە شەڕی نێوان عێراق و شۆڕشی کورد بەرامبەر کورد نەرێنی بوو، بەڵکو دژی کورد هاوکاری سوپای عێراقی دەکرد.

٦- بەهۆی ئەوەی ئێران کێشەی لەگەڵ عێراق هەبوو، لەلایەکی دیکەش لەلایەن ئەمریکاوە داوای لێکرابوو هاوکاریی شۆڕشی کورد بکات دژی ئەو یارمەتییانەی کە سۆڤیەت بە سوپای عێراقی دەدا، بۆیە دەبینین لە شەش مانگی یەکەمی شەڕدا کە ئێران چەک و تفاقێکی زۆر دەدا بە شۆڕشی کوردو هاوکاری شۆڕشی کورد و هاوکاری زۆری شۆڕشی کورد دەکات،

شکستە یەک لەدوای یەکەکانی سوپای عێراق لەبەرەکانی شەڕ و نەرمی نواندنی حکومەتی عێراق بۆ ئێران و هەوڵە نێودەوڵەتییەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان عێراق و ئێران، دەردەکەوێت کە لە دوای شەش مانگی یەکەمی شەڕ هاوکارییەکانی بۆ شۆڕشی کورد کەم دەکاتەوەو دواجاریش پشت لە شۆڕشی کورد دەکات و ڕێکەوتننامەی جەزائیر لەگەڵ عێراق مۆر دەکات و بە هاوکاریی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی عەرەبی کۆتایی بە شۆڕشی کورد دەهێنێت.

٧- ئەمریکا لە شەش مانگی یەکەمی شەڕ هەڵوێستی بەرامبەر شۆڕشی کورد باش بوو، چونکە پەیوەندیی لەگەڵ عێراق باش نەبوو ، ئەمەش بە هۆی ڕێکەوتنی نێوان عێراق و یەکێتی سۆڤیەت و زۆربوونی هەژموونی سۆڤیەت لە عێراق و بەشداریکردنی عێراق لە شەری عەرەب و ئیسرائیل، بەڵام لە شەش مانگی کۆتایی شەڕی نێوان کورد و عێراق، ئەمریکا هاوکارییەکانی بۆ کورد کەم کردەوە، بەڵکو لە ناوبژیوانیدا بوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان عێراق و ئێران بۆ ئەوەی هەژموونی خۆی بگەڕێنێتەوە بۆ ناوچەکە، لە کۆتاییدا کیسنجەر وەزیری دەرەوەی ئەمریکا پشتی لە شۆڕشی کورد کرد و ڕێکەوتننامەی لەگەڵ عێراق مۆرکرد.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

(1) وكالة نوفوستي، الاتحاد السوفيتي والشرق الاوسط مشاكل السلام والامن ١٩٥٦-١٩٧١، ص١٢٠-١٢٣.

(2) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : الموسوعة السياسية، ج٢، دار السلام للطباعة والنشر، بيروت،١٩٩٠، ص٦١١.

(3) اياد طارق خضير، السياسة الخارجية للاتحاد السوفيتي في الشرق الاوسط، اطروحة دكتوراه غير منشورة، جامعة بابل، كلية التربية، ٢٠١١، ص١٦٨-١٦٩.

(4) عبدالخالق حسين، ثورة ١٤تموز ١٩٥٨ العراقية وعبدالكريم قاسم، دار الحصاد، دمشق، ٢٠٠٢، ص١٤٩.

(5) F.R.U.S. 1958-1960,Near East Reagion :Iraq,Iran ,Arabian peninsula ,Vol XLL,briefing Notes by Director of Central Intelligence Dulles ,Washin-ton ,July 14,1958.

(6) دار الوثائق القومية المصرية، محافظ وزارة الخارجية، محفظة احداث الشرق الاوسط، ملف رقم ١٠٣٧/٣٠٠/٥، جـ٣، سري، من السفير المصري بواشنطن الى وكيل وزارة الخارجية، بتاريخ ١٩٥٨/٨/٥.

(7) یەکێک بوو لە دەزگا هەواڵگرییە بەهێزەکانی ئەمریکا، کە لەپێناو بەهێزکردن و کاراترکردنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٤٧ سەرۆکی ئەمریکی هاری ترومان دوای ڕەزامەندی وەرگرتن لە کۆنگرێس فەرمانی بە دامەزراندنی ئەو دەزگایە دا بۆ ئەوەی شوێنی نووسینگەی خزمەتی ستراتیژی ئەمریکی بگرێتەوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە :

Walter Lafber : American Russia and the cold war 1945-2002, McGraw Hill publishers, New York ,2004, p73.

(8) عبدالفتاح علي بوتاني، العراق دراسة في التطورات السياسية الداخلية ١٤تموز ١٩٥٨ – ٨ شباط ١٩٦٣، دار الزمان، سوريا، ٢٠٠٨، ص ١٦٢ "

F.R.U.S, 1958 – 1960, Vol XII, Report John S.D Eisenhower to the President Eisenhower, February 28, 1959, P 385 .

(9) محمد انور عبدالعاطي ابراهيم، العلاقات السياسية بين العراق وايران ١٩٥٨-١٩٦٣، اطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية الاداب، جامعة عين شمس، ٢٠٠٦، ص١٤٦-١٤٧.

(10) قاسم جميل قاسم، التكامل القومي في العراق، اطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية الاقتصاد والعلوم السياسية، جامعة القاهرة، ١٩٧٧، ص٢١٤.

(11) F.R.U.S, 1961-1962, Near East Reagion –Vol XVIII, Memorandum From the Deputy Assistant Secretary of State for Near Eastern and Soutg Asian Affairs (Grant) to the Under Secretary of State for Political Affairs (McGhee), Washington, May 3, 1962.

(١٢) هيلين كارير دانكوس، السياسة السوفيتية في الشرق الاوسط، ترجمة عبدالله اسكندر، ط٢، دار الكلمة العربية، بيروت، ١٩٨٣، ص٨٥.

(١٣) وريا ڕەحمانی، مێژووی پەیوەندییەکانی کورد و ئەمریکا، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢، ل٣٧.

(١٤) سعد ناجي جواد، العراق والمسألة الكردية ١٩٥٨ – ١٩٧٠، لندن، ١٩٩٠، ص٧٥-٧٧ " اديت واي، بينروز ايف، العراق، دراسة في علاقاته الخارجية وتطوراته الداخلية ١٩١٥-١٩٧٥، ج١، ترجمة: عبدالمجيد حسيب القيسي، بلا مكان الطبع، ١٩٨٩، ص١١.

(15) F.R.U.S, 1962-1963, Vol XVlll, Memorandum From Secretary of State Rusk to President Kennedy , Washington, February 9, 1963.

(16) Department of State : in coming telegram, fron Baghdad to Secretary of State, June 11, 1963 .

(١٧) مؤيد شاكر الطائي، العلاقات العراقية السوفيتية ١٩٦٣، مجلة دراسات في التاريخ والآثار، كلية الآداب، جامعة بغداد، العدد ٣٠، ايار٢٠١٢، ص٥٥٥.

(18) Haim Shemesh, Soviet – Iraq Relation, 1968-1988 in the shadow of the Iraq – Iran conflict, London,1992, P42.

(١٩) سعد ناجی جواد، المصدر السابق، ص٧٨.

(٢٠) محمود الدرة، القضية الكردية، ط٢، دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٦، ص٣٠٨-٣٣٤.

(21) Department of State :Action Amembassy Baghdad , April 12,1963.

(٢٢) ماريون فاروق سلوغلت، من ثورة الى الدكتاتورية العراق منذ ١٩٥٨، ت: مالك النبراسي، منشورات السلام، بيروت، ٢٠٠٢، ص١٦٧.

(٢٣) گۆران ئیبراهیم ساڵح، دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندییەکانی ئەمریکا و عێراقدا ٦ ئازاری ١٩٧٥- ٢ی ئابی ١٩٩٠، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٣، ل٧٧.

(٢٤) خالد خالد كوچى، السياسة السوفيتية تجاه القضية الكردية في الميزان، ط١، ستوكهولم، ١٩٩٠، ص٣٣.

(٢٥) عزيز حسن عزيز بارزاني، الولايات المتحدة الامريكية والمسألة الكوردية في العراق ١٩٦١-١٩٧٥، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين – اربيل، ٢٠٠٨، ص٨٨.

(٢٦) مسعود البارزانی، البارزانی والحركة التحررية الكردية ١٩٦١ – ١٩٧٥، ج٣، ط١، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢، ص٢٢٦ ؛ فەرەیدون عەبدولرەحیم عەبدوڵلا،

بـارودۆخی سیاسـی کوردسـتان – عێـراق ١١ی مـارتی ١٩٧٠- ١١ی مـارتی ١٩٧٤، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٤٣.

(٢٧) فەرەیدون عەبدولرەحیم عەبدوڵلا، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

(٢٨) وریا ڕەحمانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦-٧٧.

(٢٩) عومەر نورەدینی، سیستەمی نوێی جیهانی و دۆزی کورد (کوردستانی عێراق وەک نموونە)، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٣، ل٩٩.

(٣٠) گۆران ئیبراهیم ساڵح، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩-٩٠.

(٣١) شيركو فتح الله عمر، الحزب الديموقراطي الكوردستاني وحركة التحرر القومي الكوردية في العراق ١٩٤٦–١٩٥٧، مطبعة روون، السليمانية، ٢٠٠٤، ص٢٣٣.

(٣٢) محمود شاكر، موسوعة التاريخ الخليج العربي، ج٢، دار اسامة، عمان، الاردن، ٢٠٠٥، ص٨٩٦.

(٣٣) گۆران ئیبراهیم ساڵح، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٠.

(٣٤) ريبوار كريم محمود، العلاقات العراقية – الامريكية منذ عام ١٩٨٩ وافاقها المستقبلية، مركز كوردستان للدراسات الاستراتيجية، السليمانية، ٢٠٠٧، ص٢٥.

(٣٥) بهاء الدين نوري، مذكرات بهاء الدين نوري، دار الحكمة، لندن، ٢٠٠١، ص٤٢٤.

(٣٦) احمد محمد حمادي، بترول الخليج والقضية العربية في العالم، دكتوراه غير منشورة، جامعة بيروت، لبنان، ١٩٩٢، ص٢١٣.

(٣٧) موسى السيد علي، القضية الكردية في العراق، مركز الاهرام للبحوث والدراسات الاستراتيجية، ابوظبي، ٢٠٠١، ص٨٥.

(٣٨) وریا ڕەحمانی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٣.

(٣٩) هەمان سەرچاوە، ل١٦٤-١٦٦.

(٤٠) أوفرا بينغيو، كرد العراق بناء الدولة داخل الدولة، ترجمة: عبدالرزاق عبدالله بوتاني، دار اراس للطباعة النشر، أربيل، ٢٠١٤، ص١٦٣.

(٤١) حامد محمود عيسى، القضية الكردية في العراق من الاحتلال البريطاني الى الغزو الامريكي ١٩١٤–٢٠٠٤، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٩، ص٣٦٧–٣٦٨.

(٤٢) نەجمەددین عەبدوڵلا ئیسماعیل، هەولێر لەنێوان ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٩ (لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە لە بارودۆخی سیاسی)، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٦، ل١٢٩.

(٤٣) دیڤید ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبوبەکر خۆشناو، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٥٥٣.

(٤٤) الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة (١٩٦٨–١٩٧٧)، المجلد الثاني، مطبعة العاني، بغداد، ١٩٧٩، ص٦١٠.

(٤٥) شۆڕش حاجی ڕەسول، ئەنفال و کورد و دەوڵەتی عێراق، چ (٢)، چاپخانەی نور، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٣٢-٣٣؛ رامیار مەحمود، بەعسیزم و سەرکوتکردن و ژیان، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠١٠، ل٥٦.

(٤٦) خالد عبدالجبار حيدر، المسألة الكردية في الوثائق العراقية، المشكلة — الحل — النتيجة، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، كلية القانون والسياسة، قسم علوم السياسة، ١٩٨٦، ص٣٥١–٣٥٤.

(٤٧) وەرگیراوە لە نەجمەددین عەبدوڵلا ئیسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٢.

(٤٨) ئازاد عوبێد ساڵح، کاریگەریی شۆڕشی ئەیلوول لەسەر پێشخستنی ڕۆژنامەوانیی کوردی لە کوردستانی خوارووا ١٩٦١-١٩٧٥، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر،٢٠٠٧، ل٢٤٨.

(٤٩) هەمان سەرچاوە، ل١٣٤.

(50) Haim shemesh, Op Cit , p121.

(٥١) أوفرا بينغيو، المصدر السابق، ص١٦٧.

(٥٢) المصدر نفسه، ص١٦٧–١٦٨.

(٥٣) عبدالرحمن گۆمەشینی، پوختەیەک لە بیرەوەریەکانم، چاپخانەی نالی، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٢٩-٣١.

(٥٤) صلاح الخرسان، التيارات السياسية فى كردستان العراق ١٩٤٦–٢٠٠١، بيروت، ٢٠٠١، ص٢٢٢–٢٢٣.

(٥٥) صوت الثورة (دەنگی شۆڕش) "الجريدة "، ع (٧)، ئایار١٩٧٤.

(٥٦) سەید کاکە، بیرەوەری پێشمەرگەیەک، چ٢، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین — هەولێر، ٢٠٠٠، ل٨٩.

(٥٧) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: فلک الدین کاکەیی، صفحات من اعلام پارتی، مەتین "گۆڤار"، ژ(٥١)، نیسان ١٩٩٦، ص٦٩-٧٣.

(٥٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: خورشید شێرە، خەبات و خوێن، بیرەوەرییەکانی ساڵانی خەباتی پێشمەرگایەتی، چ٢، بێ ناوی چاپخانە، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٢٧٣-٢٧٤.

(٥٩) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: مسعود البارزانی، المصدر السابق، ص٣٣٢ — ٣٤٠.

(٦٠) وەرگیراوە لە نەجمەددین عەبدوڵلا ئیسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤١-١٤٢.

(٦١) الورقة الكردية في البعد الاقليمي، كادر "گۆڤار"، ژ(٣٠)، تشرینی یەکەم ١٩٩٢، ل٢٣ ؛ کامەران بابان زادە، ڕێککەوتننامەی جەزائیر و ڕەهەندەکانی لەسەر کێشەی کورد لە کوردستانی باشوور، چاپخانەی کەمال، سلێمانی،٢٠١٣، ل٤٨-٥٧.

(٦٢) ئیبراهیم جەلال، خەوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول – بنیاتنان و هەڵتەکاندن ١٩٦١-١٩٧٥، چ(٢)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی شێنێ، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٤٣٦.

(٦٣) شكيب عقراوي، سنوات المحنة في كردستان اهم الحوادث السياسية والعسكرية في كردستان العراق من ١٩٥٨–١٩٨٠، مطبعة منارة، اربيل،٢٠٠٧، ص٣٥٦.

(٦٤) شكيب عقراوي، المصدر السابق، ص٣٥٦.

(٦٥) نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری دەشکێنن، دیوی ناوەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣، بەرلین، ئەلمانیا، ١٩٩٧، ل١١٠.

(٦٦) دار الوثائق القومية المصرية، محافظ وزارة الخارجية، محفظة احداث الشرق الاوسط، ملف رقم ١٠٣٧/٣٠٠/٥، جـ٣، سري، من السفير المصري بواشنطن الي وكيل وزارة الخارجية، بتاريخ ١٩٥٨/٨/٥.

(٦٧) حبيب محمد كريم، تاريخ الحزب الديمقراطي الكوردستاني – العراق (محطات رئيسية ١٩٤٦–١٩٩٣)، مطبعة خەبات، دهوك، ١٩٩٨، ص١٣٣.

(٦٨) روبرت اوين فريدمان، السياسة السوفيتية تجاه الشرق الاوسط، (د . م، د . ت)، ص٢٢٠–٢٢٤.

(69) Haim shemesh, Op Cit, p119-120.

(٧٠) سەروەر عبدالرحمن عمر، پارتی کۆمۆنیستی عێراق و مەسەلەی کورد ١٩٣٤-١٩٧٥ (توێژینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە)، تێزی دکتۆرا (بڵاونەکراوە)، پێشکەش بە زانکۆی سلێمانی، کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکان، بەشی مێژوو، ٢٠٠٨، ل٢٧٢.

(٧١) شكيب عقراوي، المصدر السابق، ص٣٧٠–٣٧٣.

(٧٢) مسعود البارزاني، المصدر السابق، ص٣٤٠–٣٤١.

(٧٣) گوینتەر دیشنەر، کورد گەلی لەخشتەبراوی غەدرلێکراو، و : حەمە کەریم عارف، دەزگای ئاراس،٢٠٠٤، ل٢٥-٢٦.

(٧٤) ئازاد عوبێد ساڵح، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٨.

(٧٥) نەجمەددین عەبدوڵلا ئیسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٣.

(٧٦) وثائق مكتبة الوفاق الوطني في بيروت، الحزب الشيوعي والقضية الكردية، ملف ١٢٢/٢٤/٦.

[٧٧] احمد سين الفياني، السياسة السوفيتية في الشرق الاوسط، دار السلام، بيروت، ١٩٩٤، ص١٢٤–١٢٥.

[٧٨] سەروەر عبدالرحمن عمر، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دامەزراندن و دەستپێکردنەوەی شۆڕش ١٩٧٥– ١٩٧٦، چاپخانەی، سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٦-١٧ ؛ نەجمەددین عەبدوڵلا ئیسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٢-١٣٣.

[٧٩] ئیبراهیم جەلال، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦٦-٣٧٩.

[٨٠] گوینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٧-٢٨٨.

[٨١] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: خالد يحيي العزي، مشكلة شط العرب في ظل المعاهدات والقانون، دار الحرية للطباعة، بغداد،١٩٨١، ص٦٩–٧٠.

[82] Haim shemesh, Op Cit , p124.

[٨٣] بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی دەق و پرۆتۆکۆڵ و بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە بڕوانە: الجمهورية العراقية، وزارة الخارجية اللجنة الاستشارية، النزاع العراقي — الايراني، ملف وثائقي، مطبعة الحكومة، بغداد، كانون الثاني ١٩٨١، ص ٣١٣–٣٣٣.

[84] Haim shemesh, Op Cit , p125.

[85] David Mc Dowall : A Modern History of the Kurds. I.B Tauris Publishers, London, 2000, p 327.

[٨٦] گۆران ئیبراهیم ساڵح، سەرچاوەی پێشوو، ل٩.

[٨٧] نەجمەددین عەبدوڵلا ئیسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٢.

[٨٨] أوفرا بينغيو، المصدر السابق، ص١٦٧.

[٨٩] گوینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٨-٢٤٩.

[٩٠] وریا ڕەحمانی، مێژووی پەیوەندییەکانی کورد و ئەمریکا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٧-١٦٨.

[٩١] وریا ڕەحمانی، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا (کوردستان عێراق)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٥١-٢٥٢.

[٩٢] هەمان سەرچاوە، ل٢٥٣.

[٩٣] فەرەیدون عەبدولرەحیم عەبدوڵلا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٨-١٦٩.

[٩٤] وریا ڕەحمانی، مێژووی پەیوەندییەکانی کورد و ئەمریکا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٣-١٧٥.

[٩٥] ئیبراهیم جەلال، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦٦-٣٧٩.

[٩٦] گۆران ئیبراهیم ساڵح، سەرچاوەی پیشوو، ل٩٩.

[97] وریا ڕەحمانی، مێژووی پەیوەندییەکانی کورد و ئەمریکا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٦-١٧٧.

[98] گوینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٦.

[99] نازناز محەمەد عەبدولقادر، سیاسەتی ئێران بەرامبەر بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە عێراق ١٩٦١-١٩٧٥، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٢١٣-٢١٥.

[100] گوینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٧.

[101] حامد محمود عيسى، المشكلة الكردية في الشرق الاوسط، مكتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٩٢، ص٢٣٧.

[102] کریس کۆچیرا، کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا، و : حەمە کەریم عارف، چ٤، خانەی چاپ و بڵاوکراوەی ئاوێر، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٤١٦.

[103] سعد ناجي جواد، دراسات في المسألة القومية الكردية، ط١، دار العربية للعلوم، بيروت، ٢٠٠٥، ص١٣٩.

[104] عزيز حسن بارزاني، المصدر السابق، ص١٢١.

[105] بۆ زیاتر زانیاری لەسەر ڕێکەوتننامەی جەزائیر بڕوانە، کامەران بابان زادە، ڕێکەوتننامەی جەزائیر و ڕەهەندەکانی لەسەر کێشەی کورد لە کوردستانی باشوور، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٣.

## ملخص البحث

هذا الموضوع يتكون من دراسة تاريخية حول موقف الإتحاد السوفيتي والولايات المتحدة تجاه العراق و إنعكاساتها على القضية الكوردية في جنوب كردستان ما بين أعوام (١٩٧٤ – ١٩٧٥)، وهذه الدراسة عموماً تتكون من مقدمة و مدخل وثلاث محاور. وتلقي الدراسة الضوء على موقف الإتحاد السوفيتي والأمريكي تجاه العراق وتأثيراته على القضية الكوردية في جنوب كوردستان بين أعوام (١٩٧٤ – ١٩٧٥)، في منظور العلاقة بين العراق والإتحاد السوفيتي والأمريكي وتأثيرها على القضية الكوردية في جنوب كردستان قبل عام ١٩٧٤، وفي المبحث الأول ألقي الضوء على إندلاع الحرب بين قوات البيشمركة والجيش العراقي بين أعوام (١٩٧٤ – ١٩٧٥)، وخصص المبحث الثاني موقف الإتحاد السوفيتي من الاقتتال بين قوات البيشمركة والجيش العراقي (١٩٧٤ – ١٩٧٥)، وفي المبحث الثالث ألقي الضوء على الموقف الأمريكي من الاقتتال بين قوات البيشمركة والجيش العراقي في أعوام (١٩٧٤ – ١٩٧٥).

## Abstract

This topic is a historical research about the American and Union of Soviet position toward the Iraq and it's impact on the Kurdish issue in south Kurdistan during 1974-1975, in this study we will try to discuss the Iraq's relations with American and the Union of Soviet academically. After that the influence of these relations on the Kurdish issue in the south of Kurdistan will be shown. Generally this study consists of an abstract, introduction and three chapters. In the research the most point is put on the America and the Soviet Union attitude toward the Iraq and it's effect on the Kurdish issue in the south Kurdistan during 1974-1975. In this sense, in the introduction, the Iraq's relations with the America and the Soviet Union and the influence of this relations on the Kurdish issue before 1974 will be discussed. After that in the first section, the Kurdish Peshmerga forces war against Iraqi army in the 1974 -1975 will be pointed. The second chapter is put to the Soviet Union position toward the war between Iraq's army and the Kurdistan Peshmerga forces in 1974-1975. The third chapter is put to the America position toward the war between the Iraq's army and Kurdish forces during 1974 -1975. Finally, we will mention some results in some points in the research, also an abstract in Arabic and English language.

# رۆڵی قوتابخانەی ناوچە کوردییەکان
# لە پێشخستنی زانستی وەرگێڕان
# لە سەردەمی عەباسی یەکەمدا
# (١٣٢-٢٤٧ك/٧٥٣- ٨٦٨ز)

**د. شەهلە بورهان عەبدوڵڵا**
بەشی مێژوو– کۆلێژی ئاداب
زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

**پێشەکی**

بابەتەکەمان بە ناوونیشانی ((رۆڵی قوتابخانەی ناوچە کوردییەکان لە پێشخستنی زانستی وەرگێڕان لە سەردەمی عەباسی یەکەمدا١٣٢-٢٤٧ک/٧٥٣-٨٦٨ز))یە، ئەم بابەتە باسێکە ئاماژە بە زاناکان و قوتابخانەکانی ناوچە کوردییەکان دەکات کە چۆن توانییان گۆڕانکارییەکی گەورە بێنە کایەوە لە شارستانییەتی دەوڵەتی ئیسلامی بەگشتی و شارستانییەتی دەوڵەتی عەباسی بەتایبەتی، ئەمەش لە ڕێگەی گرینگیدانیان بووە بە زانستی میللەتانی تر هەروەها لە ڕێگەی فێربوونی زمانی میللەتێکی تر کە ئەویش زمانی عەرەبی بوو، توانیویانە ببن بە پردێکی پەیوەندی لە نێوان دوو شارستانیەت و دوو گەل و دوو بیرۆکە لە ئەنجامدا بەشدارییان کرد لە دروستکردنی مێژووی شارستانییەتی دەوڵەتی ئیسلام و ناوچەکە، ئەوان توانییان مێژوویەکی پرشنگ بنووسنەوە کە ئاماژە بە رۆڵی ئەم قوتابخانانە دەکات کە چۆن توانییان مێژووی رۆشنبیریی نەوەیەک بنیات بنێن.

گرینگیی ئەم بابەتە لەوە بە دیار دەکەوێت کە ئاماژە دەکرێت بە چالاکی و کاری چەندەها زاناو قوتابخانەی بەناوبانگ و بە توانای ناوچە کوردییەکان، کە گشتیان رۆڵی بەرچاو و گەورەیان هەبوو لە پێگەیاندنی قوتابی و مامۆستای زیرەک و بەتوانا، هەروەها رۆڵی پاراستنی بەرهەمی

زانستی چەندەها میللەتانیان لە خۆگرت بەتایبەتی بەرهەمی فەلسەفەی یۆنانی کە لە ڕێگەی شارەزاییان بە زمانی ئیغریقی و عەرەبی توانییان شۆڕشێکی ڕۆشنبیری بەرپا بکەن کە گرینگترین دەسکەوتەکانی ئەو شۆڕشە بریتی بوو لە وەرگێڕانی ئەم فەلسەفەیە بۆ سەر زمانی عەرەبی دواتریش لە زمانی عەرەبی چەندەها میللەتان سوودمەند بوون لەم کارە مرۆڤایەتییە.

باسکردنی هەر بابەتێک بەربەست و ئاستەنگی خۆی هەیە بەتایبەتی کە نووسینەوەی مێژووی شارستانییەت زۆر گرینگی پێ نادرێت لە لایەن تۆمارکارانی مێژوو، بۆیە کاتێک بابەتێک دەنووسرێت لەسەر ئەم بوارە هەست دەکەی کە سەرچاوەکان زۆر هەژارن، دەبێت لە نووسراوەکان لەم پەڕو ئەوپەڕی سەرچاوەکان شت بدۆزریتەوە ئەمە لە لایەک، لە لایەکی ترەوە ناوچە کوردییەکان ڕاستە پێشەنگ بوون لە پێگەیاندنی زانا لە سەردەمی دەوڵەتی ئیسلام بەگشتی و دەوڵەتی عەباسی بە تایبەتی بەڵام بایەخیان نەداوە بە تۆمارکردنی ئەم مێژووە پڕشنگدارە، بۆیە کاتێک زانیاری بە دەست دێنیت هەست بە بۆشاییەک دەکەیت لەم بوارە، پێویستە لەسەر ئێمەی توێژەر ئەم جۆرە بۆشاییانە پڕ بکەینەوە و جۆرە مافێکی زانستی بدەین بەم قوتابخانانە و زاناکانی.

ئەم تـــــوێژینەوە پێکهـــــاتووە لە دوو تەوەرە تەوەرەی یەکەم بە ناوونیشانی، هۆکارەکانی فێربوونی زمان و کاریگەری لەسەر پێشکەوتنی زانستی وەرگێڕان لە ناوچە کوردییەکان، کە ئەمیش بۆ دوو خاڵ دابەش کراوە لە خاڵی یەکەم باس لەو هۆکارانە دەکرێت کە پاڵنەر بوون بۆ زاناکان و خەڵکی ناوچە کوردییەکان بۆ فێربوونی زمانی میللەتێکی تر یان زمانی دەسەڵات، هەرچی خاڵی دووەم تێیدا ئاماژە بەو پاڵنەرانە دەکرێت کە هۆکاربوون بۆ پێشخستنی زانستی وەرگێڕان بە بەشداری ئەم زانایانە، هەرچـــی تەوەرەی دووەمە بە ناوونیشـــانی، قوتابخانەکـــانی نـــاوچە کوردییەکانە، باس لەو قوتابخانانە دەکات کە دەستێکی باڵایان هەبوو لە وەرگێڕانی زۆرینەی بەرهەمە وەرگێڕاوەکانی سەردەمی عەباسی، گشت قوتابخانەکان باسێکیان دەربارەیان پێشکەش دەکرێت.

ئەو سەرچاوانەی کە سوودیان گەیاندووە بە توێژینەوەکە زۆرن کە گشتیان ناویان وە زانیاریی دەربارەیان بە لیستێک ئامادەکراوە لە کۆتایی تۆژینەوەکە، بەڵام هەندێ سەرچاوە زانیاریی زیاتر بەخشیوە بە بابەتەکە وەکو کتێبی (الفهرست) هی مێژوونووس (ابن الندیم)ە کە کتێبێکی زۆر گرینگە بۆ هەر کەسێک کە بیەوێت زانیاری دەربارەی زاناکانی دەوڵەتی ئیسلامی کۆبکاتەوە چونکە زۆر بە شێوەیەکی جوان بە ریزبەندی باسی زۆریـــنەی هەرە زۆری زاناکـــان و بەرهەمەکانیـــان دەکـــات، هەروەهـــا سوودمان وەرگرتووە لە کتێبی (احکام السلطانیة والولایات الدینیة) هی نووسەر (الماوردي) کە باس لە بارودۆخی خەڵکی ناوچە فەتحکراوەکان دەکات و ئاماژە بە ئەرک و مافیان دەکات لە دەوڵەتی ئیسلام ، وە کتێبی (الملل والنحل) هی نووسەر (الشهرستاني) کتێبێکی گرینگ و فەلسەفی مێژووی ئیسلامە کە باس لە چینە جیاوازەکان و فرقە جیا جیاکانی دەوڵەتی ئیسلام دەکات ئەم کتێبەش سوودی بەخشیوەتە توێژینەوەکە بە نووسراوە سەنگینەکانی . بۆ نووسینی هەر توێژینەوەکی مێژوویی، بەتایبەتی سەردەمی مێژووی ئیسلامی بێت، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ نووسراوەکانی مێژوونووس (الطبري) کە خاوەنی کتێبی (تاریخ الامم والملوک)ە کە دەتوانین زانیاریی تەواو بەدەست بێنین لەسەر سەردەمی ئیسلام بەتایبەتی سەردەمی خەلیفەکان. جگە لەمانە چەندەها سەرچاوەی لاوەکی هەن کە سوودی زۆریان بەخشیوە، وەک کتێبی (تاریخ اهل الذمة في العراق) کە دەگەڕێتەوە بۆ نووسەر (الیوزبکي) کە باسێکی درێژە لەسەر بارودۆخی خەڵکی غەیری موسوڵمانانی ناوچەی عێراق لە نێوانیشیدا باس لە خەڵکی کوردستانیش دەکات، هەروەها کتێبی (علوم الیونان) هی نووسەر (اولیری)یە کە باس لە زانستی یۆنانی و زاناکانی ئەم ناوچەیە دەکات لەگەڵ بەرهەمەکانیان.

لە کۆتاییدا خۆشحاڵ دەبین ئەگەر توانیبمان سوودێک بە زانست و زانستخوازان بگەیەنین و توانیبمان کەلێنێکی ئەم بوارە مێژووییە پڕ بکەینەوە.

**دەروازە:**

وەرگێڕان بە چالاکیی مرۆڤ دادەندرێت بۆ ئەوەی بتوانێت پەیوەندی بە گەلانی تر بکات و لێیان تێبگات و ئاڵوگۆڕی بیروراکانی یەکتری بن، هەروەها هۆکارێکە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت ئاگاداری پێشکەوتنی میللەتەکانی تر بێت لە هەموو بوارەکان، وەک بواری زانستی، ئابووری، کۆمەڵایەتی،...هتد، زانستی وەرگێڕان زانستێکی کۆنە و لەگەڵ دروستبوونی مرۆڤایەتی و پێشکەوتنی زانستەکان بە دیار کەوتووە وەهیچ میللەتێک ناتوانێت خۆی بێبەش بکات لەم زانستە، چونکە بە زانستێک دادەندرێت کە هەموو میللەتێکی جیهان پێویستی پێدەبێت بۆ ئەوەی شارەزایی پەیدا بکات لەسەر پێشکەوتن و کلتووری میللەتانی تر، هەروەها خۆی پێیان بناسێنی، بۆ ئەوەی زانستی وەرگێڕان پێش بکەوێت پێویستە گرینگیی زۆر بدرێت بە زانستی زمانەوانی چونکە زانستی زمانەوانی کاریگەری خۆی هەیە لەسەر پێشخستنی زانستی وەرگێڕان[1].

وەرگێڕان هەندێ جار بووە بە هۆکارێک بۆ پاراستنی چەندەها کلتوور و کتێبی زانستی بەهێز و رزگارکردنی لە فەوتان ونەمان وەکو ئەو شۆڕشە زانستییەی کە لە سەردەمی عەباسیدا کرا، کە دەستکرا بە وەرگێڕانی دەیان کتێبی زانستی بە نرخ لە چەندەها زمان بۆ زمانی عەرەبی کە ئەو کاتی زمانی رەسمی دەوڵەتی ئیسلام بوو، زمانی حوکم بوو، ئەم شۆڕشە رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە پارێزگاریکردن لە کلتوورێکی بە نرخی شارستانییەتی جیهان، بەتایبەتی شارستانییەتی ئیغریقی کە بە سەرەتایەک دادەندرێت بۆ پێشکەوتنی شارستانییەتی جیهان بە گشتی و شارستانییەتی ئەوروپی بەتایبەتی، ئەم شۆڕشە لەلایەن چەندەها زانای گەورە و بەناوبانگی قوتابخانەکانی ناوچە کوردییەکان کرا کە پێشەنگ بوون لە وەرگێڕانی دەیان کتێبی بەنرخ لە چەندەها زمانی جیاواز بۆ سەر زمانی عەرەبی، ئەم شۆڕشەی وەرگێڕان کە لەلایەن زاناکانی قوتابخانە کوردییەکان کرا رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە بەهێزکردنی زمانی عەرەبی، خوێندنی زمانی عەرەبی لە قوتابخانەکان، هەروەها هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی کە زمانەکانی تریش بێنە نێو مەیدانی زانست و لە قوتابخانەکان وەکو زانستێکی سەربەخۆ بخوێندرێن[2].

**تەوەرەی یەکەم/ هۆکارەکانی فێربوونی زمان و کاریگەری لەسەر پێشکەوتنی زانستی وەرگێڕان لە ناوچە کوردییەکان**

**یەکەم/ هۆکاری فێربوونی زمان.**

١- هۆکاری مێژوویی و سیاسی و ئاینی:

فتوحاتی ئیسلامی بۆ ناوچە کوردییەکان لە سەردەمی خەلیفەی دووەمی دەوڵەتی راشدی خەلیفە (عومەری کوڕی خەتاب ١٣-٢٣ک/٦٣٤-٦٤٣ز)[٣] دەستی پێکرد و، زۆرینەی ناوچەکانی کوردی لە سەردەمی ئەم خەلیفەیە کەوتنە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی، ئەم فتوحاتەش کاریگەرییەکی زۆری هەبوو کە ناوچە کوردییەکان تێکەڵاوی کۆمەڵگا نوێکە ببن و هەوڵ بدەن زمانی عەرەبی فێربن، چونکە زمانی دەسەڵاتە.

هەروەها دەسەڵاتی نوێ بەپێی ئەو فەلسەفەیەی کە هەیبوو رووی کردبووە ئەو ناوچانەی کە ئاینی ئیسلامی تێدا نییە وە هەوڵی دەدا ئاینی ئیسلام تێیدا بڵاو بکاتەوە و خەڵکێکی زۆر هانبدات کە ئەم ئاینە نوێیە پەیڕەو بکەن بەڵام بە ویستی خۆیان[٤]، بەتایبەتی کە موسوڵمانان ئازادییەکی تەواویان بەخشیبووە خەڵکی ناوچە تازە گیراوەکان کە ئەوەش خۆی لە خۆیدا پاڵنەر بوو کە خەڵکەکە فێری ئەم ئاینە بن[٥] ، ئەم جۆرە سیاسەتەی کە بە سیاسەتی پێکەوە ژیان دادەندرێت، کە هەر چینێک لەم دەوڵەتە ماف و ئەرکی خۆی دەزانی، بەتایبەتی خەڵکی ناوچە تازە گیراوەکان کە دەیانبینی ئاینیان لەگەڵ پەرستگاکانیان و پیاوانی ئاینیان و گشت مافەکانی تریان وەک مافی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییان پارێزراوە، ئەمانە گشتی پاڵنەر بوون کە خەڵکی ئەم ناوچانە بیر لەم ئاینە بکەنەوە و هەندێکیان ئەم ئاینەش پەیڕەو بکەن[٦]، بۆیە کاتێک کە خەڵک پەیڕەوی ئەم ئاینە دەکەن دەبێت فێری زمانی ئاینەکەش بن کە زمانی عەرەبییە، بۆ ئەوەی شارەزا بن لە ئاینەکە.

٢- هۆکاری ئابووری:

هۆکاری ئابووری بە هۆکارێکی سەرەکی دادەندرێت کە پاڵنەر بوو بۆ فێربوونی خەڵکی ناوچە کوردییەکان بۆ زمانی عەرەبی، چونکە پەیوەندییەکی بە تینی ئابووری لە نێوان ناوچە کوردییەکان و دەسەڵاتی

ئیسلامی عەرەبی پەیدابوو، بەپێی دەسەڵاتی نوێ فەرز بوو کە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیسلامی باج بدەن بە دەوڵەت ئەگەر موسوڵمان نەبن، وەلەبەر ئەوەی ناوچە کوردییەکان زۆرینەیان موسڵمان نەبوون و لەسەر ئاینی تر بوون ئەمە وای لێکردن کە باجی زەوی[٧] و باجی سەرانە[٨] بدەن بە دەسەڵاتی ئیسلامی، بۆئەوەی ئەم پەیوەندییەش بەردەوام بێت دەسەڵاتی ئیسلامی خەڵکی ناوچەکانی هەڵدەبژارد تاوەکو باج لەجیاتی ئەو کۆبکەنەوە چونکە ئەوان شارەزا بوون لە ناوچەکانی خۆیان دەیانتوانی زۆر بە ئاسانی بڕی ئەو پارەیە دیاری بکەن لەسەر هەر ناوچەیەک، بەڵکو خەڵکی ناوچەکان ببوون بە چینێکی گەورە لە بواری بەڕێوەبردن کە تەواو دەسەڵاتی خۆیان لەم بوارە چەسپاندبوو بەتایبەتی لە کارەکانی نووسەری و بەرپرسی ناوچەکان هەروەها لە بواری داراییش[٩]، واتا ببوون بە فەرمانبەری دەوڵەتی ئیسلامی، ئەمەش وایانی لێدەکرد کە فێری زمانی عەرەبی بن تاوەکو بەردەوام بن لە خزمەتکردنی ناوچەکانی خۆیان لە ژێر سەرپەرشتی دەسەڵاتی ئیسلامی[١٠] جگە لەوەی بەردەوامیش بن لە کارەکانی خۆیان. هەروەها لە ئەنجامی ئەم پەیوەندییە ئابوورییە هەندێ خەڵکی ناوچەکانی کوردی فێری زمانی عەرەبی بوون کە ئەمەش پاڵنەر بوو بۆ بڵاوبوونەوەی زمانی عەرەبی لەم ناوچانە[١١].

٣- رۆڵی دەسەڵات لە فێربوونی زمانی عەرەبی:

أ-بە عەرەبکردنی دامودەزگای دەوڵەت:

سەردەمی راشدی بە سەردەمی سەرەتای دەستپێکردنی بڵاوبوونەوەی زمانی عەرەبی دادەنرێت لە ناوچە کوردییەکان، چونکە دەسەڵاتی نوێ دەسەڵاتێکی ئاینی بوو کە هەوڵی دەدا ئاینی ئیسلام بڵاوبکاتەوە لە ناوچە نوێکان کە تازە فەتح کرابوون، لەبەر ئەوەی رێبەرانی ئاینی ئیسلام و دەسەڵاتدارانی ئاینی ئیسلام عەرەب بوون ئەمە وای کردبوو ئەم زمانە لە ناوچەکان بوونی هەبێت و دواتریش ببێتە زمانی رەسمی دەوڵەت، هەروەها یەکەم دامودەزگای ئەوکاتی دەوڵەت بە عەرەبی تۆمارکراوە کە ئەویش بریتییە لە دیوانی جوند کە بە یەکەم دیوان و تۆمارگە دادەنرێت لە دەوڵەتی ئیسلام لە سەردەمی راشدی

داندرابێت، جگە لەمە دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە زمانی دەسەڵاتدار زۆرجار خۆسەپێن دەبێت وەکو چۆن شەهرستانی بە وتە ناودارەکەی ئەمەی سەلماندووە کە دەڵێت: خەڵک لەسەر ئاینی گەورەکانیانن[12]. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە زمانی عەرەبی هەر لە سەرەتاوە بە دیار کەوتووە و خۆی سەپاندووە.

ئەو هەڵمەتە بە عەرەبکردنەی کە دامودەزگاکانی دەوڵەتی ئیسلامی گرتەوە لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی بە تایبەتی لە سەردەمی خەلیفە (عەبدولمەلیک کوری مەروان ٦٥- ٨٦ک/٦٨٥-٧٠٥ز) لە ساڵی ٦٧ک/٦٨٧ز[13]، وای لە فەرمانبەرانی ئەو دەوڵەتە کرد کە زۆرینەیان عەرەب نەبوون هەوڵ بدەن فێری زمانی عەرەبی بن بۆ ئەوەی بەردەوام بن لە کارەکانی خۆیان، بەم شێوەیە زمانی عەرەبی دەبێت بە زمانی ئیداری و رەسمی دەوڵەت[14].

ب- هاندانی خەلیفەکان بۆ وەرگێڕانی زانستە جۆراوجۆرەکان بۆ سەر زمانی عەرەبی:

خەلیفەکانی دەوڵەتی عەباسی رۆڵێکی مەزنیان هەبوو لە گەشەسەندنی وەرگێڕان لە دەوڵەتی ئیسلامی، چونکە هانی زاناکانیان دەدا کە زۆرترین زانست وەرگێڕنە سەر زمانی عەرەبی، ئەمە جگە لەوەی کە زۆر بە سەخییانە پارەوپوولیان دەبەخشییە هەر زانایەک کە ئەم کارە بکات[15]، بۆنموونە خەلیفە (مەئمون ١٩٧-٢١٨ک/٨١٨-٨٣٩ز)[16] بۆ هەر وەرگێڕانێک بە قەد کێشی کتێبە وەرگێڕاوەکە زێری دەبەخشییە وەرگێڕەکەی[17]، هەروەها هەندێکیان مووچەیەکی بەردەوامیان وەردەگرت لەسەر ئەم کارە کە بڕەکەی بریتی بوو لە پێنج سەد دینار لە مانگێکدا وەک (سابتی کوری قەرە)[18] وەری دەگرت[19]، هەروەها بنیاتنانی بیتولحکمە باشترین نموونەیە[20] بۆ ئەم هاندانەی خەلیفەکان. زاناکانی ناوچە کوردییەکانیش شارەزاییەکی تەواویان هەبوو لەسەر زانستی جۆراوجۆری میللەتانی تر ئەمەش لە رێگەی بوونی ژمارەیەک قوتابخانە لە ناوچەکە کە وا پێدەچێت خەڵکی ناوچەکە گرینگییان زۆر بە زانست دابوویێت، هەروەها وەکو ئاماژەمان پێدا لە پێشەوە کە زمانی عەرەبی زمانی رەسمی دەوڵەت و دەسەڵات بوو بۆیە بۆ گەیاندنی زانیارییەکان

پێویست بوو زاناکانی ناوچە کوردییەکانیش فێری ئەم زمانە بن بۆ ئەوەی بتوانن لە پانتاییەکی فراوان بەرهەمەکانیان بڵاوبکەنەوە ئەمە جگە لە قازانجە داراییەکەش کە پاڵنەرێکی تری بەهێز بوو بۆ ئەم مەبەستە، گرینگیدانیان بە زمانی عەرەبی وایانی لێکرد شارەزایی تەواویان هەبێت لەسەر ئەو زمانە، کە ئەمەش وای لە خەلیفەکان کرد داوایان لێ بکەن ئەم زانستانە وەرگێڕنە سەر زمانی عەرەبی تاوەکو شارستانیەتی ئیسلام سوودی لێ وەرگرێت و دەوڵەمەند بێت[٢١].

**دووەم/ هۆکاری پێشکەوتنی زانستی وەرگێڕان.**

١- بزووتنەوە و شۆڕشی زانستی لە دەوڵەتی عەباسیدا.

أ-بنیاتنانی دەزگای (بیت الحكمة):

بیتولحکمە بە گرنگترین دەزگای زانستی دادەندرێت کە لە سەردەمی خەلیفەی عەباسی (هارون رەشید ١٧٠-١٩٣ک/٧٩١-٨١٤ز)[٢٢] دروست کراوە، ئەمەش لەبەر زۆریی زانا و زۆریی کتێبخانە لەم سەردەمە، کە سەردەمی ئەو بە سەردەمێکی گەشی وەرگێڕان دادەندرێت[٢٣]، سەردەمی خەلیفە (مەئمون١٩٧-٢١٨ک/٨١٨-٨٣٩ز)یش بە سەردەمی زێڕینی وەرگێڕان دادەندرێت چونکە گرنگییەکی زۆری دا بەم دەزگایە و زیاتر پەرەی سەند ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆر خولیای زانست بوو[٢٤]، هەروەها لەسەر بیرۆکەی موعتەزلە[٢٥] ئەمەش وای لێکردبوو پێویستی بەم کتێبە فەلسەفییانەی یۆنان بێت تاوەکو بەرگری لە بیروڕاکانی بکات، جگە لەوەی بە بەردەوامی پەیوەندی بە ڕۆمەکان دەکرد بۆ وەرگرتنی کتێبە بە نرخەکانی ژێر دەستیان تاکو وەریانگێڕنە سەر زمانی عەرەبی[٢٦].

لە ڕاستیدا بیتولحکمە بە چرایەکی ڕۆشن دادەندرێت لە مێژووی زانستی موسوڵمانان کە کتێبخانەیەکی گەورەی تێدا بوو چەندەها کتێب بە زمانی فارسی، یۆنانی، سریانی[٢٧] ..هتد لەخۆ دەگرت، ئەمە جگە لەوەی ئەم شوێنە ببوو بە کتێبخانەیەکی گشتی، گشت قوتابیانی زانست سوودیان لێ وەردەگرت[٢٨].

ب- بوونی زانا و قوتابخانە لە ناوچە کوردییەکان:

دەوڵەتی ئیسلامی خاوەن دەیان زانای بەناوبانگ و زیرەک و

لێهاتوو بوو کە ڕۆڵێکی بەهێزیان دەبێت لە دروستکردن و گەشەسەندنی شارستانییەتی ئیسلام، هەروەها بوونی چەندەها قوتابخانەی بەتوانا و سەرکەوتوو پاڵنەرێکی تر بوو بۆ بەرەو پێشبردنی زانست و زانستخوازی لە دەوڵەتی ئیسلام[٢٩]، زۆرینەی هەرە زۆری ئەو زانایانە خەڵکی ناوچە کوردییەکان بوون یان دەرچووی قوتابخانەکانی شارەکانی کوردی بوون، زیرەک و لیهاتووییان هەروەها شارەزاییان لە زمانی عەرەبی و زمانی سریانی و ئیغریقی وایکرد پێشەنگ بن لەو گۆڕانکارییە گەورەیەی کە دەوڵەتی ئیسلام پەیڕەوی کرد لە شۆڕشی زانستی بەتایبەتی لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسیدا[٣٠].

٢- ململانێی گفتوگۆ و قسە لە نێوان چەند چینێک:

ئەم ڕکابەرییە قسەیەی کە سەری هەڵدا لە دەوڵەتی عەباسی بە هۆکارێک دادەندرێت بۆ پێشخستنی زانستی وەرگێڕان، چونکە هەر چینێک لەم چینە ناکۆکانە بۆ ئەوەی بەڵگە بۆ ڕاستیی قسەکانیان بێننەوە پشتیان دەبەست بە فەلسەفەی یۆنانی کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا پاڵنەر بوو بۆ وەرگێڕانی فەلسەفەی یۆنانی بۆ سەر زمانی عەرەبی، زۆرینەی وەرگێڕەکانیش زاناکانی قوتابخانەکانی ناوچە کوردییەکان بوون. ئەم چینانەش ئەمانە بوون:

أ- چینی یەکەم: چینی مەسیحییەکانن: کە پێکهاتبوون لە مەزهەبی نەستوری[٣١]و یەعقوبی[٣٢] کە هەریەکێکیان بۆ ئەوەی بەرگری لە ڕاکانی خۆی بکات پشتی دەبەست بە فەلسەفەی یۆنانی کە وەرگێڕدرابووە سەر زمانی سریانی، ئەم مشتومڕە زیاتر لە ناوچە کوردییەکان هەبوو لە نێوان ئەم دوو مەزهەبە[٣٣].

ب- چینی دووەم: چینی موسوڵمان و غەیری موسوڵمان: بریتی بوو لە ململانێی قسەی نێوان موسوڵمانان و غەیری موسوڵمان، کە موسوڵمان کاتێک هەستیان کرد غەیری موسوڵمانان لە وەڵامدانەوە لەوان زیرەکترن ویستیان هۆکاری ئەم زیرەکییە بزانن، کە ئەویش بێگومان فەلسەفەی یۆنانی بوو وایانی لێدەکرد زۆر زیرەک بن لە وەڵامدانەوە، بۆیە موسوڵمانانیش هەوڵیاندا ئاشنای ئەم زانستە نوێیە بن[٣٤].

ت- چینی سێیەم: چینی فرەقی ئیسلامی: بەدیارکەوتنی ئەم فرەقانەی ئیسلامی وەکو موعتەزلە ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە پەرەسەندنی زانستی وەرگێڕان، چونکە زۆر پشتیان دەبەست بە فەلسەفەی یۆنانی[٣٥]، بۆ ساغکردنەوەی ڕاکانیان.

**تەوەرەی دووەم/ قوتابخانەکانی ناوچە کوردییەکان:**

قوتابخانەکانی ناوچە کوردییەکان ڕۆڵێکی گەورە و چالاکیان هەبوو لەو شۆڕشە زانستییەی کە ناوچەکانی دەوڵەتی عەباسی گرتەوە، چونکە ئەو قوتابخانانە پێشەنگ بوون لە زانستەکانی فەلسەفە، پزیشکی، گەردوونناسی، ئەدەبی... هتد، بەر لە هاتنی هێزی ئیسلامی بۆ ناوچەکە، دوای هاتنی ئەم هێزەش هەر بەردەوام بوون لەم پێشەنگییە، چونکە موسوڵمانان جێیان هێشت و دەستکاری قوتابخانەکانیان نەکرد، ئەم قوتابخانانەش خاوەن چەندەها کتێبی بەنرخ بوون لە چەندەها بواری زانستی کە گشتی وەرگێڕدرابووە سەر زمانی سریانی دواتریش لەسەر دەستی زاناکانی ئەم قوتابخانانە وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبی[٣٦]، قوتابخانەکانیش ئەمانەن:

١- قوتابخانەی نوسەیبین:

قوتابخانەی نوسەیبین ڕۆڵێکی دیاری هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی فەلسەفەی ئیغریقی لە ناوچە کوردییەکان، لە بەناوبانگترین زاناکانی (ئافرام سریانی) یە [٣٧] کە سەرۆکی قوتابخانەکە بوو ڕۆڵی هەبوو لە بەناوبانگیکردنی قوتابخانەکە[٣٨].

ئەم قوتابخانەیە لەسەر دەستی (ئەسقف یعقوب) بنیاتنراوە لە سەرەتادا ئامانجیان لە دروستکردنی ئەم قوتابخانەیە بریتی بوو لە بڵاوکردنەوەی لاهووتی یۆنانی لەلایەن ئەو مەسیحییانەی کە سریانی دەزانن[٣٩]، بەڵام ئەم قوتابخانەیە خاپوور دەکرێت لەسەر دەستی فارسەکان لەساڵی ٣٦٣ز، بەڵام مامۆستایانی قوتابخانەکە درێژە بە خەباتی زانستییان دەدەن، جارێکی تر لە شاری ڕەها[٤٠] قوتابخانەکە بنیات دەنێنەوە. بەم شێوەیە قوتابخانەکە داخرا ماوەیەک، بەڵام جارێکی تر دەکرێتەوە لەسەر دەستی نەستورییەکان بە ڕێبەرایەتی (برصوصا)[٤١] کە

لە گرنگترین چالاکیان وەرگێڕانی پەرتووکەکانی (ئەرستۆ تالیس)ە هەروەها راڤە کردنی[42]، هەروەها پەرتووکی (ئەلایساگوجی) واتا (دەروازەیەک بۆ وتارەکانی ئەرستۆ) هی گرفوریس[43]. وا پێدەچێت مامۆستایانی ئەم قوتابخانانە هەوڵیان داوە لە رێگای وەرگێران کتێبی فەلسەفی پشت ئەستووربن بە بیرۆکەی سروشتی مەسیح[44] (س)، کارو چالاکی ئەم قوتابخانەیە زیاتر بریتی بوو لە خوێندنی زانستی ئاینی، زمانی سریانی، زمانی یۆنانی، چالاکی زانستی ئەم قوتابخانەیە بەردەوام دەبێت تا دوای گرتنی ناوچەکە لەلایەن موسوڵمانان، لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی و عەباسی هەر درێژە بەم پێشکەوتنەی دەدات، ئەو بزووتنەوە وەرگێڕانەی کە قوتابخانەکەی گرتەوە رۆڵێکی دیاری هەبوو لە گواستنەوەی بیرۆکەی فەلسەفی و مەنتقی بۆ بیرۆکەی ئیسلامی.

٢- قوتابخانەی رەها:

ئەم قوتابخانەیەش یەکێکی ترە لە قوتابخانەکانی ناوچەکانی کوردی، کە مامۆستایانی ئەم قوتابخانەیە گرینگیان داوە بە خوێندنی لاهووت، پزیشکی[45]، بەڵکو قوتابخانەی تایبەتی هەبووە کە تایبەت بووە بە بواری پزیشکی[46]، ئەم قوتابخانەیە داخراوە لە لایەن رۆمەکان چونکە مامۆستایانی لەسەر مەزهەبی نەستوری بوون ئەو کاتەش ناوچەکە مەزهەبی یەعقوبی تێدا بلاو ببۆوە، بەڵام جارێکی تر لە نوسەیبین بنیاتنراوە و بە پاڵپشتیی فارسەکان هۆکارێکیش بوو بۆ بڵاوکردنەوەی زانستەکانیان لە ناوچەی فارسی و وڵاتی دوو زێ، پاشان شاری رەها بوو بە بنکەی کەنیسەی سریانی رۆژهەڵات[47].

دەربارەی چالاکی ئەم قوتابخانەیەش بریتی بوو لە وەرگێڕانی کتێبی فەلسەفەی یۆنانی بۆ ئەوەی بتوانن بە عەقڵ و مەنتق وەڵامی نەیارانیان بدەنەوە لە مەزهەبی یەعقوبی[48]، وا پێدەچێت ئەم قوتابخانەیە لەسەر هەمان رێچەڵەکی قوتابخانەی نوسەیبین رۆیشتبووبێت.

قوتابخانەی رەها بەردەوام بوو لە چالاکی زانستیی خۆی هەتا دوای هاتنی دەسەڵاتی ئیسلامی بەڵکو بوون بە سەرچاوەیەک بۆ تێرکردنی پێداویستییەکانی رۆشنبیری و شارستانی دەوڵەتی ئیسلامی، کە هەوڵیان دەدا شارەزایی پەیدا بکەن لەسەر کلتووری رۆشنبیریی یۆنانی[49].

٣- قوتابخانەی حەران:

قوتابخـانەی حەران یەکـێکە لە قوتابخـانە گەورە و بەناوبانگەکـانی نـاوچەکە، کە مەڵبەنـدی ڕۆشـنبیری یۆنـانی، ئـاینی یۆنـانی هاوبەشـی و فەلســـەفەی ئەفلاتـــۆنی بـــوو[٥٠]، جـــگە لە خوێنـــدنی بیرکـــاری و گەردووناسـی[٥١]، ئەم قوتابخـانەیە بەردەوام بـوو لە چـالاکی زانسـتی تـا دوای هــاتنی موســوڵمانانیش[٥٢] لە ســەردەمی خەلــیفە (متــەوەکل ٢٣٢-٢٤٧ک/٨٥٣-٨٦٨ز)ی[٥٣] عەباسـی بـوو بە مەڵبەنـدی فەلسـەفە و پزیشـکی دەوڵەتــی عەباســی کە پێشــتر لە شــاری ئیســکەندەرییە بــوو پاشــان گواسـتراوە بـۆ شـاری ئنتـاکیە ئینجـا گواسـتراوە بـۆ شـاری حەران[٥٤]، لە بەناوبانگترین زاناکانی (یەعقوب ڕەهاوی ٦٤٠-٧٠٨ز) کە کتێبێکی زۆری ئیلاهیـاتی یۆنـانی وەرگێـڕاوە، هەروەهـا دەڵـێن زیرەکتـرین پیـاوی ئـاینی مەسـیحی بـووە و خـاوەن ئەو فەتـوایەیە کە دەڵێـت ئاسـاییە منـداڵانی موسـوڵمانان فێـربکەن، ئەم وتەیە بەڵـگەیەکە لەسـەر ئەوەی کە منـداڵانی موسوڵمانانیش هەوڵیانداوە لەم قوتابخانانە بخوێنن[٥٥].

قوتابخـانەی حەران بەردەوام بـوو لە چـالاکی زانسـتی بە پێگەیانـدنی دەیـان زانـا لە بوارەکـانی پزیشـکی، بیرکـاری، گەردووناسـی، هەروەهـا چەنـدەها وەرگێـڕی بەناوبـانگی پێگەیانـد کە ڕۆڵێکـی مەزنیـان هەبـوو لە وەرگێڕان لە سەردەمی عەباسی[٥٦]، نموونەی زاناکان وەک: (سابت کوڕی قەرە)، (سینان کوڕی سابت)[٥٧] ، (عیسا کوڕی ئەسید)[٥٨].

بەم پێـــیە قوتابخـــانەی حەران ڕۆڵێکـــی بەرچـــاوی هەبـــوو لە دروستکردن و پێشکەوتنی شارستانییەتی ئیسلامی، ئەمەش لە ڕێگەی ئەو وەرگێڕانەی کە کرا لە قوتابخانەکە لە زمـانی سریانی بـۆ زمـانی عەرەبی، ئەمەش بـــووە ســـەرچاوەیەک کە موســـوڵمانان پشـــتیان پێدەبەســـت لە دروستکردنی زانسـتی خۆیـان، لە ڕاسـتیدا قوتابخـانەکە ببووە مەڵبەنـدێکی سـەرەکی کە زانسـتی دەبەخشـییە موسـوڵمانان دەربـارەی شارسـتانیەتی ئیغریقـی، ئەوەی زاناکـانی ئەم قوتابخـانەیەی لە زاناکـانی تـر جیـاواز دەکـردەوە شـارەزای تەواویـان بـوو لەســەر زمـانی عەرەبـی، بـۆیە وەرگێڕانەکانیـان وردتـر بـوو، جـگە لەمە ژمـارەیەکی زۆری کتێبەکـانی

یۆنانیـان وەرگێـڕاوەتە سـەر زمـانی عەرەبـی، بەم شـێوەیە کتێبخانەکـانی موسوڵمانان پڕ بوو لە کتێبی یۆنانی[٥٩] بە هۆی ئەمانەوە.

٤- ئەربل:

لە شـاری ئەربـل چەنـدەها قوتابخـانەی مەسـیحی بنیـاتنراو بـوو، کە زیـاتر کاریـان بڵاوکردنەوەی ئـاینی مەسـیحی بـووە لە نـاوچە لاچەپەکـان، هەروەهـا چەنـدەها مامۆسـتای بەناوبـانگی پێگەیانـدووە لە ناودارترینیـان (الجـاثلیق مارطیمثـاوس)[٦٠] کە لە سـاڵی (١٥٠-٢٤٣ک/٧٣٠-٨٢٣ز) کـۆچی دوایـی کـردووە هـاوچەرخی چەنـدەها خەلیفەی عەباسـی بـوو، خەلیفەکـان (هادی، مەهـدی، هـارون ئەلرەشـید، ئەمـین و مەئمـون) کە شـایەدییان داوە بۆی لە زیرەکی و لێهاتوویی و لایەنی هونەری و شـێوازی گفتوگۆکردنی، یەکەم کەسـە بە زمـانی عەرەبی بەرهەمـی نووسـیوە، چەنـدەها نووسـینی هەیە لەوانە: (کتێبێـک لەسـەر پێکهـاتەی ئەسـتێرەکان، کتێبـی ئەحکـام، چەندەها نامەی ئاینی لەسەر بابەتی فەلسەفی)[٦١].

٥- قوتابخانەی باشوش:

یەکێکە لە قوتابخانەکـانی نـاوچەی کـوردی کە کەوتـۆتە نـاوچەیەکی چیایی لە نێوان ڕووباری خـازر و ڕووبـاری زێـی گەورە، چەنـدەها پیـاوی ئـاینی و زانـا تێیـدا دەرچـوون کە لە چەنـدەها زانسـت شـارەزابوون[٦٢]، لە بەناوبانگترینیـان: (ابـراهیم بردشـنداد الاعـرج)[٦٣] بەڕێـوەبەری قوتابخـانەی باشوش بوو یەکێکە لە مامۆسـتا زیرەک و بە تواناکـانی ئەم قوتابخـانەیە، وە بەتریـک (طیمثـاوس الاول)[٦٤] لە دایکبـووی شـاری ئەربـیلە و قوتـابی (ابراهیم بردشنداد الاعرج)، کەسـێکی بە توانـا بـوو پەیوەنـدییەکی بە تینـی هەبـووە لەگەڵ خەلیفە هـارون ئەلرەشـید چـونکە خـەلیفە هـارون گرینگیـی زۆری داوە بە زانسـت، هەروەهـا بەتریـک (طیمثـاوس الاول) شـارەزایی هەبوو لە زمانەکانی عەرەبی و یۆنانی و سریانی بۆیە کتێبی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی[٦٥].

٦- قوتابخانەی قەنسرین:

یەکـێکە لە قوتابخـانە بەناوبانگەکـانی نـاوچەکە ئەگەرچـی زانیـاری لەسـەری زۆر کەمە بەڵام ئەوەی دەسـتمان کەوتـووە ئامـاژە بەوە دەکـات کە ئەم قوتابخـانەیەش گرینگـی داوە بە خوێنـدنی فەلسـەفەی یۆنـانی،

چەندەها زاناش دەرچووی ئەم قوتابخانەن وەک: (ئەسقوف ساویرس) کە چەنـد زانسـتێکی فەلسـەفە و لاهـووتی[٦٦] وەرگێـڕاوەتە سـەر زمـانی سریانی[٦٧].

جگە لە قوتابخانەی قەنسرین، شاری قەنسرین خاوەن دێرێک بوو بە نـاوی دێـری قەنسـرین کە ئەویـش رۆڵـی کەم نەبـوو لە وەرگێـڕان، رەبەنەکـانی ئەم دێـرە چەنـدەها کتێبـی فەلسـەفییان وەرگێـڕاوە، وەک: کتێبەکانی (حکم فیثاغورس، حدود افلاطون وحکمته، الحدود الی اللە، الإيمان والمحنة والعدل، حكم الفلاسفة في النفس، نصائح الفلاسفة)[٦٨].

جگە لەم قوتابخانانە چەنـدەها قوتابخـانەی تـر هەبـوون ئەگەرچـی وەکـو ئەوانـی تـر بەناوبانـگ نەبـوون بەڵام رۆڵیـان هەبـوو لەم شۆڕشـە زانسـتییە کە دەوڵەتـی عەباسـی گرتبـۆوە وەک قوتابخـانەی کەرکـووکی نەسرانی[٦٩]، قوتابخانەی نەبی یونسی یۆنانی لە نەینەوا، قوتابخـانەی ئیلیا جەزری کە کەوتبووە رۆژئاوای شاری موسڵ[٧٠].

بەم شـێوەیە ئەم قوتابخانـانە رۆڵێکـی گەورە و مەزنیـان هەبـوو لە شـکۆدارکردنی شارسـتانییەتی ئیسـلام بە بەشـداریکردنیان بە وەرگێڕانـی دەیـان کتێب لەسـەر زمـانی جیاواز بۆ سـەر زمـانی عەرەبی کە توانییـان کتێبخانەکانی دەوڵەتی ئیسلام پڕ بکەن لە زانسـتی جۆراوجۆر هەروەهـا توانییان بنیاتنانی زانستی بۆ دەوڵەتی ئیسلام بکەن بەم بەشداربوونەیان.

**ئەنجام**

١- ناوچە کوردییەکان لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب زۆرینەی هەرە زۆری فەتح کرا و کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی.

٢- هاتنی دەسەڵاتی ئیسلامی بۆ ناوچە کوردییەکان پاڵنەرێکی بەهێز بوو بۆ خەڵکی ناوچە کوردییەکان بەتایبەتی کەمینە زیرەک و بە تواناکان و فەرمانبەرەکان فێری زمانی دەسەڵات بن بۆ بەڕێکردنی کارەکانی خۆیان.

٣- هۆکاری ئابووری و هۆکاری ئاینی بە پاڵنەرێکی گرینگ دادەنردران بۆ بڵاوبوونەوەی زمانی عەرەبی، جگە لەوەی کە زمانی دەسەڵات هەموو کاتێک بالاترە لە زمانی میللەتانی تر بەتایبەتی کە دەوڵەتی ئیسلام سیاسەتی بە عەرەبکردنی گرتە بەر لە سەردەمی ئومەوی.

٤- ناوچە کوردییەکان بەر لە هاتنی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی زانای لێهاتوو بەتوانای زۆری تێدابوو کە گشتیان خولیای زانست و زانیاری بوون، هەروەها قوتابخانەکانی ناوچەکە گشتی بەر لە هاتنی ئیسلام پێشەنگ بوون لە بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری و پێگەیاندنی زانا، دوای هاتنی ئیسلامیش بۆ ناوچەکە بەردەوام بوون لە کارەکانیان.

٥- ڕۆڵی ئەم قوتابخانانە بە تەواوی لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسی بە دیار دەکەوێت، دەتوانن ببن بە هەوێنی ئەو پێشکەوتنەی کە لەم سەردەمە ڕوویدا چ لە وەرگێڕانی بەرهەمە زانستییەکانەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی، چ لە ڕێگەی نووسینی بەرهەمی زانستی بە زمانی عەرەبی.

٦- زاناکانی قوتابخانەکانی ناوچەی کوردی زۆر زیرەک و بە توانا بوون لە وەرگێڕان ئەمەش لەبەر ئەوەی لە هەموو زاناکانی تری سەردەمی خۆیان شارەزاییان زیاتر بوو لە زمانی عەرەبی، بۆیە وەرگێڕانی ئەوان بە جوانترین و تەواوترین وەرگێڕان دادەندرا، بەڵکو هەڵەکانی وەرگێڕانەکانی پێشەخۆشیان چاک دەکردەوە.

